رۆمان

# رازی بیلال



د. أحمد خيري العمري



وەرگێڕانی سەنا موستەفا

# ڕازی بیلال

ڕۆمان

نوسینی: د. احمد خيري العمري

وەرگێڕانی: سەنا موستەفا

چاپی یەکەم

٢٠١٩

# رازی بیلال

- ناوی نووسەر: احمد خیري العمري
- ناوی وەرگێڕ:سەنا موستەفا
- پێداچونەوەی: مەودود جەبار
- بابەت: ڕۆمان
- دیزاین: ناوەندی ڕێنوێن
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نۆبەی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
- قیاس: ١٤ بە ٢١

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٨١٥)ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە

RENWEN

ناوەندی ڕێنوێن

0751 140 8868 - 0750 126 9689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریك - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە ( ٦٦ )

## پێشەکی نوسەر بۆ چاپی کوردی ڕازی بیلال

پەیوەندیەکی کۆن بە برا کوردەکانمەوە دەمبەستێتەوە، لە یەکەم دراوسێوە لە مەنسور (باوکی ڤیان) تاوەکو کۆتا دراوسێ لە پارکی سەعدون لە بەغداد (باوکی عومەر) خودا لێی خۆشبێت، هەروەها لە نێوان دراوسێ کۆنەکانم هاوڕێ و هاوکاری کورد هەبوون کە تاوەکو ئێستاش هەر بەردەوامە هاوڕێیەتیمان کە لە کار و قوتابخانە و کۆمەڵگای نێو بەغدادا یەکمان ناسی، .... بەڵام ویستی خودا بوو کە زۆر زیاتر لەوەم هەبێت لەگەڵ کوردەکاندا...

لە هاوینی ١٩٨٨، لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێ و نزیکدا ڕۆیشتین بۆ گەشتێک بۆ عەقرە، لە ڕێگادا وەستاین بۆ کڕینی" هەنجیر" لە خانمێک کە شتومەکەکانی لەسەر ڕێگایەکە دەفرۆشت... خاتوونەکە ڕەتی کردەوە کە شتمان پێ بفرۆشێت، تێنەگەیشتین بۆچی، بەڵکو بگرە هەر تێشنەگەیشتین کە چی دەڵێت... پاشان شۆفێرەکە بابەتەکەی بۆ ڕوون کردینەوە: برینی هەڵەبجە هێشتا خوێنی لێ دەتکا، ئەویش نەیویست پارە لە کەسانێک وەربگرێت کە زۆر بە سادەیی وای دادەنا — هاوکارن — لەو تاوانەدا.

ئێمە ئەسڵەن نەشمان بیستبوو کە چی ڕوویداوە بەسەر هەڵەبجەدا... ئاخر خۆ ئەو کاتە کەناڵە ئاسمانیەکان بوونی نەبوو، تەنانەت وێستگەی کەناڵە بیانیەکانیش توشی تەشویش و تێکچوون هاتبوون... هەر بۆیە نەماندەزانی کە چی بەسەر هەڵەبجەدا ڕووی داوە... بەڵام ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی ئەو خاتوونە کوردیە هەر ڕێک وە زللەیەک بوو لە ڕووی هەموومان.

زللەیەکی بە ئاگا هاتنەوە. بەڕاستی شەرمەزاری هێنەر بوو.

چەند مانگێک بەسەر ئەوەدا تێنەپەڕیبوو کاتێک سالّی یەکەمی زانکۆم لە زانکۆی موسڵ دەستی پێکرد، زیاتر لە نیوەی قوتابیەکانیش لە قۆناغی یەکەم کورد بوون، هەر بۆیە لە ڕێی ئەوانەوە ئازار و مەینەتی کورد تیگەیشتم و،

دوور له ڕاگەیاندن چاوی ئاسایشەوە دیتمن... هەروەها دوور لە هەڵوێستی ئەو خاتوونە کوردیەش کە هەموو جۆرە مامەڵەیەکی ڕەت کردەوە.

هەر بۆیە کاتێک یەکەم داواکاریم بۆ هات لە وەرگێڕانی کتێبەکەم بۆ سەر زمانی کوردی، هەستەکانم پڕ بوون لە شانازی کردن و خۆشەویستی بۆ هەموو ئەو کوردانەی کە تێپەڕین بە ژیانمدا و جێ پەنجە و کاریگەرییەکی ڕووناکیان لە دوای خۆیان جێهیشت.

هەروەها ئەو خانمەشم بیرکەوتەوە - کە هەرگیز لە یادم نەچووە - بەڵام ئەم جارە بە جیاوازتر ئەوم هاتەوە یاد..

خۆزگەم دەخواست کە یەکێک لە نەوەکانی ئەو وەرگێڕانی کتێبەکەم بخوێنێتەوە...

خۆزگەم دەخواست کە هەموومان وانەکە تێبگەین..

******

لەگەڵ وەرگێڕانی " ڕازی بیلال"دەکرێ بڵێم ئەم "ڕازە"ی کتێبەکە لە جیهانی دەرەوەی ڕۆمانەکە بەکار دەبرێت، چونکە بەها ئینسانییەکان مێژوو و سنور و ڕەگەز و ڕەچەڵەک تێدەپەڕێنێت .

د. احمد خیري العمري

## لەبری پێشەکی

(١)

چەندە سەیرە، کاراکتەری سەرەکی ئەم ڕۆمانە کەسێکە بەناوی بیلال و توشی شێرپەنجە بووە. زۆرێک لە گێڕانەوەکانی ڕۆمانەکەیش لەسەر زاری لاتیشای دایکییەتی. واتە لاتیشای دایک، بیلالی کوڕی ڕەنگبێ لەدەست بدات، منیش، من کە ئەرکی پێداچوونەوەی ڕۆمانەکەم گرتە ئەستۆ، ناوم (٠٠٠٠)ە و دایکیشم ناوی (٠٠٠٠)یە. جیاوازی گەورەی ئێمەی کوڕ و دایک لەگەڵ بیلال و لاتیشای کوڕ و دایکدا ئەوەیە: لەوێ دایکەکە خەمی لەدەستدانی کوڕەکەی دەخوات و هەر دەقە و چرکەیەک بەشێک لە گۆشتی لەشی دەبێتە ئاو بەدیار کوڕە چواردە ساڵانەکەیەوە کە توشی ئەو نەخۆشییە کوشندەیە بووە و دکتۆرەکان بەنزیکەیی کاتی مردنەکەییان دیاری کردووە؛ واتە لەوێ، دایک کوڕ لەدەست دەدات. دایکە کە بە بەرچاوییەوە کۆرپەکەی باری سەفەر پێک دەنێت و بەئومێدی گەشتێکی دوور دوور دەڕوات؛ کەچی لێرە بابەتەکە پێچەوانەیە، منم کە ترسی ئەوە دایگرتووم دایکم لەدەست بەم لەکاتێکدا دکتۆرەکان کاتیان بۆ دەسنیشان کردووە- بەڵام ئەوەی لای خودایە جیاوازە لەوەی لای دکتۆرەکانە و خاوەن ڕەحم هەر خۆیەتی- لەبەر زۆری مەترسی نەخۆشییەکەی. تۆ تەماشا ئەو قەدەرە پێچەوانەیە. لەوێ کوڕ بەتەمایە بڕوات و جەرگی دایکی بکاتە کەباب، لێرە دایکێکی تەمەن چل و پێنج و پێ لە چل و شەش تەمای ئەوەی گرتووە باری سەفەری پێک بنێت و جێمان بێڵێت و جەرگی کوڕ بکاتە کۆی زوخاڵ.

من ئەم پێشهات و قەدەرە هەروا بە گۆترە تەماشا ناکەم و بڕوایش ناکەم پێداچوونەوەی ئەم پەرتووکە هەروا کارێکی بەرێکەوت بێت چونکە لێکچوون و هاوشێوەییەکی فرە لە بابەتەکەدا دەبینرێت. لە خۆمم پرسی جارێکیان،

ئاخر كات نەما ئێستا نەبێت پێداچوونەوە بۆ ئەم كتێبە بكەم؟ بەڵام هەر خۆیشم وەڵامی خۆمم دایەوە كە لە ئێستا باشتر كەیە؟ چ كاتێک لە ئێستا باتر من لە ناوەرۆكی ئەم چیرۆكە تێدەگەم؟ ئەگەر كەسێک خۆی نەخۆشێكی وەهای نەبێت، لەكوێ ڕا تێی دەگات و هێزی پێداچوونەوەی وەها كتێبێكی هەیە.

لێرە دایكێكی بەئەزموون بەنیازە بڕوات و كوڕێكی كەم ئەزموون جێبێڵێت تا چیدی ئەزموونەكانی بكات بە دوو بەشەوە، ئەزموونی لەگەڵ دایەگیان، لەگەڵ ئەزموونی پاش دایەگیان؛ لەوێیش لاتیشای دایک تەمای گرتووە ئەزموونەكانی بكات بە دوو بەشەوە، بیكات بە دوو بەرگ، ئەزموونی تا بیلال، لەگەڵ ئەزموونی بەیادی بیلالەوە، یان بڵێین: بەرگی یەكەم: لەگەڵ بیلالدا بە ڕۆح و جەستە، بەرگی دووەمیش: لەگەڵ بیلالدا بە ڕۆح و بێ جەستە.

لەوێ دایكێكی بەئەزموون دەمێنێتەوە لە ژیاندا و كوڕێكی كاڵی تازە پێكەوتوو ڕەوانەی جیهانی لای خودا و پێغەمبەران دەكرێت. كەچی لێرە شەنگە ژنێكی پاش تەمەنی چل ساڵی بەنیازە بچێتە جیهانەكەی دیكە بەو گشتە ئەزموونەی كە كۆی كردوونەتەوە و كوڕێكی نیمچە كاڵ بەجێ دەمێنێت.

( ٢ )

ڕۆمانەكە چەند كەسایەتییەكی تێدایە.

یەكەم بیلال

دووەم لاتیشای دایكی بیلال

سێهەم ئەمجەد حەلوانی

چوارەم خۆشەویستەكەی ئەمجەد (كریستین)

پێنجەم باوکی بیلال، واتە سەعید.

شەشەم بیلالی حەبەشی

( ٣ )

**بیلال...**

بیلال کوڕێکی تازە لاوی ١٤ ساڵەیە، هەروا ڕۆژێک لێیان مەعلووم دەبێت کە سەرە خڕە جوانەکەی، لوویەکی تێدا سەوز بووە و کەم کەم کار دەکاتە سەر دەمارە خانەکانی و هێواش هێواش هێز و پێزی لاشەی کەم دەکاتەوە. بینایی کز، بەڵام دڵی بەهێز دەکات.

بیلال ناوی لێ نراوە بیلال بەهۆی کەسایەتییەکی هەرە مەزنی مێژووی ئازادیخوازییەوە، مێژووی نەهێشتنی بەردایەتی. مێژووی نەهێشتنی جیاوازی ڕەنگەکان.

بیلال بەراوردگەلێکی فرە جوان لەنێوان چەندین کەسایەتی مێژووی و چەندین ڕووداوی مێژووییدا ئەنجام دەدات کە لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا سەرت سوڕ دەمێنێت کە چۆن من تا ئێستا ئەو بەراوردانەم نەکردووە، خۆ زۆر ئاسانن، منیش دەبوایە پەیم پێ ببردنایە.

ئەو تازە لاوە جوانخاسە، بەو تەمەنە کەمەیەوە، زۆرێک لە شتە جوانەکانی دنیا دەرک دەکات، بەتایبەتی پاش ئەوەی لێ مەعلوم دەبێت کە نەخۆشە و هێندەی نەماوە بەسەر دنیاوە، بێگومان بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە کە وای لێدەکات بەر لەوەی کۆچی یەکجاریی بکات، زۆرترین زانیاری بۆ ئەولا کۆ بکاتەوە، بۆیە سەرەڕای تەمەنە کورتیلەکەی، کەچی چەندین مەسەلەی ناسک و پڕ جۆشمان پێشکەش دەکات لە نامە ئەلیکترۆنەکانیدا بەتایبەتی نامەی کۆتایی.

ئەگەر تەماشایەکی هێماییانەی کۆی ڕۆمانەکەیش بکەین، دەبینین بیلال ڕەمزی عەقڵی بێخەوشی مرۆڤە لەو سەردەمەی کە تازە خوتە خوتەی زانین لە کەللە و مێشکی دەدات و هەمیشە خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری زیاتر و کردنی پرسیاری زیاترە. نەخۆشییەکەیشی وەک ڕەمزێکە بۆ ڕێگرییە ئاژەڵییەکانی ناو ناخی مرۆڤ کە وای لێدەکات بەردەوام بخەوێت، چونکە تایبەتمەندی نەخۆشییەکەیشی بەشێوەیەک بوو کە بەردەوام وای لێدەکرد زۆر بخەوێت. ئاشکرایشە مرۆڤ بە خەوتنی زۆر، هەم تەوەززەل دەبێت و هەمیش لەڕووی زانست و زانیارییەوە دوا دەکەوێت.

**لاتیشا...**

دایکی بیلال! ژنێکی مامۆستای ڕەش پێست، خوێنەوار. پاش هاوسەرگیرییەکی سەرنەکەوتووانە، لە باوکی بیلال جیا دەبێتەوە و لەو نێوەندەیشدا بیلال لەدایک دەبێت. هێندە بەسەر لەدایکبوونی بیلالدا تێپەڕ نابێت کە باوکی، دایکی جێدەهێڵێت و دایک و کوڕ تەنها دەمێننەوە.

لاتیشا پاش ماوەیەک هەست بە ناساغی ڕۆڵەکەی دەکات و پاش پشکنین، تێدەگەن کە وەرەمێک لەناو ئەو سەرە خڕت و خۆڵەی کوڕەکەیدایە و دکتۆریش زۆر بێباکانە دەڵێت کە ئەوە نەخۆشییەکی هەروا ئاسان نییە و باسەکە دەبەستێت بە مەرگ و زیندەگییەوە.

لاتیشا واقی ور دەمێنێت و چەندجارێک لە دوکتۆرەکەی دووبارە دەکاتەوە کە بەڕاستییەتی؟

دکتۆریش بە لارەمل و دڵێکی تەنگەوە بەڵێی بۆ دەکات.

دایک هەموو ڕۆژێک کوڕەکەی دەبینێت کە وا خەریکە لەدەستی دەچێت، بەڵام بڕیار دەدات تا دواڕاددەی خۆگری خۆگر بێت و لەو ڕێگەیەیشدا توشی چەندەها چەرمەسەریی و دڵسوتان دەبێتەوە.

ئەگەر بێین و چیرۆکەکە بکەینە ڕەمز، لاتیشا دەبێتە ڕەمزی عەقڵێکی بە ئەزمـوونی ناکامـڵ کە بەم ئەزمـونە ڕەنـگە کامـڵ بێـت، یـان پێویسـتی بە ئەزمـوونێکی تەواو سـەخت هەیە تـا بەهـای خـۆی لە کێشـە و گرفتەکانـدا تێبگـات و لەو تـاقیکردنەوەیەدا دەرچێـت کە هەمـووکەس لە ژیانـدا تاقیکردنەوەیەکی تووش دەبێت، ئیدی یان ئەوەتـا بەسـەریدا سـەردەکەوێت و دەبێتە یەکێـک لەوانەی دواتـر توشـی هەر کێشـە و ئەزمـوونێکی دیـکە ببن، هـیچ تێنـاکەون، یـان بە پـێچەوانەوە بـۆی دەبێـتە سـەرەتای شکسـت و نەهامەتی و کەوتنی بێ هەستانەوە. بێگومان ئەو کەسێکی بەتەمەن گەورەیە و، بەشی خۆیشی ئەزموونی ژیان نەرمی کردووە، بەڵام خـۆ دیـارە ئەزمـوونی لەدەسـتدانی کـوڕی خـۆی، ئەویـش نەک بە مردنێکـی لەناکـاو، وەک ڕووداوی هاتووچۆ نییە، مردنێکە کە پزیشک مزگێنییەکەی دەدات. ئەوە زۆر سەختە.

مـن (ئەوەی کە بە پەرتـووکەکەدا دەچـمەوە) هەمیشـە بەر لەوەی دایکـم توشی وەها نەخۆشـییەک ببێـت، تکـام لە خـودای گەورە دەکـرد کە نزیکـانی خـۆم لەناکـاو نەبـاتەوە، لانـی کەم مـاوەیەک نەخۆشـیان بخـات تـا خـۆم بـۆ کۆچەکەیـان ئامـادە بـکەم. ئێسـتایش کە خـودای بەڕەحـم و بەزەیـی خـۆی نەبێـت کەس نازانێـت کـێ بەر لە کـێ دەمرێـت و هیـوادارم، زۆر هیـوادار کە دایکیشـم چـاک بێـتەوە و خـودای گەورە شـیفای بەخێـری لەلای خـۆیەوە بـۆ بنێرێت.

زۆر لەوە دەترسـام کە یەکێکیـان بـڕۆن و مـن ئامـادە نەبـم لە ڕووی ڕۆحییەوە. بەلام ئێستا، سوپاس بـۆ خـودا، نەک جـارێ سـەد جـار، گریمـان ئەگەر دایکیشم ئۆغری خێـر بکـات، مـن ئێسـتا فریـای زۆرشـت دەکەوم بـۆی ئەنجـام بـدەن. مەسـەلەن: عەسـران پـێکەوە دوو بە دوو تەماشـای زنجیـرە کارتۆنی عەدنان و لینا دەکەین، پـێکەوە پێـدەکەنین. هەر کە کۆمپیـوتەرەکە دەگرم بە دەستەوە، دایکـم دەڵێـت: عەدنـانە؟ منـیش ئەڵـێم ئەوە گەیشـتینە ئەلقەی چەند؟

ڕۆژانە ئەتوانم چەندجارێک پڕ بە دەمی خۆم ماچی بکەم و تەماشای چاوەکانی بکەم بە پێکەنین و دڵخۆشییەوە.

ئەوەیش بڵێم: ئێمە لە ماڵەوەدا هیچکەسێکمان وەها مامەڵەی لەگەڵ ناکەین کە گوایە ئەو ئۆغر دەکات و جێمان دەهێڵێت. نەخێر، هەروەک جاران مامەڵە دەکەین بەڵام بە کەمێک سۆز و خۆشەویستی زیاترەوە، ئەگینا خراپترین هەست لای نەخۆش ئەوەیە کە وا بزانێت تۆ بەزەییت پێیدا دێتەوە.

خۆشە ترست لە ڕۆیشتنی کەسێکت هەبێت و بواریشت هەبێت هەموو ئەو شتانەی دەتەوێت یان دەتوانیت بۆی بکەیت و لەگەڵیدا هاوبەشی بکەیت.

بۆ نموونە هاوبەشکردنی گۆرانییەک کە چەند ڕۆژێک پێکەوە گوێی لێ بگرن و ناوی بنێن گۆرانییەکەی خۆمان.

بڕوام وایە خۆشترین هەست ئەوەیە یەکێکت بڕوات و تۆ جەخار بۆ هیچ شتێک هەڵنەکێشیت. ئەووی توانیبێتت کردبێتت. بە خۆشەویستییەوە ماڵاوایی لێ بکەیت. دواتریش هەرکات یادت کردەوە، هەموو ئەو یادگارییە خۆشانە بێنەوە یادت و ئۆخەیش هەڵکێشیت و بڵێیت ئۆهـ چەندە دڵخۆشم بەو هەموو یادگارییە خۆشەی کە هەمە لەگەڵت.

لەوانەیە زۆربەمان کەسێک یان چەندکەسێک هەبن لە یادماندا فریای ماڵاوایی نەکەوتبێتین و ئێستایش و ئێستایش هەر داخ و مەراقیان بۆ هەڵکێشین کە ئای ئەگەر یەک ڕۆژ بهاتایەتەوە، ئەوە و ئەوەم بۆ دەکرد، بەڵام لە نەخۆشکەوتنی ئاوەهادا ئەگەر مرۆڤ بیەوێت، دەتوانێت هەموو شتێک بکات کە حەزی لێیەتی و دواتریش زۆر خۆشحاڵ بێت و حەیفە و مەخابن بۆ هیچ شتێک هەڵنەکێشێت.

پێم وایە دەکرێت لە ناڕەحەتترین ڕووداویشدا چەندن شتی نەبینراو ببینینەوە و سودیان لێ وەرگرین. هەر خۆیشی لەو کاتانەدا هەندێک بیر و گۆشەونیگا دەکرێنەوە کە پێشتر نەکراونەتەوە و نەبینراون. ئەوانەیش بۆ

کەسـی ژێـر مـایەی کـامەرانین مـادەم بـڕوای بە قیـامەت و زینـدوو بـوونەوە هەبێت.

## ئەمجەد حەلوانی...

دەرهێـنەری فیلمـێکە بەنـاوی (بـیلال)ەوە. ئەو مەبەسـتییەتی لەسـەر کەسایەتی بەرزی مێـژووی مرۆڤـایەتی، بیلالـی حەبەشـی بنوسـێت و فیلمێک دەربهێنێت. بیلالی چکۆڵەیش هەروا دەدات بە شـەقامدا و ڕیکلامـی فـیلمەکە دەبینێت و سەری لەوە سور دەمێنێت کە دەبێت ئەو بیلالە کێ بێت؟ پاشـان بیـر لەوە دەکـاتەوە کە لەوانەیە ئەم نەگـاتە ئەو کـاتەی کە فـیلمەکە نمـایش دەکرێت. بۆیە ناونیشانی دەرهێنەرەکە پەیدا دەکات و تکای لێ دەکـات کە هیچ نەبێت بەشێک لەو فیلمەی نیشان بدات یان چەند زانیـارییەکی لە بـارەی ئەو بیلالەوە بداتێ. لە ڕێـگەی ئـیمەیڵەوە، بـیلال و ئەمـجەد دەبـنە ناسـیار و دۆست. دۆستایەتییەکەیان دەگـاتە ئاسـتێک کە ئەمـجەد گەورەتـرین چـاکە و پیاوەتی لەگەل بیلالـدا دەکـات بە بڵاوکـردنەوەی تێنوسـەکەی و ناسـاندنی بە زیاتر لە ٥ ملیۆن کەس.

لەملایشەوە: ئەمجەد تاکلایەنە عاشقی کریستین بووە، کریستین کەسـێکی بـێ بـڕوای تـا ڕاددەیەک زیـرەک لە زانسـتی دەروونناسـیدا. ئەمـجەد هێنـدە عاشـقی ئەو کیـژە بەنـازپەروەردەیە دەبێـت کە عەشـقەکەی نـاو دەنێـت (نەخۆشی کریستین). کریستینیش هیچ باکی پێی نییە و تەنهـا بـۆ خۆشـی خۆی لەگەڵیدا دەمێنێتەوە.

ڕۆژ بەڕۆژ عەشـقی ئەمـجەد تەشـەنە دەسـێنێت، پتـر توشـی دەردی کریسـتین دەبێـت. خـۆی هەر وایە، کاتێـک دو کەس پـێکەوە دەبـن، ئەگەر هەردوولا وەک یەک نەهـاتنە پێشـەوە، ئەوا یەکێکیـان ناچـار دەبێـت بەشـی ئەوی دیکەیشیان بێـتە پێشـەوە. وەک ئەوە وایە پێویسـت بێـت دە بارەسـێو هەڵگرن، بەڵام یەکێکیان دەڵێت: مـن دوو دانە زیـاتر هەڵنـاگرم، ئیـدی ئەوی

دیکەیان ناچار دەبێت هەشت هەڵگرێت و باری قورس دەبێت و لەتاو قورسی بارەکەیشی هەندێک هەڵە و لادانی تووش دەبێت. بۆ نموونە ئەوەندە بارەکەی قورس بووە، قسەی لاواز دەکات، بیرۆکەی هەڵە بەمێشکیدا دێت و هەرکاتێکیش ساردی لە بەرانبەر دەبینێت، ئەوەندەی دیکە باری لەش و دڵی قورس دەبێت. بەم کارانەیشی دەیەوێت خۆی لە خۆشەویستەکەی نزیک بکاتەوە، کەچی رێک پێچەوانەکەی راستە، هێندەی دیکە لای کەمبەها دەبێت.

زۆربەی کات ئەم کەسانە زۆر درەنگ بیریان دەکەوێتەوە کە کەوتونەتە چ گێژاوێکەوە، بەڵام کاتێک بیریان دەکەوێتەوە و دەست بە کاوێژی ئەو عومرە با بردوە دەکەن، بڕیارێکی سەخت دەدەن و بابەتەکە بەتەواوی پێچەوانە دەکەنەوە و ئەمجارە هەشتەکە دەدەن بەدەستی بەرانبەرەکەیانەوە و خۆیان تەنها دوو بارەسێو هەڵدەگرن.

ئەمجەد رۆڵی عەقڵێکی پڕپۆڵی پڕ لە کێشە و ماتەم دەبینێت. زۆرجار دەزانێت چی چاکە، بەڵام هێندە حاڵی پەرێشانە، ناتوانێت بڕیار بدات کە واز لە خراپەکان بهێنێت و دەست بەرێت بۆ ئەو چاکانە.

بۆ نموونە سوور دەزانێت ئەو هەتا زیاتر لەگەڵ کریستیندا بێت، خەفەت زیاتر دەخوات، باشتر وایە دەستبەرداری ببێت و جارێکیشیان ژمارە تەلەفۆنەکەی لە مۆبایلەکەیدا دەسڕێتەوە تا ئیدی نەتوانێت تەلەفۆنی بۆ بکات.. کەچی پاش دوو رۆژ لە چاوەتاتکێی مۆبایلەکەی دەی بەشکوو نامەیەک، زەنگێکی لەلایەن کریستینەوە بۆ بێت، لە کۆتاییدا یەک نامەی بۆ هات، ئەویش تێیدا نوسرابوو (ئاگات لە سەگەکەم کۆپەر بێت، بێ خواردن نەمێنێتەوە). درێژەی عەشقەکەی ئەمجەد لە رۆمانەکەدایە کە داخۆ لە کۆتاییدا چی لە کریستین دەکات؟

**سەعید ...**

باوکی بایۆلۆجی بیلالە. کاتێک بیلال لە سکی دایکیدا بوو، سەعید ڕۆژێکیان بەلای مزگەوتێکدا تێپەری و بینی مزگەوتەکە ناوی بیلالە. چوویە ژوورێ و لە مجێوری مزگەوتە ئەحواڵی ئەو ناوەی پرسی، ئەویش کەم تا زۆر تێی گەیاند کە ئەوە ناوی پیاوێکی ئەفریقییە، واتە ڕش پێست کە بەر لە ١٤ سەدە توانی بەهۆی باوەڕەکەیەوە خۆی لە بەردایەتی ڕزگار بکات و ببێتە کەسێکی ئازاد. بەڵێ بەهۆی ئیمانەوە.

بیلال بانگبێژی پێغەمبەری ئاخر زەمان بووە و ئیدی سەعیدیش ئەم چیرۆکەی بەلاوە خۆش دەبێت و بریار دەدات کوڕە هێشتا لەدایکنەبووەکەی بەو نێوەوە نێو بنێت.

هێندە نابات کە سەعید ژن و منداڵە مەلۆتکەکەی بەجێ دێڵێت و لە هیچکوێەکەوە دیار نامێنێت.

ئەو توشی مادده هۆشبەرەکان دەبێت و دواتریش بەهۆی بازرگانی پێیانەوە دەستگیر دەکرێت و لە بەندینخانەیەکی دوور دوور لە شوێنی نیشتەجێبوونی بیلال و لاتیشاوە بەند دەکرێت.

ڕۆژێکیان بیلال کە خەریکی خوێندنەوەی چیرۆکی بیلالی حەبەشییە و دەبینێت ئەو بیلالە لەپاش مەرگی پێغەمبەری ئاخر زەمانەوە، هەستێکی سەیر گیانی دادەگرێت و هەست دەکات ئەوە هەستی باوکایەتییە تا ئێستا لە پێغەمبەردا درکی پێ کردبوو، ئەوەتا ئێستا هەست بە بێباوکی دەکات کە ئەو پێغەمبەرە وەفاتی کردووە چونکە بیلال هەر باوکی خۆی نەبینیبوو. تاکە زانیارییەک لەبارەی باوکییەوە ئەگەر هەبا، هەر ئەوەبوو کە ناوی ڕەباح بوو. بۆیە تێگەیشت کە تا ئێستا، هەرچەندە خۆیشی نەیزانیبێت، بەڵام وەک باوک تەماشای پێغەمبەری خودای کردووە.

بیلالی چکۆڵەیش لە سەروبەندی ئەو باس و خواسەدا، کە دەیزانی وا مەرگی نزیکە، بڕیاریدا بەدووی ئەو هەستە باوکانەدا بگەڕێت و بەر لە کۆچ، کەمێک لە باوکی خۆی ڕامێنێت. پاش سین و جیمێکی زۆر، زانی کە باوکی لە فلانە بەندینخانەیە و هەرچۆنێکی کرد خۆی گەیاندە لای و لەوێ شتانێکی سەیر ڕوویاندا کە لە بەشی کۆتایی کتێبەکەدا بەرچاوی تۆی خوێنەری خۆشەویست دەکەوێت.

( ٣ )

ئەو کاتەی پێت دەڵێن، یان دەبیستیت دایکت توشی شێرپەنجە بووە، بۆ یەک چرکە ڕادەمێنیت و لە سەرەوە بۆ خوارێ، چاوێک بە خۆتدا دەخشێنیت و، خێرا یەک دڵۆپ فرمێسک دەخزێتە کالانەی چاوی چەپتەوە و، بۆ ئەوەی بەهێز دەرکەویت، دەست بە کۆکە دەکەیت، گوایە ئەو چاو سووربوونەوەیەم هی کۆکەکەیە. ئینجا بەدەم دەست گرتن بە دەمو لووتەوە، پەنجەیەکت درێژ دەکەیت بۆ لای چاو و دڵۆپە فرمسکە بەدزییەوە دەماڵیت، ئینجا بە بڕوا بەخۆبوونێکەوە دەڵێیت: هەر بەڕاست؟ شێرپەنجە؟ ئەی چۆن هەستمان پێ نەکردووە؟ وەڵڵا سەیرە.

دیسانەوە بوار بە کەسی بەرانبەر نادەیت و دەڵێیت: زۆر دڵنیایت وا نییە؟ دیسانەوە لەبەر پەشۆکاوی، دەتەوێت خۆت بەهێز نیشان بدەیت، ئەی باشە چی بکەین؟ چۆن چۆنی دەست بە وەرگرتنی چارەسەر بکەین؟ هەمدیس نایەڵیت بەرانبەر وەڵام بداتەوە، دەپرسیتەوە: ئەی دکتۆر بە خۆی گوت؟ خۆی تێگەیشت؟ ئەی باشە چۆن پێی بڵێین؟ چما خۆ ئەگەر بزانێ، ورەی دەرووخێ. بەخوا پێی بڵێین زەندەقی دەچێت. ئەی تخوا دەرەجەکەی چەنە؟ دیسانەوە هێشتا نەتهێشتووە بەرانبەر وەلام بداتەوە، ئەی دەرمانەکان، دەرمانی ئەم جۆرەی ئەو لێرە دەست دەکەوێت؟ ڤیزا و

پاسپۆرت ئامادە بکەین؟ ئەی هاووار ئەی ئەگەر ئەویش وەک فلانەکەسی دراوسێمانی لێ بێت چی؟ نا ئیشەللا وەک کاک عەبدوللا دەبێت، تووشیش بوو، پەڕاندیشی، ئێستا ئەڵێی ئاسکە بۆی دەرەچێت.

دێیتەوە بۆ ماڵەوە و، لێت دەپرسن: چی بوو ئەنجامی پشکنینەکە؟ تۆیش لەپاش ڕاهێنانێکی زۆر لە ڕێگەدا کە نەکا شتێکی خراپت لە زار دەرپەڕێت، زارت هەڵدەپچڕیت و دەڵێیت: دکتۆر لەوێ نەبوو، سکرتێرەکەیم بینی، وتی دکتۆر چۆتە سەفەر و یەک شەممە دەگەڕێتەوە، ئەنجامی پشکنینەکەی خۆیشمان کەوتۆتەوە ئەو کاتە. کەمێکیش بۆڵەبۆڵ بەسەر دکتۆردا دەکەیت کە بۆچی چۆتە سەفەر، ئەو نازانێت ئێمە نەخۆشمان هەیە... هەموو ئەو بۆڵە بۆڵەیش بۆ ئەوەیە بڕوا بە قسەکەت بکەن کە دکتۆر لەوێ نەبووە و تۆیش ئەنجامەکە نازانیت.

خێرا خۆت دەگەیەنیتە نەخۆشەکەی ماڵەوە (دایکت) و دەستی ماچ دەکەیت، لە کاتی ماچەکەدا یەک سوێ بە دڵتدا دێت، خێرا چاوت تەر دەبن، بەڵام مەجالێک وەردەگریت بۆ ئەوەی پێتەوە دیار نەبێت، بە هێواشی ماچێکی دیکەی دەستی دەکەیتەوە و، سەرێک ڕادەوەشێنیت کە گوایە ئاوەکەی نێو چاوت لە قنکەچاوتدا گۆم نەخۆاتەوە و بڵاو ببێتەوە بە هەموو چاوتدا و کەس هەستت پێ نەکات. خێرا بەرەو لای موشتەمەلات و شتەکە هەنگاو هەڵدێنیت و هەر ئەوەندەی زەحمەتە دەرگای موشتەمەلات پێوە بدەیت، یەک گریان بۆی دەگریت کە هەر نەبێتەوە، لە بەرانبەر ئاوێنەی موشتەمەلاتەکەدا تەماشای خۆت دەکەیت کە بزانیت دیمەنت چۆنە لە کاتی گریندا، داخۆ زارم زۆر دادەپچڕم یان بیچمم درێو نییە لەکاتی گریاندا؟ گریانەکەت بیر دەچێتەوە و بەدیار سەر و پۆتەلاکی خۆتەوە رادەمێنیت و هەر بەراستی خۆتت بەلاوە زۆر درێوە، ئەئوە منم لە کاتی گریندا؟ چما هێندەیش ناشرینم؟

خێرا خەیاڵت پەرت دەبێت بە جیرەی دەسکی دەرگای موشتەمەلاتەکە کە یەکێک تەنگاوە و بێخەبەر لەوەی تۆ بۆچی چاوەکانت تەڕ بوون، خۆی بە ژووردا دەکا و تۆی چاو سووربووەوە دەبینێت، بەڵام تۆ هەر خێرا شڵپێکی دیکە ئاو لە ڕووخسارت دەپرژێنیت کە گوایە سابوون چووەتە چاوتەوە، دەڵێیت: چار نییە دەموچاوم نەشۆم و سابوونی دنیا نەچێتە چاومەوە.

خەمی هەرە گەورەت هەر ئەوەیە چۆن ئەوانی دیکە بزانن، خوشکەکانم، برا بچکۆلە ١١ساڵەکەم، براکانی دیکەم، باوکم ئەوە خۆی زانیویەتی، پێکەوە بووین لە نەخۆشخانە، ئەی نەنکم ئەگەر بزانێ، خۆ ئەو خۆی هەر نەخۆشە. ئەی خۆی چۆن بزانێت؟ بۆخاتری خوا ئەگەر بزانێت چی بکات، چی بڵێت؟ ؟

چەند رۆژێک ئاوا تێپەڕ دەبن و ڕۆ بەرۆژ خەریکی لۆمەی نەفسی خۆت دەبیت و پەشیمانی لەو گوناهانە دەردەبڕیت کە کردوتن، بڕیاریش دەدەیت چیدی توخنی ئەو گوناهانە نەکەویتەوە. خۆراکی کەمت پێ دەخورێت و دەڵێیت بەخوا زۆر برسیم نییە. یان بۆ ئەوەی پێت نەزانن، بەڕۆژوو دەبیت هەروەک ئەوەی باوکم ئەو کاتەی کە تەنها ئێمە ئەنجامەکەمان دەزانی (من و باوکم) بۆ سێ رۆژ بەرۆژوو بوو تا ئەو ڕۆژەی چووینەوە لای دکتۆر و ئەنجامی نەخۆشییەکەی بە هەموومان ڕاگەیاند و بەتایبەتیش قسەی لەگەڵ دایکم کرد و وای تێگەیاند کە نەخۆشییەکەی کەمێک قورسە، بەڵام ئەگەر ورەی بەرز بێت، ئەوا وەک زۆرێک لەو خەڵکە دەیپەڕێنێت کە پەڕاندوویانە.

( ٤ )

دیارە مرۆڤ کاتێک دەبیستێت یەکێک مردووە، زۆربەی کات تاوانە هەرە گەورەکانی خۆی دێنەوە بەرچاوی. دەڵێت ئەی ئەگەر من بەم تاوانانەوە بمرم چی دەبێت؟

یەکێک لە هەرە بەخششە گەورەکان لەم جۆرە نەخۆشییەدا (شێرپەنجە) کە ئەگەر بریاربێت مرۆڤ بکوژێت ئەوە لە کاتێکدا کە بەپێی داتای نەخۆشخانەی هیوا، ٨٠٪ی نەخۆشەکان چاک دەبنەوە و کەمترینیان کۆچ دەکەن، ئەوەیە: بنیادەم فریای رێکخستنەوەی بارودۆخی خۆی دەکەوێت و فریای تۆبە و تەواوکردنی هەندێک کاری تەواونەکراو دەکەوێت کە بۆ ئەو کەسانە دەست نادات کە مەرگ لەناکاو یەخەیان دەگرێت. ئێ وەڵڵا ئەوە گەورەترین بەخششی خودایە و بە هەموکەسێکی نابەخشێت.

( ٥ )

من نازانم کەسی توشبوو چۆن بیر لە خودا و بوونەوەر و ئەو شتانە دەکاتەوە کاتێک بۆ یەکەمجار دەبیستێت توشی وەها نەخۆشییەک بووە. داخۆ بیر بکاتەوە کە باشە لەناو ئەو هەموو کەسەدا بۆچی من؟

بەڵام رەنگە لەپاش چەند رۆژ و مانگێک بیر لەوەیش بکاتەوە کە ئەی بۆچی من نا؟ بۆچی یەکێکی دیکە توش ببێت؟ لەوانەیە هیچکام لە نەخۆشەکان ئامادە نەبن نەخۆشییەکەیان بدەن بەسەر کەسێکی دیکەدا — گریمان رێگەیان پێ بدرێت. بەتایبەتی بۆ کەسی ئیماندار کە نەخۆشی هەمووی رەحمەت و بەخشندەییە کە لە کاتی نەخۆشییەکەدا زیاتر لە هەموو کاتەکانی دیکە مرۆڤ بیری بەلای نەفسی خۆی و یادی خودا و پەشیمانی لە تاوانەکانی دەبێت. نایشکرێت بگوترێت کە تۆبەی ئەو کاتە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە چونکە نەخۆشەکە دەزانێت چاک نابێتەوە. نەخێر، زۆرینەی

نەخۆشـــەکان چـــاک دەبـــنەوە و نەخۆشـــخانەیش ئەو ڕێـــژەیە بە ٨٠% دەخەملێنێت. واتە زۆرینەی نەخۆشـەکان بەو هیـوایەوە دێنە ئەوێ کە چاک ببنەوە. هەیانە بەرنامەی داهـاتوو لەوێ دادەڕێژێـت. ئەلموهیم ئەوە بـابەتێکە کە زۆر مشـتومر هەلنـاگرێ چـونکە مـرۆڤ تـا کۆتـا چـرکەیش ئومێـدی بە ڕەحمی خودا هەیە و نـاوی (الشـافي) خـودای گەورەیـش لەوێدا بەتەواوەتـی دەدرەوشێتەوە.

بەڵام ئەو خەیاڵانەی بەسەر کەسی نەخۆشـەکەدا دێـن پێـک دێـن لە چەنـدین جۆری خەیاڵ کە باش و خراپ تێکەڵ بوون هەروەک چۆن تەماتە بەسەر خەیـار و خەیار بەسەر تەماتەدا دەکەون لەناو زەڵاتەدا.

لەو کـاتەدا ڕێـژەی ئیمـان بە خـودا و ڕەحمـی خـودا لە دڵـی مرۆڤـدا تـاقی دەبێتەوە. لەو کاتەدا لەو ئـایەتە پیـرۆزە تێـدەگەیت کە دەفەرموێـت: (کەس لە ڕەحمی خودا بێهیوا نابێت مەگەر ستەمکاران).

باشە پێم بڵێ چ نەخۆشـییەک لە خـودا گەورەتـرە؟ ئەی چ نەخۆشـییەک لە ڕەحمـــی خـــودا گەورەتـــرە؟ ئەگەر ئیمانـــت بەوە هەبێـــت، ئەوا ئیمانیشـــت بە چـــاکبوونەوەی نەخۆشـــەکەت دەبێـــت، وەگەرنـــا، هەم نەخۆشـــەکەت لەدەســـت دەدەیت و هەمیش ئیمانەکەت چونکە لەوێدا ئیمان لە بێژنگ دەدرێت.

( ٦ )

زۆرکات ئێمە وا دەزانین ئەوە ئێمەین بیـری مردووەکانمـان دەکەیـن بەتەنهـا. بەڵام مەسەلەی مردن هەروەک مەسەلەی عەشق و هەمـوو بـابەتە دووسـەرەکانی دیکە وەهایە.

کاتێـک عاشـقێک ماشـوقەکەی لەدەسـت دەدات بە هەر هۆکارێـک بێـت، خـۆ تەنهـا یەکێکیـان فرمێسـک نـاڕێژن، بەڵکـوو هەردووکیـان خەریکـی داوەرانـدنی ئەسرینن.

ئەو کاتەی خۆشەویستێک، خۆشەویستەکەی ئـۆغر دەکـات، ئەوەیـان کە لە ژیانـدا مـاوە، زۆر خەم و خەفەت دەخـوات، بێـزاری دەردەبڕێـت و ڕەنـگە لەبەر

کەمخەوی و فرمێسکی زۆر، چاوەکانی گەش و ڕووخساری لاواز ببێت. ئێستا با بێین و بابەتەکە هەڵگەڕێنینەوە. ئەوەیان کە مردووە زیندوو بێت و ئەوەیان کە زیندووە بمرێت، دیسانەوە ئێمە وا دەزانین تەنها زیندووەکە خەفەتی دووری دەخوات، کەچی نەخێر، هەردووکیان خەم دەخۆن، جەخار هەلدەکێشن و ماتەم دایان دەگرێت. ئێستا خەمی زیندووەکە دووبەرانبەر دەبێتەوە کاتێک زانی خۆشەویستەکەی لەو دنیایش خەفەتی بۆ دەخوات.

خەفەتی ئەوەی ئەو دنیایش دوو هێندە دەبێتەوە کاتێک بۆی دەردەکەوێت ئەوە تەنها خۆی نییە خەمی دڵدارەکەی دەخوات، بەڵکوو ئەوەی دنیایش کە جێماوە، ئێستا خەمی ئەویەتی.

مەبەستەکەم ئەوەیە، وا نەزانرێت بە مردن خەم نامێنێت. ئەو دایکەی کە سێ کۆرپە و مێردێک و دایکێک و باوکێک و چەند ڕەفیقێک بەجێ دێڵێت، تۆ بڵێی لەو دنیا بیری ئەمانە نەکات؟ خەفەتیان بۆ نەخوات؟ چۆن نا؟ بەرەوەڵڵا.

دەتەوێت بڵێیت: ئەو باوکەی کە منداڵەکەی تازە بە تازە فێری بابە بووە، کاتێک باوکەکە دەمرێت، هیچ بیری ئەم کۆرپەی نەکات؟ بڕوا ناکەم وا بیر بکەیتەوە.

ئەم بابەتە فرە فرە هەلدەگرێت و پێوستی بە تێڕامانی زۆر زۆرە.

ئێستایش ئێوە و کتێبەکە. هیوادارم تاقەتێکی باشتان هەبێت لەگەڵیدا چونکە لە سەرەتاوە زۆر خۆش و بەهێز نییە، بەڵام لە کۆتاییدا هەموو شتەکان کە لکان بەیەکەوە، ئەوسا مانای جوان و ورد دەدەن بەدەستەوە.

کە لێیشبوونەوە، دڵنیام کاریگەری زۆری لەسەرتان جێهێشتووە. کەسایەتی بیلالی حەبەشیت لەلا دەگۆڕێت.

بە هیوای کاتێکی خۆش لەگەڵ پەرتووکەکەدا

## ئازیزم ئەمجەد

ناوم بیلالە... تەمەنم سێزدە ساڵە، لە برۆکلین دەژیم، نیۆرک.

بیستم کە بەڕێزتان سیناریۆی فیلمێک دەنوسن کە ناوی منی هەڵگرتووە، بیلال. ناتوانیت وێنای بکەیت کە چەند خۆشە بۆ من کە بە سەر شەقامەکاندا پیاسە بکەم و ناوی خۆم بخوێنمەوە لەسەر تابلۆ بڵاوکراوەکان... کە ببینم دەدرەوشێتەوە لەسەر شاشەی بانگەشە بازرگانیەکان وەک ناونیشانی فیلمێک... هەروەها زیاتریش بزانم دەربارەی ئەو هۆکارەی کە وای لە باوکم (کە بیرم ناکەوێتەوە، چونکە من زۆر زۆر منداڵ بووم کاتێک ئەو منی جێهێشت) کرد ئەو ناوەم بۆ هەڵبژێرێت.

بەداخەوە بڕوا ناکەم کە بتوانم تەماشای فیلمەکە بکەم لە کاتی دابەزاندنی بۆ سەر شاشەی سینەماکان، ئەو کات من بوونم نابێت، هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە من تووشی جۆرێکی دەگمەن لە شێرپەنجەی مێشک بووم... هەروەها لە ئینتەرنێتیشەوە زانیم کە ڕێژەی ڕزگاربوون لێی ئەستەمە، پێ ناچیت بهێڵێت بمێنمەوە تاوەکو کاتی دابەزاندنی فیلمەکە.

تێدەگەم کە لەوانەیە داواکاریەکەم سەمەرە بێت، بەڵام دەخوازم کە سیناریۆی فیلمەکەم بۆ بنێریت. خوازیارم کە ئەوە بێنمە خەیاڵی خۆم کە چی ڕوودەدات لەسەر شاشە، خوازیاری زانینی زیاترم لە بارەی بیلالەوە، تێدەگەم کە خوێندنەوەی سیناریۆ وەک تەماشاکردنی فیلم نیە، بەڵام لە هیچ باشترە...

بەڵێنت پێ دەدەم کە سیناریۆکە بۆ کەس بڵاو نەکەمەوە. هەروەها بەڵێنیشت پێ دەدەم کە بە کەسیش نەڵێم. ئەمە نهێنی نێوانمان دەبێت.

چاوەڕێی وەڵامتم..لەگەڵ ڕێز و سوپاس.

بیلال

تێبینی: ئەگەر ڕویدا و بە هەر شێوەیەک دایکمت ناسی، تکایە پێی مەڵێ کە من دەربارەی ڕێژەی ڕزگاربونەکە بە تۆم گوتوە، ئەو نازانێت کە من دەزانم.

ئەمجەد

ئەو ڕۆژە ئیمەیڵەکەم کردەوە بۆ ئەوەی داواکاری کشانەوەم لە کاری نوسینی سیناریۆکە پێشکەشبکەم، بەڵام ئەو پەیامەم تێدا بەدی کرد.

لە ئەوەڵەوە تێنەگەیشتم کە کێ ناردوویەتی، چونکە ناونیشانی نێردەرەکە کەمێک سەیر بوو... بەلایەنی کەمەوە سەیر بوو بۆ لیستی تەوەری ئەو پەیامانەی کە بۆ ئەم ئیمەیڵەم دەنێردرا. ئەو ئیمەیڵی کارەی کە لە پێگەی بانگەشە بازرگانیەکانی فیلمەکەدا دانرابوو.

لە ڕاستیدا پەیامی زۆرم پێنەدەگەیشت، زۆربەی پەیامەکانیش لە (عەبدول)ەوە دەهاتن، وەک هەمیشە پێی دەوتم کە خێرا بکەم لە نوسینەکاندا...

لەو کاتەوەی کە دەستم بە پرۆژەکە کرد کە دەکاتە پێش دوو مانگ، زیاتر لە پەیامی پەلە کردن هیچی دیکەم پێ نەدەگەیشت...

زۆر بە سادەیی لە شوێنی نادروستدا بووم... هەروەها لە سەرەتاشەوە دەمزانی کە لە شوێنی هەڵە و نادروستدام... بەڵام هیچ بژاردەیەکی دیکەم نەبوو جگە لەوەی قایل بم بە کارەکە لە ناو فیلمەکەدا چونکە پێنج ساڵ دەبوو لە بڕوانامەی دکتۆرادا بەگیر مابووم بە بێ پێشکەشکردنی ڕاستی، بڕوانامەی دکتۆرایەک لەسەر ماوەی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە ڕۆژانی سەروەری دا کە کەس بیری لێناکاتەوە و بە لایدا ناڕوات و، هیچ کەسێکیش گرنگی بە بڕوانامەکەم نادات. هەروەها داواشم لێکرابوو کە قیستی ماڵەکە و هەموو قەرزەکانی تایبەت بەوە بدەمەوە.

لە ناو هەموو ئەمانەدا وەگیر مابووم، لە هەموو ژیانم، لە دکتۆرا، لە قیستەکانی ماستەر، لە ناو خەونەکەمدا کە ببمە مامۆستایەکی درەوشاوە لە زانکۆی کۆلۆمبیا، پاشانیش لە وتنەوەی وانە و بابەتێک کە هیچ کەسێک لە زانکۆیەکی کۆمەڵایەتی لە باشووری نیۆرک دا گرنگی پێنادات، لە پەیوەندیەکەم لەگەڵ ئەو کریستینەی کە دەزانم خۆشی ناوێم وەک ئەوەی من ئەوم خۆش دەوێت، لەوانەشە هەر خۆشیشی نەوێم بە هیچ جۆرێک، بەڵکو ئەو تەنها کاتێکی خۆشم لەگەڵ بەسەر دەبات. بڕوام وایە فرمێسکێکیش نارژێت بۆم ئەگەر ڕۆژێک بڕیار بدات بە جێم بهێڵێت چونکە ئەو پیاوێکی باشتر و کارێکی باشتری لە ویلایەتێکی دیکەدا دۆزیوەتەوە...

منیش خۆشم دەویست... بە نائومێدیەوە... بە هۆگریەوە. وەک ئەوەی ئەم شتە لە جیناتی هەموو ڕۆژهەڵاتیەکاندا بۆماوە بوبێت. لە ڕۆژهەڵاتدا نەژیاوم تا ئەوەی ئەم هەست و سۆزانەیان لێ وەربگرم، بەڵام من بە نائومیدیەکەوە نقوم بووم لە خۆشەویستی ئافرەتێکدا کە لەتەکمدا دەژی، مەخابن خۆشی ناوێم.

لە هەموو لایەکانەوە بەسترابوومەوە، نامەی دکتۆرایەک کە لە هیچ شوێنێک سوودی نییە، پرۆفیسۆر میللەرێک کە هەر نوسینێکم بۆ ببردایە لە بارەی بابەتەکەمەوە بۆی دەگەڕاندمەوە و، بە دەگمەن کاتی هەبوو بۆ چاوپێکەوتنم ڕوبەڕوو. ئەو قیستی خانووانەی کە نرخەکانی فڕیبوون لە دوای قەیرانی دارایی.. هەروەها ئەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەش کە بە خوێندن لەسەری ئاڕاستەم ناکات بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت ببمە مامۆستایەکی ئاست نزم کە وانەیەک دەڵێتەوە کە کەس بایەخی پێ نادات، لە زانکۆیەک کە پشتگیری ئەکادیمیەکەیم بە ناڕەحەتی و قورسی بەدەست هێنا.

ڕۆژێک دەمویست کە (ئەستێرەیەکی ئەکادیمی)بم وەک ئێدوارد سەعید.

دەمزانــی کــە بەدڵنیاییــەوە بارودۆخەکــە دەگۆڕێــت کاتێــک لــە نامــەی دکتۆراکەم تەواو دەبم، ناسنامەی پیشەیم بەهێزتر دەبێت بۆ پێشکەشکردنی کار لە زانکۆی باشتر.. یاخود لەو بنکانەی گرنگی پێدەری موتاڵاکردنن سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

بەڵام لەو ساتەدا دەست بەستراو و ڕوخاو بووم و، هیچ بژاردەیەکی دیکەم نەبوو جگە ئەوەی قایل بم بەو داواکاریەی کە بۆم هاتبوو، بۆ کارکردن لە فلیمێکی جوڵاو دەربارەی بیلالی حەبەشی.

بە تەواوەتی نازانم چۆن داواکاریەکە هات.

(کاتژمێری دڵخۆشی)بوو! واتە: ئەو ماوەیەی کە تێیدا بە نرخێکی کەمتر خواردنەوە دەفرۆشن، کە ئەوەش زۆربەی کات لەگەڵ کاتی کۆتاییهاتنی کاردا یەکی دەگرتەوە، بە تایبەت لەو کاتەدا دەڕۆشتم بۆ یانە لە ناوچەی (woodbury)، سەرەڕای ئەوەی کە کارەکەم تاقێک بوو لە ڕۆژێکدا، زۆربەی کات  پێش ئەم کاتە تەواو دەبوو، بەڵام من لەو کاتەدا دەڕۆشتم لەبەر هۆکاری دارایی ڕوون و ئاشکرام.

جارێکیان عەبدول هاتە لام، بەو شێوەیە ناوی دێنن، ناوی عبدالعزیز یان عبد الحکیم یان شتێکی لەو بابەتەیە، ئەوەندەی کە لە یادم بێت عەرەبە و خەڵکی شوێنێکە لە خلیج، بەڵام چیدیکە ئەوە گرنگ نەبوو، لەبەر ئەوەی ئەو هەموو کات لە نیۆرک بوو. لە ئەکادیمیای نیۆرک بۆ فیلمسازی خوێندبووی و پاشان بەردەوام بوبوو لە خوێندنی بابەتێکی دیکەدا، زۆر هۆگری سینەما بوو، بە لایەنی کەمەوە دەربارەی سینەما هەموو شتێکی دەزانی. لە یەکەم فیلمی بەناوبانگییەوە، ئەوەش لە سەرەتاوە خۆش بوو کاتێک یەکەم جار ناسیم، پاشان زۆر بێزارکەر بوو، بۆ وێنا زۆر بە سادەیی پرسیاری دەربارەی بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەکالیۆرۆسم دەکرد، کاتێک منیش پێم دەگوت کە لە ساڵی ١٩٩٧ بەدەستم هێناوە، یەکسەر: ئوووو،

ئەوە ساڵی تایتانیکە! کێ دەتوانێت لە یادی بکات؟! تایتانیک لەو ساڵەدا ١١ ئۆسکاری بەدەست هێنا، بەڵام بە ڕای من شایەنی ١٢ ئۆسکار بوو، تەنانەت ١٣ ش.

جاک نیکڵسۆن شایەنی خەڵاتەکە نەبوو، بەڵکو لیۆناردۆ، ڕۆڵی جاک دەوسن هەلی ژیانی بوو، تەنانەت هێلین هێنتیش، بە بۆچونی من کەیت شایەنتر بوو بە خەڵاتەکە، بۆچونی تۆ چییە؟!

زۆربەی کات نەمدەزانی لە بارەی چییەوە دەدوێت، دڵنیا نیم کە هەر هەموو فیلمەکەم دیبێت یان نا، هەر نەشم دەزانی کەیت یان هێلین کێن، تەنها هەستم کرد کە ئەو دەربارەی لیۆناردۆ دیکاپیرۆ دەدوێت نەک لیۆناردۆ داڤینشی.

بە شێوەیەک باسی ئۆسکارەکانی ١٩٩٧ی دەکرد وەک ئەوەبوو خۆی ئەندامێک بوبێت لە لیژنەی دادوەران، یاخود هەر هیچ نەبێت پێشکەشکاری ئاهەنگەکە بووە.

پرسیم لێی: عەبدول! تەمەنت چەند بوو لەو ساڵەی کە باسی دەکەیت (جا توخوا کێ لە بیری دەکات)؟

بە شەرمێکەوە گووتی:دە ساڵ! فیلمەکەشم بە ڤیدیۆی تۆمارکراوی دیتووە لە هۆڵی سینەما کە جوڵەی جەماوەر وەک جوڵەی ئەکتەرانی فیلمەکە تێیدا دەدەکەوێت... بەڵام زۆر گریام و دایکیشم بە هەمان شێوە گریا.

عەبدول زۆر بە قوڵی حەیرانی کوبۆلا و سکۆرسیزی بوو، گفتوگۆکانی ناو فیلمەکانیانی دەرخ کردبوو، جارێکیان کەسێک پێشبڕکێی لەگەڵ کرد بەڵام دەرکەوت عەبدول فیلمی (good fellas) ی وەک ناوی خۆی لەبەر بوو.

کاتێکیش عەبدول سەرخۆش دەبوو، لە کۆتاییەکانی شەودا، دەیگووت کە دەیەوێت فیلمێک دەربهێنێت لە بارەی گەورەیی ئیسلامەوە، هەموو جارێک

که سەرخۆش دەبوو وای دەگوت... جارێکیان که سەرخۆش بوو پرسیم لێی و چاوەڕێی وەڵام نەبووم: کەوایە تۆ که دەتەوێت فیلمێک دەربکەیت لەبارەی گەورەیی ئاینەکەت... ئەی بۆچی دەخۆیتەوە و سەرخۆش دەبیت که دینەکەت ڕێگەی گرتووە لە شەراب خواردنەوە؟

یەکسەر وەڵامی دامەوە وەک ئەوەی سەرخۆشیەکەی نەمابێت: لەبەر ئەوەی که سەرخۆش دەبم و دەخۆمەوە، دەمەوێت فیلمیک دەربکەم لە بارەی مەزنی ئیسلام... دەمەویٚ خودا لێم خۆش ببێت و بمبەخشێت.

وا دەهاتە پێش چاوم که شایەنی بەزەیی بێت.

هەروەها بێ ئومێد بێت.

ڕۆژێکیان عەبدول هات و بە شێوازێکی زۆر زیادەڕەویانە و نائاسایی پێشوازی لێکردم: چاوەڕوانت بووم براکەم!...

هەستم بە ڕاڕایی کرد لە بارەی بابەتی (براکەم)ەوە، بەڵام گوێم پێنەدا، ڕانەهاتبووم که عەبدول بەو شێوەیە بانگم بکات، ئەسڵەن ڕانەهاتبووم که کەس بە (براکەم) بانگم بکات.

عەبدول داوای خواردنەوەی کرد بۆ خۆیی و منیش، وتیشی که دەیەویت لە بارەی بابەتێکی گرنگەوە گفتوگۆم لەگەڵ بکات.

چاوەکانی دەبریسکانەوە که پێی گوتم: هەلەکە نزیکە.

تینەگەیشتم لە بارەی چیەوە دەدوێ، بیرم کردەوە که دەشێت هەلی کارێکی وەدەست خستبێت لە فیلمێک یان بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی..

ئەو دوبارەی کردەوە: لە کۆتایدا هەلەکەمان گەیشت.

زیاتر هەستم بە دودڵی کرد، ئەوەڵ جار براکەم، ئێستەش: هەلەکەمان؟ ئەم دیالێکتە جیا دەکەمەوە بە تایبەت لە لای عەرەبەکان، بە دەگمەن شتێکی باشی لێوە دەردەچێت.

پرسیارم لێکرد لە کاتێکدا قومێکی گەورەم لە خواردنەوەکە دەدا: لە بارەی چیەوە دەدوێیت عەبدول؟

چاوەکانی دەگەشانەوە و گووتی: لە بارەی فیلمێکەوە کە باسی مەزنی ئیسلام دەکات!

ئاهاااا. ئێستە تێگەیشتم (براکەم و...هەڵەکەمان)..

هەر ئەوەندەی کە من لە دایک و باوکێکی موسوڵمان لە دایک بوویوم، کە ئەسڵەن زۆربەی کردارەکانی ئیسلامیان جێبەجێ نەدەکرد، عەبدول وای دەزانی کە من دەمەوێت لە هەڵەکەیدا بەشداربم لە پێشکەشکردنی وێنەیەکی مەزن لە بارەی ئیسلامەوە، بۆ ئەوەیشی خودای گەورە بمبەخشێت کە شەراب دەخۆمەوە.

نەک هەر ئیماندار(نەبووم) و نابم، بەڵکو لە بەرامبەر خەڵکدا بێ باوەڕێکی قسەلەڕووش بووم، لەو جارانەشی کە بابەتی ئاینەکان دەکرایەوە، لە بێ باوەڕێکی ئاسایی ساردەوە کە گرنگی بە بابەتەکە نەدەدا دەگۆڕام بۆ بێ باوەڕێکی توندڕەوی دژە ئاین... کریستین دەیگوت کە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ هەست کردنم بە کەم و کورتی چونکە من لە بنەچەی موسوڵمانم و، دەمەوێت بەوە پێچەوانەی (وێنەی ڕۆتینی) ئامادەکراو لەسەر عەرەب بسەلمێنم و گرەوی لەگەڵ دەکردم کە هەڵوێستم بەو شێوە توندە نەدەبوو ئەگەر ڕووداوەکانی سیپتیمبەر نەبوایە... لەوانەیە لەسەر هەقیش بوبێت.

ئەو خولیای شیکردنەوەی هەموو شتێک و گەڕاندنەوەی بۆ هۆکارە دەرونیەکان بوو، زانستی دەروناسی لە (زانکۆی نیۆرکی حکومی – سۆنی) خوێندووە و ئامادەکاری دەکات بۆ خوێندنی دکتۆرا بۆ بەدەستهێنانی هەلی کار لە نیۆرک، لەم ماوەیەدا هەموو شتێک بە شێوەیەکی بێزارکەرانە شی دەکاتەوە، هۆگر بوونم پێوەی بەوە شی کردەوە کە ئێمە وەک ڕۆژهەڵاتیەکان حەز بە کچی قژ زەرد دەکەین بە هۆی ئەوەی کە پیستمان تۆخترە،

هەروەها دوودڵ نەئەبوو لە شیکردنەوەی هەندێک شتی سۆزداری لە کاتی ئەنجامدانیاندا... هەندێک جار هەست دەکەم کە لەوانەیە (مشکی تاقیکردنەوەکان)ی بم کە تایبەتی کردووە بە خوێندنی دکتۆراکەیەوە، لەوانەیە بیر لەوە بکاتەوە کە لەسەر دەرونی عەرەبەکان بخوێنێت یان شتێک لەو بابەتە...

بەڵام خۆ من هیچ کات عەرەبێکی ڕاستەقینە نەبووم، هیچ ڕۆژێک هەستم نەکردووە کە من عەرەبم.

من بە تەواوی ئەمریکی بووم، لە کوینز لە دایک بووم و لەوێ گەورە بووم، هەروەها لەبەر ئەوەش کە دایکم و باوکم سەر بە هەمان شار نەبوون، دایکم مەغریبی بوو و باوکیشم میسری، هەر بۆیە ئەوان هیچ کات هیچ شتیکیان لە بارەی شارەکانیانەوە بۆ من جێنەهێشتووە.. هەموو کات هەستم کردووە کە من ئەمریکیم... ڕاستە ئەوان پاڵنەرم بوون بۆ فێربوونی عەرەبی، بەڵام ئەوە بە تەواوی ئەکادیمیانە بوو، وەک ئەوەی هەندێک فێری فەرەنسی و چینی دەبن... هیچ پەیوەندیەک نەبوو لە نێوان خوێندنی عەرەبی و خاوەنداریەتی (انتماء) و سەر بەوێ بوونم...

باوکم خولیای ئەوە بوو کە هانم بدات بۆ کاری دیبلۆماسی، هەموو کاتێکیش دەیگووت ئەمریکیەک کە بنەچەی عەرەب بێت و عەرەبی بزانێت هەموو کاتێک دەتوانێت هەلیکاری دەستکەوێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پڕ کێشە و هەرا و هۆریادا.

کریستین هەموو کات ماوەی ئەوەی دەدۆزیەوە بۆ گوتنی ئەوەی هەموو ئەو شیکردنەوانە بەشێکە لە نکۆڵیکردنم لە ڕاستی. دەیگووت کە من لە بارودۆخی نکۆڵیکردندام.

لەوانەیە ئەویش ڕاست بووبێت، چونکە دەشێت دایک و باوکم سووربووبن لەسەر عەرەبی فێربوونم وەک بەشێک لە قەرەبووکردنەوەی هەستکردن بە تاوانیان لەسەر ئەوەی کە هەر یەکێک لەوان شارەکەی خۆی بەجێهێشتووە.

هەوڵمدا بە عەبدول بڵێم کە زۆر پەرۆش نەبێت بۆ بەشداری کردنم لە فیلمەکە، بەڵام ئەو باسی بەهێزی و مەزنی دەرهێنان و ناوەکانی دەکرد کە دەکرێت بەشدار ببن لە فیلمەکەدا، پاشان بە شێوەیەکی زۆر خێرا دیتمەوە کە پێم دەڵێت کە من پاڵێوراوم بۆ ئامادەکردنی سیناریۆی فیلمەکە..

لێمپرسی: من؟؟ بۆ؟!

گووتی: پێت دەڵێم فیلمەکە دەربارەی بیلالی حەبەشیە، بانگبێژی پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)، هەروەهانوسراوێکی زۆر ناوازەشت بۆ خوێندمەوە لە بارەی بارودۆخی کۆیلە و کۆیلایەتی لە ناو ئیسلامدا، کە خۆی کێش کرد بۆ ناو چیرۆکی بیلال... تۆ باشترینی کە بەشداری بکەیت لە سیناریۆکەدا.

نوسراوەکە بە تەواوی ئەکادیمی بوو، بابەتی بوو، ئاماژە کردنم بۆ بیلالی حەبەشی بەو شێوەیە ناسک نەبوو کە وا لە عەبدول بکات ئەوها کاردانەوەی هەبێت، تەنها گووتم کە ئەو بووە بە سومبول و ئایکۆنێک بۆ هەموو کۆیلە و ڕەش پێستێک، هەروەها پێگەکەی لە ئیسلامدا ئومێدی بە زۆر کەس داوە.... ئەمە هەموو شتێک بوو کە گووتم.

عەبدول لە ئەوپەڕی پەرۆشی و هەیەجاندا بوو، هیچ کات باوەڕی نەدەکرد کە دەکرێت پەشیمان ببمەوە و ڕەتی کەمەوە

بەڵام، بۆچی ڕەتی بکەمەوە؟

بیرم کردەوە!

من لە بارودۆخێکی دارایی زۆر خراپدام، بەشداریکردنیشم لە سیناریۆی فیلمدا لەوانەیە هەندێک بارودۆخم بگۆڕێت و باشتری بکات.

هیچ ئاقڵێک نییە کە ئەمە ڕەت بکاتەوە.

گوێم لە عەبدول بوو پرسیاری لیدەکردم: تۆ لەگەڵماندایت لە کەشتیەکەدا؟

هیچ بژاردەیەکی دیکەم نەبوو جگە ئەوەی کە سەرکەوم لەگەڵیان.

بە توندی لە باوەشی گرتم وەک خووی باوی ناو عەرەبەکان کە ناتوانم بەرگەی بگرم و لەتەکیشیدا وشەی (براکەم براکەم)ی دوبارە دەکردەوە.

پێویست بوو زووتر بزانم کە خۆم لە چیدا تێوەگلاندووە.

◆◆◆

عەبدول بەشێک بوو لە گروپێکی فراوانتر، بەشێک لەوان وەک عەبدول بوون، کە وشەی (براکەم)یان بە رێژەیەکی زۆر بەکاردەهێنا لە تاقە رستەیەکدا، بەشێکی دیکەشیان وا دەردەکەوتن لە بەرچاوم کە زیاتر پیشەیی بن... تا ئەوەی لەدەستم دەهات هەوڵم دەدا کە بۆ هەمووی روون بکەمەوە، من ئیماندار نیم، ئەسڵەن گرنگیپێدەری ئاین نیم، بەڵکو من تەنها هەڵدەستم بە کۆکردنەوەی زانیاریە میژووییەکان کە پەیوەندی بەو ماوەیەوە هەیە کە فیلمەکە باسی لێوە دەکات و، پشتگیری ناوەڕۆکی فیکری فیلمەکە ناکەم.

هیچ کەسێک نەبوو کە گرنگی بەوە بدات کە دەیڵێم، کەسیش لە مەبەستم تێنەگەیی کە چی دەڵێم.

گروپەکە هەموویان زۆر پەرۆشی کارکردن بون..

منیش وەک ئەو بەرخە رەشە وابووم کە هەمووی دەگەڕاندەوە دواوە.

◆◆◆

قایل بوونم بە کارەکە. هەلێک بوو بۆ کریستین کە بۆچونەکەی دڵنیا بکاتەوە.

لە قوڵایی ناخمدا، دڵنیا دەبوویەوە، شتێک هەیە کە هێشتان سەر بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بیرو باوەڕاکانیەتی.

پێم گوت کە لەوانەیە ئەو ڕاست بێت، ئەوەش ڕێک ئەوەیە کە وای لێدەکات لەگەڵمدا بژی بە بێ ئەوەی یەک دیناری کرێ خانوو یان هەر شتێکی دیکە بدات.

جارێکیان بووە دەنگە دەنگمان و ئەو هەرەشەی ئەوەی کرد کە ماڵەکە جێدێڵێت.

بەڵام من لێی پاڕامەوە کە بمێنێتەوە.

لە دوای ئەوەی کە لێی پارامەوە گووتی کە ئەو قایل نییە بەو شێوەیە بیپەرستم و، پەیوەندیەکەمان تەندروست نییە.

هەستم دەکرد ئەوە ئەوە کە دەمپەرستێ و هەست و سۆزم دەقۆزێتەوە لە قازانجی خۆی.

بەڵام ئەو ماڵەکەی جێنەهێشت.

زیاتر لەبەر ئەوەی ماڵێکی نەئەدۆزیەوە کە تێیدا بژی بەبێ ئەوەی کرێ بدات و، هەموو شتێک بخوات.

◆◆◆

هەستم دەکرد کە خیانەت دەرهەق بە خۆم دەکەم، کاتێک کە هەڵدەستام بە کۆکردنەوەی زانیارییە مێژوویەکان، دەزانم ئەوە بەکاردەهێنرێت بۆ بەرزکردنەوە و بیرۆکەیەک کە من باوەم پێی نییە. عەبدول هەموو کات دڵنیای دەکردمەوە کە فیلمەکە باس لە کەسایەتیەکی مێژووی دەکات و، هەرگیز فیلمێکی ئاینی نییە بە هیچ شێوەیەک لە شێوەکان. بەڵام تەنانەت مێژوویش، دەکرێت کە لە لایەنی ئاینیەوە بچێتە پێشەوە.

ئەوەیش کێشەکەم بوو لەگەڵ فیلمەکەدا.

هەر لەبەر ئەمەیش کارەکەم زۆر بە سەبر، هێواش بوو، عەبدول زۆر نائومێد بوو لە من. ئەو دەیویست کە هەموو شتێک بزانێت دەربارەی ئەو

ماوەیە، جل و بەرگ، شێوازی قژ بەستن، جۆری ئەو ئەکسەسوارانەی کە لەناومالّدا بەکار دەهێنرا.... هتد، چونکە هەر زانیاریەکی ورد کە بەدەستی دێنم وا لە فیلمەکە دەکات کە نزیکتر بێت لە ڕاستیەوە.

هەستم دەکرد کە ئەوانە بێهودەیە، سەرچاوەکان سەرنجیان نەخستبوویە سەر ئەو جۆرە وردەکاریانە، ئەسڵەن گرنگیشی پێ نەدرابوو، بەلاّم عەبدول دەیویست؛ جا بە هەر شێوەیەک بێت.

پاشان بڕیارم دا کە واز لە کارەکە دێنم و هەموو بەرپرسیاریەتیەکانیش هەڵدەگرم...

لە هەمان ڕۆژیشدا، پەیامەکەی بیلالم پێ گەیشت.

شتێک لە ناخمدا گۆڕا کاتێک کە خوێندمەوە.

پیش ئەوە، هەستم دەکرد کە خیانەت دەرهەق بە خۆم دەکەم، لێرەدا و، لەگەڵ هەبوونی ئەگەرێک کە یارمەتی هەرزەکارێک بدەم کە چاوەڕێی مەرگە، بیرم کردەوە کە لەوانەیە ئەمە باشترین شت بێت کە دەیکەم لە هەموو ژیانمدا.

هەستیکی زۆر سەیر هەموو گیانمی داتەنی. بیرم کردەوە گەر دایکم لەمە ئاگادار بێت ئەوە زۆر شانازیم پێوە دەکات. شتێک کە زۆر بە دەگمەن ڕوودەدات بێتە بیرو خەیاڵم...

وشەکانی ئەو کوڕە شتیکی لە ناخمدا جوڵاند...

بیرم کردەوە... مێرمنداڵێک کە چەند ڕۆژێکی دیاریکراوی ماوە لە ژیاندا، دەیەوێت سیناریۆی فیلمەکە بخوێنێتەوە پێش ئەوەی بمریت. لەوانەیە ئەمە دوا هیوای بووبێت...

کێ دەتوانێت ئەوە ڕەت بکاتەوە؟

بڕیارم دا کە کریستین ئاگادار نەکەمەوە لەمە. چونکە دەیویست بەشێک لە هەست و سۆزم وەک ڕۆژهەلاتیەک کۆنتڕۆڵ بکات و بیرکردنەوەکانم

ئاراستە بکات، سەرەڕای ئەوەی ئەو خۆیشی لەوانەیە هەمان شتی بکردایە ئەگەر مێردمندالێک بەو بارودۆخەوە داوایەکی لەوشێوەی لێبکردایە.

نامەی دەست لە کارکێشانەوەکەم سڕیەوە.

لە ناو ئەو فیلمەدا دەمێنمەوە کە باسی (بیلالی حەبەشی) دەکات، بەڵام لەبەر خاتری (بیلال)ێکی دیکە.

♦ ♦ ♦

## لاتيشا

لەو ساتەوەی کە بیلال لە دایک بوو، تێگەیشتم کە ژیانم بۆ هەتا هەتایە گۆڕاوە.

من ئەم ڕستانەم زۆر دەبیستەوە. وایش وڕێنەم دەکرد کە تێیگەیشتبم. بەڵام شتەکە زۆر جیاوازە کاتێک ڕوودەدات.

تاوەکو کاتی لە دایک بوون، ئاگاداری هیچ گۆڕانکارییەک نەبووم کە ڕووبەڕووم ببێتەوە.

بەڵام کاتێک هەموو شت کۆتایی هات و، بۆیان هێنام، تێگەیشتم.

چاوەکانی بە پشکنین و وردەکارییەکەوە کردەوە، وەک ئەوەی بمناسێتەوە، زۆر بە توندی دەلەرزی و دەستی کردە گریان. ڕاستەوخۆ چویە دڵمەوە. تێگەیشتم مانای ئەوەی دایک منداڵەکەی خۆشبوێت چییە. شتێکی زۆر جیاواز لە هەموو ئەو هەست و سۆزانەی کە پێشتر تاقیم کردبوویەوە، یاخود لە بارەیەوە خوێندبێتمەوە.

لە باوەشم گرت وەک ئەوەی بەڕاستی بەشێک بێت لە من ، تێگەیشتم کە ئیدی ژیانم بۆ ئەبەد بەستراوە بەم دروستکراوەوە. ئیدی لەمڕۆوە ژیانم موڵکی خۆم نییە، چیدی ئازاد نەماوم، دەستبەرداری ئازادییەکەم بووم، بەڵام شاد بووم بەو دەستبەردار بوونەم. لەوانەیە پێش ئەوە بە تەواوی ئازاد نەبوبێتم، لەوانەیە پەیوەندییەکەم بە باوکییەوە جۆرێک بوبێت لە دەستبەسەرداگرتن، بەڵام لەگەڵ بیلال وام دەهاتە پێش چاو کە شتەکە زۆر جیاوازتر دەبێت. دڵخۆش دەبم بەو دەستبەرداربوونەم لەگەڵ ئەو، وەک ئەوەی بۆ ئەمە دروستکرابێتم. بەڵام لەگەڵ (سەعید) شتەکە وەک هۆگربوون وابوو.

سەعیدیش گریا، دەستی ماچ کردم، دەستی بیلالیشی ماچ کرد. داوای لێکردم کە لێی خۆش بم، بەڵێنی دامێ کە دەگۆڕێت، من هیلاک بووبووم لەو

جارانـەی کـە داوای لێخۆشـبوونی دەکـرد، بەڕاسـتی هـیلاک بووبـوم. خۆشـم دەویست، ئەو باش بوو، هەندێک جـار. ئـەو کاتانـە نـا کـە سـەرخۆش دەبـوو یاخود لە ژێر کاریگەری کۆکایندا بوو.

ئەو جارانە دەگمەن بوون کە تێیدا سـەعیدم بینیبـێ کـە دەگریـەت، بەڵام ئەو گریا و بیلالی بەدەستەوە هەڵگرتبوو کە ئەلعانـە لـە دایـک بـووە، لەگـەڵ خۆی بردی و دەسوڕایەوە پێـی، بـە دەنگێکـی نـزم ورتـەی دەهـات و قسـەی لەگەڵ دەکرد... شتێکی دەچرپاند بـە گـوێی بیلالـدا کـە نـەمتوانی تێیبگـەم. فرمێسکەکانی دەموچـاوی پـڕ کردبویـەوە. دەمزانـی کـە هەسـتەکانی سـەعید وەک ئـەوەی ڕۆلـەر کۆسـتەر وایـە، ئـەوەی ئـەمڕۆ دڵخۆشـی دەکـات دەکـرێ سبەی تووڕەی بکات، بەڵام ئەم هەڵوێستە زۆر جیاوازیی هەبوو، ئەو ڕێگەیـەی کە کوڕەکەی پێ هەڵگرتبوو و بە گوێیدا دەیچپاند، زۆر کاریگەری هەبوو.

سەعید گەڕایەوە و منداڵەکەشی بۆ گەڕاندمەوە، دوبارە پێی گوتمـەوە کـە ئەو دەگۆڕێت لەبەر خـاتری بـیلال، داواشـی لێکـردم کـە لێـی خـۆش بـبم لـە هەموو ئەو شتانەی کە ڕویانداوە.

لـە ڕابـردوویم دەبـووری لەبـەر ئـەوەی زۆر خۆشـم دەویسـت وەک ئـەوەی نەخۆش بم، بـێ ئومێـد بـم لـە چـاک بوونـەوە، مـن زۆر هـۆگری بـووم، هـیچ شتێکم لەدەست نەدەهات جگە ئەوەی لێی خۆش بـم تەنانـەت پـێش ئـەوەش کە جێگەی لێدانەکانی کاتی سەرخۆشـی و تووڕەبوونـە لـە ناکاوەکـانی لەسـەر جەستەم لاکەوێ.

ئەو ڕۆژە بیرم کـردەوە، ئەگـەر نـەگۆڕێت، ئـەوە چیدیکـە پیویسـتیم پێـی نابێت لە هەموو بارودۆخەکاندا من تازە خۆشەویسـتیەکی دیکـەم دۆزیوەتـەوە کەدڵمی داگیر کردووە. سەعید لێت خۆش دەبم لەبەر ئەوەی شتێکم دۆزیـەوە کە دوور لە تۆ سەرقاڵم بکات، ئەگـەر نـەگۆڕێیت ئـەوە ناتوانیـت هەسـتەکانم وەژارە بخەیت... ئەو ساتە کۆتایی هات.

سەعید هێشتان لە بارودۆخە باشیەکەیدا بوو کاتێک چرپاندی بە گوێمـدا: ناوی دەنێین (بیلال).

پێم گووت: بیلال؟ بۆچی بیلال؟ نەمدەزانی کە خۆشت دەوێت.

پرسی: کێم خۆش بوێت؟

وەڵامم دایەوە: بیلال... گۆرانیبێژی ڕاپ. بیرم نایەت کە خۆشت ویستبێت یان گوێت بۆ ڕادێرابێت.

گووتی: نا، بیلالی گۆرانیبێژی ڕاپ نایێژم... بەڵکو بیلالی حەبەشی ڕاستگۆ و بانگبێژی پێغەمبەر موحەمەد دەڵێم.

موچرکەیەک بە گیانمدا هات. ئەوە ئەوەڵجار بوو کە سەعید شتێک بڵێت لە بارەی پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت) موحەمەدەوە. هەر ئەوەندەی کە لە خێزانێکی موسوڵمان لە دایک بوو بەس نەبوو کە بیکاتە موسوڵمان، چەندین جار لەگەڵم هاتووە بۆ کەنیسە... بەڵام هیچ کاتێک لەسەر ئیسلام و پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت) نەدواوە... ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە هیچ شێوەیەک لەسەریان زانیاری نەبووە.

پێم گووت: واتای چی بانگبێژ؟

گووتی: بیلال بەندەیەکی ڕەشپێست بوو، ئەو لە یەکەمەکان بوو کە بڕوای بە پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت) موحەممەد هێناوە، خاوەنەکەی زۆری ئەشکەنجەداوە، بەڵام ئەو ئارامی گرت... یەکێک لە بڕواداران هەستا بە کڕینی و پاشان ئازادی کرد، ئەو دەنگێکی فرە خۆشی هەبووە، بۆیە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)یش هانی داوە کە بانگ بدات، کە لە شوێنێکی بەرز دەوەستا و، خەڵکی بانگ دەکرد بۆ نوێژ، بەوەش دەیانزانی کە کاتی نوێژ هاتووە... بیری لێ بکەوە چەندە جوانە.

جوان سەرنجم نەدا کە چی گووت، بە مێشکیشمدا نەدەهات کە ئەم (بیلال) ەی باسی دەکات لە دواتردا ژیانی خۆم و ئەویش دەگۆڕێت، من زۆر سەعیدم خۆش دەویست، بە بێ هیچ هۆکارێکی دیاریکراو، نەخۆش کەوتبووم و نەخۆشییەکەیشم سەعید بوو، بەڵام قەت بە خەیاڵمدا نەهاتبوو

که شتێکی لەو شێوەیە بڵێت، ئەم سێ دێرەی کە گووتی، بە تەواوی جیاواز بوو لە هەموو ئەو شتانەی کە گوتبووی لەو ساڵانەی کە ناسیبووم تێیدا، من ئەوم خۆش دەویست لە کاتێکدا ئەو دواناوەندی تەواو نەکردبوو، بەڵام من سەرکەوتوو بوم و، زانکۆم تەواو کرد، هێشتاش ئاوات و ئامانجی زیاترم هەبوو، بەڵام بەم شێوەیە خۆشم ویست، سەرەتا وام بیرکردەوە کە ویستێکی سەرپێی بێ، ئەوانەی چواردەوریشم بەو شێوەیە گومانیان برد، بەڵام هەر خۆشم ویست، کاتێک ئەم سێ دێڕەی گووت و، دەموچاوی گەشایەوە بە ڕووناکیەکی درەوشاوە، هەستم کرد کە لە ناخیدا گەنجینەیەکی شاراوە هەیە هەر ئەوەشە وای لێکردوم خۆشم بوێت.

چیرۆکی بەندە ڕەش پێستەکە کە بڕوادارێک ئازادی کردبوو لە کۆیلایەتی،کاری تێکردبووم.

وا خەیاڵم کردەوە کە دەنگی خەمبار بێت، کاتێک بانگ دەبێژێت بە دەنگێک، کە وەک دەنگی جەیمس براون بێت..

گووتم پێی: کەواتە بیلال!!

تەماشایەکی بیلالم کرد، بێ خەیاڵ لەوەی لە باوکی چاک دەبمەوە و، بەو نەخۆش دەکەوم.

بارودۆخی سەعید بەو شێوەیە (میهرەبان)ەی زۆری نەخایاند، هەر چەند ڕۆژێک بوو، لە دە ڕۆژ تێنەپەڕی... پاشان ڕوناکیەکە بە تەواوی لە دەموچاوی باری کرد.

بارودۆخی لە مەودای مانگەکانی دواتردا زۆرداڕما.. کێشەکانی پتر بوو، سەرخۆشبوونەکانیشی بە هەمان شێوە، پێم وابێ ئەو چیتر هەر بە کێشانی مادده هۆشبەرەکانەوە نەوەستا، بەڵکو بووە بەشێک لە تۆڕی بڵاوکردنەوەی ماددەی هۆشبەر.

من خۆم یەکلایی کردبوویەوە.. ئەو هەڵەم قۆستەوە کە لە نەخۆش بوون بەوەوە شیفام وەرگرتبوو، بۆیە بڕیام دا کە لە ژیانی خۆم و بیلالیش بیکەمە دەرەوە.

تورە بوو و هاواری دەکرد و جوێنی دەدا، بەوەشەوە نەوەستا لێی دام و ئەو تەلەفزیۆنەی شکاند کە هێشتر قەرزەکەیم بە تەواوی نەیابوو، بەڵام من سووربووم لەسەر بڕیارەکەم.

پاشان دەرچووە دەرەوە و... (نەگەڕایەوە).

هەرگیز نەگەڕایەوە، تەنانەت بۆ دیتنەوەی بیلالیش.

هێشتاش کەمێک خۆشم دەوێت، سەرەڕای هەموو شتێک ... بەڵام هەر کەمێک، وا بیر دەکەمەوە ئەو تەنها بۆ ئەوە هاتبێتە ژیانمەوە کە بیلالم پێ ببەخشێت و دواتر گۆڕی گوم بکات. هەر وایشی کرد.

♦ ♦ ♦

ئەو ساتە، کە ژیانم تێیدا گۆڕا، ئەو ڕۆژەی کە بیلال هات.

بەڵام ساتێکی دیکەش هەیە.... کە ژیانم بۆ ئەبەد گۆڕا.. بەڵام ئەمجارە بۆ ئەبەدێکی کۆتا.

ئەوە ئەو کاتە ڕووی دا کە زانیم بیلال توشی شێرپەنجە بووە.

هەموو شتێک زۆر بە خێرایی ڕووی دا. سەرمابوونێکی ئاسایی، تا.. سەر ئێشە.. سەرگێژ خواردن.. هیلاکی.. سەرەتا هەوڵمدا کە شتەکە چارەسەر بکەم وەک هەر دایکێکی دیکە بە دەرمان کە لە فرۆشگاکان بوونی هەیە. بەڵام بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەردەوام بوو بە بێ ئەوەی بیلال هیچ باش بوونێ بە خۆیەوە ببینێ.

لە دوای نیوە شەوەوە، لە شەوی جەژنی سوپاسگوزاری بردم بۆ نەخۆشخانە. دوودڵی هەموو گیانی گرتبوومەوە. شتێک لە ناخمدا پێی دەوتم

که هیچ شتێک باش نییە، لە پڕێکدا ئەم هەستەم بۆ هات، ئەنا بۆ هەتا بەیانی چاوەڕێ دەکەم. دەبوایە ئەمشەو بچم بۆ لای دایکم لە سانت لویس و، بۆ نانی ئێوارە چاوم بە خێزانەکەم بکەوێت لە جەژنی شوکرانەبژێری، بێگومان نەڕۆشتم، لە تەک بیلال مامەوە... لە نیوەشەودا هەستێک ڕووی تێکردم کە لەوانەیە بیلال لە دەست بدەم، ئەو هەموو خێزانەکەمە و، هەموو ماڵ و موڵکمە کە هەمە. بە پەلەفرکێ گەیاندمە نەخۆشخانە وەک ئەوەی تازە توشی تا بوبێ.

شیکاریەکی دیکە و دڵم هێشتا هەرنائارامی دایگرتووە.

کاتێک گەیشتینە سەر ئامێری شیکاری سیتی سکانەکە و، زرنگانەوەی موگناتیسیەکە، خۆمم قایل دەکرد کە ئەمە تەنها چەند پرۆتۆکۆڵێکە بۆ کێشانەوەی پارە لە کۆمپانیاکانی بیمە.

خەریک بووم دەستم بە قایل کردنی خوتخوتەکەم دەکرد کە هیچ شتێک نییە شایەنی دودڵی بێ و هەموو شتەکان چاکن و وان لە جێگەی خۆیاندا.

ئەمە ڕوونادات... بەسەر بیلالدا ڕوو نادات. نە بەسەر من نە بیلال. ئەم پزیشکە زۆر زیادەڕەوی دەکات لە قەلەقبوونی. هەموو ئەم پرۆتۆکۆڵانە هەمووی بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەوەیە کە هیچ شتێک نییە شایەنی خوتخوتە بێت لە بارودۆخی بیلالدا. بەڵام ئەمە ڕوونادات ، بەسەرمدا ڕوونادات. هەموو ئەنجامی شیکاریەکان نێگەتیڤ دەبێت.

بیلال دەردەچێتە دەرەوە.

هەر هیلاکبوونە، هیلاکبونێکە و تێدەپەڕێت. هەموو مێردمنداڵانێک لەو تەمەنەدا ئەگەری تووشبونیان هەیە.

◆◆◆

ساتەکە گەیشت.

پەرستیارەکە هات بۆ ئەوەی پێم بڵێت کە دکتۆر زاک دەیهەوێ بمبینێت لە ئۆفیسەکەی خۆی.

هەموو کات ئەمانە ڕوودەدەن.

چومە ژوورەوە بۆ ناو ئۆفیسەکە وەک ئەوەی لە ژێر کاریگەری دەرمانی بێ هۆشکەردا بوبێتم. پزیشکەکە چەند پرسیارێکی ئاڕاستە کردم کە هەر نازانم بە چ شێوەیەک وەڵامم داوەتەوە. چاوەڕێی ڕستەکەی بووم. توخودا دکتۆر گوللەکەت بتەقێنەو کۆتایی بە شتەکە بێنە.

ئۆمێدەوار بووم پێی لە کاتێکدا کە ڕێگەکەی بۆ ئاسان دەکردم. ئەو زۆر قۆز بوو. بۆ ئەبێ پزیشکی بخوێنێت لە کاتێکدا بەو هەموو قۆزیەوەیە؟ دەیتوانی زۆر بە ئاسانی ببێتە فاشیۆنیست، ئەکتەر، یاخود بێژەرێک، ئایا دەیزانی کە ئەگەر پزیشکی بخوێنێت ڕۆژێک لە پشت مێزەکەیەوە دادەنیشێت بۆ ئەوەی بە دایکێک بێژێت تاقانەکەی خەریکە لەدەست دەدات؟

بە تەواوی نوقوم بووبوم پاشان وشەیەکم بەر گوێ کەوت.

وشەیەکی لاتینی درێژی ئاڵۆز، گووتی: وەرەم لە مێشک.

بۆشاییەکی بۆ کردمەوە بۆ ئەوەی تێبگەم.

بە هێواشی لە دویەوە دوبارەم کردەوە: وەرەم لە مێشک!

سەری لەقاند بە داوای لێبووردنەوە.

پێم گووت: چ جۆرێک لە وەرەم؟

چاوەکانی لە ناو چاوم چەقاند و گوتی: لە جۆری ترسناک.

پێم گووت: شێرپەنجە؟!!!

دوبارە سەری لەقاندەوە.

چاوەڕێی دارمانی خۆمم دەکرد، بەڵام ڕووی نەدا. لە پڕێکا هەستم بە توورەبوون کرد. تورە بوون. خۆمم لە ناو تورەبوونێکی زۆردا بینییەوە، حەزم دەکرد پڕ بە دڵم هاوار بکەم... شتومەکەکانی ناو ژوورەکە بشکێنم. جون بدەم و بقیڕێنم.

دەمەویست هاوار بکەم: بۆچی بیلال؟ بۆچی بیلالی من؟ تاقانەکەم؟ ماڵ و موڵکم.

هیچ شتێک لەوانەم نەکرد. پزیشکەکە شتێکی ئیجابی دەگووت، لە بارەی گەشتی چارەسەری قورس بەڵام شایەنی خۆماندووکردنە.

تووڕەبوونەکەم لە ناخمدا حەشاردا وەک هەمیشە. هەر وەک هەموو کاتێک کە لە ژیانمدا کردوومە.

دەربارەی شیکارکردنەکە لێم پرسی بە دیاریکراوی، لە بارەی ناوەکەوە، بۆ ئەوەی لە دوایدا لە ئینتەرنێت بۆی بگەڕێم.

پێی گووتم: Focal brainstem Glioma

ئاخر ئەو ناوە زۆر گەورە بوو بۆ بیلال، زۆر بەزەیم پێیدا هاتەوە، ئەو زۆر بچوکە بۆ نەخۆشیەکی گەورەی ئاڵۆزی لەو شێوەیە!

پزیشکەکە بەردەوام بوو لەسەر ڕۆڵگێرانی ئاراستەکاری، بێ شک ئەوو هاوکارەکانی لەگەڵم دەبن و گەشتی چارەسەرەکە زۆر ئاسان نابێت، بەڵام پێویستە لەسەرمان بە ئومێدەوە بچینە ناوی و تێیپەڕێنین.

هەندێ کوڕاسەم وەرگرت لێی لە بارەی هەندێ کۆمەڵەی پشتگیریکاری پیشنیارکراو، پێی گووتم کە لەوانەیە یارمەتیم بدەن، لە کاتێکدا من هەر ناوی نەخۆشیەکەم دوپات دەکردەوە لەگەڵ خۆمدا تاوەکو لە بیری نەکەم.

دەچمە گۆگڵ تاوەکو هەموو ڕاستیەکان لەوێ بەردەست بخەم.

کاتێک بیلال هات لە کۆیلایەتیکردنەکەی باوکی ئازادی کردم، سەعید هەر وەک شێرپەنجە وابوو.

منیش پێویستە ئەمڕۆ لەگەل بیلالدا لە دژی ئەو شێرپەنجەیە بوەستمەوە کە تەمای ئەوەی گرتبوو لێمی دووربخاتەوە.

♦ ♦ ♦

## بیلال

پێچەوانەی هەموو ئەوانەی کە بیریان دەکردەوە. شێرپەنجە باشترین شت بوو کە لە ژیانمدا ڕووی دابوو، لەو کاتەوەی کە لە دایک بووم.

ڕاستە کە ئەو ئەم ژیانە کۆتایی پێ دەهێنێت.

بەڵام سەرەڕای هەموو شتێک، باشترینە کە ڕوویدابێت.

دایکم هیچ کاتێک نەیدەزانی کە چی دەچێژم، پێش ئەو شێرپەنجەیەی کە هاتبوو کۆتایم پێ بهێنێت. هەوڵمدا کە هەموو کات لێی بشارمەوە، ئەوەم کرد لەبەر خاتری ئەو، هەروەها خۆیشم... تیناگەم بۆچی ئەو ڕاستیەم شاردەوە، بەڵام من هیچ شتێکم نەگووت هیچ شتێک، تەنانەت وشەیەکیش.

دایکم هەرگیز نەیزانی، کە هەموو ئەوانەی لە چارەسەرکردنی شێرپەنجەکە دەمچەشت، هەموو ئەو ڕشانەوە و دڵتێکهەڵاتن و ژانە سەر و گێژ بوونە، هەموو ئەو ئەسیریە لە سەر جێگەی نەخۆش و ئەو سۆندانەی کە دەچویە ناو و لێمەوە دەهاتە دەرێ، هەموو ئەو برین و کێمانەی ناو دەرونم، هەروەها وشکی قوڕگم کە نازانم چۆن باسی بکەم.... هەموو ئەمانە، دەبوونە هیچ لەبەرامبەر تەنها یەک ڕۆژی ئەوەی دەمچەشت لە قوتابخانە، تەنانەت یەک ڕۆژی ئاسایی لە ڕۆژەکانی قوتابخانە.

لە پۆلی چوارەوە دەستی پێکرد، هەموو شتێک زۆر ئاسایی بوو پێش ئەوە، لە پۆلی چوار و لە دوای سێ مانگ لە دەستپێکردنی خوێندن لە پایزدا، دایکم کارێکی دەستکەوت وەک مامۆستایەک لە قوتابخانەیەک لە برۆکلین، بۆیە بڕیاری دا کە ماڵەکەمان بگوێزینەوە بۆ ماڵێکی دیکە نزیک لە کارەکەی، ئیدی بەو شێوەیە برۆنکسمان جێهێشت، ئەو شوێنەی کە لێی دەژیاین، قوتابخانەکەم بەجێهێشت کە هەموو شتەکان تێیدا ئاسایی بوو، بۆ قوتابخانەیەکی نوێ، لە برۆکلین.

له ئەوەڵ ڕۆژی ئەوێوە، هەموو شتەکان خراپ بوون، هەر بەردەوامیش بوو له خراپبوون، بەڵکو... له ڕادەبەدەر خراپبوون هەموو ڕۆژێک، هەموو ڕۆژێک، بۆ ماوەی سێ ساڵ به نزیکەیی، تاوەکو ئەو کاتەی توشبوونم به شێرپەنجه دیاریکرا، یاخود به لایەنی کەمەوه تاوەکو ئەو کاتەی که له قوتابخانه زانیان که من توشبووی شێرپەنجەم.

ڕۆژی یەکەم بەم شێوەیه دەستی پێکرد: مامۆستاکه داوا له هەمووان دەکات که پێشوازیم لێ بکەن، هیچ کەس پێشوازی ناکات، هیچ کەسێک هاوڕێیەکی نوێی ناوێت که له نیوەی ساڵی خوێندندا هاتبێت، پاشان داوام لێدەکات که له کورسیەکی چۆڵ له دواوەی هۆڵەکه دابنیشم، هەمووان له نێو ئەو تەماشاکردنه بێ باکانەدا ترنجابون، کاتێکیش دادەنیشم گوێم له یەکێکیان دەبێت که له دوای منەوه دەڵێت: تۆ ئەی قەڵەو.

پێکەنین لێره و لەوێ بەرز دەبونەوه، وانەبێژەکەش ئاوڕی دایەوه و به قورسیەکەوه دەیگووت: بەسه جۆن.

بەڵام جۆن واشنتن بەمه کۆڵی نەدا. هەر ئەوەندەی وانەکه کۆتایی هات دوپاتی کردەوه و مایکیش پشتی گرت: تۆ ئەی قەڵەو، تۆ ئەی پشت ئەستوور، تۆ ئەی تۆپی قەڕنابیت...

بڕیارم یا که وێڵیان کەم، وەک ئەوەی نەبیستم که چی دەڵێن، یاخود وەک ئەوەی نازانم که مەبەستیان منه. ئەمەش وەک دیاره هەڵه ڕوون و ئاشکراکەمه که نەمدەتوانی چاکی بکەمەوه.

گەر بۆکزێکم له جۆن بدایه، یاخود بەرهەڵستی و پەرچەکردارم هەبووایه، لەوانەیه بگەڕامایەتەوه بۆ ماڵ و شوێنی لێدانەکان لەسەر جەستەم بوایه، بەڵام دەکرا که شتەکه لەو سنورەدا بوەستایه.

بەڵام من گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و پرزم لەو شوێن لێدانانەی کە نابینرێن ، کاتێکیش دایکم لێی پرسیم کە ڕۆژەکەم چۆن بووە، وەڵامم دایەوە: باش بوو.

ئەمە وەڵامی هەموو ڕۆژێکم بوو، هەموو ڕۆژێکیش لە ڕۆژی پێشتری خراپتر بوو.

لە ڕۆژی دووەمیشدا هەڵەیەکی گەورەم کرد، کە کاریگەری لەسەر خراپترکردنی بارودۆخەکە هەبوو.

پرسیارم لە یەکێکیان کرد لە بارەی تەوالێتەوە. ئەویش ئامارەی بە ئاودەسخانەی تایبەت بە کچان کرد، من بە پرتە بووم بۆیە ڕاستەوخۆ چوومە ژووری بێ ئەوەی ئاگاداری ئامارەی تایبەتی سەر دەرگاکە بم، چوومە ژوورەوە و دەنگی کچان بەرز بویەوە، زۆر بە خێرایی هاتمە دەرەوە و هەمووی چاوڕێی هاتنە دەرەوەی منیان دەکرد، دەنگی پێکەنینەکان و تەوس و توانج و تەشەرەکان  بەرز بونەوە، شتەکە لە مایک و جۆنەوە گۆڕا بۆ هەموو قوتابخانەکە، ببومە ئامانجێکی گشتی بۆ هەر کەسێک کە بیویستایە... جۆن واشنتۆن وێنەی هاتنە دەرەوەمی بە غاردان لە ئاودەستی کچانەوە گرتبوو، هەروەها داشی نابوو لە پێگەی قوتابخانە... هەزار بینەر و زیاتر لە هەزار ڕەخنە پێش ئەوەی بسڕێتەوە.. بەڵام ئەی کێ لەو مۆبایلانە دەیسڕێتەوە کە تاوەکو ئێستاش ئاڵوگۆڕی پێ دەکرێت؟

هەموو ڕۆژێک لە ڕۆژی پێشووتری ناخۆشتر بوو، هەموو هەفتەیەک لەوە پێشی بە ئازارتر بوو.

بە خۆمم دەگووت: جۆن و مایک لەمە کۆڵ دەدەن، بێزار دەبن... یەکێکی دیکە دەدۆزنەوە.

ڕووینەدا، کەسیش بە هانا و یارمەتیمەوە نەهات، بە هیچ شێوەیەک، هیچ کەس.

وام لێهاتبوو کە دوعام دەکرد لە خوای گەورە کە چاویان من نەبینێ، بە شتێکی دیکەوە سەرقاڵ بن، پتر گرنگی بە وانەکانیان بدەن... یاخود بڕۆنە قوتابخانەیەکی دیکە.. یان ویلایەتێکی دیکە... هەر شتێکی دیکە بێت.

بەڵام ڕووی نەدا.

پاشان نزیکەی سێیەم یان چوارەم مانگ لە چوونم بۆ قوتابخانەکە، وام لێهاتبوو بەوە خەوم لێدەکەوت کە خەیاڵی جۆن و مایکم بکردایە کە دەمرن.

هەموو شەوێک دڵخۆشی خۆم لە خەیاڵەکانمدا دەبینیەوە کە بە خراپترین شێوە دەمرن.

خەیاڵم کردەوە کە دەسوتێن، بە هێواشی ئازار دەچێژن پێش مردنیان... پاشان هیچ شتێکیان لێ نامێنێتەوە.

خەیاڵم دەکردەوە کە دەڕفێندرێن، تاوانبارێک دەیانگرێت و لە ماڵێکی دوورەدەست دەیانشارێتەوە و خراپترین جۆری ئەشکەنجەیان دەدات.

دەمهێنانە پێش چاوم کە نوقم دەبن و دەخنکێن.

خەیاڵم دەکردەوە کە بە هێڵی ئاسنیەکەوە بەستراونەتەوە و شەمەندەفەرەکە بەسەریاندا دەڕوات و یەک ئێسکی بەستراو بەیەکەوەیان نامێنێتەوە.

هەموو شەوێک، پێش ئەوەی بنوم، خەیاڵی کۆتاییەکی پڕ بە پێستی خۆیانم دەکردەوە، ئەوەی کە دەمچەشت لە بەیانیاندا لەسەری کەم دەکردمەوە.

هەموو بەیانیەکیش، دەڕۆشتم و دەمبینی کە هیچ شتێ نەگۆڕاوە و هیچیان لێبەسەر نەهاتووە و، ئەوان نە گوازراونەتەوە بۆ قوتابخانەیەکی دیکە، نە ڕفێندراون، شەمەندەفەرەکەش ڕێگەی ئاسای خۆی بڕیوە بە بێ ئەوەی پارچەی کردبن وەک ئەوەی ئاواتم دەخواست.

هەموو بەیانیەکیش دایکم دەیپرسی: ڕۆژەکەت چۆن بوو؟ منیش هەموو ڕۆژێک دەهاتمە جواب: باش بوو.

نـا.... ڕۆژێکیـان ڕۆیشـتمە لای و دەلـەرزیم، هـەموو گیـانم دەلـەرزی، لـە تەوقی سەرمەوە تاوەکو نوکی پێم، پـێم گـووت: منداڵـەکان لـە قوتابخانـە... منداڵەکان لە قوتابخانە...

بە ترسەوە لە باوەشی گرتم و گوتی: چیانە؟

پێم گووت: پێم دەڵێن قەڵەو.

ئەوە هەموو شتێک بوو کە پێم گووت. لێی پرسیم: ئەوە هەموو شتێکە؟

وتم: بەڵێ، هەموو شتێک، هیچ شتێکی دیکەم نەدرکاند، نازانم بۆ.

پێی گووتم: شتەکان باش دەبن...

نەبوو... باش نەبوو.

◆ ◆ ◆

دوای ئەوەی دڵنیا بوومەوە کە هیچ شتێک بەسەر جۆن و مایکدا نایـەت، وام لێهات کاتێک دەخـەوتم هـەموو شـەوێ دەپاڕامـەوە لـە خـوای گـەورە کـە هەڵنەستمەوە. بمرم.. ئاواتی شێوەیەکی دیاریکراوم نەدەکرد لە مردن، تـەنها و تـەنها دەمەویسـت کـە بـەردەوام بـم لـە خـەوتن و بـۆ هـەتا هەتایـە هەڵنەستمەوە. هیچ کاتێک. نەمەویست بچم بۆ قوتابخانـە، ئـەو شـوێنەی کـە قوتابیەکان پێم پێدەکەنن و ڕیسوام دەکەن و کەمم دەکەنەوە.

نەیشمردم، تەنانەت ئەم دوعایەشم گیرا نەبوو.

خۆمم لە نێو ڕقلێبونەوەیەکی زۆردا دۆزیەوە بەرامبەر بە خـۆم هـەنگاو بـە هەنگاو، چیدی وام دەبینی کە مـن شـایەنی ئـەوەم کـە جۆن و مایک پێمـی دەگێڕن، خۆمم دەبینـی کـە بەڕاسـتی قەڵـەوم، کـاتێکیش تەماشـای ئاوێنـەم دەکـرد کەسـێکی بێـزراو و قێـزەونم دەبینـی کـە شـایەنی ئەوەیـە کـە پێـی دەکرێت.

لەگـەڵ هـاتنی پـۆلی پێـنج، کچـەکانیش هاتنـە ڕیـزی گروپـی تەشـەر پێکەرەکان، بە تایبەت ئەو کچە جوانانـەی کـە خـەڵکانێکی زۆر لـە دەوریـان بوون و بەناوبانگ بوون لە قوتابخانە.

لەو ماوەیەشدا توندی ئازاردانەکان کە پێم دەگەیشت پتر بوون.

جارێکیان لە ناو پاسەکەوە پاڵیان پێوە نام کە خەریک بوو دەڕۆیشت، چاویلکەکەم تێکشکا و پانتۆڵەکەشم دڕا.

جارێکیشیان لە ناو ئاودەسخانەکاندا بەندیان کردم لە دوای تەواوبوونی قوتابخانە.

بە نزیکەیی ڕاهاتبووم لەسەر داکێشانی پانتۆڵەکەم لە ناو هەمووانداو لە ناوەڕاستی هۆڵەکانی قوتابخانەدا.

ئەرێ، بیرم لە خۆکوشتنیش کردەوە، بیرم لە هەموو شێوازەکان کردەوە و خەونم پێوە دەبینین.

بەڵام کەسێکی ترسنۆکی وەک من، تەنانەت هێزی ئەوەیشی نەبوو کە ئەوەی دەیهەوێت بیکات.

ڕقم لە خۆم دەبویەوە، تا ڕادەی مردن ڕقم لێ دەبویەوە، بەڵام هیچ کەس بەمەی نەدەزانی، هەموو شتەکە لەوەدا بوو کە من وا دەردەکەوتم پتر حەزم لە کەنارگیری و هێمنی بێت.

پاشان شێرپەنجە وەدەرکەوت.

کاریگەریەکی ئیجابی هەبوو.

شتەکان زۆر گۆڕان ... هەر بە یەکجاری و تەواوی کۆتایی نەهات، بەڵام بە دڵنیاییەوە گۆڕا، وەرس کردنەکان زۆر کەم بونەوە.

لەو کاتەوەی کە بۆ یەکەم جار ڕۆیشتمە ئەو قوتابخانە لە دوای هاتنە دەرەوەم لە نەخۆشخانە، هەستم کرد کە شتێک گۆڕا.

تێڕوانینێکی بێدەنگیەکی بێ دەربڕین هەبوو. بە شێوەیەک تەماشام دەکەن وەک ئەوەی نمونەی توشبوو بە شێرپەنجە بم لە قوتابخانە.

بەزەیی پێداهاتنەوە هەبوو، ڕقم لێی بویەوە. نادروست و ڕیسواکەر بوون. بەڵام زۆر چاکتر بوو لە ئازاردان و گاڵتە پێکردن.

گوێ پێنەدان هەبوو، ئەمەیان زۆرترین شت بوو... ئەوەش باشترین شت بوو بۆ من.

حەزم لێ نەبوو کە شتێک بم لێی ڕامێنن یاخود بەزەییان پێدا بێتەوە. باشتر بوو کە شتێک بم گوێی پێ نەدرێ.

مایک و جۆن هەر بەو شێوەیان کرد، هەموو ئەوانەیش کە بەشداریان لەگەڵ دەکردن. لە ناکاو بوونم نەما لە لای ئەوان. چیدیکە تیرەکانیان ڕوبەڕووی من نەدەوەشاند. بێزاربووم لەوەی ببمە کیسی شەڕەمست کە تورەی و خوتخوتەییەکانیان لە مندا بەتاڵ دەکردەوە.

لەوانەیە بە تەواوی هیلاک نەبوبێتم. بەڵام زۆر کەم بوویبویەوە.

لە ڕۆژەکانی ئەوەڵەوە بڕوام نەدەکرد. دەچوومە لای لۆکەرەکەم و پێشبینی گاڵتەپێکردن یاخود پێداکێشان بەسەرم بە تۆپی دەست یاخود هەر شتێکی دیکەم دەکرد.... بەڵام، هەموو ئەوانە لە پڕیکدا وەستان. زۆر زۆر دەگمەن بویەوە.

تەنانەت مامۆستایەکانیش، لە پڕیکدا زۆر میهرەبانتر بوون و گرنگیان پیدەدام.

پێش ئەوە هەر بەوە بەسیان بوو کە بێژن (بەسە جۆن) کاتێک جۆن لە بەرامبەریان شتێکی بکردایە. دەبوو کە توشی شێرپەنجە ببم بۆ ئەوەی بگەم بەمە.

شێرپەنجە هەلێکی پێدام کە بە ئازادی هەناسە بدەم، برینەکانم سارێژ نەبوون، بەڵام بۆشاییەکم دۆزیەوە بۆ ئەوەی هەناسە بدەم.

بە خۆشەویستیەکی زۆرەوە تەماشای خانە شێرپەنجەییەکانم دەکرد.

ئەو وای کرد کە ئازاردانی جۆن و مایکم لێ دورکەوێتەوە، شوکری قەت تەواو ناکەم...

من زۆر ڕقم له جەستەی خۆم دەبویەوە، ڕقم له خۆم دەبویەوە، هەر بۆیە شێرپەنجەم بە شتێکی خراپ لە قەڵەم نەدەدا.. من بە ڕێگەیەک لە ڕێگەکان شایەنی بووم.

بۆ ماوەیەکی درێژ و ڕەبەق ئاواتەخوازی مردنێ بووم، هەروەها خەیاڵم دەکردەوە کە لە ناکاو دێت و لە جۆن و مایک قوتارم دەکات.

بەڵام ئەو سەرەتا شێرپەنجەی نارد، ئەوەیش بەس بوو بۆ سڕینەوەیان.

مێشکم لە بارودۆخێکی باشدا نەبوو... وەرەمێکی تێدا بوو کە بەرە بەرە گەورە دەبوو.

بەڵام من باشتر هەناسەم دەدا.

◆◆◆

کاتێک دایکم باسی بۆ کردم لەسەر فیلمێک کە خەریکی ئامەدەکردنین بە ناوی (بیلال)ەوە بە پرتەوە چومە ئینتەرنێت تاوەکو بۆی بگەڕێم، تەمامبوو کە هەر زانیاریەک دێتە بەردەستم لەسەری بیزانم، تەنانەت گەر هەرچەندێکیش چکۆڵە بێ. لە سەرەتاوە زۆر نەبوون.

بەڵام خەیاڵی ناوەکەمم کردەوە کە لەسەر پەڕەی بڵاوکراوەکانە، خەیاڵم کردەوە کە هەموو شەقامەکان و گۆڕەپانەکان داگیر دەکات.

ئەزانم من نیم، بەڵام ناوەکەمە.

بیرم کردەوە کە ئەوە زۆر بێزارکەر دەبێ بۆ هەر کەسێک گەر ڕۆژێ ئازاری دابم یاخود تانە و تەشەری لێدابم.

بیرم کردەوە کە لەوانەیە هەست بە تاوان بکەن، کاتێک کە ناونیشانەکە دەبینن، لەوانەیە ئەوەیان وە یاد بخاتەوە کە کردویانە بە من.

پتر بە دوای ئەو کاراکتەرەدا چووم کە فیلمەکە باسی لێوە دەکات.

یەکێک بوو لەو کۆیلە ڕەشپێستانەی کە باوەڕی بە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) هێنابوو. پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)ی

موسولْمانان، ئەو كۆيلـە و بەنـدە بـووە و خاوەنەكـەی زۆری ئەشـكەنجە داوە لە سزای ئەوەی باوەڕی بە پێغەمبەر( درودی خـودای لەسـەر بێـت) هێنـاوە. بەڵام یەكێك لە هاوڕێ فـرە زەنگینـەكانی پێغەمبـەر( درودی خـودای لەسـەر بێت) لە خاوەنەكەی كڕی و ئازادی كـرد. دایكـم شـتێكی لـەو شـێوەیەی پـێ گووتم كاتێ مانای ناوەكەی خۆمم لێپرسی.

پاشان، شتێكی زۆر ناوازەم خوێندەوە، شتێك كەوای كـرد تاڵـەكانی قـژم هەستنەوە و ڕێك بنەوە.

بیلال توانی تۆڵە بسەنێتەوە.

توانی خاوەنەكەی بكوژێت كە ئازار و ئەشكەنجەی دابوو.

بیلال بوو بە (پاڵەوان)ی من.

نەك لەبەر ئەوەی كە ناوەكی وەك ناوی منە، بەڵكو لەبـەر ئـەوەی تـوانی تۆڵە بسەنێتەوە.

ئەم جیهانە پێویستی بە وێنەی وەك بیلالە، بۆ ئەوەی باشتر ببێت.

هەندێ ڕەسمی بیلالم وەدەسـت خسـت كـە بـەو شـێوەیە دەردەكـەوێت لـە فیلمەكـەدا. بۆخـۆم دادەنیشـتم و دەمهێنایـە پێشـچاوم كـە چـۆن تۆڵـە لـە خاوەنەكەی دەكاتەوە... هەروەها لە جۆن و مایك و شێرپەنجەش.

دەمهێنایە پێش چاوم بە شێوەی سێ دووری.

نا نا بە چوار...

لە دووری چوارەمەوە لە تەكیدا بووم... یاخود هەر خۆم ئەو بوبێتم.

بـە لای ئاوێنەكـەدا تێپـەڕیم، بـۆ یەكـەم جـاریش لـە دوای چەنـد سـاڵێك هەسـتم كـرد كـە دەكـرێ ئـەو كـوڕەی لـە بەرامبـەرم دەردەكـەوێ ڕقـم لێـی نەبێتەوە.

ئومێدێكم بەدی دەكرد كە دەكرێ خۆمم خۆشبوێ، یاخود هەر بـە لایـەنی كەمەوە لە ڕقلێبونەوەی دەست هەڵگرم...

هەموو شەوەکەم تێپەڕاند کە من لە ناو فیلمێکی چوار دووریدام لە سازکردن و دەرهێنان و ڕۆڵبینینی خۆم. کە بیلال تۆڵە لە هەموو ئەوانە دەکاتەوە کە ئازاریان داوە، نەک تەنها خاوەنەکەی.

لە بەیانیەکەیشی لە ناو پێگەی فیلمەکەدا گەڕام وەدوی ئیمەیڵی کەسێک کە بتوانم پەیوەندی لەگەڵ ببەستم.

ئیمەیڵێکم ڕەوانە کرد بۆ کەسێک ناوی ئەمجەد حەلوانی بوو، نوسرابوو ئەو (سەرپەرشتیاری مێژوویی سیناریۆکەیە).

داخوازیم لێکرد کە چاوم بە سیناریۆی فیلمەکە بکەوێ.

لە هەمان ڕۆژ، دانیشتنێک هەبوو، لە دانیشتنەکانی دیکەی چارەسەری کیمیایی.

نەمدەزانی، کە یەکەم هەنگاوەکانم ناوە لە چارەسەرکردنی ڕاستەقینەدا... جیاواز.

◆◆◆

from: Amjadhelwani@bilalmovie.org
to:bilal٢٠٠١ny@hotmail.com
subject: سلاو

چۆنی بیلال؟ حاڵت چۆنە؟ هیوادارم کە باش بیت.

گرنگیدانت بە فیلمەکە دڵخۆشی کردم، هیوادارم هەلی تەماشاکردنیت بۆ بڕەخسێت لە کاتی پێشکەشکردنیدا.

بەداخەوە وەک ئەوەی داوات کردبوو ناتوانم سیناریۆکەت بۆ بنێرم، ئەوەش لەبەر هەبوونی هەندێک بەربەستی یاسایی کە قەدەغەی بردنە دەرەوەی هەر شتێک دەکات لە ئەو کەسانەی لە فیلمەکەدا کار دەکەن.

لە پای ئەوەدا، هەڵدەستم بە کۆکردنەوەی هەرچیەک کە پێم بکرێت لە زانیاری لەسەر بیلالی حەبەشی لە کتێبە مێژووییەکاندا و، ناردنی بۆت، دەتوانیت سیناریۆی فیلمەکە خەیاڵ بکەیتەوە کە لەسەر ئەو زانیاریانە بەندە بە سیناریۆی ڕاستەقینەی ئەو فیلمەی کە بە ڕاستی بەرهەمدەهێندرێت.

ئەم سیناریۆیە کۆپی هاوبەشمان دەبێت، من و تۆ، لە چیرۆکی بیلالی حەبەشیدا.

پێت چۆنە؟

ڕێز و سڵاوم

ئەمجەد

◆ ◆ ◆

## ئەمجەد

چی بکەم؟

ئایا بچمە ناو یاریەکی لەو شێوەیەوە لەگەڵ مێردمنداڵێک بەو بارودۆخەوە؟

ئایا درک بەوە دەکەم کە لێرە چی ڕوودەدات؟

ئەسڵەن دەبێ چی بگووترێ بەوانەی کە لەسەرەی مەرگدان؟ دایکم مرد و پێش ئەویش باوکم، نەمدەزانی کە چۆن تەنانەت بە وشەیەکیش ئازاریان لێ کەم بکەمەوە، دایک دڵخۆشی خۆی لە ئایندا دۆزیەوە، کاتێک باوکم مرد ئەو قورئانی بۆ دەخوێندەوە و دەستی گرتبوو، ئەو مەودایەشی کە پێش مردنی بوو زۆر باوەڕدارتر بوو... کاتیک ئەو لەسەر جێگەی مەرگدا بوو، هەوڵمدا کە ڕۆڵەکەی خۆی ببم بۆی کە لەگەڵ باوکمدا بەو شێوەیە بوو، قورئانی بۆ بخوێنمەوە... ئەوەم جارێ دوو جار کرد تەنها لەبەر ئەوەی ئەو هەست بە ئارامی بکات... بەڵام ئەوە منی ئارام و ئاسودە نەکرد... هەستم بە خنکان کرد.. نەمدەتوانی ڕۆڵ بگێرم.

تەنانەت لە کاتی مەراسیمی بەخاک سپاردنیدا، هەستم بە هیچ شتێک نەدەکرد بەرامبەر مەراسیمەکە، باوەڕم نەبوو کە شتێک بوونی هەبێ لە دوای ئەم ژیانە.. هەر بۆیە هەموو شتێک لە بەرچاوم بە زیادەڕەوی لە باوەڕدا دەهاتە پێشێ... زۆر دڵگران بووم بە لێک دابڕان لەگەل دایکم، هەروەها مەراسیمەکە وا دەهاتە پێش چاوم کە بۆ خۆشی بینینی خێزانی مردووەکە و بوغراکردنیان دانرابێت... ئەمەم بە کریستین گووت و ئەویش لێکردانەوەکەی دڵنیاکردمەوە...

هەروەها گوتیشی کە زۆربەی مەراسیمەکان هەر بۆ ئەوە دەکرێت!

دایکم لە سەرەمەرگیدا بوو، منیش شتێک نەبوو کە پێی بێژم، ئەو قایل بوو بە مردن، بە شێوەیەک لە شێوەکان باوەڕی بە بوونی خودا و ڕۆژی

حيساب و هەموو ئەو شتانە هەبوو... من شتێكم پێ نەبوو كە بیڵێم، ئەویش چاوەڕێی هیچ شتێك نەبوو لە من كە بیڵێم، ئەو هەندێ خزم و ناسیاوی هەبوو كە ئەوەیان گرتبویە دەست.

بەڵام.. ئایا دەكرێت هەمان شت بكەمەوە لەگەڵ مێرد منداڵێكدا كە چاوەنواڕی مردنە و، تەمەنیشی لە سێزدە ساڵیدایە؟

ئایا پێی بێژم: كە هیچ شتێك بوونی نیە لەوێ و چاوەڕێی ناكات... كاتێك دەمرێت لە پڕێكدا ڕووناكیەككان دەكوژێنەوە و، دەڕوات و، هەموو شتێك بێ دەنگی باڵی بەسەردا دەكێشێت..!

ئەمە ئەو شتە بوو كە باوەڕم پێی هەبوو.

بەڵام ناكرێت ئەم شتە بوترێت بە منداڵیك كە خەریكە دەمرێت.

ناكرێت...

♦♦♦

هەموو كات باوڕم بەوە بوو كە ڕاستەقینە باشترە تا خەیاڵ.

هەر بۆیە ڕاستەوخۆ توشبوونی باوكم بە شێرپەنجەی پەنكریاس بە خۆی ڕاگەیاند هەر كە پێم زانی، دایكم دەیەویست بابەتەكەی لێ بشارێتەوە و، بەردەوام بێت لە وەرگرتنی چارەسەر بەرەبەر تاوەكو ئەنجامی دەبێت...

من پێم باش بوو كە پێویستە ڕاستەوخۆ بیزانێت..

بەڵام، ئایا ئەمە بەسەر منداڵێكیشدا جێبەجێ دەكرێت كە چاوەڕێی مەرگە؟

ئایا دەتوانم خاتر جەم بم لەسەر ئەوەی هیچ شتێك ڕوو نادات لە دوای مەرگ و، بابەتەكە وەك دەركێشانی وایەرێكە لە پلاكەكەی، هەموو شتێك دەكوژێتەوە و كۆتایی دێت؟

چۆن دەتوانم خاترجەم و سوور بم لەسەر ئەوە كە هێشتا من نەمردوومە.

من خۆم تووشی چی كرد؟

♦♦♦

هیچ مەجالێکی گەڕانەوە نیە..

من وانەم بە کەسانی پێگەیشتوو دەگووتەوە، وانەی مێژوو..

ئەوڕۆ، پێویستە لە بەرامبەر هەرزەکارێکدا بوەستم کە دونیا جێ دێڵێ، بۆ ئەوەی شتێکی لەسەر مێژوو پێ بڵێم، شتێکیش لەسەر داهاتوو.

دەمزانی کە دەبێت پەیامێکی ئیجابی بۆ ڕەوانە بکەم..

هەر نا با بە ئازایانە پێشوازی لە مەرگ بکات...

لە ئەرکەکەم ڕامام هەندێک کە کەمێک پیش ئێستا خۆمم تووشی کرد.

پێویستە لە (بیلالی حەبەشی)دا شتێک بدۆزمەوە، کە (بیلالی نیۆریکی) ئازا و بەهێزتر بکات لە ڕوبەڕووبونەوەی شێرپەنجەدا.

هیچ کات ئاسان نیە.

بەڵام کشانەوە لە ناو هەڵبژاردندا نەماوە، مادام کە من پەیامەکەم ڕەوانە کردووە.

◆◆◆

From: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com
To: amjadhelwani@bilalmovie.org
Subject: کێشە نییە

چۆنی کاک ئەمجەد.

سوپاس بۆ پرسیارەکەت، بەڵام ئایا چۆن بیردەکەیتەوە کە نەخۆشانی شێرپەنجەی مێشک هەستیان چۆنە؟

بیرۆکەکە خراپ نییە، دەتوانین پێکەوە سیناریۆی فیلمی بیلال دابڕێژینەوە، منیش وا دایدەنێم کە هەمان سیناریۆی فیلمەکە پەخش دەکرێت لەسەر شاشە..

چاوەڕوانی ئەوەم کە دەینێریت.

سڵاو و ڕێزم

بلال

♦ ♦ ♦

From: amjadhelwani@bilalmovie.org
To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com
subject: بەردەکە

لە سەرەتاوە دەست پێناکەم وەک هەمیشە.

بەڵکو لە دیمەنی پێشەکیەوە دەست پێدەکەم، ئاخر گرنگە. دوای ئەوە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ دیمەنی سەرەتاکان بە فلاش باک.

هەروەها بە بیلال دەست پێناکەم. بەڵکو بە ئەفسانەیەکی ئیغریقی کە لەوانەیە وەبەر گوێت کەوتبێ، وەک هەموومان گوێمان لێی بووە، ئەویش ئەفسانەیەکە کە جێی دیارە لە عەقڵ و بیری ڕۆژئاوایدا.

باس لە سیزیف دەکەم، ئەفسانەی سیزیف، بە دیاریکراویش (بەردەکەی سیزیف).

کورتەی چیرۆکەکە لەوەدایە کە خودا سیزیف بەوە سزا دەدات کە دەبێت بەردێکی گەورە بۆ لوتکەی شاخەکە هەڵبگرێت، لەوێش، پێش گەیشتن بە لووتکە، بەردەکە خلۆر دەبێتەوە بۆ خوارەوە، لەسەر سیزیفیش ئەوەیە کە دەبێت دوبارە بەردەکە هەڵبگرێتەوە بۆ لوتکەکە، ئەوەیشی کە ڕوویدابوو بەسەریدا دیسان دوبارە دەبێتەوە، جار لە دوای جار... تا ئەبەد.

سزای سیزیف ئەوەیە کە بەردەوام بێت لە کارێک کە مانای نییە، ئەنجامی نییە.

ئەوەیە کە هەموو هەوڵدانت (بای شەماڵ بیبات)... هیچ شتێک لە دواتەوە نەبێت.

◆◆◆

باشە، ئەمە بەردەکەی سیزیفە، داخۆ چ پەیوەندیەکی بە بیلالی حەبەشیەوە هەیە؟ باشە بۆ چیرۆکەکەم بەوە دەست پێ کرد؟

لەبەر ئەوەی بەردێکی دیکە هەیە، جیاوازتر لە هەموو بەردەکان لە چیرۆکی بیلالی حەبەشیدا.

بەردێک، گرنگ، دەکرێ یەکەم شت بێ کە کەسێک وە فکریدا بێت کاتێک گوێی لە چیرۆکی بیلال دەبێت.

بەردێک.. کە بووەتە کۆڵەکە و چیرۆکی بیلالی حەبەشی و گەشتەکەی لێوە وەرگیراوە.

ئەو بەردە، رەگی داکوتاوە لە قوڵایی یادگەی هەر کەسێک کە بیلالی حەبەشی بناسێت یاخود گوێی لە چیرۆکەکەی بووبێت.

ئەو بەردە، بەردی بلال نەبوو ڕێک، بەردی ئومەیە بوو..

بەڵام بە بیلالەوە لکا.

ڕێک لەسەر سنگی بیلال دانرا.

◆◆◆

شوێن: مەککە، شارێکە لە دوورگەی عەرەبی، لە شوێنیکدا کە بیابان چواردەورەی داوە.

کات: سەدەی شەشەمی زایینی.

بۆنە: بتپەرستان لە مەککە ڕێگری لە ئاینێکی تاقانە پەرستی نوێ دەکەن.

ئومەیەی کوڕی خەلەف، خاوەنی بیلال، لە نیوەڕۆدا بیلال دەباتە دەرێ، لەو کاتەی کە خۆر بەرز دەبێتەوە، بۆ چۆڵەوانیەکانی مەککە، بیابانەکەی کە لە دەرەوەی شارەکەیە، ئەو و ئەوەیشی لەگەڵیەتی بەردێک ڕادەکێشن و دەینێنە بان سنگی بیلال. پێی دەڵێن: هەر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، تاوەکو دەمریت یاخود کوفر بە ئاینە نوێیەکە دەکەیت و دەگەڕێیتەوە بۆ پەرەستنی بتخوداکان.

بەردەکە لە بان سنگی بیلالە، هەوا و هەناسەدانی لێ زەوت کردووە، بیلال گوێی پێ نایات و هەوڵ دەدات هەناسە وەربگرێت، کاتێک هەناسە هەڵدەکێشێت، بەردەکە زیاتر لەسەر سنگی توند دەکەن...

بەردەکە لەسەر سنگی بیلالە، پشتیشی لکاوە بە لمی گەرمی سوتێنەری بیابانەکەوە، لە چواردەوریشی ئومەیە و ئەوانی دیکەیە، پێی دەڵێن کە بژاردەیەک هەیە کە بەردەکە لەسەر سنگی لادەبات، بژاردەیەک.. کە یارمەتی دەدات لە بەردەوام بوون لە ژیان... بژاردەیەک کە تەنها بە زمانی دەیڵێت. پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)یش، خاوەنی بانگهێشتنامەی تاقانەپەرەستی، ئەوەی لەسەر لابردبوون، بە لاوازەکانی گوتبوو، تەنانەت بە ئازادەکانیش، کە ئەوان دەتوانن ئەو (واتە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)) بە خراپە ناوزەد بکەن، ئەگەر ناچار بوون لەسەر ئەوە.

بیلال ئەوەی دەزانی... دەیزانی کە دەتوانێت بە زمانی وشەی کوفری سەرزارەکی بێژێت و، بڵێت کە ئەو باوەڕی بەو پەیکەرانەیە و، هەر لە ڕیزی باوەڕداران بە ئاینە نوێیەکە بیهێڵێتەوە، بە بێ کێشە و شەرمەزاری. پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) ئەوەی بە ڕوونی پێ گووتبوون.

ئەدی بۆچی بیلال ئارام و پشوو درێژە لەسەر ئەو ئازار و ئەشکەنجەدانە و، ئەو بەردە گەورە پڕ ئازارەش هەر وا بە بان سنگیەوە؟

زۆر بە سانایی، لەبەر ئەوەی بیلال ڕەتی کردەوە، تەنانەت کە ئەو لە نێو ئەو بابەتە دایە، خۆی بە لاواز دابنێت.

ئەرێ، ئازادیان لێ ستاندبوو، بەڵکو بگرە هەر لە لەدایک بوونەوە ئازادی لێ ستاندرابوو.

بەڵام نەک (هێزەکەی).

ئەگەر ئازادیەکەی دەست بەسەر کرابێت، ئەمە وای لێ ناکات کە لاواز بێت... ئومەیەی کوڕی خەلەف و ئەوانەی لە تەکی بوون وایان دەزانی کە

شتەکە زۆر خراپترە، ئەگەر ئازادی لە بەندەیەک بستێننەوە ئەوە لاواز دەبێت.. تەنانەت بەندە و کۆیلەکانیش بەو بیرکردنەوەوە وڕێنەیان دەکرد، تەنانەت بیلالیش پێ دەچێ بەو شێوەیە فکری کردبێتەوە، وای داناوە کە تەنها لەبەر ئەوەی کە ئازادی لێسەندراوە دەبێت لاواز بێت.

ئەو بەردە... کە لەسەر سنگی دانرابوو، وای کرد کە بە شێوەیەکی جیاواز خۆی ببینێت... وای لێکرد کە ببینێت ئیمان چی بەسەردا هێناوە، ئیمان چی تێدا گۆڕیوە...

ئەو بەردە وای لێکرد کە بزانێت ئەوڕۆ بەهێزترە، وای لێکرد بزانێت کە باوەڕ و ئیمانەکەی کردویەتیە کەسێکی بەهێزتر، بەهێزتر تەنانەت لە هەندێک لە باوەڕدارە ئازادەکان کە ئەو سەبر و تاقەتەی ئەمیان نەبوو...

ئازارەکەی زۆر خراپ بوو بەدڵنیاییەوە، دەرنابڕدرێت... بەڵام بەردەکە وای لە بیلال کردبوو کە بزانێت کە هێزی چەند بەرابەر دووهێند بووەتەوە..

ئازارێکی زۆر گەورە... ئەرێ، بەڵام باوەڕ وزەی سەبر گرتنی مەزنتر کردبوو لای ئەو...

دەکرا کە بەردەکە ئەو بشکێنێت، بەڵام بە پێچەوانەوە وای لێکرد کە ببینێت چەندە بەهێزە، دەتوانێت چەندەی تر بەهێز بێت.

لە بەردەکەوە ئیرادەی ئومەییە تێقرنجا و تێکشکا، لەوانەیە ئەوی ڕۆژێ تێگەیشتبێت کە ئەو شتەی لە ناو ناخی بیلالدا ڕوویدا ئاسایی نەبوو... ڕووداوێکی یەکجار دەگمەن بوو..

هەروەها لە بەردەکەشەوە، بیلال دوبارە لە دایک بوویەوە، ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان ئازاد بوو، تەنانەت پێش ئەوەی کە بە ڕەسمی لە کۆیلایەتیەکەی ئازاد ببێت، تێپەڕینی بە نێو ڕووداوی ئەو بەردەدا سەرکەوتن بوو لە کاتێکدا بە وشەی تاقانە پەرەستی (ئەحەد، ئەحەد) دەیگلمانند و مینگە مینگی بوو، ئەوە بانگدانی شایەتحاڵی ئازادبوونی بوو... ئەو

ئازادییەی کە چەند کاتژمێرێک لە نێوەندیان بوو لە هەموو بارودۆخەکاندا...

◆◆◆

بەردێک بهێنەرە پێش چاوت، لەسەر سنگی ڕووتی بیلال.

لەم گەرمەکەش لەو بیابانە چۆڵ و هۆڵەدا، لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا، لەوانەیە لە نیوەی هاوینیشدا بووبێت.

ئەگەر پەیگەرتاشێک سروشی بۆ بهاتایە لە دیمەنێکی لەو شێوەیەوە، ئەگەر بیکردایەتە پەیکەرێک یاخود سومبولێک..

ئەگەری دەبوو کە ناوەکەی: سومبولی ئازادی بێت.

ئەرێ، ئەو بەردەی بیلال، چویە ناو مێژوو، وەک سومبولێک بۆ ئەو هێزەی کە لە باوەڕ و ئیمانەوە دێت، ئازادیش کە لەو هێزەوە دەردەپەڕێت.

◆◆◆

تەنها بەردێک..

جارێک لە لای سیزیف وەک نمونەی کات بە فیڕۆدان و هیچ بەدەست نەهێنان.

جارێکیش لە تەک بیلال، نمونەیەک بۆ باوەڕێک کە کەسەکان بەهێز دەکات، لە کۆت و بەندەکانیان وەدەریان دێنێ لە لاوازییەکەیان.

لە ژیانی هەر یەک لە ئێمەدا، هەموو کات ئەم بژاردەیە هەیە..

بەردێک، دەیکەینە بەردەکەی سیزیف و، هەموو ژیانمان لە هەوڵی بێ هودە و بە هیچ نەگەیشتن بەسەر دەبەین..

یاخود بەردێک.. دەیکەینە بەردەکەی بیلال و، وامان لێدەکات هێزەکانمان بدۆزینەوە...

هەموو کات بەردێک هەیە...

بژاردەیەکی دروستیش هەیە کە هەڵیبژێرین..

سیزیف یاخود بیلال.

## لاتيشا

بیلال خەوتبوو لە دوای ئەوەی ڕشانەوەکەی تەواوکرد کە لە ئەنجامی چارەسەرە کیمیاییەکەوە توشی دەبێت، ئەو شوێنانەی بە ڕشانەوەکە پیس بووبون خاوێنم کردەوە و لە بەردەم کۆمپیوتەری ژوورەکەیدا دانیشتبووم هەوڵمدەدا پێگەیەک بدۆزمەوە کە هەندێک ئامۆژگاری و ئاڕاستەکردنی تێدابێت بۆ ئەو دایکانەی کە ڕۆڵەکانیان توشبووی شێرپەنجەن لەگەڵ پێشکەشکردنی چارەسەر، بە تایبەت پشتگیری دەروونی بۆ ئەو دایکانەی کە بارودۆخی ترسناکی ڕۆڵەکانیان پێ دەزانن، لە پێگەکەدا هەندێک بژاردنم شک دەبرد کە بەهۆی نەچوونم بۆ ڕێکخراوەکانی پشتگیری توشم دەهات، هەموو جاران کاتم نەبوو کە بچمە ئەو ڕێکخراوە پشگیریکارانەی کە ناوم تێیاندا تۆمار کردبوو.

پێگەی ئیمەیڵەکەی بیلال کراوە بوو، پەیامێکم تێدا بەدی کرد کە بۆ بیلال ڕەوانە کرابوو لە لایەن ئەمجەد حەلەوانیەوە:

بیلال پێی گووتبووم کە ئەو نامە بۆ سیناریستی فیلمەکە دەنێرێت و داوای سیناریۆکەی لێدەکات، کێشەیەکم تێیدا نەدۆزیەوە، پێشبینیم کرد کە وەڵام نەدرێتەوە، بەڵام تێفیکریم داخۆ بیلال بە ڕاستی لە دوای (بیلالی حەبەشی) دەگەڕێت یاخود بە دوای باوکیدا، چونکە هەموو ئەو شتانەی کە بە باوکیەوە دەیبەستێتەوە ئەو ناوەیە کە ئەوی ڕۆژێ بۆی هەڵبژاردبوو کە لە دایک بوو پاشان ڕۆیی... بیرم کردەوە کەئایا بە ڕاستی دەکرێت بە دوای سەعید دا بگەڕێت لە دوای ئەو هەموو ساڵە و ئایا ئەسلەن ئەوە سوودی هەیە بۆ بیلال.

پێشبینیم نەدەکرد کە وەڵامدانەوە لە سیناریستەکەوە هەبێت، بەڵکو بگرە پێشبینیم نەدەکرد کە کەس پەیامەکەی بخوێنێتەوە. ئەوەم پێ گووت

تەنها لەبەر ئەوەی بێ ئومێد نەبێت، بەڵێنم پێدا کە هەوڵ بدەین لە ناو ئینتەرنێتدا بە دوای بیلالی حەبەشیدا بگەڕێین، متەقی لە زار دەرنەپەڕی ئەوی ڕۆژێ.

بیلال وەڵامدانەوەی یەکەمی ئەمجەدی بە من ڕانەگەیاندبوو. چەند سەیر و بێ متەقە ئەم کوڕە، هەموو کات ئەوەم زانیبوو، پتریش بوو کاتێک کە هاتینە بڕۆکلین، هەموو کات هەوڵمدەدا ک ئەو دیوارە بشکێنم کە بەدەوری خۆیدا دروستی کردبوو، بەڵام سەرنەکەوتم.. هەندێک کات زۆر قسە خۆش و ڕووخۆش دەبێت، هەندێک جاریش لە نێو بێ دەنگیەکی بێزارکەردا نوقوم دەبێت.

دە فکرم هات کە دەشێ کێشەیەکی هەبێ لە قوتابخانە، سەرنجم دا کە هاوڕێی زۆری نییە، هیچ کەس پەیوەندی پێوە ناکات، لە دوای قوتابخانە کەس لەگەڵی نایەتە دەرێ.

زۆر هەوڵمدا کە لێی بپرسم، وای لێبکەم ئاگادارم بکاتەوە کە ئەگەر شتێکی هەڵە بوونی هەبێ لە قوتابخانە، هەموو کات وەڵامی دەدایەوە (هەموو شتێک باشە).

شکم لە هەبوونی شتێک کرد، ڕۆیشتم بۆ قوتابخانەکەی، بەرپرسیارەکەیم چاوپێکەوت، پێی گووتم بیلال هیچ ڕۆژێک سکاڵای تۆمار نەکردووە، ئەگەریش کێشەیەک هەبایە ئەوە دەیگووت، هەروەها ئامۆژگاریشی کردم کە لێی گەڕێم خۆی کێشەکە چارەسەر بکات ئەگەر هەبێت، هەروەها ڕوونی کردەوە کە هەوڵدانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە وای لێدەکات پشت بە جگە خۆی ببەستێت و دەبێت هەموو کات بیپارێزی، هەروەها مادام لە بارەی کێشەکەوە نەدواوە، ئەوە پێویستی بە هەبوونی من نیە تێیدا.

شکم بۆ هەبوونی ئازاردان و وەڕەس کردن ڕۆیشت لە لایەن قوتابیەکانەوە بەرامبەری، ئەو جارێکیان هاتبویە لای من بۆ ئەوەی پێم

بێژێت ئەوان بە قەڵەو ناوزەندی دەکەن، دەلەرزی، بیلال بەو شێوەیە قەڵەو نەبوو، تەنها کەمێک لە کێشی ئاسایی خۆی زیاتر بوو، لێیم پرسی کە ئەگەر هەموو شتەکە هەر ئەوەندە بێت، دڵنیای کردەوە، هەوڵمدا کە ئارامی کەمەوە، هەروەها ڕێژەی کێش زۆریم بۆ ڕوون کردەوە لەگەڵ ئەوانەی لە تەمەنی ئەودان، بۆ ئەوەی هەست نەکات کە تاقی تەنیایە. متەقی لێوە نەهات، چیدیش باسی ئەو بابەتەی نەکردەوە...

جگە بێدەنگی و تەنهاییەکەی، زۆری دەخوێندەوە، بە باشی دەخەوت و بە باشی دەیخوارد، بە گشتی نیشانەکانی باش بوو، تاکە شت سەرنجم دا تێدا نەما و ڕۆیشت، ئەوەبوو کە لە نوسینیندا لێهاتووییەکی باشی هەبوو، هەستم دەکرد ئەوەی لە منەوە وەرگرتووە، بەڵام بە تەواوی وەستابوو لە نوسینەوە، یاخود نوسینی هەر شتێکی ناواز لە ئەرکەکانی وانەی ئینگلیزیدا. وا بیرم کردەوە کە لەوانەیە ئەمە بەشیک بێت لەوەی کە گەورە دەبێت، هەروەها لەوانەیە کوڕانی تەمەنی ئەو وای دەبینن کە نوسین شتی کچانە بێت بە شێوەیەک لە شێوەکان، پێم خۆش نەبوو لەمەدا تێکەڵ ببم...

سەیرە.. شێرپەنجە کەمێک بێدەنگیەکەی شکاندبوو، نهێنی شاردنەوەکەی نەشکاندبوو، تەنها بێ دەنگیەکەی، زۆر زۆر دەدوا و پرسیاری دەکرد، لە هەموو ژیانی ئەو ماویە زۆرترین پرسیاری لێدەکردم دەربارەی باوکی. نەمدەزانی ئاخۆ ئەم پرسیارانە لە ئەنجامی زانینیەتی بە توشبوونی شێرپەنجە، یاخود پرسیاری عەمبارکراوی ناو ناخیەتی لەو کاتەوەی هۆش و فامی کردوەتەوە کە باوکی بەجێی هیشتووە و ڕۆیشتووە کە ئەو هیشتا لە تەمەنی چەند مانگێکیدا بووە، شێرپەنجە هات بۆ ئەوەی ئازادی بکات... یاخود ئەم پرسیارانە لە ئەنجامی سروشتی ئەو تەمەنەوە دێت، کاتێک کوڕ لە بەردەم دەرگاکانی هەرزەکاریدا دەبێت، پێویستی زیاتر بە باوکی دەبێت، لەوانەیە زۆر زیاتر لە هەر کاتێک.

له بێدەنگیەکەی ئازاد بوو، بەڵام بە نهێنی پارێز مایەوە، لە بەرواری گەڕانەکانی ئینەتەرنێت و پێگەکاندا گەڕام و دیتم کە هەندێک پیگەی کردووەتەوە کە باس لە جۆری ئەو شێرپەنجەیە دەکات کە تووشی بووە، هەروەها رێژەی ڕزگاربوون لێی. هەندێک کات هەموو بەرواری گەڕانەکانی دەسڕیەوە، بۆیە نەمدەزانی کە سەردانی چ پێگەیەکی کردووە، هەندێک جارانیش وەک خۆی دەیهێشتەوە، وەک ئەوەی بیهەوێت پێم بیژێ، کاتێک کە من سەرنجی سەردانیکردنەکانی دەدەم، کە ئەو ڕێژەی کەمی ڕزگاربوونی پێ دەزانێت.

نازانم ئەگەر ئەم شتە لەسەرم ئاسانی دەکات یاخود نا...

دایکێک بزانیت کە ڕۆڵەکەی هەلی کەمی ڕزگاربوونی خۆی دەزانێت..

ئەوەش کە لە هەر دە هەلی ڕزگاربوونێک، پێویستە ئەو هەشتیان هەڵبچنێت، بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت...

لە سندوقی نامەکانی بیلالدا، نامەیەک لە ئەمجەدەوە هەبوو کە نەکرابویەوە.

پێ دەچێ ئەو کاتە ڕەوانە کرابێت کە چارەسەری کیمیایی لە دەمارەکانیدا لێشاو دەبات.

یاخود لە جارێک لە جارەکانی ڕشانەوەیدا.

لە بیلال ڕامام، لە خەوێکی قوڵدا بوو، وەک لە هۆش خۆ چوون بوو لە تاو هیلاکی.

تەماشای نامە نەکراوەکەم کرد.

لە هەموو بارودۆخەکاندا بیلال منداڵە، ئەمجەدیش دەشێت زۆر لەو گەورەتر بێت.. پێویستە چاودێری بکەم بزانم چی بە کوڕەکەم دەڵێت.

بە دڵە خوتەیەکەوە نامەکەم کردەوە و بڕیارم دا کە نیشانەی خوێنراوەکە لابەم لە دوای ئەوەی کە تەواوم کرد.

نامەکەی ئەمجەد پێشبینی نەکراو بوو.

پێشبینیم دەکرد کە باسی ئەو ساڵە بکات کە بیلالی تێدا لەدایک بووە یاخود ئەو شوێنەی کە تێیدا لە دایک بووە، یان شتێک لەو بابەتە.

بەڵام سیزیف و بەردەکەی و ئەفسانەیەکی ئیغریقی!

هەروەها بەردەکەی بیلال؟ ئەو ئەشکەنجەدانەش لەسەر لمی سوتێنەر؟

هەروەها پێکەوە بەستنیان، هەوڵدانی بێ ئاکام لە بەرامبەر سەبر و بەرگەگرتن لە پێناو ئازادی؟

هەروەها ئەو ڕستەیەی کۆتایی کە دەڵێت، هەموومان لە ژیانماندا تووشی بەردێک دەبین، کە دەتوانین بیکەینە بەردەکەی سیزیف یاخود بیلال.

هەموو ئەوانە زۆر بەهێز بوون..

زۆر بە باشی نازانم کە ئایا بیلال لەوە تێدەگات کە ئەمجەد بۆی نوسیوە... بەلام من، خۆمم دۆزیەوە کە زۆر کاردانەوەم بۆ ئەوە هەیە کە نوسراوە.

کاتیک دەمخوێندەوە، چیرۆکی ژیانم و ژیانی ئەوانەی چواردەورم لە نێو ئەو دێرانەدا دەدۆزیەوە، زۆربەی نزیکەکانم هەموو ژیانیان وەک یارییە بێ ماناکەی سیزیف بەسەر دەبەن، من لە سانت لویس گەورە بووم... سیزیف ناوێکی گشتگیر و ڕێک بوو بۆ هەمووی بە نزیکەیی.. لە کەشێکی سیزیفیدا کە خودا سزای داون بەوەی هەموو ژیانیان لە بەرزکردنەوەی بەردەکە بۆ سەرەوە و پاشان خلۆربونەوەی بەردەکە بۆ شوێنی خۆی و پاشان دوبارەکردنەوەی هەمان شت بەسەر بەرن. هەر کەسێک لە کلارا ئەڤینیوی سانت لویس ژیابێت تێدەگات مەبەستم چییە، یاخود تێناگات، لەبەر ئەوەی ئەوە بە تاکە ڕێگە دادەنێت بۆ ژیانکردن، ڕێک سیزیفی، بەڵام سیزیفی ئێرە زەنجییە نەک ئیغریقی، ئەو گەڕەکە لە خراپترین گەڕەکەکان بوو بۆ ژیانکردن لە هەموو ئەمریکادا، نەک هەر لە مەیسوری بە تەنها، هەر کەسێکیش

دەتوانێت خەیاڵ بکاتەوە کە لە دایک بوون لە گەڕەکێکی لەو شێوە مانای چییە، بە دەگمەن دەتوانرێت لێی دەربچیت ئەوە نەبێت کە باشترینە تیایاندا، دەبوایە من لە نێویدا بمامایەتەوە، رێژەی هەژاری و کوشتن وەک رێژەی مردنی بیلال بە شێرپەنجە وابوو، وەک ئەوەی هەموو کات لەسەرم بووبێت کە ڕووبەڕووی ئەم ژمارانە بوەستمەوە و هەوڵی ڕزگاربوون لێی بدەم..

باوکم زۆربەی کاتەکان بێ کار بوو، بەڵام زۆر خۆشی دەویستم، ئەو ڕۆژەی لە قوتابخانە بە سەرکەوتووی دەرچووم، پێی گووتم هەلێک هەیە کە بتوانم لە گەڕەکەکە و لەو ژمارە و ڕێژانە دەربچم. ئەو ڕۆژەی کە ئەوەی گووت بە خەونێکی زۆر دوور دەهاتە پێش چاووم، بەڵام من دەستم گرت بە خەونەکەمەوە و، بەدیم هێنا، ئەگەریش بەشێکی بووبێت، باوکم لە بەندێ دا بوو.

تاکە کەس بووم لە نێو منداڵی نزیکەکانم کە چوومە زانکۆ... لە لایەکەوە شانازیان بووم و لە لایەکی دیکەشەوە سەرشۆڕیان..

لە یەکێک لە کاتەکان... دەبوو کە گەیشتنە زانکۆ و بەدەستهێنانی شەهادەی بەکالیۆرۆس تەواو بکەم، بەڵام چاووم بە سەعید کەوت، سەعید گەڕاندمیەوە بۆ چوارگۆشەی یەکەم، بۆ بەردەکەی سیزیف، هەموو ڕۆژێک هەڵی دەگرم و دەیبەم بە خێرایی بۆ ئەوەی بتوانم کرێی لیستە و قیستی خوێندنەکەم بدەم کە تەواوم نەکردبوو وەک ئەوەی پێم خۆشە.. بەڵکو تەنها لە شەهادەی دیبلۆمدا وەستام... سەعید هەندێک جار کاری دەکرد، زۆربەی کاتەکانیش نەیدەکرد، ئەو هۆگربوونم پێوەی دەقۆزتەوە، بۆیە هیچی خەرج نەدەکرد بۆ ماڵەکە لەوەی کە لە کارەکەی بەدەستی دەهێنا.

ئەو هۆگربوونی منی بە هەل دەزانی، بۆ ئەوەی پارەکانم لە هۆگربوونی بە ماددە هۆشبەرەکانەوە خەرج بکات.

ئەوە ڕێک بە جوانی مەودای سیزیفی ژیانی من بوو..

پاشان بیلال هات، ڕزگاری کردم لە هۆگربوونم و بەردی سیزیفی، پاشان ڕووبەڕووی ژیان بومەوە وەک ئەوەی کە نزیکە لەو وەسفەی سیناریستەکە کردی لێرەدا: وەک ئەوەی بەردەکەی بیلال بوبێت.

داخوازی تەواوکردنی زانکۆم پیشکەش کرد، قەرزێکم وەدەست خست کە یارمەتی ئەدام بۆ ئەوە، لە هەمان کاتیشدا کارم دەکرد بۆ ئەوەی خەرجی بیلال بەدەست خەم... لە ناو قەرزدا نقوم بووبوم بۆ ئەوەی قەرزی خوێندنەکەم بدەم، بەڵام من بڕوانامەی بەکالیۆرۆسم لە زانکۆی مەیسوری وەرگرت، لەو ڕۆژەیشدا کە باوکم لە زیندان دەرچوو، یەکەم ڕۆژم دەبێت کە دەست دەکەم بە کارەکەم وەک مامۆستای وانەی ئینگلیزی لە دواناوەندی فیرگسۆن لە سانت لویس.

لە بیلالی خەوتوو کەمێک ڕامام: ئەم شێرپەنجەیەش کە مێشکی دەخوات، ئەویش بە هەمان شێوە بەردێکە..

بەڵام من تاوەکو ئێستا نازانم ئایا وەک بەردەکەی سیزیف ڕەفتاری لەگەڵ دەکەم، یاخود بەردەکەی بیلال...

◆◆◆

وەک سروشتی کارەکەم، خەریکبووم نمرەیەکم لەسەر نوسینەکەی ئەمجەد دادەنا.

بێگومان +Aم دەداێ بە دڵنیاییەوە.

بەڵام بە خێرایی پەیامەکەم داخستەوە و وام لێکرد کە (نەخوێندراوە بێت).

لە خۆمم پرسیار دەکرد داخۆ ئەمە سوودی بۆ بیلال دەبێت!

◆◆◆

## ئەمجەد

کاتێک ئەوەی کە نوسیبووم بۆ بیلال خوێندمەوە، هەستم بە شەرمەزاری کرد بەرامبەر بە خۆم.

چۆن شتێک دەوێژم کە خۆم جێبەجێی ناکەم..

ڕاستە کە من خۆم وەدور خستووە لە باسکردنی هەر ئیمان و باوەڕێک... بە ڕەهایی باسی هێزی (باوەڕ)م کرد، باسی باوەڕ بوون بە خودام نەکردووە، بەڵکو تەنها باوەڕ، بەڵام بیلال زۆر بە سادەیی دەتوانێت وابیر بکاتەوە کە باس لە باوەڕبوون بە خودا دەکەم، ئەو یاخود هەر کەسێکی دیکەش هەر بەو شێوەیە بیر دەکاتەوە ئەگەر ئەوە بخوێنێتەوە کە من نوسیومە.

ئەمە چ دوڕوویییەکە، بیرم کردەوە...

دوبارە پەیامەکەم خوێندەوە لە مۆبایلەکەمدا کە لە ناو میترۆدا بووم، زۆر قەرەباڵەخ بوو هەر وەک ئەوەی کە لایەقە بە نیۆرکەوە لە دوای نیوەڕوانی ڕۆژی هەینیدا، بە شیوەیەک نامەکەم خوێندەوە لەگەڵ خۆمدا وەک ئەوەی بیخوێنمەوە بە دەنگێکی بەرز، کەیفم بەوە دەهات کە نوسیبووم، بەڵام ئەو ڕقی لێم بویەوە، زۆر زۆر ڕقی لێم بوویەوە، کەیفم بە جیاوازیکردنەکەی نێوان بەردەکەی سیزیف و بەردەکەی بیلال دەهات. بیرۆکەکەم پێ جوان بوو، بەڵام هەستم کرد کە خراپە دەکەم.. هەستم کرد کە وەک ئەوەیە کە هێزی خۆم نیشانی کەسێکی بچوکی وەک بیلال دەدەم..

ئایا من هەڵە بووم لە پێدانی ئەو دووریە ئەفسانەییە لە جیاوازی کردن؟ لە کۆتاییدا سیزیف ئەفسانەیەک بووە کە ڕووی نەداوە، سەرەڕای کاریگەریە ڕۆشنبیریەکەی، ڕووی نەدا.. بەڵام بەردەکەی بیلال ڕوویدا، لە تاویدا بیلال ئارەقەی کردەوە کە لە سەریەتی و لە سەر ئەو لمە گەرمەی مەککەدایە..

نازانم... زۆر ڕاڕا بووم لە بارەی ئەوەی کە نوسیومە، کەیفم پێی هات و، ئەو ڕقی لێم بوویەوە، ڕقم لەوە بوو کە لە ئاستی ئەوەدا نەبووم کە نوسیوومە، ڕقم لێی بویەوە لەبەر ئەوەی زۆر لەوە کەمتر بووم کە بەردەکەی بیلال بخەنە سەر سنگم، لەوانەیە زۆر لەوە کەمتریش کە سزاکەی سیزیفیش وەربگرم... من تەنها کەسێک بووم کە هەندێک گوتەی جوانم گووتبوون و لە ئاستشیاندا نەبوو..

تەماشایەکی خەڵکەکەم کرد لە ناو میترۆکەدا.

زۆربەیان لە نێوان بەردەکەی سیزیف و بەردەکەی بیلالدا بوون تەنانەت گەر سیزیف یان بیلالیشیان وەبەرگوێ نەکەوتبێت.

لەوانەیە ئەوان هەموو کات لە بەردەم بەردەکە بوبێتن، پاشان زیوس (خودای ئیغریقیەکان) فەرمانیان پێدەکات کە وەک سیزیف هەڵی بگرن، یاخود ئومەیەیەک کە هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکات کە لەسەر سنگیان دایدەنێت.

وە فکرم دا هات، پێدەچێت زیوس و ئومەیە یەکیان گرتبێت ئێستا.

پێدەچێت ئێستە ئەوان بە شێوەیە لە شێوەکان پێکەوە کار بکەن...

لەوانەیە زیوس بەرپرس بێت لە هەزاران کەس، ملیۆنان هەزار کەس کە ژیانیان لە هیچدا بەسەر دەبەن.. کار دەکەن لە هەڵگرتنی ئەو بەردانەی کە دەکەوێت و خلۆر دەبێتەوە پێش ئەوەی بگاتە لووتکە و، بەردەوامیش دەبن لەوە... هەرکەسێکیش لەوانە گەر لە قەدەری خۆی لابدات، دەڕوات و ئومەیە دەیگرێت و، بەردێک لە سەر سینگی دادەنێت..

پێدەچێ لە قازانجی بەڕێوەبەری بانکێک پێکەوە کاریان کردبێت... کە بەدەستهێنانەکان و قازانجەکانی پتر دەبێت هەرچەندێک یاری (فیلیبرز)ە شێتانەکەیان بەردەوام بێت.

لە ناو بیرکردنەوەکانمدا غەرق بووبوم و، ویستگەی Barclays central م لە کیس چوو، کە دەبوو لەوێ دابەزم بۆ ئەوەی بگەمە چێشتخانەی Bogota Latin Bistro کە لەگەڵ کریستین ڕێکەوتبووم تاوەکو بیبینم، لە وێستگەی دواتر دابەزیم و، بە پێیان ڕۆیشتم تاوەکو گەیشتمە چێشتخانەکە، سەرم سووڕما کاتێک کریستینم لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێیەکانی دیت، ئەو پێی نەگووتبووم کە لەگەڵ ئەواندا دێت، بە ئاشکراش لۆمەی دواکەوتنەکەمی لێ دەکردم کاتێک دەیگووت بە هەمووان: دەتوانین بیسەلمێنین کە بابەتی دواکەتن و پەیوەست بوون بە کاتەوە لە ئەمجەددا بابەتێکە پەیوەندی بە جیناتەکانەوە هەیە و، پەیوەندی بە ڕەفتاری وەرگرەوە نییە.. لە ئەمریکا لە دایک بووە و تێیدا ژیاوە بەڵام بەشێوەیەک ڕەفتار دەکات وەک ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بێت..

هەندێکیان خەنین و هەندێکیشیان بە شێوەیەکی بەزەیی پێداهاتنەوە تەماشای یەکدیان دەکرد، ئەو هەڵوێستەی زۆر ڕەق بوو بە شێوەیەک وەک ئەوەی بە هەموان بێژێت کە چەند بەهێزە و چەندە توانای زەلیل کردنی منی هەیە...هەروەها چۆن پێداگری کرد لەسەر کڕینی سەگ (کۆپەر) ڕێک ئەو کاتەی کە زانی من ڕقم لە سەگە و لێیان دەترسم... هەر دەشی گووتەوە کە ڕق لێبوونەوەم لە سەگ هیچ پەیوەندیەکی بە ترسەوە نییە، بەڵکو بەو پاشماوە بەجێماوانەی ئاینەوە کە لە ناخمدا هەیە، چونکە موسوڵمانەکان پێیان وایە کە سەگ گڵاوە. من تەنانەت ئەوەشم نەدەزانی لەسەر موسوڵمانەکان!...

هەموو کاتەکە بە بێدەنگی مامەوە و زارم هەڵنەپچڕی، کریستینیش بە هیچ شێوەیەک گوێی پێنەدەدا، بەڵکو ئەو لەگەڵ براندۆن دا گفتوگۆی دەکرد و وتوێژی خۆشیان دەکرد. وەک هەموو کاتێک لەو کاتەوەی پێش چەند مانگێک دەرکەوت لە ژیانیدا.

بیرم کردەوە ئەگەر کریستین لە بارەی بەردەکەی سیزیفەوە کە نوسیومە بخوێنێتەوە ئەوە بەو جۆرە ڕاڤەی دەکات کە من دەمەوێت زانیاریەکانم بسەلمێنم لە بارەی شارستانیەتی ڕۆژئاواییەوە نە کەمتر نە زیاتر... هەروەها هەستکردنم بە کەموکوڕی وام لێدەکات کە زێدەڕۆیی بکەم لە هەموو شتێکدا.

وەفکرم دا هات کە کریستینیش بە شێوەیەک لە شێوەکان وەک بەردەکەی سیزیف وایە، لەسەر پشتم هەڵی دەگرم بە بێ هەبوونی سودێکی ڕاستەقینە لە هەبوونی پەیوەندی لەگەڵیدا.

بەڵام من خۆشم دەویست..

یاخود وام بیردەکردەوە کە پێناسەی هەست و سۆزەکانم بەرامبەری بەو شێوەیەیە.

◆◆◆

From: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com
To: amjadhelwani@bilalmovie.org
subject :پرسیار

سوپاس کاک ئەمجەد بۆ نامەکە.

ئـەوەی نوسـیبووت خوێندمـەوە و کـەمێک پـێش ئێسـتە دانیشـتنی چارەسـەری کیمیـایم تـەواو کردبـوو. بـاوەڕ ناکـەم بزانیـت کـە لـە دوای ئـەوە هەسـتت چـۆن دەبێـت. ئاواتـەخوازم کـە کـەس نـەزانێت. دڵ تێکهـەڵاتن وای لێکردم کە هەست بکەم کیسێکی پـڕ لـە ڕشـانەوەم... وا هەسـتم دەکـرد کـە ژوورەکـە دەمخولێنێتـەوە، قورگیشـم دەسـوتا.. هـەروەها بـۆنی ڕشـانەوەکە هەموو لووتمی داگیر کردبوو تەنانەت ئەگەر هەمووشی لابرابێت لە بەرچاوم.

پاشان ئەوەی نوسیبووت خوێندمەوە، وا هەست دەکەم کە تێی گەیشتم.

بەڵام پرسیارت لێدەکەم... ئەگەر کەسێک بێت بۆلام و، پێم بێژێت کە تۆ لەم ئازار و ئەشکەنجە ڕزگارت دەبێت ئەگەر تەنها هەندێک وشە دەرببـڕی کـە لەسەرت ناکەوێ و، هیچ شتێک لەدەسـت نادەیـت بـە گـوتنی.. ئایـا مـن ئـەو وشانەم دەگوت؟

با پرسیارەکەت بە شێوازێکی دیکـە لـێ بکـەم، وای دابنـێ مـن دەمـەوێت دیمـەنێک بخەمـە سـەر دیمـەنی ئەشـکەنجەدانەکەی بـیلال، بـیلال و لـە سـەر سـنگی بـەردێک هەیـە، لمـە سـوتێنەرەکەش لـە ژێـری، دایکـی یـاخود خوشکەکەی یاخود هاوسەرەکەی یان خۆشەویستەکەی (نازانم، هـەر کەسـێک بێت) بێتە لای و پێی بڵێت: ئەی بیلال، ئەوە تەنها چەند وشەیەکە، بیڵـێ و ئەم ئەشکەنجەدانە کۆتایی پێ بێنە.

چـی وەڵام دەداتـەوە؟ بـە تایبـەت کـە تـۆ دەڵێیـت کـە پێغەمبەرەکـەیان (درودی خودای لەسەر بێت) ڕێگەی ئەوەی پێدابوون..

From: amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

subject :بەڵێ دەکرێت

بیلال دایکی ڕاستەقینەی هەبوو، ناوی حەمامە بوو، خوشکێکیش کە ناوی غوفەیرە بوو، بەڵام بەڕاستی زۆر نازانین لە بارەیانەوە. نازانین کە کامیان لە مەودای ئەو کاتەدا بوونیان هەبووە لە ژیانی بیلالدا.

هەروەها دەتوانین وای لێبکەین کە پێی بڵێت، بۆ ئەوەی هەڵوێستی دەربڕێت: دەمەوێت بە ئومەیە بڵێم کە من بەهێزترم لە تۆ، تۆ ئیتر من ناترسێنی، ئەرێ.. من ئازار دەچێژم.. ئەرێ.. من ئەشکەنجە دەدرێم.. بەڵام ئەم ئازارەم کە سەبری لەسەر دەگرم و ئارامم، پەیغامیک بۆ هەمووان ڕەوانە دەکات، سەبارەت بە هێزی باوەڕ، دەتوانێت بێژێت بە باوەڕداران کە لە تواناتاندایە سەبرگر و تاقەت و پشوو درێژ بن، هێزی پتر چاوەڕێیانە.

هەروەها پەیغامێک بۆ بتپەرەستان دەنێرێت: باوەڕەکەمان بەهێزترمان دەکات لە ئێوە... چیدیکە لێتان ناترسین.

♦ ♦ ♦

## بیلال

سیزیف ئەناسم، پێشووتر هەر بە سەرپێی لە بارەیەوە خوێندبومەوە.

ئەمڕۆش زیاترم لە بارەیەوە خوێندەوە.

ئێستە دەزانم مەبەستی ئەمجەد چییە.

مادام ئێمە هەر ئازار دەچێژین بە هەر شێوەیەک بێت، دە کەواتە با لە ئازارەکانمان واتا دروست بکەین.. پێم وابێت ئەوەیە مەبەستی.

پێش شێرپەنجە، لە دەستی ڕیسواکردن و ئازاردانی هەموان لە قوتابخانە لەگەڵم ئازارم دەچەشت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، هەموو شتێک بێزارکەر بوو، بە بێ هوودە، هیچ شتێکم نەکرد هەر بۆ وەستاندنی ئەم هەموو ئەشکەنجەدانە.

پاشان شێرپەنجە بە پسکەپسک بۆ مێشکی من هات.

دەتوانم خۆم بدەم بە دەستەوە بۆی.. خۆ بە هەموو شێوەکان هەر دەیچەژم.

ئەمجەد دەڵێت بەردەکەی بیلال، لە ئازارەکانم مانا دروست دەکات.

یاخود دەکرێت ئێستە لە ئازارەکانم مانا دروست بکات.

هەموو شتێک دەکرێت یان بەردەکەی سیزیف بێت یاخود بەردەکەی بیلال.

ئەوەش بەندە بە خۆمانەوە.

هێشتاش هەست بە دڵ تێکچوون دەکەم، هێشتاش ڕشانەوە پڕی کردووم.

چۆن دەتوانم ئەم بەردە بکەمە بەردەکەی بیلال، نەوەک تەنها بەردێکی بێ سوودی سیزیفی؟

◆◆◆

From: amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

subject:سەرەتاکان

زۆر نازانین لە بارەی منداڵیی بیلالی حەبەشیەوە، یاخود ئەوماوەیەی پێش باوەڕهێنانی کە بووە هۆی بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ خاوەنەکەی (ئومەیە) و ئەو بەردە.

ئەمە زۆر ئاساییە، چونکە بیلال تەنها کۆیلەیەک بوو، هەر شتێکی قێزەون و بێزارکەر بوو لە چاوی سەرکردەکانیان و هەموو کۆمەڵگا، بۆ ئەبێت کەسێک گرنگی بە لە دایکبوون و منداڵی کۆیلەیەک بدات.

سەرەڕای ئەوەش، ئێمە هەر شتێک لە بارەی بیلالەوە دەزانین، کە وامان لێدەکات لە ئەم خراپەکاریە پتر تێبگەین، وامان لێدەکات تێبگەین لە ئاستی پلەی کۆیلە لەو کۆمەڵگەدا.

سەرچاوەکان دەڵێن کە بیلال لە لەدایکبووی (سراة) بووە، سراة یش ناوچەیەکە لە نێوان مەککە و یەمەندا، هەروەها دەشڵێن لە مەککە لەدایک بووە.

بۆ نازناوی (المولدین)، واتای ئەوە دەگەیەنێت کە لەسەر فەرمانی خاوەنەکەی (دایک)ی لە دایک بووە و، بڕیاری داوە کە سوود لە مێینەییەکەی وەربگرێت، هەر بۆیە ئەو وای لێکردووە کە منداڵ بخاتەوە، لە کۆیلەیەکی وەک خۆی، دەکرێت ئەویش یەکێک بوویێت لە کۆیلەکانی و دەشکرێت وا نەبێت، بۆیە منداڵێکی کوڕی دەبێت و گەورە دەبێت بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە کارەکانی یاخود بیفرۆشێت یان مێینەیەک بخاتەوە بۆ ئەوەی ببێتە خزمەتکار یان کڵفەتێک یان ئەویش بفرۆشێت.

لەسەر فەرمانی خاوەنەکەی لە دایک بووە، چونکە کەیفی بە بردنەوە و قازانجی زیاتر بوو.

ماف زەوتکردنی مرۆڤێک لە مرۆڤێکی دیکە، واتە لە دایک ببێت و، تێبگات کە ئەو کوڕێکە بۆ ئەوەی قازانجی زیاتر بهێنێت بۆ کەسێکیان، لە دایک بووە بۆ ئەوەی بفرۆشرێت، لە دایک بووە بۆ ئەوەی یەکێکیان سوودی لێ ببینن، کە پێشووتر سوودیان لە باوکیشی وەرگرتووە...

ڕووشاندنی کەرامەتی مرۆڤ، واتە لە دایک بووبێت، لەسەر فەرمانی خاوەنەکەی، کە دەیەوێت کۆیلەیەکی تر لە ناو موڵکەکەیدا ببینێت... وەک ئەوەی ئەسپێکی دیکە بێت... یاخود هەر جۆرێک لە جۆرەکانی مەڕ و ماڵات..

هەر بەم شێوەیە بە ئەگەری زۆرەوە بیلال باوکی نەناسیوە.

دایکی ئەوی بوو تەنها لەبەر ئەوەی سامانەکەی پتر بێت... نوقتە.. کۆتایی.

زۆرێک لە سەرچاوە مێژووییەکان بە ناوی دایکیەوە ناوزەدیان کردووە... بیلالی کوڕی حەمامە، نەک بە ناوی باوکەوە وەک ئاسایی.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ناوە بەربڵاو بووە تەنانەت ئەگەر ئەگەری هەبوونی ناوێکی دیکەش هەبووبێت ئەویش: بیلالی کوڕی ڕەباح بووە..

ناوزەند کردن بە ناوی دایکەوە جۆرێک بووە لە سوکایەتی پێکردن... ئەمە بە ئاماژەیەک دادەنرێت ئەگەر شاراوەش بێت بۆ ئەو شتانەی کە لە لای عەرەب بە سووکایەتی پێکردن دانراوە..

پێ دەچێت ئەو زۆر ئازاری بەوەوە چەشتبێت.

◆◆◆

بەم شێوەیە بیلال لە دایک بووە، هەر بەم شێوەیەش زۆربەی کۆیلەکان لەدایک بوونە، بەجێهێنانی داخوازی خاوەن دارایییەکان بۆ بەدەستهێنانی

پارەی زیاتر. کۆیلەکانیش، بە پێی ئەوەی سەرچاوەیەکی بەهێزی پارە بوون، کە بخۆرەکانیان هیچ کات تێر نەدەبوون لە پتر کردنی.

لە کۆیلایەتیدا لە دایک بوو، جگە ئەوەش هیچی تری نەدەزانی.

دەشبوایە هەر بەو شێوەیە بمێنێتەوە.

بەڵام ئەوەی لە دواتردا ڕوویدا جیاواز بوو.

♦ ♦ ♦

زۆر نازانین دەربارەی حەمامە، دایکی بیلال.

نازانین داخۆ وەک (بەردە)فرۆشرا بێت، یاخود هەر وەک بیلال بەو شێوەیە لە دایک بووە.

نازانین داخۆ ئەسیر بووە کاتێک منداڵ بووە لە ئەنجامی ڕێگەپێگرانەوە یاخود وەک کۆیلە فرۆشراوە لەبەر ئەوەی خێزانەکەی بە نەبوونیدا تێپەڕیون.

نازانین داخۆ هیچ لە ژیانی پێشووی وەبیر مابێ، ژیانی پێش بەردایەتی، یاخود هیچ شتێکی لە یادەوەریەکانی بۆ بیلال باس کردووە، بەڵام هەر دەبێت هەموو بەردەیەک یادەوەریەکی هەبووبێت کە لە نزیکەکانی بۆی ماوەتەوە، ئەو کاتە بۆیان گێڕاوەتەوە کە توانیبێتیان بە ئازادی هەناسە بدەن...

♦ ♦ ♦

## بیلالی حەبەشی

ناوم بیلالە.

دایکم ناوی حەمامە و، باوکم ناوی ڕەباحە.

من بەردەی یەکێک لە بنەماڵەکانی مەککەم، ئەویش بنەماڵەی کوڕی جەمحە.

زۆربەی کات لە لای یەکێک لە سەرۆکەکانی بنەماڵەکە کار دەکەم: ئومەیەی کوڕی خەلەف.

بە (بیلالی کوڕی حەمامە) ناوزەندم دەکەن. چونکە من هەرگیز باوکمم نەدیوە.

دایکم زەواجی لەگەڵ باوکم کردووە تەنها لەبەر ئەوەی منی ببێت لە سەر داخوازی گەورەکەی. بەڵام باوکم لە شوێنێکی زۆر دوور کاری دەکرد بۆیە دایکم هەواڵی ئەوی لێ بڕا.

هەر بەم شێوەیە لە دایک بووم بۆ ئەوەی ببمە بەردەیەک.

نەک هەر بە بەردەیی لە دایک بووم.

بەڵکو تەنها بۆ ئەوە لە دایک بووم کە بەردە بم... دایکمیان لە باوکم مارە کردووە بۆ ئەوەی بەردەیەکی ببێت و بچێتە نێو سامانی گەورەکەی.

هەر لەو کاتەوەی فامم کردوەتەوە، هەست دەکەم کە ئەمە نابێت ڕاستبێت.

ئەرێ.. بێجگە بەردەیی بوون هیچی ترم نەزانیوە.

بەڵام من هەستم دەکرد کە ئەمە ڕاست نییە، شتێک لە ناخمدا دەیگوت کە ئەمە هەمووی نادروستە.

لەوانەیە دایکم، لە منداڵیمدا شتێکی پێ گوتبێتم لە سەر کاتێک کە لە شوێنێکی دووردا ئازاد بووە... کاتێکی زۆر دوور کە منداڵیەکەی تێدا وەبیر دێتەوە کە دەیتوانی هەر شتێکی خواستبا دەیکرد، لە ناو کێڵگەکاندا گەمە و کایەی دەکرد و بە دوای پەپولەکاندا دەفڕی و ڕایدەکرد...

پێم وابێجارێکیان پێی گوتم، کە ناوی حەمامە نەبووە، خۆی ئەو ناوەی بژاردە کردووە بۆ خۆی تاوەکو بەوەوە بانگی بکەن چونکە ئەو دەیەویست بۆ دوور بفڕێت، ئازاد وەک کۆتر..

لەوانەیە لەو ڕۆژەوە، ئەوەی دیبێ کە من دەتوانم دوو باڵم هەبێت...
هەروەها دەتوانم لە هەموو ئەمانە بۆ زۆر دورتر بفڕم..

♦♦♦

## لاتیشا

هەستێکی زۆر سەیرم هەیە سەبارەت بەو نامە ئاڵوگۆڕکردنەی نێوان ئەمجەد و بیلال..

ئایا بیلال بە ڕاستی حەز بە هەبوونی زانیاری پتر دەکات لە بارەی بیلالەوە، ئایا ناوەکەی بە تاقە شت دادەنێت کە بە باوکیەوە دەیبەستێتەوە، هەر بۆیەش بە دوایدا دەگەڕێ... ئایا بۆ سایەی باوک دەگەڕێ؟

ئایا ئەمجەد (سێبەری باوک)ە بۆ ئەو، ئەگەر بە شێوەیەکی ئەگەرانەش بێت!!

هەمووکات هەوڵ و تەقەلام کردووە کە دایک و باوکیش بم بۆ بیلال، وەک چۆن هەموو دایکەکانی دیکە دەیکەن، شکستیشم هێنا، هەروەک چۆن زۆرینەیان شکست دێنن، زیاد لە کەسێکم ناسی لە دوای ڕۆیشتنی سەعید، هەندێکیان زیاتر لە پەیوەندیەکی سەرپێیان دەویست، بەڵام من هەموو کات لە چاوی بیلالەوە لێم دەڕوانین، ئایا ئەم پیاوە دەتوانێت ببێتە باوک بۆ بیلال، یاخود هەر سێبەرەکەیشی بۆ بیلال؟

هەموویان شکستیان هێنا لە تاقیکردنەوەکەدا، هەر بۆیەش لەسەرم بوو کە ببمە دایک و باوکیش بۆ بیلال، منم کە دەچم لە تەکی بۆ ڕاهێنانی بەیسبۆڵ، منم کە پێی نیشان دەدەم کە لێدانی وردتر چۆن دەبێت، هەر منم کە لە بارەی کاسی سوپەر بۆڵەوە لەگەڵی دەدوێم، هەروەها هەر منیشم کە فێری پایسکل سواری و مەلەوانیم کرد، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە لە پیاوەوە فێری ببێت.

وا بیرم دەکردەوە کە ئەمە سروشتییە... ئەو ڕۆڵی ژنە پاڵەوانەی کە دەیگێڕم، لەوانەشە هەموو ئەو ئافرەتانەی کە مێریان نەماوە هەر بەو شێوەیە بکەن، تەنانەت ئەوانەش کە بەو شێوەیە نین! شتێکی سروشتیە...

هەموو هەوڵێکی خۆمم دەدا بۆ ئەوەی هەرزەکاری بیلال بە ئاسایشی بڕوات بە کەمترین زیان.

هەرگیز بیرم نەکردبۆوە کە دەکرێت پێش هەرزەکاری بیلال لەدەست بدەم!

هەموو کات لەم خەیاڵانە هەڵدێم، بۆ ڕێژەی ڕزگاربوون و مانەوە، بۆ گۆگڵ بۆ ئەوەی توێژینەوە نوێیەکان بدۆزمەوە بەڵکو ڕێژەی نوێی تێدابێت، بۆ ئەوە توێژینەوە نوێیانەی کە بە چارەسەری نوێوە دانراون، بۆ چیرۆکی ئەوانەی کە لە شێرپەنجە ڕزگاریان بووە... هەوڵ دەدەم کە بیهێنمە پێش چاوی خۆم کە ڕۆژێک دەوەستم و چیرۆکی خۆم و بیلال و ڕزگاربوون لە شێرپەنجە بۆ ئەو دایکانەی کە منداڵیان توشبووی شێرپەنجەن دەگێڕمەوە هەروەها چۆن لەو تۆفانە ڕزگارمان بوو.

بەڵام دوبارە ڕۆڵی ئەو ئافرەتە پاڵەوانەی کە دەبێت بیگێڕم.

ساتەوەختی زۆر قورس هەن، کە هیواخواز بووم سەعید لێرە بوایە. پیاوێک هەبوایە و لەم دەرد و بەڵایەدا یارمەتی بدامایە.

بەڵام جوان دەزانم گەر سەعید بهاتایە، ئەوە ساتەوەختی زۆر قورستر بوونی دەبوو...

لەوانەشە هەر لە تەکم نەبوایە لە ساتە قورس و پڕ ئازارەکانی بیلالدا.

هەندێ بیرۆکەی پڕ و پوچمان هەیە لە بارەی بەهێزی پیاوەوە..

گەر بەهێز بوایە، خوای گەورە هەڵیدەبژارد بۆ منداڵ بوون!

بەڵام من بە دروستی پێویستم بە هێزی پیاو نەبوو.

پێویستم بە هاودەم و هاوخەمێک بوو لەم گووزەرەدا، بە لایەنی کەمەوە هاوڕێیەک. ووبی و دیان و ماغی لە قوتابخانە زۆرترین هاوکاری وهاوخەم بوون، هەموو ئەو ڕۆژانەی کە لە قوتابخانە بە مۆڵەت وەرم گرتبوون لە لایەن ئەوانەوە دادەپۆشرا پێش ئەوەی بەڕێز وید دەست بکات بە سکاڵا

کردن، ئەو بەڕێز ویدەی کە هیچ کات قایل نەبوو بە چوونم بۆ ئەو قوتابخانە.

ئەریّ ڕاستە، ئەوان هاوەڵێکی زۆر باش بوون، هەست و سۆزەکانیشیان ڕاستەقینە بوو، بەڵام من حەوجێم بە هاوەڵێکە.

ئاخۆ ئەوە بیلالە کە پێویستی بە سایە و سێبەری باوکە؟ یاخود منم کە حەوجێم بە سێبەری پیاوە؟

ئەو ئافرەتە پاڵەوانەی کە پێویستی بە سیبەری پیاوە.

◆◆◆

ئەنجامی شیکاریە تاقیگەییەکانی بیلال ئاماژە بۆ باشتربوونی ناکات.

پەرستار بێتی بە تەواوی هەموو شتێکی پێ نەگووتم... تەنها بە زەردەخەنە و بەزەیەکەوە گووتی کە بیلال (منداڵێکی ئازایە) و بە بەهێزیەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

دەمزانی ئەو وشەیە واتای چییە، تەنانەت وام لێهاتبوو ئەو زەردەخەنەشم دەناسیەوە، پێ دەچێ هەموو پزیشکان و دەستەی پەرستاران لەگەڵ ئەو زەردەخەن ڕاهاتبن و بەرەبەرە جێبەجێیان کردبێت، بەڵام من خاترجەمم کە هەریەک لەوان تەقەلایەکی زۆری وەگەڕ خستووە لە سەرەتاوە تاوەکو ئەوە بکات.. هەروەها وام لێهاتبوو ئەو ژمارانەم دەناسیەوە کە پێویستە ئاماژە بۆ باش بوون یاخود خراپ بوونی بارووەدۆخی بیلال بکەن... هەموو جاران کە ئەنجامی شیکاریەکان دەردەچوو، بەراوردم دەکرد لەگەڵ بارودۆخی دەروونی گشتی بیلالو شتێکم بەدی دەکرد، بیلال خراپتر دەبێت...

بەڵام ئەم کەڕەتەیان، بیلال بە شێوەیەکی گشتی زۆر باش دەهاتە پێش چاوان، سەرەڕای ئەوەی کە ئەنجامی شیکاریەکانی خراپ بوون.

نەمدەزانی ئەو کاریگەری بیلالی حەبەشیە کە وا بەسەریەوە.

ماغی پێی گووتم: جاتسبی مەزن بەسەر موبی دیکدا سەرکەوت... زۆر شڵەژاو بوو لەسەر ئەوەی کە نەمدەزانی چ چیرۆکێک هەڵبژێرم بۆ قوتابیەکانم ئەم ساڵ، بەڵام جاتسبی توانی بەسەر نەهەنگی سپیدا سەرکەوێت، پێ دەچێت لەبەر ئەوە بێت کە من نامهەوێت ئەوە بخەمە ڕوو کە من زۆر بە موبی دیک دەچم!

پاشان دووا: بەڵام گەر بڕاردە بەدەستی من بێت، کتێبە دڵخوازەکەی خۆم هەڵدەبژێرم...

بە پرتەوە پێم گووت: کتێبی بێتی کرۆکەر بۆ چێشتلێنان؟

وەڵامی دایەوە: ئەرێ، بە چاپی کەندلیش. ١٦٠٠ پەڕە!

ماغی زۆر قەڵەو بوو، بەڵام لەگەڵ قەڵەویەکەیدا زۆر خۆی گونجاندبوو بە شێوەیەکی ئاسوودە، تاوەکو لە جارێک لە جارەکان بڕیار دەدات کە ڕێو شوێنی پارێز بگرێتە بەر، پاشان پەشیمان دەبێتەوە کە ئەوەندە ناهێنێ خۆی بخاتە ناو باروودۆخێکی ناخۆشەوە، هەروەها پێشی وایە کە خواردن زۆر خۆشترە لە سمتێکی جوان، وەک هەموو قەڵەوەکان، زۆربەی کات پێش هەموو شتێک گاڵتەو نوکتەی لەسەر قەڵەوەکان دەگووت.

گەڕامەوە بۆ بابەتی جاتسبی و لێم پرسی: جاتسبی بۆ پۆلی نۆ؟ ئایا ئەوە زۆر گران نییە لەسەر ئەوان... ئەوە زۆربەی کات بۆ پۆلی دە بەرەو سەروتر دەبێت.

گووتی: ئەرێ.. دروستە، پێش هەموو شتێک داوایان لێدەکەم کە تەماشای ئەو دوو فیلمە بکەن کە لە چیرۆکەکەوە وەرگیراوە، هەروەها یەکێک لەو دوانە نوێیە وەک دەزانیت، لە پاڵەوانیەتی کاپریۆیەو کچەکان زۆر بەمە دڵخۆش دەبن!... داوایان لێدەکەم کە هەردوو فیلمەکە بەراورد بکەن، هەندێکیش لە قوتابیەکان هەڵدەبژێرین بۆ خوێندنەوە.. چیرۆکەکە باس لە خەونێکی ئەمریکی دەکات، زۆر گرینگە ئەمە لە دڵ و دەروونی تازە پێگەیشتووەکاندا بچەسپێنین.

پاشان پرسیاری لێکردم: تۆ لە نێو چ چیرۆکێکدا ئەبلەق ماوی.. یاخود هێشتان بیرت لێنەکردووەتەوە؟

هاتمە گۆ: (جذور).... (جذور)هەڵدەبژێرم... ئەوەی ئەلێکس هیلی.

بە سەرسامیەکەوە گووتی: جذور؟؟! چی وای لێکردیت کە بیر لەوە بکەیتەوە... ئەوە بە دڵنیاییەوە گرانە بۆ پۆلی دەیەکان.

گووتم: نازانم، لە پڕێکدا بیرم کەوتەوە... ئەرێ! وایە گرانە، بەڵام کراوە بە زنجیرەی تەلەفزیۆنی، هەندێک بەشی هەڵدەبژێرم و لەگەڵ منداڵەکاندا گفتوگۆی لەسەر دەکەین.

◆◆◆

هەر وایش بوو، لە ناکاوێکدا بیرم کەوتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە خۆشەویسترین کتێب بوو لە دڵمدا کە هێشتا بچوک بووم، بەڵام ئێستە کەمێک لە تەمەنی قوتابیەکانم گەورەترە.

کاتێک کە ئەمجەد لە نامەکەیدا لە بارەی ئەو ئەشکەنجەوە نوسیبووی کە توشی بیلال هاتبوو، تەنها بۆ ئەوەی بڵێت کە ئەو هێشتا بتەکان دەپەرستێت، هەروەها ئەو بەردەش کە ئەمجەد بە سیزیف بەراوردی کردبوو، هەستم کرد کە بە شتێکی لەو شێوەدا تێپەڕیوم، هەستم دەکرد ئەو دیمەنە لە یادگەمدا وجودی هەیە، وەک ئەوەی لەو ژیانەدا هەبووبێتم و لە تەک ئەو کەسانەدا بوویم کە تەماشای بیلال دەکەن و لە کاتێکدا ئەو ئەشکەنجە دەدرێت، وەک ئەوەی پێشتر لە فیلمێکدا تەماشام کردبێت و ئەو دیمەنە لە ناو یادگەمدا هەڵکۆڵرابێت.

شتێکی ئاشنا لەوەدا بوونی هەبوو.

پێدەچێ لەبەر ئەوە بێت کە ئەشکەنجەدان خۆی ببو بە شتێکی ئاسایی.. بەڵام شتیک هەیە لەوە زیاترە کە هەستم پێ کرد ئەو ساتە.

له کاتێکیشدا ماغی لەبارەی جاتسبی مەزن و "موبی دیک"ەوە دەدوا، هاتەوە یادم کە ئەو دیمەنەم لە ناو فیلمی (جذور)دا دیتووە. لە ناو کتێبەکەدا نا. بەڵکو لەو فیلمەی کە لە کتێبەکەوە وەرگیرابوو.

کۆنتا کینتی، ئەو کوڕە ڕەش پێستەی کە لە ئەفریقاوە ڕفێندرا و هێنرا بۆ ئەمریکا و لێرە فرۆشرا... ڕەتی دەکاتەوە کە ئەو نازناوە وەربگرێت کە خاوەنە سپی پێستەکەی بۆی دانابوو... خاوەنەکەی نازناوی (توبی) بۆ هەڵبژاردبوو، وەک ئەوەی سەگێک بوبێ و بیکڕێت یاخود وون بوبێ و دۆزیبێتیەوە و ناوێکی بۆ هەڵبژاردبێت، کۆنتا کینتی هەموو بانگکردنێکی بەو ناوەوە ڕەت دەکردەوە و گوێی پێ نەدەدا و وەڵامی نەدەدایەوە.

ئەو بە گوریسەوە بەسترایەوە و بە قامچی زۆر بە توندی لێی درا، لە پیش چاوی هەموو بەردەکانی دیکە..

نێوت چییە؟

وەڵامی دەدایەوە: کۆنتا کینتی.

قامچییەکانی پیاوە سپی پێستەکە دوبارە هێرشی دەکرد و پرسی دەدایە:

نێوت چییە؟

ئەویش بە دەنگێکی باش نەبیستراوەوە دەیگووت: کۆنتا کینتی.

کۆنتا کینتی... کۆنتا کینتی.

خەریکبوو دەمرد...

کاتێک پرسیارەکە هاتەوە: نێوت چییە؟

گووتی: توبی.

تەنها لێرەدا پیاوە سپی پێستەکە سەرکەوت. داواشی لێکرد کە دەنگی بەرز بکاتەوە، بۆ ئەوەی بەردەکانی دیکە گوێیان لێی بێت.

بیلال کۆڵی نەدا و خۆی نەدا بە دەستەوە، هەر لەسەر خودای تاک و تەنها سوور بوو.

بەڵام هەڵوێستی هەرتک لەوان لە ناوەڕۆکەوە وەک یەک بوو.

کۆنتا کینتی لەسەر ناسنامەی خۆی سووربوو، لەسەر تاقە شت کە لە گوندە دورەدەستەکەی لە گامبیا بۆی مابویەوە کە بازرگانە بێ بەزەییەکان لەوێ ڕفاندبوویان... بیلالیش لەسەر تاقانەیی خودا سوور بوو، کە توانستی ئەوەی پەیدا کرد لە ڕێگەی باوەڕەوە ناسنامەی خۆی دیاری بکات و شوێنێک لە نێو مرۆڤاندا بۆ خۆی ساز بکات و بدۆزێتەوە.

بە شێوەیەک لە شێوەکان زۆر پێک دەچوون، بەڵام هەر یەک لەوان لە ڕێگەیەکی جیاواز، یەک لەوان لە ڕێگەیدا بۆ ئازادبوون، ئەوی دیکەیش لە ڕێگەی بە کۆیلە بوون، یەک لەوان ناسنامەی خۆی دەپارێزێت، لە ڕێگەی باوەڕهێنان بە خودای تاقانە.. ئەوی دیکەیش ناچار بوو کە دەستبەرداری ناسنامەی خۆی بێت، بۆ ئەوەی لە ژیاندا بمێنێتەوە.. بەڵام بویە ژیانی کۆیلایەتی.

بیلال و کۆنتا کینتی، لە پێش چاوم وەک ڕوخسارێکی هاوشێوە لە ئاوێنەدا دەردەکەوتن، یەکێک لە ساتی سەرکەوتندا، ئەوی دیکە لە ساتی شکان و شکست هێناندا.. ئایا لە لای بیلال سەرکەوتن بوو لەبەر ئەوەی بە خودایەکی زۆر مەزن بەستیەوە وەک لە ناوێکی کەسی، لە کاتێکدا لە لای کۆنتا کینتی بە کەسی مایەوە؟ ئایا هێزێکی مەزنتر بیلالی لە خۆ دەگرت، لەبەر ئەوەی باوەڕبوونی بە خوداکەی باوەڕبوون بە خودی خۆی مەزنتر کرد؟ لە کاتێکدا بارودۆخەکە زۆر لەوە تەنگتر بوو لە لای کۆنتا کینتی؟ یاخود زۆر لەوە ئاڵۆزترە و، هەندێک هەل بۆ بیلال ڕەخساوە کە بەهێتری کردوە و هەلی ڕزگاربوونی هەبێت، لە کاتێکدا هەلی ڕزگاربوونی کۆنتا کینتی سنوردابوو؟

هەرچیەک بێت. هەستم کرد شتەکە شایەنی ئەوەبێت کە منداڵەکان بیخوێننەوە. هەستم دەکرد کە لێرەدا هەمووان (جذور)ێکیان هەیە لەم

دیمەنـەدا، نـە ڕەش پێـست بەرامبـەر سـپی پێـست، نـە خـاوەنیش بەرامبـەر بـەردە، بـەڵکو ڕاسـتیەکە پەیوەنـدی بـە ڕاسـتی ناخمانـەوە هەیـە، بـە ناسنامەکەمانەوە، بە دەستگرتن و پارێزگاری کردنمان لێی، بە سوورربوونمان لەسـەری، بەرامبـەر ئـەو شـێوە جۆراوجۆرانـەی قـامچی کـە وامـان لێـدەکەن دەستبەرداری ناسنامەی خۆمان بین و بە یەکێکی دیکە قایل بین...

بە دەنگـی مـاغی بـە ئاگـا هاتمـەوە کـە دیگـووت: بـە هەڵـە لـێم تێمەگـە لاتیشا، جذور زۆر نایابە و هەموو شتێکە، هەروەها زۆر گریـام کاتێـک کە لـە هەرزەکاریمـدا خوێندمـەوە بـەڵام ئـەوە بـە تـەواوی بـۆ ئاسـتێکی دیکـە دەگەڕێتەوە، ئایا هەست ناکەی کە ئـەوەمان تێپەڕانـدبێت ئێسـتە؟ ئـەو شـتە وەک خۆی نەماوەتەوە کە کاتێک چیرۆکەکە دەرچوو...

پێم گووت: چیمان تیپەڕاندووە؟

بـە زەردەخەنـەوە تەماشـایەکی کـردم و تـاوی دایـێ: ڕەگەزپەرسـتیمان تێپەڕاندووە... ئێستە خۆ سەرۆکێکمان هەیە لە ئەمریکیە ئەفریقیەکان.

دەزانیت کە زۆربەی سپی پێستەکانیش ئـەویان هـەڵبژاردووە (دەمزانی کـە ئەو لە هەردوو جارەکەدا دەنگی بەو داوە.. لە کاتێکدا من لـە یەکەمیانـدا زۆر بە پەرۆشەوە هەڵم بژارد و، لە جاری دووهەمدا نەڕۆیشتم).

ئـەو مەبەسـتی ئـەوە بـوو: لـە کۆتایـدا کۆنتـا کینتـی سـەرکەوت لـە دوای ئەوەی کە بوو بە تووبی.

گووتم پێی: کی گووتویە کە من ئەو چیرۆکەم لەبەر ئـەوەی کـە بـاس لـە ڕەگەز پەرستی دەکات هەڵبژاردووە بەو واتایە؟ کۆیلایەتی جـۆری جیـاواز بـە خۆیـەوە دەبینێـت، هـەروەها ڕەگ و ڕیشـە و زنجیـری بەسـتنەوەی هەیـە... شـتەکە پەیوەنـدی بـە ڕەنگـی پێسـتەوە نییـە... چیرۆکەکـە هەلێکـە بـۆ منداڵەکان کە بەم واتایانە ئاشنا ببن و تێیان بگەن.

ماغی گووتی: ئەوە بەڕاستی قووڵ و بە واتایە. منداڵەکان بە ڕاستی سوود لەو واتایانە وەردەگرن...

پاشان بەردەوام بوو: ئەگەر بتوانیت بیگەیەنیت.

چاوێکیشی داگرت.

ماغی زۆر بە پەرۆشەوە دەهاتە پێش چاوم.

خۆشم هەر خوتخوتەم بوو.

♦ ♦ ♦

هێشتاش بیرمە ئەو ڕۆژەی دیاری ڕۆژی لەدایک بوونم کردەوە، سندوقێکی گەورە بوو کە هیوای زۆر مەزنی پێوە گرێدرابوو، کردمەوە و بینم حەوت شریتی ڤیدیۆی زنجیرەی جذور لەگەڵ کۆپیەکی کتێبەکەی تێدابوو، هەمووی بەکارهێنراو بوو، باوکم بە داشکاندنێکی گەورەوە دەستی کەوتبوو.

ئەوکات من لە تەمەنی دە ساڵیمدا بووم، باوکم وەک هەموو ڕۆژەکانی دیکە کەم دەرامەت و بێ پارە بوو. سەرەڕای ئەوەی هێندەی چڵە چقڵێک دەیتوانی بخوێنێتەوە و بنوسێت، بەڵام لە تەک ئەوەیشدا هیواخوازی باشترین بوو بۆ من، ئەو دەیگووت کە من دەتوانم ببمە نوسەرێکی زۆر مەزنی کتێب کە پڕ فرۆشترین کتێبەکان دەنوسم وەک جذور...

ئەوی شەوە بە گریانەوە نوستم، من خەونم بە بوکەڵەکانی گروپی سپایز گێرڵزەوە دەبینی، نەدەبویتە حەیران و هاندەرێکی خۆشەویستی ئەو گروپە لەو کاتەدا ئەگەر ئەو بوکەڵانەت نەبوونایە... یاخود هەر بە لایەنی کەمەوە دانەیەکیان.

هیچ حەولم نەدا کە کتێبەکە بخوێنمەوە یاخود تەماشای زنجیرەکە بکەم، ئەسڵەن بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە کتێبەکە نزیک نەکەوتمەوە. لە پێشمدا بوبووە شاهیدی لەدایکبونێکی غەمبار و، بێ سامانی باوکم و خەونە زیادەڕەوییەکانی کە من ڕۆژێک نەمتوانی بیهێنمە دی.

لەو ڕۆژەی کە باوکم حوکم درا، ئەمن لە حەڤدە ساڵیمدا بووم، دەستم کرد بە خوێندنەوەی چیرۆکەکە.

ئیدی تێگەیشتم باوکم شتێکی زۆر قوڵتر و کاریگەرتری لە بوکەڵەکانی سپایز گێرڵز پێداوم، کە ئەستێرەکەی لەم ماوەیەدا شاردبۆوە.

چیرۆکەکە کاریگەریەکی قوڵی لەسەرم هەبوو، وام هەست دەکرد کە وەک کۆنتا کینتیم، خۆمم بە گیرخواردوویی دۆزیەوە لە گەڕەکێکی هەژارنشیندا، لە گیتو لە سانت لویس، لە کاتێکدا نەوەکانی کۆنتا کینتی بەردەوامی بە چیرۆکەکە دەدەن و پێدەگەن و دەگەنە پلە باڵاکان، وەک نوسەرەکە خۆی، من ئاواتەخواز بووم کە هەموو ڕێگەکە کورت بکەمەوە، ڕێگەی باپیرە و نەوە، کە ئەمن کۆنتا کینتی بم و بگەمە ئازادیەکەم و شوێنێکی باشتر لەوەی کە تێیدام.

(جذور)م وەک گوریس دەبینی کە بتوانێت لە کلارا ئەڤینیو دەرم بهێنێت.

چیرۆکەکەم زۆر کەیف پێهات، دواتر تەماشای زنجیرەکەیشم کرد...

بەڵام هیچکات پێشبینیم نەکردبوو کە ڕۆژێک دێت بە قوتابیەکانمی دەڵێمەوە..

هەروەها بە خاترجەمیەوە پێشبینی ئەوەشم نەکردبوو کە ئەوە بە هۆی بیلالەوە بێت!

◆◆◆

چومە پۆلەکەوە و لە ناو فکران تێچەقیبووم: ئاخۆ ئەوە باوەڕ بوو کە وای لە بیلالی حەبەشی کرد بەهێزتر بێت لە کۆنتا کینتی؟ بەڵام خۆ کۆنتا کینتیش بە باوەڕ بوو.

نهێنی سەرکەوتنی بیلالی حەبەشی لە چیدایە؟ ئایا ئەوە ئەو بارودۆخەی چواردەوریەتی کە وای کردووە بەرگریکردنەکەی سەربگرێت، لە کاتێکدا شتەکە زۆر لە کۆنتا کینتی گەورەترە؟

بیلالی من لە کامیانەوە نزیکترە؟

لە حەبەشیەوە_ کە باوکی بە بۆنەی ئەوەوە ناوی نابوو؟

یاخود لە کۆنتا کینتیەوە؟

♦ ♦ ♦

From: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

To: amjadhlwani@bilalmovie.org

subject: بۆچی باوەڕی هێنا؟

خۆشەویستی من کاک ئەمجەد...

ئایا بیلال پێزان بوو بەوەی کە ئازادیەکەی دەستەبەر دەبێت کاتێک باوەڕ بە خودای تاقانە دەهێنێ؟

قەسدم: ئایا هیچ زانیاری و نوسراوێک هەبوونە کە بڵێت پێویستە بەردەکان ئازاد بکرێت، ئەوەش بوبێت بە هۆی باوەڕهێنانی؟

حەول دەدەم کە پەیوەندی نێوان بەردایەتی و باوەڕەکەی بهێنمە پێش چاوانم...

بۆچی باوەڕی هێنا؟

♦♦♦

## ئەمجەد

ئەم کوڕە زۆر زیرەکە، بێ شک لەو شتەدا تێوەم دەگلێنێت کە نامەوێت خۆمی لە قەرە بدەم.

چلۆن بزانم بۆچی بیلال باوەڕی هێنا... ئەسڵەن هەر مرۆڤێک بۆچی باوەڕ دەهێنێت؟ هەر ئەوەیە کە من تێی نەگەشتووم. ئێ باشە من چۆن بزانم کە بیلال بۆچی باوەڕی هێناوە لە سەدەی شەشەی زاینیدا، سەدەی شتە پڕ و پوچ و ساختەکان، من تەنانەت تێناگەم بۆ هێشتا مرۆڤ باوەڕ دێنێت تاوەکو ئێستا، لە دوای پازدە سەدە، لە سەدەی زانست و راستیەکان.

تێدەگەم کە پێ دەچێت هەندێک ئەڵقەی وون بوو هەبێت لەم گەردونە، شتە نادیار و لێڵەکان، کە مانەوەی بەو شێوەیە هەندێک کەس بێزار دەکات، بۆیە مەیلیان بۆ بیروباوەڕ سەبارەت بە هەبوونی هێزێکی ناسروشتی دەچێت، لە شوێنێک لە پشت سروشتەوە، شوێنێکی نەبوو تەنها لە هۆش و بیریاندا نەبێت، بەڵام ئەم گریمانانە هەستی ئارامی بە مرۆڤ دەبەخشن، هەر بۆیەش پەنای بۆ دەبەن.

تێدەگەم کە شتەکە بەم شێوەیە دەستی پێکرد، هەموو ئاینەکان لەم پێویستیەوە سەریان هەڵدا، پێویستی ڕاڤەکردنی ئەوەی کە ڕوودەدات لە چواردەوری مرۆڤدا لەو دیاردانەی کە لە تێگەیشتنیدا بێ توانایە...

تۆفان و زەمین لەرزە و هەورە بروسکە و گەردەلولەکان هەموویان لەو شتە نادیار و شاردراوانەن، هەر بۆیە دەبوو کە بۆ هەر یەک لەوان خودایەک هەبێت و شییان بکاتەوە و مەتەڵەکەیان هەڵ بهێنێت..

پاشان، بەرەبەرە، خوداکان یەک بە یەک کەمیان کرد، هەرچەندێکە بیرکردنەوەی بەرەو پێشەوە ڕۆیی هەستا بە دەستبەرداربوون لە هەندێک خوداوەندەکان کە بە هەبوونیان حەوجێ نەمابوو، هەنگاو بە هەنگاو،

گەشتینە تەنها یەک خوداوەند، کۆتا دانە لە یاریگاکەدا مایەوە.. هەروەها پێویستیش بوو کە کۆتا جوڵان بوونی هەبێت، تەنها یەک شا ماوەتەوە لەسەر تەختەکە، دەرباز بوون نییە، کش مەلیک.

دەبوو کە ئەم خوداوەندەیش بڕوات...

بەڵام هێشتا خۆڕاگرە، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر... هێشتا ملیۆنان کەس هەنە کە باوەڕیان بە بوون و وجودی هەیە.

دایک و باوکم هەرگیز باوەڕدار نەبوون. بە لایەنی کەمەوە بە شێوەیەکی چاولێکەری و تەقلیدی نا.

بێ باوەڕییان لە پێش چاوی مندا ڕانەگەیاندووە بەڵام باسی باوەڕیشیان نەکردووە، باوکم کەسێکی ئەکادیمی بوو کە باوەڕی بە زانست هەبوو، هەموو تەمەنیشی لە تاقیگەکاندا بردە سەر، ئاشکرایشە کە خودای لە ناو بۆری تاقیکردنەوەکاندا نەدۆزیوەتەوە، نازانم ئەگەر بە دوایشیدا وێڵ بووبێ و گەڕابێت. دایکم قانونی تەواو کردبوو لە شارەکەی خۆی، پاشان هاتبوویە نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ ئەوەی ماستەر لە بابەتەکەی خۆیدا بەدەست بهێنێ و پاشان بگەڕێتەوە، بەڵام لێرە باوکمی ناسی خۆشی ویست و هاوسەرگیریان کرد و هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، هەروەها ماستەری بە پایان گەیاند لە زانکۆی ئەمریکی لە واشنتۆن دی سی، بەڵام مۆڵەتی پارێزەری پێ نەدرا لە نیۆرک، لە بری ئەوە هەموو ژیانی لە دادگادا کاری کرد، پێم وایە زۆری دەربارەی ئەو ناهەقیە دەزانی کە لە جیهاندا بوونی هەیە بەشێوەیەک کە ناتوانرێت باوەڕ بە خودایەک بهێنرێت کە باوەڕدارەکان بە ئەو پێ دەڵێن دادپەروەرە.

ئەو هەرگیز ئەوەی نەگووت، بەڵام من بەو شێوەیە هەستم پێی کرد.

لایەنگری هیچ ئاینێک و پەیڕەو کردنی لە ماڵی ئێمەدا بوونی نەبوو، دایک و بابیشم زۆر بە ئاسایی گۆشتی بەراز و شەرابیان دەخواردەوە، ئەمن

لە تەمەنی هەژدە ساڵیمدا بووم کاتێک زانیم موسوڵمانەکان شەراب ناخۆنەوە و گۆشتی بەراز ناخۆن، تەنانەت ئەو گۆشتەیشی کە دەیخۆن دەبێت بە شێوەیەکی دیاریکراو بە خۆیان سەر بڕابێت.

ئەوەم کاتێک پێ زانی کە بابم هەندێک میوانی عەرەب و موسوڵمانی هێنایەماڵەوە بۆ بۆنەیەک، ئەوەم زۆر بە نا مەنتیقییانە دەبینی... دایکم پێی گووتم شتەکە پەیوەندی بە (شارستانیەتەوە) هەیە و بەس، هەروەها رێک وەک (نەخواردنی گۆشتی مانگایە لە لایەن هیندۆسەکانەوە). شتەکەش لەو خاڵەدا بڕایەوە.

ئاهەنگی سەریساڵی تازەمان دەگێرا بە بێ ڕۆیشتن بۆ کەنیسە، تەنها ئاهەنگ گێڕان وەک بەشێک لەو شارستانیەتەی کە من تێیدا لە دایک بووم و گەورە بووم، هەروەها ئاهەنگی ڕۆژی سوپاسگوزاریمان دەگێڕا، ئێمە بە تەواوی ئەمریکی بووین. لە بارەی جەژنی موسوڵمانەکانەوە زانیاریم نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە دایک و باوکم پەیوەندیان بە هەندێک ناسرا و خزم و کەس دەکرد و هەندێک کارتی پیرۆزبایی و جەژنانەیان بە دەست دەگەیشت. وە بیرم نایەت کە هیچ یەکیان مۆڵەتێکی وەرگرتبێت لە کارەکەی یاخود ئاهەنگێکی دیاریکراوی گێڕا بێت لە ماڵدا. ئەوە تەنها بەشێک بوو لە ڕابردوو کە هەندێک موجامەلەیان لە نێوان یەکتریدا دەکرد، نە پتر و نە کەمتر.

تەنها یەک سومبول و ئاماژەی ئاینی هەبوو لە ماڵی ئێمەدا. من بۆ چەند ساڵێکیش هەرگیز بە ئاماژەی ئاینیم دانەنابوو.

کتێبێکی پیرۆزی موسوڵمانەکان بوو، قورئان، لە کۆتایدا هەر کتێبێک بوو، وەک کتێبی بنچینەی جۆرەکانی داروین کە لە هەمان ڕەفەدا لە تەک ئەو هەبوو..

بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز بابەتێک بوو بۆخۆی.

ڕێــک لــە ناوەڕاســتدا بــوو، بــە شــێوەیەک دانرابــوو کــە بەرگــە زەخرەفەکراوەکەی لە پێشەوە بوو، بە پێچەوانەی کتێبەکانی دیکەوە کە بێجگە بەشی شانەکانی لە لاوەوە هیچی دیکە نەدەبینرا.

(شتێکی تەنها شارستانیانەیە) ئاوا بیرم کردەوە، هەر بەو شێوەیەش ڕاڤەم کرد. نازانم کە ئاخۆ دایکم هەر بە ڕاستی ئەمەی گووتبێ یاخود من شتەکەم لەسەر ئەو گۆشتە هەژمار کرد کە موسوڵمانەکان نایخۆن. بیرم کردەوە کە شێوازی دانانی کتێبەکە (بە جیاوازتر) ئەو بەشە ماوەیەیە لەو شارستانیەتەی کە وا لە موسوڵمانەکان دەکات شەراب نەنۆشن و گۆشتی بەراز نەخۆن.

لەو کتێبخانەیەی کە ئەو کتێبەی بەو جۆرە لێ دانرابوو، هەروەها لە ڕەفەی یەکەمیشدا هەندێک پەرداخی شەراب هەبوون کە پێویست بوو بە پێی ئەو کتێبەی لەسەرەوەیە قەدەغەکراو بێت.

یەکێک لە میوانەکان کە گۆشتی نەدەخوارد تەنها بەو شێوەیە نەبێت کە بە دیاریکراویی ڕەخنەی لە هەبوونی قورئان و پەرداخی شەرابەکان گرت لە هەمان کتێبخانەدا.

دایک و بابم بە شەرمەزاریەکەوە زەردەخەنیان کرد.

(شتەکە هەر پەیوەندی بە شارستانیەوە هەیە).

هەر بۆیە زۆر سەمەرە بوو کاتێک لە دوای چەند ساڵانی زۆر زانیم کە بابم دەڕوات بۆ نوێژی هەینیان لە مزگەوت.

ئەوەم بە ڕێکەوت زانی، کە لە شەقامی ڤۆڵتنندا پیاسەم دەکرد لە برۆکلین و بینیم کە لەگەڵ کۆمەڵێک باوەڕداردا دێتە دەرێ، ئەوە نابێت ڕێکەوت بێت، ئەو شەقامەکەی دەبڕی و کڵاوێکی سپی کردبوویە سەریەوە.

نەک هەر بە ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت شۆک بووبوم.

بەڵکو تەنانەت بەو ڕاستیەش کە ڕێک لەو کۆمەڵەیە دەچوو کە لە دەرەوەی مزگەوت لە تەکیاندا بوو. بە ڕوخساریەوە، بە ڕەگی پێستیەوە، بە ڕووکاری دەموچاویەوە.

من هەرگیز پێشووتر سەرنجی ئەوەم نەدابوو.

خاترجەم بووم کە ئەو خۆی بوو نەوەک کەسێکی دیکە کە لەو بچێ، هەروەک چۆن هەوڵمدا کە خۆم قایل بکەم.

زۆر بە توندیەوە پرسیارم لە دایکم کرد لەو بارەیەوە: ئەرێ، دەچێتە نوێژی جومعان، چیت بەسەریەوە داوە؟

ئەوە هیچ کات شتێکی شارستانی نەبوو، بیرم کردەوە... پێ دەچێ ئەوە تەنگوچەڵەمەی نیوەی تەمەنی دواکەوتووی بێت...

یاخود تەنگوچەڵەمەی کۆتایی تەمەن، لەوانەیە.

◆ ◆ ◆

لە جێگەدا بووین، من و کریستن و کۆپەر، کە هەموو کات سوور بوو لەسەر ئەوەی لە تەکماندا بخەوێت چونکە گوێی بە ڕازینەبوونەکانم بۆ ئەوە نەدەدا.

کریستین جگەرە هەمیشەییەکەی داگیرساند، کاتێک من لێم پرسی و تەماشای بنمیچەکەم دەکرد: بۆچی خەڵک هێشتا باوەڕ بە خودا دێنن؟

کرسیتین هەناسەیەکی قوڵی لە جگەرەکە دا، من تەنها دەنگیم بیست، بەڵام چاوم لە بنمیچەکە لانەدابوو.

گووتی: هێشتا خەڵک باوەڕ بە خودا دێنن چونکە هێشتا پێویستیان پێیەتی.

ئەوەی گووت و دوکەڵی جگەرەکەی دایەوە دەرێ، تۆپە دووکەڵاویەکانم دیت کە بەرچاومیان لێڵ دەکرد لە بینینی بنمیچەکە.

مەبەستت چییە لە پێویست بوونیان بەوە؟ بۆچی دەبێت حەوجێ هەبێت بەو؟ چیدی ئێمە لە ئەشکەوتەکان ناژین کریستین، ئەوەم پێ گووت.

هەندێ تۆپی دوکەڵی دیکەیشی دەرکرد، تۆپەکان لەبەردەم مندا مەلـەیان دەکـرد و پـێش ئـەوە وەلاکـەون دوبـارە دواو و گـووتی: شـتەکە زۆر لەمـە ئاڵۆزترە...

هەستم دەکرد کە تۆپی دوکەڵەکان ڕاڤەی ئەوەن کە مەبەستیەتی.

بە نیسبەت منەوە بابەتەکە هەمووی بوو، بابـەتی بـاوەڕ بـوون بـە خـودا، وەک تۆپـەکانی کریسـتین، بـە زووی و خێرایـی نامێنێـت... بـە هۆکارێـک لـە هۆکارەکان باوەڕەکە نەدەڕۆیشت.

پێم گووت: تا چەندێک ئاڵۆز؟ حەوجێ بە پاڵپشـت و گۆپـاڵی دەروونـی؟ ئەمە زۆر بەو شێوەیە ئاڵۆز نییە..

لـە جێگەکـەدا هەسـتا و دەیگـوت: نـا.. زۆر لـەوەش ئـاڵۆزترە، ئـەرێ، پاڵپشتی دەروونی ئاشکرایە کـە ئـارامی دەسـتەبەر دەکـات، بـەڵام ڕێـک وەک لووتکەی شاخێکی بەفرینە، زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە ئێوەی (بێ باوەڕی)ی نـوێ پێشبینی دەکەن، ئەوەی بە گاڵتەجاڕیەکەوە گووت.

(مەبەستت چییە؟) بە سەرسوڕمانەوە لەئاوازی گوفتارەکەی گووتم.

گووتی: تۆ وادەزانیت کە من بەستراوم بە ئاینەوە یـاخود بـاوەڕدار نیمـە، بەڵام دیارە کە مێشـکی مرۆڤایـەتی لەسـەر بـاوەڕبوون بـە شـتێکی بـەدەر لـە سروشتی و ئاسایی بەرنامەڕێژکراوە، یـاخود بـا بێـژین کـە لایـەنگیری ڕوون و ئاشکرا لە گۆڕێدایە لەناو نەست و پرۆسەی درک کردندا کە بە گشتی ڕێگـای باوەڕبـەخۆبوون ئاسـان دەکات...زۆربـەی خوێندنگـەکانی ئێسـتە ئـەوە دڵنیـا دەکەنەوە.

پێم گووت: ئایا ناکرێت ئەوە لـە ئـەنجامی پرۆسـەی پەرەسـەندنەوە ڕووی دابـێ؟ واتـە مـرۆ پێویسـتیان بـەم هەسـتانە هـەبووە لـە مـاوەی پرۆسـەی پەرەسەندیان لە وەچەکانیاندا، هەروەها کـاتێکیش کـە ئـەوان لـە دارسـتان و ئەشـکەوتەکاندا ژیانیـان بەسـەر دەبـرد، ئایـا پێویسـتیان بـە پاڵپشـتێکی دەروونی هەبووە؟

بە تاوێک وەڵامی دایەوە: ئەرێ.. پێ دەچێ، دەشێت هێشتاش پێویستیان بەمە بێت هەتاوەکو ئەو هەستانە زاڵ و سەرپێ بن.. پاشان، ئەی بەڕێز داوکنز، ئایا نابینیت کە تیۆری گەشەسەندن لە باوەڕبوون بە خوداوە تێوەگلاوە؟ئایا لێرەدا و لەم بارودۆخەدا هەبوونی باوەڕ وەک هەبوونی دەست و لاقانمان چوونیەک نابێت!! وەک ئەوەی کە لە پرۆسەی پەرەسەندنەوە وەدەرکەوتبێت وەک چۆن بەشەکانی جەستەمان لەو پرۆسەیەوە دروست بووە و دەرکەتووە.

ئەو ئاماژەی بە ریتشارد داوکنز دەکرد، بیرمەندی بێ باوەڕی بەناوبانگ کە تیۆری گەشەسەندنی کردووە بە ئاینێک و باوەڕی پێ هێناوە، منیش کتێبەکانیم لە لای خۆم دانابوو وەک ئەوەی کتێبی پیرۆزم بن.

ئەو بێ باوەڕێکی زۆر توند بوو، منیش هەموو جاران ڕامدەگەیاند کە لایەنگیری بیروبۆچوونەکانی ئەوم... ئەو وەک پێغەمبەر وابوو بۆ بێ باوەڕەکان، منیش خۆم بە یەکێک لەوان دەزانی.

کریستین چوویە گەرماوەکەوە، گوێم لە دەنگی دوشی ئاوەکەوە بوو کە دەهاتە خوارێ. کەمێک دواتر بەر گوێم کەوت کە بە دەنگێکی بەرز گووتی: بێگومان تۆ دەزانی کە ئێوە بەڕاستی وەڵامەکانتان پێ نادرێتەوە، هەروەها وەڵامەکانی ئاینیش دەکرێ قایلکەر نەبێت بۆ من و تۆیش، بەڵام بە لایەنی کەمەوە وەڵام پێشکەش دەکات.. ئەمەش دەبێتە خاڵێک بۆی.

پرسیم: چ وەڵامێک؟

سەری لە حەمامەکەوە هێنایە دەرێ کە هێشتا پرچی وشک دەکردەوە: تو ئەو خودایە! پێم مەڵێ کە نازانیت مەبەستم چییە... پرسیاری ئێمە لە کوێوە هاتوین؟ هەموو شتێک لە کوێوە دەسی پێکردووە؟ مرۆ لە کوێوە وەدەرکەوتووە و هاتووە؟!

وەک ئەوەی کە لەسەر ئەو پرسیارانە ڕاهاتبێ گووتم پێی: ئێمە لە تەقینەوە مەزنەکەوە دەستمان پێکردووە ئەو کاتەی کە کات تێیدا دەستی

پێکردووه، ماددەش لەم تەقینەوەیەوە وەدەرکەوتووە، کارلێکی زۆر ڕوویداوە، پاشان لە دوای ئەوەوە پەرەسەندن و پێشکەوتنی بەسەردا هاتووە.

گوێم لە دەنگی توالێتەکە بوو کە بەتاڵ ئەبوویەوە.

پاشان گووتی: خۆت کە دەزانی وەک وابێت هیچت نەگووتبێ، وەڵامەکەت وەڵامی هیچ شتێک ناداتەوە و بێ کەڵکە.

- **بۆچی وەڵامی ناداتەوە؟؟ لە تەقینەوە مەزنەکەوە دەستمان پێکردووە.**

- باشە، ئەدی پێش ئەو چی بوو؟ ڕێک ئەم خاڵە، چی لە پێش ئەوەوە هەبوو؟.. کێ ئەو تەقینەوەی کردەوە... خۆ تەقینەوەکان هەر لە خۆوە ڕوو نادەن! ... لەوانەیە وەڵامەکانی ئاین ساوێلکانە بوبێت، بەڵام خۆ هەر وەڵامێک دەداتەوە، ئێوە هیچیشتان پێ نییە بۆ وەڵامدانەوە.. ئاین لەوانەیە چیرۆکێکی ساویلکانە بکاتە وەڵام، وەک فیلمە جوڵاوەکانی واڵت دیزنی، بەڵام چیرۆکەکە لە کۆتایدا پێکەوە بەستراوە، ئێوە خۆ ئەوەشتان نییە، هەر هەندێک دیمەنی بێدەنگ پێشکەش دەکەن نەوەک پێکەوە بەستراو.. تەنانەت ڕەتی دەکەنەوە کە پرسیارە ڕاستیەکەش ببینن: کێ دەستی پێکرد؟

کۆپەر وەڕی وەک ئەوەی گوفتارەکانی ئەو بە ڕاست بخاتەوە.

پاشان گڵۆپەکەی لای خۆی کوژاندەوە.

پێ دەچێ نوستبێت.

بەڵام من.. هەر خەریک بومم بەملا و بەولادا تەپاوتلم دەدا.

کێ دەستی بەمە کرد؟

◆◆◆

From: amjadhelwani@bilalmovie.org
To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com
subject:بیلال باوەڕ دەهێنێت

چیرۆکێک نییە بۆ باوەڕهێنانی بیلال.

زۆربەی ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا بۆ یەکەم جار لەو کاتەدا بۆ هەر یەکێکیان چیرۆکی باوەڕهێنان هەیە..

بیلال چیرۆکێکی لەو شێوەیەی نییە.

نەک لەبەر ئەوەی کە باوەڕهێنانی گرنگ نەبووە.

بەڵکو ئەگەر دەربڕینەکەی ڕاست بکەینەوە ئەوە لەبەر ئەوەبو کە باوەڕهێنانەکەی بەبێ هیچ دراما و چاوەڕوانیەک بوو.

باوەڕهێنانەکەی ڕاستەخۆ بوو.. بە بێ ململانێی ناوەکی، وەک ئەو ململانێیانەی کە وای لەوانی دیکە کرد کە چیرۆکیان هەبێت، چیرۆکی دەرچوون لە بیروبۆچونە کۆنەکانیان و، باوەڕهێنانیان بە بیروبۆچونێکی نوێ...

بەڵام بابەتەکە لە لای بیلال زۆر لەوە ئاسانتر بوو..

وەک ئەوەی ماوەیەکی زۆر بێت کە چاوەڕێی ئەو ساتەی کردبێت.

بە لایەنی کەمەوە بەڵگەنامەیەکی مێژووی ئەمەی بۆ ڕاگوێزاوین لەو بارەیەوە..

"وضینی کوڕیعطاءگووتی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) و ئەبو بەکر لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە، لە کاتێکدا ئەوان بەو شێوەیە بوون بیلال بە لایاندا تێپەڕی کە مەڕوماڵاتەکانی عەبدوڵای کوڕی جدعانی دەلەوەڕاند، بیلال یەکێک بوو لە بەردەکانی ئەو لە مەککە. گووتی: عەبدوڵای کوڕی جدعان لە مەککەدا خاوەنی سەد بەردە بوو، کاتێک خودای گەورە پیغەمبەرەکەی (درودی خودای لەیەر بێت) نارد، ئەو فەرمانی دا کە

هـەموويان لـە مەككـە دەربچـن تـەنها بـيلال نـەبێت كـە مەڕومالآتـەكانی بـۆ دەلەوەڕاند، پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) لە ئەشكەوتەكەوە سـەری دەرپەڕاند و گووتی: ئەی شوان.. شیر هەیە؟ بیلالیش گووتی: تـەنها بـزنێكم هەیە، ئەگەر ویستان ئەوڕۆ لـە شـیرەكەیتان دەدەمـێ، پاشـان گـووتی: ئـەی غولآم ئایا موسولْمان نابیـت؟، ئـەویش هاتـە لای پێغەمبـەر( درودی خـودای لەسـەر بێـت) و موسـولْمانبوونی خـۆی ڕاگەیانـد و گـووتی: موسـولْمانبوونی خـۆت بشـارەوە و لێـی بێـدەنگ بـە. ئـەویش وای كـرد. پاشـان بـە مەڕومالآتەكەیەوە پشتی هەلْكرد وملی ڕێگای گرتەوە بەر."

هەر بەم سادەییە ڕوویدا.

بەلآم شتێك نییـە هـەر بـەو ئاسـانیە ڕووبـدات، بـە تـەنها ئاینێـك بخەیتـە پێش كەسێكەوە و قایل ببێت، بەلآم دەكرێ زۆر لەوە قولْتر بێت...

لێـرەدا ئـەوەلْ شـت هەیـە كـە ناتوانرێـت ئەگەرەكـەی چاوپۆشـی بكـەین، ئەویش ئەوەیە كە دایكی بیلال (حەمامە) خەلْكی حەبەشە بووە، حەبەشـەیش زۆربـەی دانیشـتوانەكی پـەیڕەوی ئـاینی مەسـیحیەت دەكـەن، نـازانین كـەی حەمامە دورخراوەتەوە و هۆكاری دورخرانەوەكەیشی چۆنـایی بـووە، هـەروەها بەردەكان ناچار دەكرێن كە ئاینەكەیان بگۆڕن كاتێـك دوردەخرێنـەوە، بـەلآم دەشێ كە دلْی حەمامە هەر بە ڕێبازێكەوە مابێتەوە كە باوەڕیـان بـە خـودای تاقانە هەیە، نە بە پەیكەر و بتەكان كـە بـە هینـدەی ڕۆژەكـانی سـالْ بوونـە وەك ئەوەی عەرەب لەو كاتەدا دەیانكرد... هـەروەها لەوانەیـە هەنـدێك شـتی بۆ بیلال ڕاگوێزابێت لەو بارەیەوە.. لەوانەیە هەنـدیك شـتی بـە بیـرو هۆشـیدا چرپاندبێت لـە بـارەی خـودای تاقانـە و ڕاستەقینە لـە بەرامبـەر ئـەو هـەموو خوداوەندە زۆر و بۆر و نادروست و ناڕاستیانەوە..

لەوانەیە هەر خۆی بەو فیترەتە پاکەی، بە بەڵگە نەویستییەکەی، گەمژەیی بت پەرەستی بۆ دەرکەوتبێت..

لەوانەیە وێنەی بەردایەتی خۆی وای کردبێت کە هەست بەو هەموو زوڵمە بکات لە ناو سیستەمی بت پەرەستیدا... خۆ ئەگەر خوداوەندەکان راستەقین بونایە بەو خراپییە نە ئەبوو..

ئەگەر بتەکان باش بوونایە ئەوە بە هەبوونی بەردە قایل نە ئەبوون و نەیاندەهێشت بەو شێوەیە بێت...

شتێک لە ناخی بیلالدا وای لێکردووە کە زۆر بە خێرایی بە بیرۆکەی توڕدانی هەموو ئەو بتانە قایل ببێت و، باوەڕ بە تەنها خودایەکی تاقانە بهێنێت...

♦ ♦ ♦

ئایا ئاینە نوێیەکە توڕدانی سیستەمی بەردایەتی لە خۆدەگرێت؟ نا.

ئەو ماوەیە سەرەتای ئاینە نوێیەکە و زانیاریەکانی بوو، هەموو ئەوەی کە وجودی هەبوو لە کتێبە پیرۆزەکەی موسوڵمانەکاندا لەو ماوەیەدا لە چەند ئایەتێک تێنەدەپەڕی، شتێکیش نەبوو کە ئاماژە بێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی بەردایەتی.

ئەدی بۆ بیلال بە سیستەمێکی دیکە قایل دەبێت، کە هەر وەک بەردەیەک دەیهێڵێتەوە؟

بەڵام داخۆ ئەگەر ئەو ئاینە ئازادی بۆ فەراهەم بکردایە ئایا بە ڕاستی باوەری پێ دەهێنا؟

ئەوکاتە، باوەڕهێنانەکەی تەنها لەبەر ئازادبوونی دەبوو.. تەنها لەبەر ئەو بۆشاییە کەسیە دەبوو..

ئەو کاتە هەموو بەردەکان باوەڕیان بە ئاینە نوێیەکە دەهێنا، تەنانەت ئەگەر لە بیرۆکەی ئاینە نوێیەکە تێنەگەیشتنایە، تاقانەپەرستی... ئەوان لە

پەرەستنی بت و پەیکەرەکان خۆیان قوتار دەکرد تەنها لە پێناو وەچنگ کەوتنی ئازادیەکەیان.. پاشان بت پەرەستی دەگەڕایەوە سەرلەنوێ لە دوای مەودایەکی زۆر کورت بە شێوەیەکی نوێ...

ئەوی کات هەموو سەرکردەکانیش لە تەک ئاینە نوێیەکەدا هەڵوێستەیان دەبوو تەنها لە پێناو بەرگری کردن لە موڵک و بەردەکانیان.. نەک لەبەر هەڵوێستەیان لەتەک بیرۆکەی تاقانەپەرەستی...

ناوەخن و کرۆکی ئاینە نوێیەکە باوەڕهێنان بوو بە خودای تاقانە.. ئەوەش لە لای عەرەبەکان پیشبڕکێیەکی مەزن بوو، ئەوان چەند هۆزێکی جیاکراوە بوون لە یەک دی، هەر هۆزێک بتی دڵخوازی خۆی هەبوو لەگەڵ هەندێکی دیکەی یارمەتیدەر، ئەوەش سەرەڕای هەندێک بتی هاوبەش لە نێوان هەندێک لە هۆزەکان، هەمووشیان لە لای کەعبەوە ڕیزکرابوون، ئەو ماڵە پیرۆزەی کە هەموو هۆزانی عەرەب بۆ حەج کردن دەهاتنە ئەوێ، ژمارەی هەموو بتەکان دەگەیشتە سێ سەد و شەست بت و پەیکەر، جیاواز لە گرنگی...

خۆڕزگارکردن لەوژمارە زۆرەی بتەکان لە هۆش و بیری عەرەبەکان کارێکی هەروەها ئاسان نەبوو، هەروەها هێنانە ناوەوەی بابەتی ئازادکردنی بەردە بەو زووانە بابەتێکی زۆر ئاڵۆز بوو بۆ ئەو بارودۆخە. لەوانەشە ببوایەتە ڕێگریەکی زۆر گەورە...

هەر بۆیە، ئاینە نوێیەکە، بە لایەنی کەمەوە لەو سەرەتا زووەوە، زۆر گوێی بە بابەتی بەردەکان نەداوە...

لە تەک ئەوەیشدا بیلال باوەڕی هێنا...

بەڵام شتێک، لە نێو ئاینە نوییەکە، لە سەرەتاوە هەر ڕوون و ئاشکرا بوو..

دەشێ کە سەرنجی بیلالی ڕاکێشا بێت.

ئاینە نوێیەکە هەموو کەسێکی کردبووەیە بەندە..

هەمووی!... هەموو گەورەکانی مەککە، هەموو سەرۆک و زەنگین و بازرگان و گەورەکان... هەمووی.

هەمووی، تەنانەت پێغەمبەری ئاینە نوێکەیش ( درودی خودای لەسەر بێت)، ئەویش بوبویە بەندە بە پێی ئەو زانیاری و سروشانەی کە بۆی هاتبوونە خوارێ...

چلۆن؟

ئەوە بەندایەتیە بە واتایەکی نوێ، ئەم جارەیان سروشتی پەیوەندیەک دەبێت لەگەڵ خودای تاک..

هەموو مرۆڤایەتی یەکسان دەبن لە پەیوەندیەکەیان لەگەڵ خودای تاک و تەنها، دەبن بە بەندەی ئەو..

کاتێک خاوەن و بەردەکەی یەکسان دەبن لە پەیوەندیەکەیان لەتەک ئەو خودایەی دەیپەرستن و، دەبن بە بەندەی...

هەر دەبێ پەیوەندیەکەی نێوانیان بگۆڕێت.

دەشێ شتێکی هاوشێوەی ئەوە بە بیرو هۆشی بیلالدا گوزەری کردبێت.

◆◆◆

کەواتە بڕیاری باوەڕهێنان بەو شێوەیە هاتووە کە وا دەردەکەوێ ڕاستەخۆ بوبێت..

بەڵام وەک دیارە کە زۆر لە ئەوڵ سەرنج قوڵترە.

سەرەڕای ئەوە، زۆر دوورە کە بیلال، لە ساتی قایل بوونی بە ئیسلام، ئەوەش کە بە گوێرەی موسوڵمانانەوە ساتی دەربڕینی هەردوو شەهادەکەیە (اشهد ان لا الـه الا اللّٰه و ان محمدا عبده و رسوله: شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەک نییە جگە خودای تاقانە و موحەمەدیش بەندە و

پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت)ی ئەوە)، زانیبێتی کە خۆی بە چییەوە تێوەگلاندووە.

زۆر دوورە کە بیلال لەو ساتەدا زانیبێتی، کە مێژووی بەم ئاینە نوێیە دەگۆڕدێت..

هەروەها لەوەش کە ئەو تێگەیشتبێت، لەو ساتە زووەدا، کە ئەو دەستێکی بالای دەبێت لەو گۆڕانەدا و، دەچێتە ناو مێژووەوە، بە لێهاتووی و بەهرەکەیەوە.

◆◆◆

بیلال دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو.

ئەمەش بێ شک وای لە خاوەنەکەی (ئومەیە) دەکرد کە داوای لێبکات گۆرانی بلێت، هەروەها بۆ ئەوانەشی کە لە گەلی بوون لە سەرۆک هۆز و بەرەبابەکان، ئەمەش سەرەڕای هەموو ئەو ئەرکانەی دی کە هەر بەردەیەکی دیکە هەیەتی لە شوانی مەڕومالات و کارە ئاساییەکانی ماڵەوە.

هیچ شتێک نازانین دەربارەی ئەو گۆرانیانەی کە بیلال دەیچڕین... بە داخەوە کە ئەرشیفێکمان لەو بارەیەوە بۆ نەماوەتەوە.

بەڵام دەزانین کە ئەو دەنگێکی خۆشی هەبووە و وشە و دەربڕینەکانی هەستی دەبزواند.

ئەوە ئەو بەهرەیە بوو کە بیلال لە قورگ هەستەکانیدا هەڵی گرتبوو، بەڵام بە ئەگەری زۆرەوە دەبێت درکی بە بەهرەکەی خۆی نەکردبێت ئەو ڕۆژەی باوەڕی هێنا، ئەو ڕۆژەی کە شایەتوومانی گووت و بتەکانی ڕەت کردەوە، کە بەهرەکەی زۆر بە زووی دەیکاتە پلە بەرزەکانەوە لە ئاستێکی گرنگدا....

پاشانیش دەیخاتە مێژووەوە...

له عەبدوڵاوە دەگێڕنەوە دەڵێت: ئەوانەی کە موسوڵمانبوونیان ڕاگەیاند حەوت بوونە، پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) ئەبوبەکر، عمار، دایکیشی سومەیە، سوهەیب، بیلال هەروەها میقدادیش.

ئەوەی کە باوەڕ بهێنی شتێکە و... ئەوەیش کە باوەڕەکەی ڕابگەیەنێت شتێکی دیکە... بە تایبەت ئەو دەمەی ئەو ئاین و باوەڕە لە ژێر هەڕەشە و ڕووبەڕووبوونەوەدا بێت... هەروەها بە تایبەتتر کە بەردەیەک بیت لە لای کەسێک کە باوەری بە بت پەرەستیەوە و نەک هەر خاوەنتە، بەڵکو پێشی وایە کە تۆ لەسەر فەرمان و داخوازی ئەو هاتوویتەتە دونیا و لە دایک بوویت، بۆ زیادکردنی برێکی دیکە لە قازانج بۆ سەر سامانەکەی...

دەکرا ئەم باوەڕە لە دڵی بیلالدا بمێنێتەوە بۆ خۆ وەدوورخستن لەوەی کە دەکرێ ڕوویدات.

بەڵام دوو شت هانی بیلالیان دا کە ببێتە یەکێک لەو حەوت کەسەی کە باوەڕەکیان ئاشکرا کردووە.. هەروەها لە کاتێکی زۆر قورس و زوودا بانگەوازیان بۆ کردووە...

بەهرەکەی بیلال لە دەنگیدا بوو، لەوەی کە بە دەنگێکی ناوازە ئەوە بڵێت کە هەستی پێ دەکات، لەوەی کە دەری ببڕێت.

پاشان باوەڕهێنان هاتە گۆڕێ، دەشبوو کە بیشارێتەوە.

پێ دەچێ ئەوە زۆر گرانتر و قورستر بوبێت لەو بەردەی کە دواتر لە سەر سینگی دایدەنێن بە هۆی ئەشکەنجەدانەوە، ئەو قوڕگە داخراوە ئازاری دەدا وەک چۆن ئەو بەردە ئازاری دەدا.

ئەو ژێیەکانی دەنگی وەک قامچی لێی دەدا: بیڵێ! باوەڕەکەت وەدەرخە! لە ڕێگەی قوڕگتەوە ئەوەی ناو دڵت بخە سەر زارت! ئەو باوەڕەیان پێ بێژە کە دڵتی داگیر کردووە... ئەو پێویست بوو کە باوەڕەکەی ئاشکرا بکات.. ئەوەی کە بەهرەیەکی هەبێت ئەوا کەمێکی فیڵی لێدەکات تاوەکو ڕێگری

لێبکات له دەربڕینی ئەوەی که باوەڕی پێی هەیه ئەگەر ئەمه دژی ئەوانه بێت که له چواردەوریدان.. بەڵام ئەوه بەڕاستی ئەشکەنجەیەکی ڕاستەقینه دەبێت.. زۆر گران دەبێت که لەسەری بەردەوام بێت، له داپۆشینی بەهرەکەی، له بێدەنگ کردنیدا...

مەبەستەکه بۆ هەموو بەهرەیەکه: وێنه کێشان، نوسین، گۆرانی ووتن..

هەر یەکێک خاوەنی بەهرەیەک بێت، به بێ ئەوەی باوەڕی به شتێکی دیاریکراو بێت، زۆر ئاسان دەبێت بۆی که هەر شتێک که هەوادار و لایەنگرانی بیانهەوێت دەری ببڕێت.. ئەوەی که له بیروبۆچونەکانی نەترسێت.

بەڵام ئەوەی که بەهرەیەکی هەبێت و له تەکیدا بابەتێکیش بوونی هەبێت، ئەوه زۆر لەسەری گران دەبێت که ئەو بابەته به بەهرەکەی دەرنەخات... کێشمەمێشێکی ناوەکی یەکجار زۆر زۆری بۆ دروست دەبێت گەر هەوڵیدا بەهرەکەی بێدەنگ بکات. هەروەها کارەکه زۆر لەوەش گرانتر دەبێت ئەگەر هەوڵی ساختەکردنی دا... ئەگەر هەوڵی دا ناچاری بکات لەسەر وتنی پێچەوانەی ئەوەی که باوەڕی پێیەتی..

بیهێنه پێش چاوت له مەودای بێدەنگ بوونیدا، ناچار دەبێت فەرمانەکانی سەرۆکەکەی جێبەجێ بکات به گۆرانی گووتن، لەوانەیه گۆرانی بەسەر بتێک له بتەکاندا بێژێت، یاخود هەر شتێکی دیکەی بێ بایەخ لەو شتانەی که سەرخۆشان داوای دەکەن... ئەو قورگی یاخی دەبوو لێی، دەیەویست بێ دەنگی بکات.. لەوانەیه ئازاری دابێت، بیخنکێنیت... لەوانەیه هەوڵی دابێت که داوای لێبوردن له خاوەنەکەی بکات... به ڕاستی بێژێت که قورگی باش و تەواو نییه و، توانای گۆرانی گووتنی نییه.. لەوانەیه سەرۆکەکەی چەند جارانێک باوەڕی پێی کردبێت، له جارەکانی دیشدا به تەمبەڵیەوه خۆی له گێلی دابێت..

بەڵام هەرگیز پێشبینی ئەوەی نەکردووە کە ئەو قوڕگە چی دەشارێتەوە..
پێشبینی کێشمەکێشی دەروونی بیلالی نەکردووە...
ئاشکراکردنی باوەڕەکەی، حەوتەمی حەوتەکە بوو لە مەککە، ئەوەش ئەنجامی کۆتایی ئەو کێشمەکێش و ململانێ ناوەکییە بوو...

♦ ♦ ♦

نازانین کە چۆن باوەڕەکەی ئاشکرا کرد... ئایا ئاوازێک دەخوێنێت بە ئایەتەکانی قورئان؟ ئایا بە دەنگێکی زۆر خۆش شایەتوومان دەڵێتەوە؟ ئایا لە کاتی گووتنیدا بە ئاوازەوە دەیڵێ؟ ئایا پەرۆش بوو؟ ئایا دڵگران بوو؟ ئایا بە دڵخۆشیەوە دەیگووت؟

هیچ شتیک نازانین..

هیچ شتێک نازانین جگە ئەوەی لەوەی حەوتەمینی حەوتەکە باوەڕەکەی ئاشکرا کرد!

شتێکی دیکەش لەوانەیە هانی بیلالی دابێت لەسەر ئاشکراکردنی باوەڕەکەی..

عەرەب گۆرانیبێژە پیاوەکانیان دەچەوساندەوە... بە پیاوانی (ژنانی)ناوزەدیان دەکردن... پیاوەتیان کەمە و.. لاوازن.. چونکە گۆرانی گووتن تەنها بۆ مێیەکان بوو.. هەروەها ئافرەتیش لە لای عەرەب یەک قیچ سەروتر بوو لە پلەی بەردە.. بەڵام ئەوانیش لە دۆخێکی گاڵتەپێکردن و چەوسانەوەدا بوون..

عەرەبەکان چێژیان لە گۆرانی پیاوان وەردەگرت لە لایەن بەردە دەنگ خۆشەکانەوە... بەڵام ریسوایان دەکردن.. بە تەنها وەک ئامێرێکی چێژ وەرگرتنیان دادەنان.. ئامێرێکی چێژ وەرگرتن...

بیلال هەر تەنها لەبەر ئەوە نەدەچەوسێنرایەوە کە بەردەیە... بەڵکو لەبەر ئەوەیش کە وا ناوزەندیان دەکرد کە تەنها (کوڕی دایکیەتی)..

هەروەها بەهۆی بەهرەکەشیەوە..

هەروەها لە ناخی خۆیدا، وەک هەر کەسێکی خاوەن بەهرە، دەزانێت کە نابێت بەهرەکەی ببێتە هۆی بێ ڕێز و بە کەم سەیر کردنی...

ئایا کێشمەکێش لە ناخیدا هەبوو؟ ئایا پێیان وابوو کە لاوازە، لەبەر هێندەی کە گۆرانی دەگووت؟ لەبەر ئەوەی ئەو بەردەیەکە و گۆرانی دەبێژێت؟

باشە... کەواتە ئەم بەردە گۆرانیبێژە بۆیان دەسەلمێنێت کە لەوان بەهێزترە..

چیدی ناترسێت لێیان..

ئەو بە باوەڕەکەی ڕوبەڕویان دەبێتەوە... ئەو گۆرانیبێژە لاوازە دەیسەلمێنێت، کە کاتێک بەهرەکەی لەگەڵ باوەڕهێنان بە شتێک یەک دەگرێت، ئەوا مرۆیەک دێنێتە کاراوە کە لە هەموو پیاوان ڕەقتر و بەهێزتر و خۆڕاگرتر بێت...

هەر بۆیە باوەڕەکەی ئاشکرا کرد..

حەوتەمینی حەوتەکە، لە مەککە..

◆◆◆

## بیلالی حەبەشی

گوێم لێیان بوو کە باسی ئاینە نوێیەکەیان دەکەن.

من خەریک بەجێهێنانی هەندێ لە کارەکانی بەڕێز خاوەنەکەم ئومەیە بووم، چونە ژووری تاوەکو پێی بڵێم کە کاروانەکەی شام بۆ چەند ڕۆژێک دوادەکەون، بە پێی ئەوەی یەکێک لەوان کە کەمێک پێش ئێستە گەیشتبوویە مەککە گووتبووی، ئومەیەی گەورەم دڵخۆتەی هەبوو لە بارەی گەیشتنی کاروانەکە لە وادەی پێشبینی کراوی خۆی، پێی ڕاگەیاندم کە هەر شتێکم زانی لەو بارەیەوە خێرا و دەستبەجێ پێی ڕابگەیەنمەوە، کاتێکیش کاروانێکی دیکە گەیشت، کە ئەویش لە شامەوە دەهات، پرسیارم لێکردن یەکێک لەوان پێی ڕاگەیاندم کە لەسەرەتای شامەوە دیتونی، هەروەها نوێنەر و ڕێنوێنیکەری کاروانەکە توشی تا بووە و ئەوانیش چاوەڕێی نوێنەرێکی دیکە یان باشبوونەوەی ئەوەی خۆیان دەکەن.

گەورەکەم لە دارو نەدوە بوو، ئەو شوێنەی کە هەموو سەرگەورە و سەرۆک هۆزەکانی مەککە بە نزیکەیی هەموو ڕۆژێک تێیدا کۆدەبونەوە و، باسی شتەکانی مەککە و بازرگانیەکانی و ئەوەی تێیدا ڕوودەدات دەکرد، هەندێک کاتیش دەکەوتنە دەمەقرەوە لە نێوان پیاوێک لە یەکێک لە هۆزەکان و پیاویکی دیش لە هۆزێکی دیکە.

ئەوڕۆ کەشەکە زۆر ناهەموار بوو، خاوەنی دەسەڵات و حوکم، عەمری کوڕی هیشام دەنگی زۆر بەرز بوو، عوتبەی کوری ڕەبیعەش دەیەویست ئارامی بکاتەوە، ئەبو لەهەب زۆر بە شەرمەزاریەوە دەردەکەوت، ئەبوو سوفیانیش لە سوچێک دانیشتبوو چاودیری بارودۆخەکەی دەکرد، بەڵام سەرگەورەکەم ئومەیە بێدەنگ بوو متەقی لێوە نەدەهات.

عـەمری کـوڕی هیشـام قسـەکانی ڕووبـەڕوی ئەبولەهـەب دەکـردەوە بـە لۆمەکردنـەوە: برازاکـەت کێشـەی زۆرمـان بـۆ دروسـت دەکـات ئێمـە لـەو بێبەرین.. وەرزی حەجکردن نزیکە، هەموو هۆزەکانی عەرەب دین بۆ مەککە، ئەگـەر ئـەوەی دەیڵێـت دزە بکـاتە ناویـان و بـەوە بـزانن کـە نـەمانتوانیووە بێدەنگی بکەین ئەوە بە سوک دێینە پێش چاویان و ئابڕوومان دەچێ.

ئەبولەهـەب وەڵامـی دایـەوە: ئـەوە هـەموو ئەوەیـە کـە بەلاتـەوە گرنگـە!! سەروەری و سەربەرزیت لە بەرامبەر عـەرەب!! بەلاتـەوە گرنـگ نییـە کـە ئـەو سوکایەتی بە خوداکانی باو باپیرانمان دەکات!!

عــەمرو بــە خێرایــی گــووتی: ســەروەری ئێمــە لــە مەککــەدا بــەهۆی خوداکانەوەیە، بێ شک هەر شتێک بەسەر ئەواندا بێـت ئـەوە بەسـەر ئێمـەدا هاتووە.

ئەبوو سوفیان گووتی: تێبینیم کردووە کە هیشـتا ترسـناکی بابەتەکـەتان سـەرنج نـەیاوەتێ.. شـتەکە تـەنها پەیوەنـدی بـە سـەروەریمان یـاخود خوداکانمانەوە نییە.

عەمرۆ پڕی دایێ: ئایا لەوە زیاتر هەیە؟ چییە؟

ئەبوسوفیان گووتی: ئەوەی موحەمەد دەیڵێت،ئەگەر بڵاو ببێتەوە، مەککە هەر نامێنێ..

ئومەیەی سەر گەورەم سەری قایل بوونی لەقاند و گووتی: ڕاستت گوت، ئەوە بوو منیش لەفکرم دا بوو.

عوتبە گووتی: مەبەستت چییە ئەی ئەبوو سوفیان؟

ئەبوسـوفیان هەسـتایەوە بـە بـێ دەنگـی وەک ئـەوەی بیهـەوێ هـەموو وشەکانی خڕ بکاتەوە و هەموو تەماشاکردنەکانیش لەسەر ئەو بوون.

گەیشتە لای پەنجەرەکە و لێیەوە تەماشایەکی کەعبەی دەکرد: مەککە لەسەر بەیەکگەیشتنی کاروانەکان دەژیەت، ئەمە ژیانمانە، بازرگانی، ئەدی بۆچی کاروانەکان لە مەککەدا پێک دەگەن؟ لەبەر ئەوەی کەعبەی تێدایە، لە مەککەشدا هەموو بتەکانی عەرەبی تێدایە، هەموو عەرەب دێن بۆ مەککە بە خاتری بتەکانی، هەروەها لێرە شتومەکەکان ئاڵوێر دەکرێن و ئێمە دەیبەینەوە، مەککەش دەیباتەوە.

پاشان ئاوڕێکی دایەوە و گووتی: شتەکە ئاسانە، بت نەبێت لەمەککەدا، کەواتە هیچ عەرەبێکیش هاتوچۆی ناکات، بازرگانی نییە، قازانج نییە، مەککەش نییە.

مەککە نییە..

هەموویان ڕووخساریان تێک ترشاند.

ئەبو لەهەب کێشای بە سەری خۆیدا لە شەرمەزاری باس و خواسەی برازاکەی.

عوتبە گووتی: هێشتا کەمینەن، تاوەکو ئێستا لەسەر هیچ شتێک سوور و دڵنیا نین... پێویستی بەو هەموو دڵەخوتەیە نیە ئەی ئەبو سوفیان.

گەورەکەم ئومەیە گووتی: ئەرێ کەمینەن، بەڵام ناوبانگی موحەمەد بە باشی ڕۆیشتووە، هەروەها لە نەوەکانی هاشمە، یەک لە گرنگترین بەرەبابەکانی مەککە، خەڵکیش بە ڕاستگۆی دەستپاک ناوی دەبەن، هەروەها خێزانەکەیشی خەدیجە گەلێک زەنگینە و بێ سوچ و پەنا پشتگیری دەکات... هاوڕێیەکەیشی ئەبوبەکر بە هەمان شێوە، ناوبانگی ئەویش پاک و چاکە، لەولاشەوە زاواکەی وەرەقەی کوری نەوفەلە کە ئەویش بە هەمان شێوە پشتی دەگرێت... ئەدی ئەو پلەو پایەیەی کە لە مەککەدا هەیەتی و گومانی تێدا نییە.. هەموو ئەمانە ئەوەی کە موحەمەد بانگەوازی بۆ دەکات دەبێتە ریگری لەبەردەم هەندێک کەس.

بابەتەکە بێ شک ترسناکە وەک ئەوەی ئەبو سوفیان گووتی.. بابەتەکە تەنها سەروەری و سەربەرزی خۆمان یاخود خوداکانمان نییە.. بەڵکو بابەتەکە لە بنەڕەتدا پەیوەندی بە بوونی خۆمانەوەیە.

لە ناکاوێکدا ئاوڕی بۆ من دایەوە وەک ئەوەی ئەمێستاکە هەستی بە بوونم کردبێت: چیت دەوێت بیلال؟

نێزیک بوومەوە و چرپاندم بە گوێیدا لە بارەی دواکەوتنی کاروانەکەوە.

لە ڕوخساریدا بێزاری وەدەرکەوت و گووتی: نەفرت لەموحەمەد.. هەر بە ناوهێنانی خراپی خوداوەندەکان وای کرد کە کاروانەکە دوا بکەوێت.

♦♦♦

کەواتە کەسێک هەیە کە باس لە خودای تاقانە دەکات لە مەککەدا.

لە بارەی وەلانانی بتەکانەوە.

هیچ ڕۆژێک باوەڕم پێی نەهێناوە. لەوانەیە تەنها لەبەر ئەوە بێت کە دایکم هەندێک شتی پێ گووتم لە بارەی خودای تاکەوە، کە ناتوانرێت ببینرێت یاخود دەستی لێبدرێت... شتێک کە لە منداڵییەوە بۆی ماوەتەوە.. وەک ئەوەی کە ئەو خودا تاقانەیە خودایەک بێت کە هیچ کەسێک شایەنی پەرەستنی نەبێت جگە منداڵان پێش ئەوەی پیس ببن...

لەو ڕۆژەوە بە شێوەیەک سەیری بتەکان دەکەم کە باوەڕم پێیان نییە. کڕنۆشی بۆ دەبەم تەنها ئەو کاتەی لە تەک گەورەکەمم چونکە ئەو وادەکات.. هیچکات ڕووی نەداوە کە بە تەنها بوبێتم و نوێژم بۆ دابەستبێت.

کەواتە ئەو موحەمەدە، ئەوەی کە باسی خودای تاقانە دەکات.

هیچ کات مامەڵە و هەڵسوکەوتم لەگەڵی نەکردووە، بەڵام ئەو بە ئەمانەتپارێزیەکەی ناسراوە، هەر گەشتیارێک دەیەوێت شتێک لە مەککەدا جێبهێڵێت و بگەڕێتەوە و وەک خۆی بیدۆزێتەوە ئەوا لە لای ئەو جێیدێڵێ..

ئەو تەنها یەک بەردەی هەبوو، ناوی زەید بوو، خەدیجەی خێزانی بە دیاری دابووی پێی، ئەویش ئازادی کرد و پاشان گرتیە خۆی و کردی بە کوڕی خۆی.

ئای چەندە هیواخوازبوم ئومەیەش بەو شێوەیە بکات، ئای چەندە هەوڵمدا کە قایلی بکەم لە هەموو شتێکدا بۆ ئەوەی وەک کوڕێکی خۆی سەیرم بکات، هەموو شتێکم جێبەجێ دەکرد کە حەزی پێی دەبوو، دەستبەجێ دەمکردن، بەڵکو قایلی بکات..

ئەوەیش وای کردبوو کە مامەڵەکردنی باش بێت لەگەڵم، بێ شک، هەروەها وای لێهاتبوو کە زیاتر و زیاتر پشتی بە من دەبەست.. کاری ژمێریاری و داراییەکانی بە من دەسپارد.. خاترجەمم کە بەردەی دڵخوازی ئەو بوم.. ئەمن زۆر نزیک بووم لێیەوە، هیچ کات لێمی نەداوە.. نایەتەوە یادم کە هیچ کات ئەوەیکردبێت.. هەندێک کات زۆر بە توندی قسەی پێدەگوتم.. ئەوە هەموو شتێک بوو.. خۆ زۆریش خراپ نەبوو.

بەڵام... هەرگیز لەو باوەڕەدا نیم کە وەهای بیرکردبێتەوە کە ببێتە بابم.. من بەردە ڕەشەکەم.. هیچێ نیم جگە کارگوزارێک کە کارەکەی ڕادەپەڕێنێت.. هەروەها دەنگێکی زۆر خۆشی هەیە کە داخوازی لێدەکات لە ساتەکانی سەرخۆشبوونی و خۆش ڕابواردنی گۆرانی بۆ خۆی و هاوڕێکانی بێژێت..

بەڵام، لە لایەن منەوە، هەموو کات هەوڵم دەدا کە لە ئومەیەدا ئەو باوکە بەدی بکەم کە هەرگیز نەمناسیوە.

بە گشتی پەیوەندیەکی باوکانەی خەیاڵکراو بوو تەنها لە لایەنێکەوە.

من تەها بەردەیەک بووم بۆ ئومەیە.

◆ ◆ ◆

ئەمن ئەبوبەكرم دەناسی، هەروەها لە هێندێک بەردانم بیستبوون کە لە تەکی موحەممەددا دەچێتە شاخ لە دەرەوەی مەككەدا.

وام لێهاتبوو کە هەلم وەچنگ کەوتایە ڕانە مەڕەکانم دەبرد و بۆ ئەوێ دەچووم، کە ئەگەری هەبوو لەوێ بیاندۆزمەوە... موحەممەد و ئەبوبەکر..

ئومەیەی گەورەم وای دادەنا کە لەوەڕاندنی مەڕ و مالآت کارێکی نزمترە لە تواناکانی من، ئەو حەزی دەکرد کە لە بازرگانی و کاری ژمێریاریەکانی لەگەڵی بم... بەلآم من دەمگووت کە وەرزی حەج لە ڕێدایە و مەڕەکان دەبێت قەڵەو ببن و... من شوێنی باش پێ دەزانم لە نێوان شاخەکاندا کە پڕیەتی لە گژ و گیا..

ئەویش قایل بوو و لێم گەڕا کە مەڕەکان بلەوەڕێنم..

هەموو ڕۆژانێک دەڕۆیشتمە دەرێ بۆ شاخەکانی مەککە، بەڵکو موحەمەد و ئەبوبەکر وەدی بکەم..

دەنگم بەرزەوە دەکرد بە گۆرانی گووتنەوە، بەڵکو دەنگم وەخەبەریان بهێنێت لە هەبوونی کەسێک لەو ناوەدا..

لە ڕۆژی شەشەمدا بەڕاستی وەخەبەر هاتن..

ئەوان هاتن و داوای شیریان لە من کرد.

پێم دان و چاوەڕوان بووم لێیان شتێک بێژن کە من چاوەڕێیبیستنی بووم.

شیرەکەیان خواردەوە و بە ڕاستی پێیان گوتم..

پێشنیاری باوەڕهێنان بە خودای تاقانە و دەستبرداربوون لە هەموو بتەکانیان خستە پێشمەوە، هەروەها کە شایەتوومان بڵێم.. شایەتی دان بەوەی کە هیچ خودایەک نییە جگە خودای تاقانە و مەحەمەدیش بەندە و نێردراوی ئەوە..

پیش ئەوەی بیڵێم، پرسیم: شایەتی بدەم کە موحەمەد بەندە و نێردراوی ئەوە؟ موحەمەد بەندەیە؟ خۆ ئەو گەورەیەکی ئازادە.. چۆن دەبێتە بەندە؟

ئەبوبەکر وتی: هەموومان بەندەی خوداین.. هەموومان لەوەدا یەکسانین.. سپی پێست چاکتر نیە لە ڕەش پێست.

هەموومان بەندەین و یەکسان.

تێگەیشتم.

ئازادی من ئەوەیە کە لە بەردایەتی ئومەیە دەربچم ، بۆ ئەوەی ببمە بەندەی خودا..

بە سووربوونێکی زۆرەوە شایەتوومانم هێنا..

خودای تاک... بە بێ بتەکان..

هەمووشمان تەنها بەندەی خوداین.

♦ ♦ ♦

From:bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

To: amjadhelwani@bilalmovie.org

subject:پێشنیار

ڕێک کەوتین کە سیناریۆی فیلمەکە پێکەوە بنوسین.

ئەمە پێشنیاری منە.

لە هەمان ئەو دیمەنەی کە بیلال باوەڕ دێنێ، لە کاتێکدا مەڕەکان دەلەوەڕێنێ، گۆرانی دەچڕێ..

بە تەنها لە بیاباندا گۆرانی دەڵێت.. کەس گوێی لێوە نییە.. گۆرانیەکی خەمناک دەڵێت، ئەو باوکەی دەدوێنێت کە نەیناسیوە.. باس لە بارەی ڕەفتار و مامەڵەی خراپی ئەوانی دیکەوە دەکات لەگەڵیدا.. هەروەها پێی دەڵێت کە ئەگەر ئەو وجودی هەبوایە پێ دەچێ شتەکان بگۆڕایە..

گۆرانیەکی خەمناک، کە تێدا بیری ئازادییەک دەکات کە هیچ کات پێی ئاشنا نەبوو وەک ئاشنا نەبوونی بە باوکی... کە لە دوایدا دەیڵێت و، دەتوانیت دیمەنی باوەڕهێنانەکەی دابنێیت..

پێت چۆنە؟

♦♦♦

## لاتیشا

بیلال بەو نامەیەی منی کوشت.

هەر خۆم زۆر کاریگەر بووم بەوەی کە ئەمجەد نوسیبووی.. ئەم پیاوە زۆر باش دەنوسێت، وشەکانی و شیکاریەکانی لە بارەی باوەڕهێنانی بیلال (بیلالی حەبەشی) بە قەناعەتەوە، هەروەها دوور بوو لە ستریۆ تایپی ئامادەکراو.

هەروەها بیلال لە کەسێکی توندی دراماتیکیانە دەچێت، ئەگەر لە ناو ڕۆمانێکدا بوایە ئەوە بێ گومان دەبویە سومبولی ئازاد بوون لە بەردایەتی و کۆیلایەتی.

بە بێ باوک و، گۆرانیبێژێکی دەنگ خۆش، هەروەها زۆر بە توندی ئەشکەنجە دەدرێ لەبەر خاتری باوەڕەکەی.. کارێکی زۆر هەیە کە دەتوانرێت لەم کەسایەتیەوە دەربهێنرێت..

ئەوەی کە ئەمجەد دەینوسی من بە چاوی مامۆستایەک دەمخوێندەوە کە ڕاهاتبوو لەسەر ڕاستکردنەوەی ئەوەی کە قوتابیەکان دەیاننوسی. بە دڵنیاییەوە ئەمجەد A+ی وەردەگرت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە چاوی دایکەوە دەمخوێندەوە، لە هەوڵێ دا بووم کە پێشبینی ئەو کاریگەریە بکەم کە ئەمجەد بە نوسینەکانی دەیخاتە سەر کوڕەکەم... زۆربەی کات شتەکان ئیجابیانە بوون، نەمدەخواست کە نوسینەکان بگۆڕێت بە ڕیکلام و بانگەواز کردن بۆ ئیسلام، نا لەبەر هێندێ کە من دژی ئیسلام بم یاخود هەر شتێکی دیکە، بە پێچەوانەوە کەیفم بەوە دەهات کە بیلال هەندێک شت بزانێت دەربارەی ئاینی باوکی (ئەو باوکەی کە بە نزیکەیی هیچ شتێکی نەدەزانی لەبارەی ئاینەکەیەوە) بەڵام من تەنها حەزم بە قۆستنەوەی نەخۆشیەکەی بیلال بە هیچ لایەکدا نەدەکرد.

ئەوەی لەسەر بەهرە نوسیبووی زۆر گرنگ بوو، لەوانەشە وای لێکردبم کە لە فکری ئەوەدا بم چۆن بتوانم هانی بیلال بدەم لە گەڕانەوە بۆ نوسین لە ڕوبەڕوبونەوەی شێرپەنجەدا.

من لە بەیانی زوودا نامەکەم خوێندەوە کە لە شەودا ڕەوانە کرابوو، پێشووتر خوێندرابوویەوە، ئەمەش واتای ئەوەیە کە بیلال نامەکەی کردوەتەوە، هەروەها ئاماژەیەک هەبوو کە وەڵامی نامەکە درابێتەوە.

چومە ناو فایلی نامە نێردراوەکان، نامەکەی بیلال توشی شۆکی کردم، کوشتمی.

بیلال هەموو شتێکی جێهێشتووە، بۆ ئەوەی بیربکاتەوە کە بیلالی ئەسڵی گۆرانی دەڵێت (بە خەمناکیەوە) لە بارەی باوکیەوە کە هیچ کات نەیناسیەوە، بیلال باوکی دەوێت، هەموو ئەوانەی کە کردمن لە ڕۆڵبینینی دایک و باوک لە هەمان کاتدا بە کەڵک نەهات.

دەیهەوێت ئەو گۆرانیە بکاتە پێشەکی، بۆ ئەو شتانەی کە دواتر ڕوودەدەن...

بەشێک لە من ئازاری دەچەشت کاتێک بیری لە شکستەکان دەکردەوە.

لە دوای هەموو شتێک بیلال باوکی دەوێت. لە دوای هەموو شتێک کە هەوڵمدا بۆ کردنی، هێشتا هەر هەست بە پێویست بوونی باوکی دەکات.

بەشەکەی دیکەشم دڵتەنگ بوو بۆ ئەو، لەبەر بیلال..

بیلال دەیەوێت کە گۆرانیەک بچڕێت و بیکاتە دیاری بۆ باوکی، تێیدا ئەوەی پێ دەڵێت کە لە ناو مێشکیدا دەگوزەرێت.

داخۆ چی بێژێت، ئایا باسی شێرپەنجە دەکات؟ یاخود قوتابخانەکەی؟ یان ڕاگواستنمان بۆ برۆکلین؟ ئەدی چی دەبێژێت دەربارەی من؟ ئایا دەڵێت کە من بە شێوەیەکی باش هەوڵمداوە؟ ئایا داوای لیبوردنم لێدەکات؟

ئایا لێی دەپرسێت کە بۆچی ڕۆیشت و جێی هێشت؟

بۆچی ئەگەر بۆ یەک جاریش بێت هەوڵی نەدا کە ببینێت؟ نە تەنانەت پیرۆزبایکردنێکی جێژنانە لە جێژنی سەری ساڵدا... یان لە جێژنی لە دایک بوونیدا؟

بەڕاستی دەبێت گۆرانیەکی زۆر خەمناکانە بێت.

منداڵێکی توشبوو بە شێرپەنجە، بۆ ئەو باوکەی دەنوسێت کە هەرگیز نەیدیوە.

بەڕاستی پڕ بووم لە ئازار و توڕەیی و تێکشکان.

ژیان بە هیچ شێوەیەک دادپەروەر نییە.

◆ ◆ ◆

مستەر وید بانگی کردم بۆ ژوورەکەی.

زۆربەی کات شتەکە باش دەرناکەوێت.

لەو کاتەوەی کە هاتوومەتە ئەم قوتابخانە مستەر وید هیچ کات میهرەبان نەبووە لەگەڵم. هیچ کات دە هەوڵێ دا نەبووە کە وشەیەکی جوان یاخود گوفتارێکی ڕێک دەگەڵ مندا بێژێت. هەموو کات هەوڵی دەدا کە بەشێوەیەکی لە سنور دەرچوانە لە کارەکانم ورد ببێتەوە.

بچوکترین کێشە واتای ئەوەی دەگەیاند کە من دەبوو گوێبیستی وتارێک بم لە بارەی پیشەی ئەکادیمی و ناوبانگی قوتابخانە.

هیچ کات تەنەخییم (درێغی) لە هیچ شتێکدا نەکردووە، هەموو ئەوانەیشی کە بەسەرم دەهات بەسەر هەموانیشدا دەهات. دڵم ئارام دەبویەوە گەر ڕەگەزپەرستی کێشەکەی بوایە، بەڵام ئەوە بابەتەکە نەبوو، پەیوەندی نێوان ئەو و بۆبی زۆر باش بوو، هەروەها بە هەمان شێوە پەیوەندیکەیشی بە زۆرترین مامۆستای ژن و پیاوی ڕەش پێستەوە زۆر باش بوو.

ڕەنگی پێستم هیچ پەیوەندیەکی بە بابەتەکەوە نەبوو. بە کورتی و بە پوختی ئەو قایل و دڵشاد نەبوو بە من، پێ دەچێ لەبەر ئەوە بێت کە من زۆر بە بچوکتر لە تەمەندا دەزانێ لەوەی کە ببمە مامۆستایەک لە قوتابخانەکەی ئەو. لەوانەیە وای بینیبێ کە لاتیشای هاتوو لە سانت لویسەوە ناتوانێت مامۆستایەکی باش بێت لە قوتابخانەیەک لە برۆکلین-نیۆرک.

ڕۆیشتم بۆ ژوورەکەی، زەردەخەنەیەکی لەسەر ڕووخساری کێشابوو، دە فکرم هات کە دەشێت بابەتەکە زۆر لەوانەی پێشووتر ترسناکتر بێت.

مستەر وید گووتی: خاتوو لاتیشا، دەزانیت کە بارودۆخی ئێستات زۆر لەبەر چاو دەگرم، بڕوا ناکەم کە هاوکاریەکی لەوە گەورەتر بە هیچ کەسێکی دی بدرێت..

ئەو لەسەر حەق بوو، من هەموو مۆڵەتەکانی ساڵانەم لە نەخۆشیەکەی بیلالدا خەرج کردبوو، ئەگەر ووبی و ماگی و دیان هاوکارییان نەکردمایە ئەوە شتەکان هیچ بە باشی نەدەڕۆیشتن.

سەری قایل بوونم لەقاند و بە بێ دودڵیەوە گووتم: ئەرێ.. ڕاستە و من سوپاسی هەمووان دەکەم.

ئەمە پێشەکیەک بوو لە مستەر ویدەوە، بێ شک دەیهەوێت بابەتێکی دی بکاتەوە.

بە نزیکەیی زەردەخەنەکەی دیار نەما و گووتی: بەرگوێم کەوت کە دەتەوێت (جذور) کتێبی هەڵبژێردراوی قوتابیەکانت بێت؟

گووتم: نەخێر، نەک تەنها دەمەوێت، بەڵکو بەڕاستی لەگەڵ قوتابیەکاندا دەستمان بە خوێندنی جذور کردووە.

گووتی: خاتوو لاتیشا، کتێبی (جذور) هەرگیز پێشتر لە قوتابخانەدا نەخوێندراوە، هەروەها هیچ لەو کتێبە باوانە نییە کە بە قوتابی پۆلی دە بخوێندرێت.

وەڵامم دایەوە: ئایا شتێکی دیاریکراو هەیە کە ڕێگر بێت لە خوێندنی کتێبێک کە پێشتر نەخوێندرابێت؟

گووتی: نەخێر، بێ گومان ئەوە بابەتەکە نییە... بەڵام کتێبەکە گەلێک ئاستی بەرزە، لەوانەیە زۆر بەرزتر بێت بۆ پۆلی دە.

وەڵامم دایەوە: بەڵام من لەگەڵ زنجیرە فیلمەکەی کە لە کتێبەکەوە وەرگیراوە پێشکەشی دەکەم، هەروەها هەموو بابەتی کتێبەکە ناخوێنین، بەڵکو تەنها ژیانی کۆنتا کینتی.

گووتی: ئێمە هانی ئەوە نادەین (خوێندنەوە لە فیلمەوە)، خوێندنەوە لە کتێبەوە ئەوەیە کە ئێمە دەمانەوێت، هەرچەندە بژاردەی خوێندنەوە بە یارمەتی فیلم لە لای ئەوانی دیکە دەمێنێتەوە.

بە هێمنیەوە گووتم: بەڵام ماغی هانی قوتابیەکانی دەدات کە تەماشای جاتسبی مەزن بکەن، پێم وایە بە هەردوو بەشەکەشیەوە. جیاوازیان چییە؟

گووتی: جیاوازیەکە ئەوەیە جاتسبی مەزن لە گرنگترین ڕۆمانەکانی ئەدەبی ئەمریکییە.. بەڵام (جذور) بە تەواوی جیاوازە.

بە تەواوی شۆک بوبوم: ئاخر (جذور) چییەتی؟ خۆ خەڵاتی پۆلیتەرز و خەڵاتی نێودەوڵەتی بردووەتەوە.

مستەر وید زۆر بێ هیوا دەردەکەوت، بە تورەییەوە پێنوسەکەی لە ناو دەستەکانیدا دەجوڵاند و گووتی: خاتوو لاتیشا، من ڕێزی (جذور) و کاریگەریەکەی دەگرم، من هێشتا قوتابیەکی زانکۆ بووم کاتێک دەرچوو و زنجیرەکانی پێشکەش کرا، هەروەها بە تەواوی کاریگەریەکەیم لە یادە کە لەسەر هەمووان دروستی کردبوو، بەڵام ئەوە بە تەواوی ئاستێکی زۆر جیاوازترە، ئەو کات تۆ هەر لە دایک نەبوویت، هەر بۆیە قورسە کە لێی تێبگەیت، ئەو کاتە لە نێو سپی پێستەکاندا هەست کردن بە تاوان بوونی هەبوو، جذوریش ڕۆڵێکی سەرەکی و دیاری هەبوو لە هەبوونی ئەم هەستەدا،

بەڵام بەڕاستی ئێمە ئێستا لە ئاستێکی تەواو جیاوازداین، ئێمە ئێستە سەرۆکێکی بە ڕەگەز ئەفریقی هەیە... توخودا، بۆ ئێستە (جذور)؟

بیرۆکەی هەستکردن بە تاوان لە لایەن سپی پێستەکانەوەم بە دڵ بوو، مستەر ویدیشم هاتە پێش چاو کە گەنجە و لە حەفتاکاندایە بە پرچ و قەنافیزێکی درێژەوە لەگەڵ هەستکردن بە تاوان... تەمام گرتبوو کە پێی بڵێم ڕەش پێستیش هەست بە تاوان دەکات ئەگەر من جذور پێشکەشی قوتابیەکانم نەکەم.. بەڵام بینیم کە بارودۆخەکە بۆ ئەوە ناشێت.

بە هێمنیەوە گووتم: بەڵێ ئێمە لە قۆناغێکی جیاوازترداین، هەر بۆیەش لە هەوڵدا دەبم کە جذور پێشکەشی قوتابیەکانم بکەم بە شێوەیەکی جیاواز، نەک لە ڕووی هەستکردن بە تاوانەوە بۆ ئەوەی ئەمە بقۆزمەوە ئەگەر ئەوەت مەبەستە، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی جذور زۆر شتی تێدایە کە شایەنی ئەوە بێت قوتابیەکان بیزانن و لێوەی فێر ببن..

قسەکەمی بڕی: بەڵام قوتابیەکانت هەر خۆ ڕەش پێست نین، ڕێژەیەک لە سپی پێست و ئیسپانیشی تێدایە.

بە خاترجەمییەوە بەردەوامیم بە قسەکانم دا: ڕێک ئەوەیە کە منیش گەرەکمە بیڵێم، دەتوانین کە (جذور) بکەینە جذوری هەمووان نەوەک تەنها بۆ ڕەش پێست بێت، لە ڕێی دۆزینەوەی جۆرەکانی نوێی کۆیلایەتی و بەردایەتی لە ژیانماندا... لەوانەیە هەستکردنی ڕەش پیست بەوەی کە زوڵم لێکراوە کەلەپچەیەکە و پێویستە ڕزگار ببێت لێی. هەروەها پێ دەچێ هەست کردنی سپی پێست بە تاوان (ئەوەم گووت و دەمهەویست پێبکەنم) کەلەپچەیەک بێت و نیاز بە خۆ ڕزگارکردن هەبێ لێی... من بۆشاییەک جێدێڵم بۆ قوتابیەکان بۆ ئەوەی کەلەبچەکان بدۆزنەوە لە ژیانی تازەگەریدا، بەوەش دۆزینەوەی هەلێک بۆ قوتاربوون لێی..

بە شێوەیەکی زۆر جیاوازتر تەماشای کردم وەک ئەوەی چاوەڕێی ئەم گوفتانە نەبوبێت لێم، پاشان گووتی: بیرۆکەکە زۆر جوانە بەڵام، ئایا قوتابیەکانت پێویستیان بە خۆ ڕزگارکردنە لە کەلەپچەکانیان؟ پێم وابێت ئەوان پێویستیان بە سیستەمە، زۆریش ئاسانە کە کەلەپچە بوون و سیستەم تێکەڵ بکەن..

بە خێرایی گووتم: لەوانەیە بیرۆکەیان دەربارەی یاخیبوون، ئەویش بۆخۆی کەلەپچەیەک بێت... ئەمەش هەلێکە بۆ دەستبەرداربوون و قوتاربوون لەو بیرۆکەیە.

وا دەردەکەوت کە پەڕەیەکی دیکە بەکاربهێنێت: ئەدی چی دەربارەی دزینی ئەدەبیات؟ خۆت دەزانیت سەلمێندراوە کە ئەلێکس هیلی بە تەواوی ڕاستگۆ نەبووە لەوەی کە ئەمە چیرۆکی ڕاستەقینەی خێزانەکەی بێت، ئەو هەندێک پارچەی لە چیرۆکەکانی دیەوە ڕاگوازتووە بۆ ئەوەی خۆی؟

ئەوەش وانەیەکی دیکە دەبێت بۆ قوتابیەکان ، ناتوانیت لە سزا هەڵبێیت تەنانەت ئەگەر براوەی خەلاتی بۆلیتەرزیش بیت، هەروەها ناچاریت ملیۆنێک دۆلاریش بدەیت لە سزاکەیدا! چ وانەیەک لەوە مەزنتر دەبێت بۆ قوتابیەکان؟

زۆر نائومێد دەردەکەوت کە دەیگووت: چی ڕوودەدات ئەگەر ناچاربیت کە مۆڵەت وەربگریت؟ چۆن هاوکارەکانت دەتوانن ئەمە بەردەوام پێ بدەن لەگەڵ قوتابیەکاندا، کاتێک کە ئەوان پێ دەچێت هەمان بیر و بۆچونیان دەربارەی چیرۆکەکە نەبێت وەک ئەوەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە؟

ڕێک لەسەر پەتەکە بووم بۆ قایل کردنی، بە متمانەوە گووتم: هەموومان هاوکاری یەک دەبین.

متەقی لێ بڕا و بە درێژی تەماشامی دەکرد، وا دەردەکەوت کە سوور بێت لەسەر گۆڕینی جذور پێش ئەوەی بچمە لای، ئێستا وا دەدەکەوێت کە بە گوفتارەکانم قایل بوبێت.

به فکرم دا هات که ئەو هەستەی سپی پێست بە تاوان کە ماوەتەوە بەکاریهێنم لە بارودۆخێک ئەگەر هەبێت لە لای مستەر وید: هەروەها گۆڕینی کتێبەکە لە دوای دەستنیشانکردنی و زانینی ئەوە لە لایەن قوتابیەکانەوە ئەوە بیرۆکەیەکی نێگەتیڤانە لە بارەی بەڕێوبەرەوە لە مێشکی قوتابیەکاندا دەچەسپێت دەربارەی تەداخولکردنی بەڕێوبەر لەو بابەتەدا، هەر بۆیەش لێکدانەوەی ئەوە بە هۆی بابەتی کتێبەکەوە زۆر شەرمەزارکەر دەبێت بۆ هەمووان، هەروەها بۆ بەڕێوبەریش!

ڕەنگی بەڕێوبەر ڕاستەوخۆ لە سپیەوە گۆڕا بۆ سوور، پاشان بە خێرایی هاتە گۆ: جذور کێشەی نییە، کارێکی قسە هەڵگرە بەڵام زۆر مەزنە، تەنها پەیوەست بەوەی کە گووتت لە واتا قوڵترەکانی بەردایەتی و کەلەبچە... ئەوە کارێکی زۆر ناوازە دەبێت.

ئۆفیسەکەم بەجیهیشت و تێدەفکریم: کۆنتا کینتی هەموو کات دەتوانێت سەریکەوێت، تەنانەت ئەگەر ناوەکەیشی ببێت بە توبی.

ناشزانم بۆ یەکسەر بیلالم بیرکەوتەوە، مەبەستم بیلالی حەبەشیە.

◆◆◆

## ئەمجەد

هەوڵ دەدەم بە پێی توانا درۆ نەڵێم.

لە بارەی باوەڕ بوون بە خوداوە دەدوێم بە سیفەتی هێزێک کە دەتوانێت پۆزەتیڤانە بێت لە ژیانی مرۆڤدا، بێ گومان پۆزەتیڤانە بووە لە ژیانی زۆرێکدا، هەروەک چۆن سلبیش بووە لە سەردەمانێکی زۆردا بە تایبەت لەم سەردەمەی خۆماندا.

لە بارەی باوەڕبوون بە خوداوە دەدوێم نەک خودا خۆی.

درک بەوە دەکەم کە هەرکەسێک ئەوانەی بۆ بیلالی دەنوسم بخوێنێتەوە پێی وایە کە من بێ باوەڕ(کافر)م، بە تایبەت لە تەمەنی بیلالدا... بەڵام تاکە ڕستەیەک نوسیبێتم کە ببێتە هۆی ناکۆکی خۆم و ویژدانم بونی نییە، ئەرێ ڕاستە نیوەی ئەو ڕاستیانە دەبێژم کە باوەڕم پێیانە، بەڵام خۆ درۆ ناڵێم. باوەڕهێنان دەکرێ هەر باوەڕێ بێت.. واتە باوەڕهێنان بە هەر بابەتێک، باوەڕهێنان بە خودا لێرەدا وەک باوەڕهێنانە بە دادپەروەری کۆمەڵایەتی یاخود بە یارمەتیدانی ئەو کەسانەی پێویستیان بە یارمەتیە یاخود مافی ڕەگەزە جیاوازەکان..

بەم شێوەیە بە خۆمم و دەروونم گووت، تاوەکو قایلی بکەم، بۆ ئەوەی بێژم کە من دوڕووی ناکەم یان لە باوەڕهێنانی خۆم نابەزمە خوارێ لە ڕێی ئەوەی بۆ بیلالی دەنوسم..

ئەوە تەها باوەڕهێنانە بە کەیسێک..

من باس لە خودا ناکەم..

بەڵام شتێک پێی دەگووتم، کە من درۆ دەکەم.. هەروەها دەشزانم کە درۆ دەکەم... هەروەها ئەوەش دەزانم کە باوەڕهێنانی بیلال بە خودا، بە تاقانە پەرەستی، وەک هیچ کەیسێکی دیکە نەبووە..

دەمزانی کە ئاین لەوانەیە وەڵامی قایلکەری پێ نەبێت...

بەڵام کریستین ڕاستی گووت، هیچ وەڵامێک لە کوفردا بووندا نییە..

◆◆◆

هەوڵمدا کە بە عەبدول بڵێم.

ئەو سەرخۆش بوو، ئەوەم بە هەل زانی کە ئەو لەوانەیە لە زۆرترین بە ئاگاییبوونیدا بێت کاتێک کە سەرخۆشە..

پێم گووت: عەبدول، من کافرم.

تێم ڕاما وەک ئەوەی تێنەگەیشتبێت، وەک ئەوەی یەکەم جاری بێت من ببینێت.

پاشان کەوتە قاقا لێدان.

لە هیستریای پێکەنیندا تەقیەوە وەک ئەوەی نوکتەیەکم پێ گووتبێت.

پێکەنینەکەی زۆر بێزارکەر بوو و هەستم بە گاڵتەپێکردن کرد، تەمای ڕۆیشتنم گرت، بەوە تاسام و ئەویش هەستی کرد کە ئەوەی کردی زۆر بێتام بوو، بە خێرایی گووتی: ببورە ببورە مەبەستم خراپ نەبوو، بەڵام نوکتەیەکم بیرکەوتەوە لە بارەی کافرییەوە.

پێم گووت: نوکتە؟ کامەیە؟

گووتی: بە تەواوی نوکتە نییە، بەڵکو ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە بەسەر یەکێک لە هاوڕێکانمدا هاتووە... ئەو گومانی هەبوو لە هەبوونی خودا، ڕۆیشتبوو بۆلای مەلایەکی مزگەوت بۆ ئەوەی کیشەکەی پێ بڵێت، وا دەردەکەوێت کە مەلاکە پەلەی بوبێت، گوێی ڕادێراوە بۆ نیوەی قسەکان و بە خێراییەوە گوتویەتی: کوڕم، ئەگەر دەتەوێ زینا بکەیت یان مەی بخۆیتەوە، کێشە نییە، بیکە، بەڵام دەبێت باوەڕت بە خودا هەر بمێنێت. هەوڵبدە کە لە کاتی خۆیدا نوێژ بکەیت و ئیستیغفار زۆر بکەیت.

دیسان گەڕایەوە بۆ هیستریای پێکەنین..

پاشان گووتی: خۆ هاوڕێکەم هەر خۆی لە هەموو باروودۆخەکاندا زینای دەکرد و دەیخواردەوە!

بەردەوام بوو لە پێکەنین. نەمزانی کە چی مایەی پێکەنینە لەم شتەدا بەو ڕادەیە. مەلایەکی گێژ هەروەها شتێکی چاوەڕوانکراو لە ئەوانەی لەو شێوەیەن.

عەبدول وە ئاگا هات لەوەی کە من پێنەکەنیم پێکەنینەکەی بەرە بەرە کەم کردەوە و پاشان بە تەواوی بێدەنگ بوو.

گووتی: ئایا تۆ بەڕاستیتە؟

وەڵامم دایەوە: بێگومان بەڕاستمە. من کافرم... پێم مەیەژە کە بە ناو شک و گوماندا تێنەپەڕیویت.. عەبدول لە دێر زەمانەوە لە کۆمەڵگاکەت وەدەرکەوتویت و ئێستا لە کۆمەڵگایەکی ئازاددا دەژیت..

بەسەرسامیەوە سەیری کردم: لە کۆمەڵگاکەی مندا لەوانەیە کافری زۆر زیاتری لێرەی لێبێت.. ئایا وا دەزانیت کۆمەڵگای من هەمووی باوەڕدارە؟ لەوێ کافرەکان زۆرن، نەک هەر لە نێو گەنجی وەک تەمەنی من، بەڵکو تەنانەت لە نێو بەتەمەنەکانیشدا.. بەڵام بە زۆری بێ باوەڕبوونیان کاردانەوەی کپ کردن و لغاو خستنە نێو دەمیانەوەیە لە لایەن پیاوانی ئاینییەوە... بێ باوەڕی لەو باروودۆخەدا تەنها کاردانەوەیەکە بۆ قوتاربوون لەوانەی کە بانگەوازی ئەوە دەکەن کە نمونەی خودان... ئاخر خودای گەورە بە کارەکانی ئەوان چی؟

من زۆر گوێم بۆ ئەو قسە بێزارکەرانە ڕایەخستبوو.

گووتم پێی: ئەی بۆ باوەڕ لەوێ لە ئەنجامی شۆردنەوەی میشکەکان نییە لە لایەن ئەو پیاوە ئاینیانە؟

به تەواوی بە ئاگا دەهاتە پێش چاوم کاتێ گووتی: ئەوە دەکرێت بە گوێرەی فێرکردنە ئاینییەکان و وردی و درشتیەکانیەوە. بەڵام بیرۆکەی هەبوونی خودا لە هەموو شارستانیەتەکانی جیهاندا بوونی هەیە، کۆمەڵگەیەکی مرۆیی نییە کە پەرستوویەکی نەبێت... ئەوە هەرگیز لە رێگەی مێشک شۆردنەوەوە نابێت.. زۆر قورسە خەیاڵکردنەوەی هەبوونی پیلانگێرانێک بۆ شۆردنەوەی مێشکی هەموو مرۆڤ لە سبەینێی مێژووەوە.

زۆر سەرم سوڕما لەوەی ئەم وتانەلە عەبدولەوە دەرچێت، بە تایبەت کە سەرخۆشیشە.

چۆن باوەڕ بە شتێک دێنیت کە نەتدیوە عەبدول؟ .. گێل مەبە.

ئەمجەد هەموو شتێک کە باوەڕی پێ دێنیت مەرج نییە ببیندرێت... هەندێ شت هەنە کە شک و گومانت لە بوونیان نییە بەڵام ناشیان بینیت..

- **ئایا دەڵێیت هێزی کێشکردن و کارەبا؟ بە توانجێکەوە گووتم.**

- **نا مەرج نییە ئەوە، مەبەستم ئەوە نەبوو، بەڵام دەکرێ هەرتک جێبەجێ ببن لەسەر ئەوەی دەیڵێم..**

- **بەسیکە عەبدول، نە کارەبا دەبینین نە هێزی کێشکردن، بەڵام لە ناو کاریگەریەکەیدا دەژین..**

عەبدول بە پێکەنینەوە گووتی: ئەمجەد بەسیکە، رێک ئەمە ئەوەیە کە باوەڕدارەکان دەیڵێن.. دەڵێن هەموو جیهان کاریگەری خودای لەسەرە..

پاشان بێدەنگ بوو و ڕەنگی ڕوخساری گۆڕا. گووتی: مەبەستم شتێکی دیکە بوو..

مەبەستم خۆشەویستی دایکمە بۆ من، نایبینم و شێوەی نازانم چلۆنە، ناتوانرێت ببیندرێت، بەڵام دەزانم کە ئەو منی خۆش دەوێت، ناتوانم گومان لەوە بکەم هەرگیز... دەزانم کە رۆژی هەزار جار بیرم لێدەکاتەوە و لە هەموو نوێژەکانیدا بۆم دەپارێتەوە، ئەو زۆر نوێژ دەکات...

پاشان دەستی بە گریان کرد هاواری دەکرد: دایە.. دایە..

ئاااخ ئەم ڕۆژهەڵاتیانە! چەندە جێی بەزەین. بیری دایکت دەکەیت؟ باشە، کەواتە پەیوەندی پێوە بکە یاخود تکتێکی تەیارە ببڕە و بڕۆ بۆلای. بەڵام ئەوان هەر زۆر گرنگە بە لایانەوە کە زیادەڕەوی بکەن لە چونە ناو ڕۆلی دراماتیک و تراژیدیکەوە بۆ هەموو شتێک.. بیرم کردەوە لەوانەیە لە شەرابەکەیدا پارچە حەبێکی دانابێت کە وای لێبکات لە ئەوپەڕی پێکەنینەوە بچێت بۆ ئەو پەڕی گریان..

پێم گووت: بەڵام خۆشەویستی سۆزە، ناکرێت بخرێتە نێو بازنەیەکەوە لەگەڵ ئەو خودایەی کە لەسەروی هەموو شتێکەوە دایدەنێن، ناتوانرێت سۆز ببینرێت، بەڵام ئەمە خودایە!

یەکسەر وەڵامی دایەوە: بە دڵنیاییەوە خودا لە تەک هیچ شتێکی دیکە دانانرێت لە یەک بازنەدا.. خودا ئەوەیە کە هەموو بازنەکانی بەدی هێناوە، هەر بۆیە بازنەیەک نییە بۆ ئەو.

ئەم ڕستە کاریگەرترین و قایلکەرترین ڕستە بوو کە بیستبێتم... بەڵام من بێدەنگیم هەڵبژارد.

لە کاتێکدا فرمێسکەکانی دەسڕی پێی گووتم: دەزانیت؟ ئەوە سینەما بوو کە وای لێکردم باوەڕ بە خودا بهێنم.. هەروەها ئاینەکەمم خۆش بوێت.. ئەوەش بەشێکە لە هۆگر بوونم پێوەی..

درامایەکی دیکە. ئێستە لەگەڵ سینەما.

بە دەموچاومدا ڕوون و ئاشکرا دیار بوو کە باوەڕم پێی نەکرد.

گووتی: بڕوا ناکەیت ها؟... گوێ ڕادێرە.. حەوت ساڵیم بوو.. خاڵم بە شاشەیەکی سینەماوە هات، هەروەها ئامێرێکی پێشکەشکردنی ماڵی، بڕیاریدا کە کۆمانبکاتەوە، هەموو نەوەکان، لە ژووری میوانی گەورە، کە لای ئێمە پێی دەگوترێت (دیوەخان) هەروەها دەرگایەکی هەیە بۆ دەرەوەی دەرگای

هاتنــە ژوورەوە، هــەمووماں خــڕ بووینــەوە بــۆ ئــەوەی تەماشــای فیلمی (ریسالە)ی موستەفا العقاد بکەین وەک ئەوەی لە هۆڵی پێشکەشکردن بین.. دایکم پێی گووت کە فیلمەکە لەسە شریتی ڤیدیۆیی هەیە و هـەزار بـار لە تەلەفزیۆن لێدراوە. خاڵم پێی گووت: نا.. سینەما جیاوازترە.

عەبدول تەماشایەکی پەرداخەکەی کرد، هێشتا کەمێک لەو ویسکیەی تـێ مـابوو کـە داوای کردبـوو.. بـەرزی کـردەوە بـۆ ئـەوەی قـومی کۆتـایی بخواتەوە... پاشان لە پڕێکدا وەستا.. پەرداخەکەی گەڕاندەوە وەک ئـەوەی دەستێک ڕێگری لێکردبێت..

بەردەوام بوو: سوێند دەخۆم بە خودا ئەمجەد.. ئەو تەزووەی هەستم پێی کرد لە ماوەی فیلمەکەدا، ئەو موچورکەی کە بە ناو جەستەمدا تێپەڕی، لـە دوای ئـەوەوە هەسـتم پێـی نەکردوەتـەوە لـە هـیچ تاقیکردنەوەیـەکی جەستەیدا.. بە خـودا سـوێند دەخـۆم.. هێشـتاش ئـەو تاقیکردنەوەیـەم لـە یادە.. لەو ڕۆژەوە من هۆگری سینەمام، هەر جارێک کە دەچمە سینەما بۆ فیلمێک هیواخوازم هەمان تاقیکردنەوە ڕووبدات، ئەوەی کە هەست بە هـەمان تەزوو بکەم، ئەوەی کە دوبارە هـەمان ئـەو هەستە بکەمـەوە کـە ئـەو شـەوە هـەمبوو، لـەو ڕۆژەوە مـن بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکان، زۆر بـاوەڕدارم.. سـەرەڕای ئـەوەی پیـاوانی ئـاینی لـە وڵاتەکـەم فیلمیـان بـە هـەموو شـێوەیە قەدەغە کردووە.

تەمام گرتبوو کە لێی بپرسم داخۆ لە ژێر کاریگەری شتێک بوبێت کاتێک تەماشای فیلمەکەی کردووە لە حەوت ساڵیدا. پاشان هەستم کرد کە ئـەوە زۆر تونـد و ڕق دەبێـت بـۆی کـە پێویسـت نییـە، ئـەو بـە شـێوەیەک زۆر ڕاسـتگۆیانە دەردەکـەوت کـە نەشـمدەتوانی هاسـۆزی و هاوخـەمی لەگـەڵ دەرببڕم.

دانەیەکی کێشا بەسەری خۆیدا و پاشان تەماشای گڵاسەکەی کردەوە، ئەم جارەیان بەرزی کردەوە بۆ لێوەکانی و ئەوەی کە مابوو بە یەک قوم خواردیەوە و چۆڕپڕی کرد...

پاشان گوتی: ئەی ئایا دەزانیت کە موستەفا العقادیشیان کوشت؟ ئەوانەی کە بە ناوی ئاینەوە دەدوێن؟

وا هاتە پێش چاوم کە سێبەری فرمێسکم لە چاویدا بەدی کرد.

تەماشایەکی منی کرد و چاوەکانی دەبریسکایەوە: بەڵام خودا هەیە..

♦ ♦ ♦

From: amjadhelwani@bilalmovie.com
To:bilal٢٠٠١ny@hotmail.com
Subject:احد، احد

له هیشامی کوڕی عەروەی کوڕی زوبەیر، له باوکیەوە دەگێڕنـەوە دەڵێـت: وەرەقـەی کـوڕی نەوفـەل بـە لای بیلالـدا تێپـەڕی کـە ئەشـکەنجە دەدرا، لـە کاتێکـدا ئـەو دەیگـوت: ئەحـەد، ئەحـەد، ئـەویش دەیگـوت: ئەحـەد و هـەر ئەحەدە خودا ئـەی بـیلال، پاشـان وەرەقـە ڕووی دەکـردە ئومەیـە و ئەوانـەی وایان له بیلال دەکرد لە هـۆزی جـەمح و دەیگـووت: سـوێند بـە خـودا ئەگـەر لەسەر ئەوە بیکوژن ئەوە بە پیرۆز دایدەنێم.

وەرەقەی کوڕی نەوفـەل کێیـە؟ وەرەقـە یـەکێک بـوو لـە کەمینـەکانی کـە باوەڕیان بە تاقانەپەرستی هـەبوو لـە مەککـەدا، ئـەو لـە ئـەهلی کتێـب بـوو، ئـەهلی کتێبـیش دەربڕینێکـی ئیسـلامیەکە مەبەسـتمان پێـی (یـەهودی و مەسیحیەکانن) پێکـەوە، چونکـە ئـەو دوو ئاینـە هەریـەک کتێبـی تایبـەت بـە خـۆی هـەبوو، تـەورات بـۆ یەهودیـەکان و ئینجیلـیش بـۆ مەسـیحیەکان... هەروەها لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی هـەردوو ئاینەکـە هـەمان نـاوەڕۆکی ئیسـلامە، کە ئەویش تاقانەپەرەستییە لە بەرامبەر زۆر و بـۆری بتـەکان و باوەڕنـەهێنان پێیـان، ئـەم سـێ ئاینـەیش هـەموویان دەگەڕێنـەوە بـۆ یـەک پێغەمبـەر کە ئەوەش ئیبراهیمی پیغەمبەرە، هەر بۆیـە هاولایـەنی لـە نێوانیانـدا بـە لایـەنی کەمـەوە لـە نـاوەڕۆک و لـە سـەرەتاوەیە، زۆر لـەوە زیـاترە کـە ئێسـتا دەردەکەوێت..

وەرەقە پیاویکی گەورە بوو لە تەمەندا، هەروەها لـەو مـاوە زووەدا کـۆچی دوایی کرد، ئەو وازی لە مەسیحیەت هێنا و هـەروەها ئینجیلـی دەکـردەوە بـە عەرەبی، بۆیـە خـەڵکی مەککـەش چیـدی پەیوەنـدیان لەگـەڵ دروسـت نـەکرد

کاتێک ئاینی باووباپیران و بتەکانی بۆ مەسیحیەت جێهێشت، لەبەر ئەوەی هیچ پێویستی بەوە نەدەکرد، ئەو هەر ئەوەندەی بەس بوو کە وازی لە ئاینەکەی هێنا و پشتی لە هۆزەکەی کرد بەڵام هیچ کات بانگەوازی بۆ گۆڕانٰ نەکرد و ڕووبەڕووی بتەکانی هۆزەکەی و بیروباوەڕەکانی نەبوویەوە..

بەڵام وەرەقە هیچ بژاردەیەکی لەبەردەست نەبوو جگە ئەوەی پشتگیری لە بانگەوازی تاقانەپەرستی بکات کە دەزانێت لە هەمان سەرچاوەی مەسیحیەتەوە هاتووە، هەر بۆیە لێرەدا دەبیینین کە پشتگیری بیلال دەکات، کە دەبیینێت ئەشکەنجە دەدرێت و دەڵێت ئەحەدە و هەر ئەحەد پێی دەڵێت (خودا یەکە و یەک ئەی بیلال)، پاشان هەڕەشە لە خەڵککی مەککە دەکات بە پیرۆزکردنی بیلال ئەگەر بیکوژن، (سوێند دەخۆم بە خودا ئەگەر لەسەر ئەوە بیکوژن ئەوە بە پیرۆز دایدەنێم)...

ئەو دەیهەویست بیکات بە سانت بیلال ئەگەر لە ژێر ئەو ئەشکەنجەدا بمرێت.

ئەو لە پەیڕەوانی هەمان ئاینی دادەنا.. (سانت بە زمانی ئیسپانی و لاتینی واتە پیرۆز. ئینگلیزییەکەیشی "سەینت"ە)

بەڵام ئەو نازناوەی لە دواتردا بیلال بەدەستی دێنێت، زۆر تایبەت دەبێت، هیچ کەس وەری ناگرێت..

زۆر زیاتریش دەبێت لەو نازناوی پیرۆزەی کە چەندەها کەس وەریان گرتووە لە مێژوودا.

♦ ♦ ♦

ئەوانەی یەکەم جار موسوڵمانبوونیان ڕاگەیاند حەوت بوون: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)و ئەبوبەکر، بیلال، خباب، سوهەیب، عەمار و سومەیەی دایکی. پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت) (درودی خودای لەسەر بێت)مامی ڕێگری بوو، ئەبوبەکریش هۆزەکەی، ئەوانی دیکەیش قەڵغانیان لەبەر کرا و پاشان لە ژێر تینی خۆردا ئازار دەدران.

هیچ کەسێکی نەبوو تاوەکو بەرگری لێبکات.. بەردەیەکی تەنها لە حەبەشەوە... بە بێ باوک، لەوانەیە ئەو کاتە دایکیشی حەمامە کۆچی دوایی کردبێت، چونکە سەرچاوەکان هیچ شتیکی لەو بارەوە باس ناکەن، هەروەها زۆر کورتە بالا بوو، کە ئاسان دەبوو بۆ گەنجەکان بە ناو شەقامەکانی مەککەدا بیگێڕن..

لە کاتێکدا کە دەیگوت، وەک ئەوەی ئەو وشە تاکە شت بێت کە بیزانێت... وەک ئەوەی ئەوە زوبانە نوێیەکەی بێ و هەموو شتێک کە دەیزانێت لێی تەنها ئەو سێ پیتەیە، چەندەها و چەندەها بار دەیڵێتەوە، لە کاتێکدا ئەو دەخشێنرێت لەسەر لمەکەی ناوکۆڵانەکانی مەککە..

ئەرێ.. ئەمە بە رێگەیەک لە رێگەکان زوبانە نوێیەکەی بوو، ئەلفوبا نوێیەکەی کە لە رێگەیەوە جیهان دەبینێت، وای لێهاتووە لە رێگەی هاوێنەی خوداییەوە دەیبینێت، ئەو جیهانەی کە بتەکانی تێدا لە ئەژمار نایە و بەجێی هێشتووە بووە بە جەنجاڵیەکی نا ئارامبەخش بۆی، وەک ئەوەی چەندین هاوێنەی جیاوازت لەسەر یەک دانابێت، لێڵ و ناڕوون بە شێوەیەک کە ناتوانی هیچ شتێک ببینیت...

بیلال بەسەر شەقامەکاندا دەخشێندرا، گەنج و شوانەکانیش هێرشیان بۆ دەبرد، پێی پیدەکەنین، بەردەیەکی ڕەش، کورتەبالا، بێ باوک ، گۆرانیبێژ، ئایا بوێری ڕووبەڕووبونەوەی سەرگەورەکانی هەیە؟

خەڵکی پتر لەم دیمەنەدا کۆ دەکرێنەوە، لە ناو ئەو ئازار و ئەشکەنجەدا کە توشیان بووە هەناسە دەدەن، ئەوە دەبژێرن کە چەشتوویانە.

بەڵام بیلال جگە ئەحەد، ئەحەد هیچی دیکەی نەدەگوت... لەوانەیە بە بەرزترین دەنگی گوتبێتی، بە هەموو هێزێک کە تێیدا مابێت، هەموو جەستەی پڕ بووە لە شوێنی لێدان و برین، بەڵام دەنگە زێیەکانی هەر کاریان دەکرد: دەیگووت احد، احد..

لەوانەیە پێکەنیبن، ئەم احد، احدە چییە؟

کەمینە بوون کە دەیانزانی، تەنانەت بیلالیش دەشێ نەیزانیبێ، کە ملێۆنان، دەیان ملیۆن، لە دوایدا دێن بۆ مەککە، بۆ ئەو کۆڵانە تەسکانەی کە تێیدا ڕادەکێشرا و بە زەویدا دەخشێنرا، هەروەها ئەوەی کە بیلال دەیگووت دوبارە دەکرێتەوە وەک بەشێک لە نەریتی حەجکردن..

ئەم ملیۆنانە، لە دوای ئەوەی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە، دەوەستن بۆ ئەوەی دوو رکات نوێژ بکەن، لە نێو هەموو سورەتەکانی قورئان کە ١١٤ ەن ئەم سورەتە دێت، کە هەندێک جار پێی دەبێژن سورەتی دڵسۆزی، ئیخلاس، یاخود سورەتی تاقانەپەرستی، ئەو سورەتەی کە بیلال بەشێک لە ناوەڕۆکەکەی وەرگرتبوو لەوەی کە دیگووت..

سورەتەکە دەڵێت، زۆر کورتە، گرنگیشە "قل هو اللّه احد*اللّه
..........."

(سورة الإخلاص)

هەر ئەوەندە، نوقتە و کۆتایی.

هەر ئەوەش بوو کە بیلال دەیکرد.

دەیگوت احد... احد..

وەک ئەوەی بیلال بەسترابێتەوە بە مانای ئەم سورەتەوە، کە خودای ڕاستەقینە و ڕەها و تاک کە لە هیچ شتێکدا لە مرۆ ناچێت، لە کەس نەبووە و کەسی لێ نابیت وەک مرۆڤ، لە دەرەوەی هەموو کات و شوێنێک و هەر بەراوردێکدایە..

وەک بڵێی لەوەتەی لە دایک بووە بە دوای ئەو داڕشتە و دەربڕین و واتایانە گەڕاوە..

کاتێکیش کە دۆزیەوە گوێی بە هیچ شتێکی دیکە نەدا..

احد، احد، ئەو ڕۆژە گەرمە، لە مەککە.

له پڕ ئازادی گەیشت.

لە ئەو پەڕی بارودۆخی ئازار و ئەشکەنجەداندا، لە پڕ ئازادی سەری دەرهێنا

ئایا بیلال گوێ بیستی چەلەحانێکەی نێوان ئومەیە و ئەبوبەکر بوو؟

نازانین، لەوانەیە بزانین و لەوانەشە نا... بەڵام ئەو هەر دەیگووتەوە "احد، احد".

لە ناکاوێکدا: بەردەکە لادەدرێت.. کەلەپچە و زنجیرەکان دەکرێنەوە.. ئەبوبەکریش یارمەتی دەدات، پاشان پێی دەڵێت: بیلال، تۆ ئازادی!

ئەو بەردەیەک بوو ئەشکەنجە دەدرا، ئەشکەنجەکە وەستا، بەڵام ئەوە هەموو شتێک نەبوو..

ئەویش ئیدی ئازاد بوو..

احد، احد.

♦♦♦

بەڵام ئەبوبەکر کێیە؟

ئەوە نزیکترین کەسەکانە لە پێغەمبەر موحەممەدەوە ( درودی خودای لەسەر بێت)، ئەوەڵ کەسیشە لە پیاوان کە باوەڕی پێ هێنا. لە کاتێکدا هاوسەرەکەی، خەدیجە، ئەوەڵ کەسە لە ئافرەتان کە باوەڕی پێ هێناوە.

ئایا ئەبوبەکر بە هاندانی دەروونی خۆی ئەو هەڵسوکەوتەی نواند، یاخود ئەوە بە ڕێککەوتن لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) موحەممەد بووە؟ نازانین، ئەگەری ڕوودانی هەردووکیشیان پێکەوە هەیە.. ئەبوبەکر بە شێوەیەک پڕ بوو لەو شتانەی کە موحەممەد بانگەوازی بۆ دەکرد.

دەکرێ کڕینی بیلال بۆ ئازادکردنی بەشێک بوبێت لە ئەو پلانەی کە پیغەمبەر موحەممەد تێیدا بڕیاری داوە کە بەرگری پێ بکات لە شوێنکەوتووە

لاوازەکانی، هەن کە خێزانە بەهێزەکانیان دەیانپارێزن، ئەوانەشی کە خێزانێکی بەهێزیان نییە دەتوانن ئەوە بڵێن کە شوێنکەوتوانی بتپەرەستی دەیانەوێت بیڵێن و موحەمەد و خودای موحەمەد بە درۆ بخەنەوە لە پێناو قوتاربوون لە ئەشکەنجەدانیان..

لە بارودۆخی یاخیبونی وەک بیلالدا، دەنگەژێیەکانی ناچار دەکرا کە بە هەرشێوەیەک بێت نەمێنێت، بەڵام ئەو هەر هاواری دەکرد"احد، احد" هەر دەبوو کەسێکی وەک ئەبوبەکر دەست تێوەربداتە ئەم کارە.

با ئاگادار بین کە لێرەدا ئەبوبەکر هەستا بە گۆڕینەوەی بیلال بە بەردەیەکی دیکی و گووتی بە ئومەیە (ئەو لەسەر ئاینی تۆیە)..

کەواتە، لەم ئاینە نوێیەدا، بەردەکان شوێن ئاینی سەرگەورەکانیان ناکەون هەمیشە..

کەواتە، لەم ئاینە نوێیەدا، بەردە بۆی هەیە بڕیار بدات لەوەی کە دەیهەوێت.. دەتوانێت بڕیار لەسەر ئەوە بدات کە باوەڕی پێی هەیە، ئەگەر تەنانەت پێچەوانەی ئەو باوەڕەش بێت کە سەرگەورەکەی هەیەتی..

ئەوە ئازادیان لە دەرگاکان دەدات..

◆ ◆ ◆

ئەوە تۆ ئازادی بیلال..

ئەوە کەلەپچە و زنجیرەکان کرانەوە..

ئەوە بەردەکە لابرا بیلال..

ئەوە تۆ ئازادی..

دەتوانیت بەرز بفڕیت، ئەی کوڕی حەمامە، هەر رێک وەک ئەوەی دایکت دەیەویست بیکات..

دەتوانی ئەو مەککە جێ بهێڵیت کە ئەشکەنجەی دایت و سوکایەتی و توانج و تەشەری پێ کردیت و لە شەقامەکانیدا ڕایکێشایت لەسەر زەوی..

دەتوانیت هەموو ئەوانە لە پشتتەوە جێ بهێڵیت و دەست بە ژیانێکی نوێ بکەیت لە شوێنێکی دی..

ئایا ئەمە ئەوە نییە کە دە فکری هەر کەسێکدا دێت کە تازە بە تازەیی لە زیندانی بەردایەتی هاتووەتە دەرێ؟

ئەرێ..

بەڵام بیلال نا..

◆◆◆

بیلال لە مەککە مایەوە، لە تەک موسوڵمانە نوێیەکانی وەک خۆی، بارودۆخیشیان هیچ کات ئاسایش نەبوو، هێشتا گەورە و بازرگانەکانی مەککە بڕوادارەکانیان دەکردە ئامانج و هەلیان دەدۆزیەوە بۆ ئازاردانیان، هەرچەندە بیلال ئێستە ئازادە، بەڵام هەر وەک موسوڵمانە لاواز و هەژارەکانە کە سەر بە هیچ هۆزێکی بەهێز و گەورە نین و موعەرەزن بۆ ئەشکەنجە و ئازاردان، هەرچەندە ئەو لە ژێر چاودێری و پاراستنی (ئەبوبەکر)دا بوو.. بەڵام هێشتا هەر لە لێواری مەترسیدا بوو.

لە دوای پێنج ساڵ بەردەوامبوونی چەوساندنەوە لەسەر بانگەوازە نوێیەکە، پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) بڕیاری دا کە موسوڵمانە لاوازەکان و هەژارەکانی بنێرێت بۆ حەبەشە، کە لە ژێر دەستی شایەکی مەسیحی دادپەروەر بوو، بە گوێرەی ئەوەی کە سەر بە یەکێک لە ئاینەکانی ئیبراهیمی بوو کە نزیک و هاوسۆز دەبوو لەگەڵ ئاینی نوێدا، چونکە شت گەلێکی زۆر هەن تێیدا کە هاوشێوەی ئاینەکەی خۆیەتی.. بەڵکو تەنانەت ڕێزی سومبولەکانیشی دەگرێت وەک مەسیحی پیرۆز و خاتوونە عەزراء (مریم).

ئەوە ئەو کۆچکردنە بوو بۆ حەبەشە..

بەڵام بیلال نەڕۆیشت!

ئەو لەو لاوازانە بوو کە زۆر بە ئاسانی دەتوانرا سیفەتەکانی کۆچەری تێدا هەبێت بۆ حەبەشە..

بەڵام ئەو نەڕۆیشت..

ئایا دەتوانین خەیاڵی ململانێیەک لە ناخیدا بکەین؟

بەڵکو هەر دەکرێ کە خەیاڵ نەکەینەوە!

نەڕۆیشت.

بە فکریدا نەهات کە بچێت بۆ وەتەنی باووباپیرانی.. بیری لەوە نەکردەوە کە بە دوای خزم و نزیکەکانی دایکی (حەمامە)دا بگەڕێت، لە خاڵەکانی، خاڵۆژنەکانی، یاخود نزیکەکانی باوکی کە جگە ناوەکەی هیچی دیکە لەسەر نەدەزانی، دەیتوانی بیکات.. بچێت بۆ ئەو شوێنەی کە هەمووی بە شێوەیەک تەماشای دەکەن کە وەک خۆیانە، بە هەمان ڕەگی پێست، هیچ شتێک لە یەکەم تەماشاکردنەوە دەریناخات کە ئەو بەردە بێت.

بەڵام ئەو نەیکرد.

دەشێت ترسابێت لەوەی ئەگەر بڕوات بۆ ئەوێ ئەوە بەجێبهێڵێت کە لە مەککەدا دۆزیویەتیەوە..

ترسا لە خۆی..

پێداگری کرد کە بمێنێتەوە..

ئەو خۆی لەوەدا دۆزیەوە کە باوەڕی پێی هێنا..

ئەو هاوبیری و هاو بڕوایی بە بەهێزتر دۆزیەوە تاوەکو هاو ڕەنگی..

◆◆◆

## بیلالی حەبەشی

نیـازی دەرخسـتنی هـیچ شـتێک نـەبووم. هـەورەها نەشـم دەویسـت کـە بیشارمەوە.

من بومەتە بڕوادار. ئەوە پەیوەندی بـە کەسـەوە نـەبوو. یـاخود هـەر بـەم شێوەیە لە سەرتاوە بیرم کردەوە.

ئیمانەکەم لە دڵمدا شاردبۆوە، زۆر دڵخۆش بووم پێی، وەک منـداڵێک کـە چۆلەکەیەکی دۆزیبێتەوە و بە دڵخۆشیەوە بۆ ماڵەوەی بردبێتیەوە.

لە دوای کەمێک نەمـدەتوانی ڕێ بـە خـۆم بگـرم تـاوەکو ئـەوانی دیکـەش دڵخۆش ببن.

من زۆر پێی خۆشحاڵ بووم، دەشمەویست ئەوانی دیکە بەو شێوەیەی مـن بن.

لەگـەڵ هەنـدێک بـەردە و خزمـەتکاری چـواردەورم دووام، شـتەکە زۆر بـە لایانەوە سەیر و ترسناک بوو.

یەک لەوانە، عورووە، هەموو دەم کەیفی بەوە دەهات کە خـۆی لـە ئومەیـە نزیک بکاتەوە، ئەو دەیبینی کە من شوێن و پلە و پایەیەکی تایبەتم هەیە لە لای ئومەیە، هەموو کات هەوڵی دەدا لە هەموو شتێکدا پێشم کەوێت.

ئەوەی کە باسم لەسەر کردبوو بووە هەلێک بۆ عورووە، پاشان پـێم وابێـت ڕۆیشتبووە لای ئومەیە بۆ ئەوەی لە منی پڕ بکات.

لە ئەوەڵەوە ئومەیە گوێی پێ نەدا، کاتێـک لـە بـازاڕدا بـووین لـە پڕێکـدا پێی گووتم: دروستە! عورووە دەڵێت کە تـۆ باسـی ئـەو پڕوپوچیانـە دەکـەیت کە موحەمەد لەسەری دەدوێ. ئایا ڕاست دەکات؟

بێدەنگ مامەوە.

بیدەنگیەکەم ئەوی وروژاند، دوبارەی کردەوە: ئەوە ڕاستە کە عورەوە دەیڵێت؟

متەقم لێ بڕا. بە هیچ شتێک زارم بۆ هەڵنەدەپچڕا، بێدەنگیەکەم وەڵامێکی ڕوون بوو. لەوانەیە ویستبێتی کە ڕەتی بکەمەوە ئەگەر تەنانەت بە درۆشەوە بێت. بەڵام هەر ئەوەندەی بە درۆ ناچار ببم، ئەوە واتای سەرکەوتن بۆ ئەو دەگەیەنێت.

مستە کۆڵەیەکی لێدام. خەریکبوو بکەومە سەر زەوی. هەر بە بێدەنگی مامەوە.

لێیدامەوە و گووتی: باجەکەی دەدەیت هەی گەمژە، زۆر لەوە بە زیرەکترم دانایت.

◆ ◆ ◆

لە سەرەتادا لە تەویلەی ئەسپەکان دەستبەسەری کردم.

ڕێیشی دەدا بە هاتنی ئاو و خۆراک بۆم.

پاشان هات بۆ ئەوەی لێم بپرسێت: ئایا هەر لەسەر گەمژەییەکەت ماوی؟

کاردانەوەم نەبوو.

شەقێکی تێهەڵدام.

ئایا هەر بە دوای موحەمەدەوەی؟

وەڵامم نەبوو.

دوبارە شەقێکی لێدامەوە و گووتی: دەیبینیت هەی گەمژە.

◆ ◆ ◆

بۆ ماوەی دوو ڕۆژ ئاو و خۆراکی لێ قەدەغە کردم.

پاشان هاتەوە و پرسی: هێشتا هەر بە دوای موحەمەد و خوداکەیەوەیت؟

بێدەنگی بوبووە وەڵامم.

شێتی دایگرت، هەستی دەکرد کە من لێم بردووەتەوە بە ئیرادەکەم. هەر تەنها بێدەنگیم بردنەوەم بوو.

لە شتەکە گەیشتم. بۆیە سوور بووم لەسەر ئەوەی بێدەنگ ببم.

بە قامچی چەند جاران پێیدا کێشام کە ژمارەی جارەکان نازانم، هێندە لێیدام تاوەکو ڕوخسار یەک پارچە سوور بویەوە و لە تاو ئارقەدا ئاوی لێدەچۆڕا.

پاشان دەموچاوی لە دەموچاوم نزیک کردەوە و گووتی: تۆ گەمژەیت. خودای زۆرمان هەن. هوبەل و مەنات و للات و عوززا.. چۆن جێیان دێڵیت بۆ ئەوەی باوەڕ بە خودایەک بهێنیت کە نایبینیت!

تەنها یەک وشەم لەسەر زوبانم دۆزیەوە، پێم وابێ هەر نەشمەتوانی جگە لەوە شتێکی دی بێژم.

گووتم: احد، احد.

ئەگەر تفم لە ڕوخساری بکردایە هیچ کات بەو شێوەیە تووڕە نەدەبوو کە گوێی لەو وشەیە بوو. درکی بە کاریگەریەکەی کرد لەسەرم.

بە هەموو هێزی خۆی زللەیەکی لێدام.

بە چاوانێکی پڕ متمانە بە خۆبوونەوە گووتم: ئەحەدون، ئەحەد.

وای لێهات وەک شێتان بە قامچی لێیدەدام، وەک ئەوەی ئەو وشە ئەوپەڕی سوکایەتی بووبێت بۆ خۆیی و خێزانەکەیشی.

خاڵی لاوازیم دۆزیەوە.

ئەویش خاڵی بەهێزی منی درک پێکرد.

احد احد.

◆ ◆ ◆

نیوەڕۆکەی ڕۆژی دواتر خەریکی ئامادەکردنی شتێک بوو، ئەو دەیهەویست نیشانی هەموانی بدات کە چیم پێ دەکات.. بە تایبەتی

عـورووەی ڕاسـپاردبوو بـە فرمـانی سـزادانی سەرزەنشـتکردنی ئاشـکرا و ڕاستەوخۆی من.

لاق و دەسـتم بـە زنجیـر بەسـترابوونەوە، پاشـان عـورووە حـەبلێکی بـە قاچمـەوە بەسـت و بـە شـەقامەکانی مەککـەدا دەیخشـاندم و پـڕ بـە دەنگـی هاواری دەکرد: تەماشای ئەم بەردەیە بکەن کە لە گەورەکەی یاخی بووە، تەماشای ئەم پیاوە ژنانیە بکەن کە لە سەرخۆشیتاندا گۆرانی دەگووت، ئێستا شوێن موحەمەدی کافر کەوتووە، تەماشای بکەن کاتێک سزا دەدرێت تاوەکو ببێتە پەند.

ئومەیە ئەوەی کردبووە ئاهەنگێکی ئاشکرا و خەڵکی مەککە و نەجیب زادەکانی بانگهێشت کردبوو.

ئەو باسی هەیبەت و گەورەیی و سەروەری مەککەی دەکرد کە دەبێت بگەڕێندرێتەوە تاوەکو بەردەکان لانەیەن و شوێنی موحەممەدی کافر نەکەون.

بێ شک دەبێت کەسێک پڕی کردبێت و بابەتەکەی گەیاندبێتە ئەم ئاستە لەگەڵی، لەوانەیە عورووە بوبێت، نازانم، بەڵام ئومەیە هیچ کات بەو شێوەیە و تا ئەم ئاستە ڕقی لێم نەبووە، هەروەها کەمێک خاترجەمیم هەیە کە ئەو بەو شێوەیە خوداوەندەکانی کەیف پێ نەدەهات. زۆرباش دەزانم. بەڵام لەوانەیە ڕێز و شکۆی بریندداربوبێت لەوەی یەکێک لە بەردەکانی لە فرمانەکەی دەرچووە، بەردەیەک لە نزیکترین بەردەکان لێوەی و متمانەپێکراوترینیان، هەروەها ئەوەش دزە بکات و بە ناو هەموو مەککەدا بڵاو ببێتەوە.

دەیهەویست بە ئاشکرا و لە پێش چاو هەمووواندا بگەڕێمەوە.. بۆ ئەوەی شکۆ و سەروەری بۆ بگەڕێنمەوە، نەوەک سەروەری خوداوەندەکان وەک دەیگووت.

بەڵام من خۆمم یەکلایی کردبۆوە.. احد احد .

هەر وشەیەک کە دەمزانی سڕیمەوە لە میشکمدا، هەموو ئەوانەی کە دەمزانی لە پیتەکان، هیچ شتێک نەمابوویەوە لە ئەلف و با لای من جگە ئەو سێ پیتەی وشەی احدیان پێک دەهێنا..

زوبانم بە هیچ لایەکی دیکەدا نەدەچەرخا.

دەستەکانی عورڕوەُ هیلاک بوو لە تاو لێدانم، وا دەردەکەوت، منیش هەر دەمگووت ئەحەد ئەحەد..

ئومەیە فەرمانی کرد بەوانی دیکە کە یارمەتی عورڕوە بدەن، بە هەموویانەوە تێیان هەڵدەدام، چیدی ژمارەیانم جیا نەدەکردەوە، لەوانەیە سێ یان چوار بووبن..

ئومەیەش شێتی دایگرتووە، دەیەویست بە ئاشکرا شکۆی بۆ بگەڕێتەوە، بەڵام بێدەنگیم بە ئاشکرا ڕیسوای دەکرد.

پێ دەچێ لە ساتێکدا پەشیمانی دایگرتبێت لەوەی کە هەر لێی پرسیم لە بارەی باوەڕەکەمەوە..

بەڵام من هەستم بە پەشیمانی نەدەکرد لەبەر ئەوەی گووتم: احد احد

ئەرێ، ئازار وەخت بوو دەیکوشتم، بەڵام من دەمزانی کە کەرامەتی ئومەیە و خوداکانی پتر ئەو ئازار دەدات..

شتێکی دیکە هەبوو کە ئازاری دەدام جگە قامچی و لێدانەکان..

ئەو هەستەم بوو کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمهەویست وەک کوڕی خۆی تەماشام بکات.

ئەوە بە ئازارتربوو لە قامچییەکان..

◆◆◆

پاشان نازانم چۆن بە بیری ئومەیەدا هات کە بەردێک لەسەر سنگم دابنێت.

ئەشکەنجەدانەکە ئاسایی بوو، بە لێدان و قامچی و ڕاکێشانی پەلەکانم شکستی خوارد لە گەڕاندنەوەی شکۆی.

بیری لە شتێکی گەورەتر کردەوە. شتێکی زۆر توندتر.

ئایا ئەوە بیرۆکەی ئەو بوو یاخود عورەوە..

نازانم.. بەڵام لە پڕێکدا، ئەوە ئەوانن بەردەکە ڕادەکێشن، ڕەق وەک دڵەکانیان، دایدەنێن لەسەر سینگم..

لەوانەیە ویستبێتی بمرم، بەڵام نەک بە خەنجەر وەک ئەوەی (سومەیە) و (یاسر)یان پێ کوشت، ئەو دەیەویست بە هێواشی بمکوژێت، لەبەر ئەوەی ئیدی هەموو کات وا بیر دەکاتەوە کە بژاردەی گەڕانەوەم هەبوو بۆ بتەکان و قوتارکردنی خۆم، بەڵام من ڕەتم کردووەتەوە..

بەردەکە لەسەر سینگمە، لە ژێریدا شێلراوم، بەڵام دەنگم هێشتاش دەڵێت: احد، احد.

چیدی کۆنترۆڵم بەسەر دەنگە ژێیەکانمدا نەمابوو. ئێستا لە ژێر فەرمانی من دەرچووە. گوێم ها پێوەی کە دەڵێت (احد، احد)، لە کاتێکدا من بێ توانام لە گووتنی هەر شتێک یاخود لە کردنی هەر شتێک.

(احد، احد)ئەوە هەموو شتێکە کە بەر گوێم دەکەوێت.. لە دەرەوەی منیشە.. بەڵام من زوو زوو نامێنم.. وام لێدێ کە هەست بە هیچ ناکەم..

لە ناکاو گوێم لە دەنگێکی ئاشنا دەبێت.. کە لەگەڵ ئومەیەدا قسە دەکات..

ئەوە دەنگی مەحەمەدە؟ ئەبوبەکر؟ ئایا دەنگی وەرەقەیە؟ دەنگەکان لە نێو مێشکمدا تێکهەڵاتبوون کە جگە احد، احد هیچ شتێکی دیکەی تێدا نەمابویەوە.

نازانم. بەڵام ئومەیە ئاشکرای دەکات کاتێک دەدوێ و دەڵێت ئەبوبەکر.

کەواتە ئەبوبەکرە.

گوێم لە چەلەحانێی نێوانیانە بەڵام لاوازم لە تێگەیشتنی. هێشتاش هەر دەنگە ژێیەکانم دوبارەی دەکردەوە (احد، احد).

لە پڕێکدا... بەردەکە لەسەر سینگم لادەبرێت.

چی ڕوودەدات؟ نازانم. هەر بەردەوامم لە گووتنی (احد،احد).

زنجیرەکان لە دەست و لاقم دەکرێنەوە، بە تەواوی چی ڕوودەدا لێرە؟ نازانم. بەڵام من دەڵێم (احد، احد). چیدیکەم نەدەزانی جگە ئەم وشانە.

یەکێک یارمەتیم دەدات لە هەستانەوە.

احد، احد.

لە دوای ئەوە هیچی دیکەم بیر نایەتەوە.

◆ ◆ ◆

لە نیوەی شەودا وەخەبەر هاتم.

لە هەموو شوێنی برینەکانم برین پێچ هەبوو. پتر لە کەسێکیش لە بەردەمم وەستابوون.

لە نێویاندا عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکر بوو، هەموو شتێکی بۆ باس کردم. ( عبدالرحمن )

ئەبوبەکر بە بەردەیەکی دیکە گۆڕیومیەتەوە. ئومەیەش بە گرێبەستەکە قایل بووە.

پاشان گووتی: هەروەها ئازادیشی کردویت...

چیی؟!!

عەبدوڕەحمان دوبارەی کردەوە: تۆ ئازادی بیلال. ئازادی..

لەوانەیە ئەمە خەون بێت، لەوانەیە بەردەکە سینگمی شەق کردبێ و وای لێبکەم شتی گەوجانە ببینم.

چاوەکانم قوچاند.. نامەوێ شتێک ببینم کە ڕوونادات..

له بەیانیدا کە بەخەبەر هاتم لە تاو ئازار.. دیتم کە برینپێچەکان لە شوێنی خوێندان.. نە زنجیر نە بەرد لە گۆڕێدا نییە.

کچۆڵەیەکی لێبوو کە بە گلاسێک ئاو و زەردەخەنەوە هات بۆ لام.

گووتم: ناوت چییە؟

گووتی: ئەسماء. من کچی ئەبوبەکرم.

پێم گووت: دەزانی من کێم؟

گووتی: جا کێ ناتناسێت؟ تۆ بیلالیت، احد احد.. ئێستە هەموو کەس بەوە ناوت دەبات.

هەوڵمدا کە ئەوەی عەبدوڕەحمان پێی گووتم بە فکرم بێنمەوە، ترسم لێنیشت کە ئەمەش بەشێک بێت لە خەونەکەم؟

گووتم: ئایا من بەردەی بابتم؟

یەکسەر گووتی: نەخێر بە دڵنیاییەوە، تۆ بەندەی خودایت.

پاشان بە سەرسامیەوە تەماشای کرد: نەتزانیەوە؟! تۆ ئازادیت! بابم تۆی ئازاد کردووە.

◆◆◆

From: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

To: amjadhelwani@bilalmovie.org

Subject:واو

هەست بە زیاتر لە (واو)ێک دەکەم لێرەدا.

ناتوانم ئەوە بشارمەوە.

(واو) لەبەر ئەوەی نەمدەزانی کە یەهودی و مەسیحی و ئیسلام هەموویان سەر بە ئیبراهیمن.

بۆ من ئیبراهیم کەسایەتیەکی تەوراتی بوو. باسی ئەوە ناکەم کە ئایا زۆر گەڕاوم بە دوایدا یاخود کەم. بەڵام ئەوە لە مێشکمدا مابوویەوە. نازانم لە کوێ.

(واو) لەبەر ئەوەی ئەمە ئەو ئاینانە دەخاتە یەک لاوە، لە یەک چاڵدا، لە کاتێکدا لەم ڕۆژەدا وا دەردەکەوێت کە لە باردۆخێکی دوژمنکاریدا بێت (نەک لەبەر ئەوەی کە ئەمە بە شێوەیەک لە شێوەکان گرنگە بۆم، بەڵام هەر واو).

(واو) لەبەر ئەوەی بیلال لە بارودۆخی ئەشکەنجەداندا کە دەڵێت (احد، احد) گوازرایەوە بۆ ئەوەی کە ملیۆنان کەس بیڵێن لەو حەجەی کە باست کرد، ڕاستی (واو) ئەگەر ئەوە ڕاست بێت!، ئایا دەتوانن ئەمە لە فیلمەکەدا دابنێن؟

(واو) لەبەر ئەوەش کە وام زانی بوو ئەبراهام لینکۆلن یەکەم کەس بووە کە بەردەکانی ئازاد کردووە.

پێم وابوو کە ئازادکردنی بەردان شتیک بووە لە ئەمریکا ڕووی داوە.

ئێستا دەدەکەوێت کە زۆر لە ئەمریکاش کۆنتر بووە.

(واو) لەبەرئەوە.

◆◆◆

سانت بیلال.. دیسانەوە (واو). بیرۆکەیەکی زۆر جوانە.

هەر بەڕاستی بووە سانت بیلال؟

From: amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

Subject: وەڵام

خۆشحاڵم بەوەی کە بە بۆچونی تۆ زیاتر لە (واو)ێک هەیە لە چیرۆکی بیلالدا.

بۆ وەڵامی پرسیارەکە: ئایا (بیلال) بووە سانت بیلال؟

نەخێر. نەبووە ئەو شێوەیەی کە وەرەقەی کوڕی نەوفەل مەبەستی بوو.

گۆڕێکی بۆ دروست نەکرا کە سەردانی بکرێت. گۆڕەکەیشی لە دیمەشقی پایتەختی سوریای ئێستایە، هێشتاش هەیە، بەڵام گۆڕێکی کەمێک ئاساییە.

بابەتەکە ئەوەیە کە بەشێکی گەورە لە موسوڵمانان، پلە و پایەیەکی گەورە بۆ گۆڕەکان دانانێن، بە جۆرێک بە پیرۆزی نازانن.

ئەو بت پەرستیەی کە ئیسلام دژی وەستایەوە، هەر تەنها بتەکان نەبوو کە دەپەرسترا، بەڵکو هەندێک کات دەکرا کە گۆری پیاو چاکێک بێت، خەڵکی لە دوای مردنیان گۆرەکانیان بە مەزن لە قەڵم دەدا، بە شێوەیەکیش مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد وەک ئەوەی پەیکەرێک بوبێت، تەنانەت ئەگەر ناویشیان لێ نەنابێت پەیکەر و نەگوترابێت کە ڕوودەکرێتە ئەو بۆ پەرستن و پاڕانەوە..

بەڵام یادکردنەوەی بیلال بە ڕێگەیەکی زۆر کاریگەرتر بەردەوام بوو زیاتر لەوەی ئەگەر ببوایە بە سانت بیلال.

دەکرا کە گۆڕێکی بۆ دابنرێت و خەڵک قوربانی بۆ بکەن مۆم لەسەر گۆڕەکەی بسوتێنن بۆ نمونە، بەڵام بیلال کاریگەرییەکی زۆر زیاتر لەمەی بە جێهێشت...

ئەو کاریگەری و شوێن پێیەی بیلال جێی هێشت، وەک بەردەیەک باوەڕەکەی بوو کە بووە هۆی ئازادبوونی، پاشانیش پلە و پێگەکەی کە

بەدەستی هینا هەرچەندە پێشتر بەردە بوو هەروەها پێستیشی ڕەش بوو، سەرەڕای ئەوەیش عەرەب ڕەگەزپەرست بوون و، ڕەش پێستیان بە ڕەنگی پیستیان دەپێوا..

ئەم کاریگەریە، زۆر گەورەتر بوو لە گۆڕێک سەردانی بکرێت.. یاخود بتێک بپەرسترێت.

شتێکت گووتی دەربارەی لینکۆڵن و ئازادکردنی بەردەکان کە لە ئەمریکا ڕووی داوە؟

باشە، پێویست بە زیادەڕەوی ناکات، ئیسلام بەردایەتی بە تەواوی ڕەت نەکردەوە، بە لایەنی کەمەوە بە شێوەیەکی ڕەسمی و یاسایی نا وەک لە ئەمرکا ڕووی دا، شتەکە زۆر جیاوازترە، ئازادکردنی بەردایەتی لە ئەمریکا پەیوەندی بە بارودۆخی ئابووریەوە هەبوو و هۆکاری زۆر ئاڵۆزی هەیە کە لە مەودا جیاجیاکانی مێژوودا ڕووی داوە.

نەخێر، ئیسلام بە تەواوی بەردایەتی ڕەت نەکردەوە، بەڵام ڕەگ و ڕیشەی وشک کرد، ئەگەر بەو شێوەیە دەری ببڕین.

بە واتای ئەوەی لەو بارودۆخەی کەم کردەوە کە تێیدا خەڵکی دەبوونە بەردە، هەروەها سزادانی دیاریکراوی دانا کە بەسەر یەکێکدا دەسەپێت، کە پێویستە لەسەری بەردەیەک لەو بەردانەی هەن ئازاد بکات، بۆ ڕوونترکردنەوەی بابەتەکە باشتر ڕوون دەبێتەوە دەبێت گەر بێژین ، ئەگەر کەسێک لە موسوڵمانان هەستا بە لادان لە سومبولەکان و بۆنەکان بۆ نمونە، ئەوە یەکێک لەو سزا دیاریکراوانەی هەیە ئەوەیە کە هەستێت بە کڕینی بەردەیەک و ئازادکردنی، ڕێک وەک ئەوەی ئێستا دادگای ئەمریکا هەڵدەستێت بە سزادانی خزمەتکردنی کۆمەڵگا، بۆ نمونە تاوانبار بەشداری بکات لە لێخوڕینی سەیارە بە سەرشێتانە و کەمتەرخەمیەوە بۆ نمونە لە خاوێنکردنەوەی شەقامەکاندا.

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو پارەی تایبەت هەبوو لە خەزێنەی دەوڵەتدا کە ساڵانە تایبەت دەکرا بە ئازادکردنی بەردەوە.

هەروەک چۆن وەسیەتنامە و زانیارینامە هەبوو بۆ مامەڵەکردنی باش لە تەکیاندا، ئەوان لە کاتی ئازادبوونیاندا بە تەواوی وەکو ئەوانی دیکەیان لێدەهات، زۆرێک لەوان پلەی بەڕێوەبەرایەتی گرنگیان پێ ئەسپێردراوە، هەروەها زۆرێک لە زانایانی شارستانیەتی ئیسلامی لەوان بوون.

شتەکە وەلانانی نەبوو وەک ئەوەی لە ئەمریکا بە سەرپەرشتی لینکۆڵن ڕووی دا!

بەروارد کردن هەر خۆی هەڵەیە..

بەراوردکردن لە نێوان ئاستەکانی مێژوو بەو شێوەیە زوڵمێکی گەورەیە لە هەردوو ئاستەکە.

◆◆◆

## لاتيشا

پەرستار بێتی وەک هەموو کات بە زەردەخەنە پێی گووتم کە دکتۆر تشۆنغ لە ئۆفیسەکەی خۆی لەگەڵم دەدوێ.

بەڵام ئەم جارە بێتی زەردەخەنەی نەکرد.

جوڵەی جەستەی زۆر ڕەق و زبرانە بوو.

پێم وابێت ماسولکەکانی ڕوخساری لەسەر زەردەخەنە ڕاهاتبوو بە جۆرێک هەر زەردەخەنە نەکردنێکی وا دەردەکەوت کە شتێکی باش لە گۆڕێدا نەبێت.

زۆر ئومێدەوار بووم. هەروەها بەیانیەکی زۆر باش بوو، بیلال زۆر باش و چالاکتر دەردەکەوت، هەروەها قوتابیەکانیش لە پۆلدا زۆر باش بوون.

زۆر بێ مێشک بووم. پرسیارم لێکرد: بێتی.. تۆ باشی؟

بێتی بە واق وڕمانێکەوە تەماشای کردم. پاشان سەرسامی دەموچاوی زیادی کرد.

بە نیوە زەردەخەنەیەکەوە گووتی: ئەوە لە گەورەیی خۆتەوەیە، سوپاس بۆ هەواڵپرسینت.

وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوە.

لە ڕێگەمدا بۆ لای دکتۆر تشۆنغ تێگەیشتم!

بێ شک ئەنجامی پشکنین و تیشکی موگناتیسەکەیە کە هەفتەی پێشوو بۆ بیلال دووبارە کرایەوە.

دەبێت بێتی شتێک بزانێت لەسەر ئەوەی تشۆنغ پێم دەڵێت، هەر بۆیە ڕاهاتووە کە بە ئەنقەست زەردەخەنەیەک لەسەر ڕوخساری بنەخشێنێت.

لە کاتێکدا من بە بێ مێشکیەوە پرسیارم دەربارەی خۆی دەکرد.

تشۆنغ بە ڕەچەڵەک ئاسیایی بوو. هەموو کات وا دەهاتە پێش چاوم کە ئەو کەم دوو بێت، بەڵام هەستم دەکرد کە ئەو خاوەنی زۆرێک هەست و سۆزە.

ئەویش ڕوخساری نیگەرانی و مەراقێکی زۆری پێوە دیارە، دەشێت ئەرکێکی زۆر گرانی پێ ئەسپێردرابێت.

باشە، چی خراپتر هەیە لە شێرپەنجە؟

"خاتوونە لاتیشا، هیواخوازبووم کە ئەورۆ هەر خۆت نەبوویتایە".

ئۆو خودایە، چ سەرەتایەک، بەڵێ منیش هەروەها، ئاواتەخوازبووم تەنها نەبوومایە. هەر لە سەرەتاوە. نەفرەتت لێبێت سەعید لە هەر کوێ بیت. هەزار جار نەفرەتت لێبێت. لەوانەیە هەر لە یادت نەبێت کە کوڕێکت هەیە، داخۆ بگات بەوەی کە هەر بزانیت توشی شێرپەنجە بووە.

دکتۆر تشۆنغ چوویە ناو بابەتی سەرەتای مێژووی سەرهەڵدانی بارودۆخی نەخۆشیەکەی بیلال لەو کاتەوەی کە شێرپەنجەی تیدا دەست نیشانکرا، پاشان چوویە ناو بابەتی جۆرەکانی شێرپەنجەی مێشک و پۆلێنکردنی..

تەنانەت باسی ئەوەیشی کرد کە چۆنە لە ژێر مایکرۆسکۆپدا.

پاشان باسی جیاوازی ڕێژەی ڕزگاربوونی هەر یەکەیانی کرد.

پاشان گووتی کە شیکاریەکانی یەکەم، لە بازنەی ڕێژەیەکی زیاتری ڕزگاربووندا دادەنرا.

دکتۆر تشۆنغ ڕایدەکرد لەوەی کە دەیهەویست بیڵێت. ئەوە بە ڕوونی دیار بوو.

پێم گووت: ئێستە ئەنجامی شیکارییەکە گۆڕاوە؟

سەری لەقاند. ناوێکی دوور و درێژی گووت کە نەمتوانی ئەوەڵ بار لەبەری بکەم.

لێم پرسی: ئایا ئەم شیکارییە لە ڕێژەی ڕزگاربوونێکی خراپتر دایدەنێت؟

دووباره سەری لەقاندەوە. چاوەکانی لە من هەڵدەهاتن. پاشان گووتی: زۆر داوای لێبوردن دەکەم.. داوای لێبوردن دەکەم خاتوونە لاتیشا.

قسەکەیم بڕی:"پێم مەڵێ کە بەم زوانە دەمرێ" .. نازانم چۆن ئەو وشەیەم لە زار هاتە دەرێ. دەنگی خۆمم نەناسیەوە.

لە دەموچاوی دەرکەوت کە کارەکەم بۆ ئاسان کرد. دەردەکەوت لە ڕوخساریدا کە من ئەو ئەرکە قورس و گرانەم لەسەری لابرد.

گووتی پێم" خاتوو لاتیشا، بە داوای لێبوردنەوە، شتێکی زۆر نییە کە بتوانین بیکەین بۆ ئەم بارودۆخەی بیلال. حاڵەتەکە ناوی Diffused brainstem glioma، ئەوەش حاڵەتێکی زۆر بەروەپێشەوە ڕۆشتووە، بە داخەوە.. پزیشکی نەگەیشتووەتە ئەو بارودۆخەی کە بتوانێت یارمەتی ئەم حاڵەتە بدات" .

بە دەنگێکی کز و لاوازەوە گووتم: ڕێژەی ڕزگاربوون چەندە دکتۆر؟

بۆ چەند چرکەیەک لێمی ڕووانی. پاشان دوبارەی کردەوە: شتێکی زۆر نییە کە بتوانین بیکەین خاتوو لاتیشا.

دوبارەم کردەوە: مەبەستت چییە؟ هیچ ڕێژەیەکی ڕزگاربوون نییە؟

گووتی: شتەکە بەو ئاسانیە نییە، بەڵام ئەگەر ڕێژەی ڕزگاربوونمان بە سەر پێنج ساڵدا دابەش کرد، بەڵێ، هیچ ڕێژەیەکی دەرچوون نییە.

پێویستم بە چەند سانێک بوو تاوکو لەوە تێبگەم کە گووتی. ئەرێ منیش خوێندبوومەوە کە ڕێژەی دەرچوون لێی دابەش دەکرێت بەسەر پێنج ساڵدا. بەڵام هیچ کات لێم تێپەڕ نەبوبوو کە هیچ ڕێژەیەکی ڕزگاربوون بوونی نەبێت (لەوانەشە تێپەڕیبێت بەس من پێم باشتربوو کە ئاگاداری نەبم)

پێم گووت: مەبەستت چییە دکتۆر؟ سفر لە سەدا؟

بە دڵگرانیەکەوە لێمی ڕووانی کە وای دادەنێم ڕاستەقینە بوبێت، پاشان سەری لەقاند و گووتی: ژمارەیەکی لەو شێوەیە ناڵێین، بەڵام ڕێژەیەکی ڕزگاربوون نییە لە ماوەی پێنج ساڵدا.

کەمێک بێدەنگ بوو تاوەکو ئەوە وەرگرم کە گووتی.

هەستم بە هیچ شتێک نەکرد. هیچ شتێک. بەڕاستی هیچ شتێک. من لە جەستەم دەرچوبووم و لە گفتوگۆی نێوان دکتۆر تشۆنغ و خاتوو لاتیشام دەڕوانی.

لەوانەیە لەبەر ئەوە بوبێت کە هیوام دەخواست ئەمە بەسەرمدا ڕوونەدات. هەستەکانم لە پڕێکدا پوکانەوە.

لە ناکاوێکدا گوێم لە دەنگی خاتوو لاتیشا بوو کە لە جەستەمەوە دەردەچوو کە دەیگووت بە دکتۆرەکە وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێ: ئێستا من چی بکەم؟

بە بەزەییانەوە تەماشای کرد.

(تیمارکردنەکە بەردەوام دەبێت، یارمەتی کەمکردنەوەی نیشانەکان دەدات.. بەڵام نیشانە سەرەکیەکان لە ناو نابات).

ئەوهای گووت.

هەناسەیەکی قوڵم لە جەستەی خاتوو لاتیشاوە هەڵکێشا، سەرم سورما کە هیشتاش دەتوانم ئەوە بکەم، پاشان پرسیم: بیلال چەندە کاتی هەیە؟

دکتۆر تشۆنغ لە کاتێکدا ڕاستەخۆ سەیری چاوەکانمی دەکرد گووتی: چەند مانگێک. لەوانەیە لە شەش مانگ تێپەر نەکات.

ئەوەی گووت و بۆشاییەکی بۆ کردمەوە تاوەکو هەرسی بکەم. بە بێ هیچ هەستێک خۆمم دۆزیەوە هەژماری ئەوە دەکەم ئایا بیلال تاوەکو جێژنی لەدایک بوونی چواردەیەمی دەژی.

بەردەوام بوو: ڕیژەی کۆتایی ٩ مانگە.. ڕێژەیەک هەیە لە ٣٠% کەمترە کە بۆ ماوەی دوو ساڵ بژی.

هەستم بە هیچ نەکرد. نە تووڕەیی نە دڵگرانی نە شۆک نە ئازار.

هیچ هیچ.

وام هەست دەکرد وەک ئەوەی مردبێتم.

خۆمم دیت کە لەسەر کورسیەکە هەستامەوە و دەستم دەبرد بۆ دکتۆر تشۆنغ تاوەکو تەوقەی لەگەڵ بکەم، هەروەها گوێشم لە دەنگی خۆم بوو کە پێی دەگووت: سوپاس بۆ هاریکاریت دکتۆر.

دکتۆر تشۆنغ گووتی: خاتوو لاتیشا. پێم وابێت تۆ پێویستت بە دانیشتنە. کوپێک ئاو دەخۆیەوە؟

پێم گووت: نا، سوپاس. من باشم. پێویستە بڕۆم.

پێی گووتم: خاتوو لاتیشا. پێویستە کەمێک دابنیشیت. تۆ لە حاڵەتی شۆک بووندایت.

گوێم لە دەنگم بوو کە بەرز و توند بوو: من باشم.

پاشان بە دەنگێکی کەمێک نزمتر: سوپاس بۆ تۆ.

پێچم کردەوە بۆ دەرگاکە و چوومە دەرەوە بۆ ناو مەمەڕەکە. بە هەنگاوی هێواش و و ڕێک و پێک دەڕۆیشتمە ڕێوە وەک بڵێی هەواڵێکی خۆشم بۆ هاتبێت. نازانم بۆ.

بە لای بێتی دا تێپەڕیم. هەمان شێوازی ڕوخساری دووبارە کردەوە کاتێک بینیمی.

خۆمم دیتەوە کە خەندەی بۆ دەکەم و پێم گووت: سوپاس بۆ تۆ بێتی، سوپاس بۆ هەموو شتێک.

کاریگەری ئەوەم دیت کە لە ڕووی پێم گووت و بیستم کە شتێکم پێ دەڵێت، بەڵام نەوەستام..

چوومە دەرەوە بۆ شەقامەکە، زۆر بە ئارامی و بێ دەنگی باران دەباری. باران دەستی پێ نەکردبوو کاتێک چوومە ژوورێ بۆ نەخۆشخانە. هەستم کرد کە ئەوە وێنای ڕێگەی سروشت دەکات لە بەشداریکردن لەگەڵم لەوەی کە بیستم. وەک ئەوەی پێم بێژێت: بۆچی دەگریت؟ قەیدی ناکات.. من لە جیاتی تۆ دەگریەم. چەترم پێ نەبوو. گوێم پێی نەدا.

لە سانت نیکۆلا ئەڤینیودا دەسوڕامەوە و سەر میترۆی نزیک واشنتۆن هایتس نەکەوتم، پیاسەم دەکرد بێ ئەوەی ئاگام لە ڕێگەکە بێت. لە سەرەتای ئەمستردام ئەڤینیو دا، فرۆشیاری داری سەری ساڵ (کریسمس) هەبوو کە چەند هەفتەیەکی مابوو.

هاتە بیرم کە لەوانەیە ئەمە کۆتا جەژنی سەری ساڵ بێت بۆ بیلال.

بیرم کردەوە لەوەی کە زۆر ناوازەی بکەم.

بیرم لە جەژنی سەری ساڵی داهاتوو دەکردەوە، بیلال ئەو کاتە ڕۆیشتووە. من تەنیا ئەبم. داری جەژنی سەری ساڵ هەر ناکرم. ئاخر بۆ کێی بڕازێنمەوە؟

خەڵکم دەبینی دەسوڕانەوە. وا لێم دەڕوانین وەک ئەوەی یەکەم جارم بێت خەڵک ببینم. ئەو گەنجەی وەرزش دەکات. بیلال ناگاتە ئەو تەمەنە. کوڕێک و کچێکم بینی لە ژێر چەتردا و قۆڵیان بە قۆڵی یەکترەوە و پیاسەیان دەکرد. بیلال هەرگیز لەگەڵ کچێک نابێت لە ژێر چەتردا.

ئەو لە چواردە ساڵیدا دەمرێت. پێش ئەوەی هیچ کچێکی خۆش بوێت. پێش ئەوەی هیچ بژاردەیەکی ڕاست لە ژیانیدا بژاردە بکات. پێش ئەوەی بزانێت بە ڕاستی دەیەوێت ببێت بە چی.

ئێستا درک بەوە دەکەم بۆچی دکتۆر تشۆنغ پێی گووتم کە من لە حاڵەتی شۆکدام.

ئەریَ ڕاستە. من وام. بەڵام ئایا ئەوانەی لە حاڵەتی شۆکدان دەزانن کە ئەوان بەڕاستی وان؟

ئایا ئێستە ئەگەر من بچمە ناو پرمەی گریانەوە حاڵەتی شۆکبوونەکەم تێدەپەڕێنم؟

من بە تەواوی لە جیهانێکی دیکەدا بووم.

بیلال دەمریَ. نوقتە کۆتایی. ئەم جیهانەش بەردەوام دەبێت وەک ئەوەی بیلال پێیدا تێنەپەڕیبێت. وەک ئەوەی من هەر نەمخستبێتەوە ئەو جیهانە.

ڕێک وەک کەسێ وابووم کە دەرزی بەنجی لە تەوقە سەریەوە تا نوکە پێی وەرگرتبێت، بەڵام هێشتا بە ئاگایە لەوەی ڕوودەدات.. بە بێ هەستێکی ڕاستەقینە. بە بێ هیچ هەستپێکردنێک..

دەمزانی کە بەنجەکە دەڕوا و نامێنێت.

بەڵام لەو ماوەیەدا جیهان زۆر غەوارە دەردەکەوت.

گەیشتمە گۆرستانەکەی Trinity. بە لای پەرژینەکەیدا دەڕۆیشتم. فکرم لە خودا دەکردەوە. بۆ یەکەمجار لە دوای ماوەیەکی زۆر بیری لێدەکەمەوە. ئەو بوونی هەیە؟ ئایا هەست بەوە دەکات کە چی ڕوودەدات؟ ئایا هەست بە ئازارەکانم دەکات؟ ئەو بڕیاری دا کە بیلال لە ناو ئەو هەموو ملیۆن خەڵکەدا توشی ئەم جۆرە شێرپەنجەی مێشک ببێت؟ نەدەکرا توشی جۆرێکی دی لە شێرپەنجە ببێت بە ڕێژەیەکی یەک قیچ باشتری ڕزگاربوون... هەر بە لایەنی کەمەوە بۆ ئەوەی ئومێدم هەبێت. بە لایەنی کەمەوە بۆ ئەوەی بجەنگێم. نەک بچمە نێو جەنگێکەوە ڕوون و ئاشکرا دەزانم کە ئەنجەمەکەی دیاریکراوە و نوسراوە.

ئەسڵەن خودا بۆ شێرپەنجەی دروست کرد؟! بۆچی دەبوایە شێرپەنجە دروست بکات؟ بۆچی هەموو ئەم ئازارانەی دروست کرد؟

لە نێو پەرژینەکەوە گۆڕەکان زۆر ڕوون دیار بوون. دەمزانی گۆڕی کەسە گرنگ و ناودارەکان لە نیۆرکدا تەواو بوون، پاشان نۆرەی ڕووفاتی منداڵ و هەژار و نەزانراوەکان هات.

بیرم کردەوە: منداڵان.. هەژاران.. نەناسراوەکان...

وەک بیلال.. وەک بیلالەکەم..

ئەو دەکرا ڕاگوێزرێت بۆ خانەیەکی دیکە، خانەی کەسە گرنگەکان.. بەناوبانگەکان.. بەڵام ئەو زۆر بەئاسانی هەلی ئەوەی نەبوو. چ زوڵمێکە. چ زوڵمێکە.

نازانم بۆچی بیری ئەوەم کەوتەوە کە ئەمجەد نوسیبووی، لە بارەی ئەو پیاوە بەتەمەنەوەی کە دەیگووت بیلالی حەبەشی دەکاتە پیرۆزێک و سەردانی گۆڕەکەی بکرێت، پاشان بیرم کردەوە لەوەی کە نوسیبووی دەربارەی ئەو کاریگەرییەی کە لە گۆڕەکە گرنگترە..

هەرتک شتەکە زۆر بێ ئەهەمیەت بوون.. چ کاریگەرییەک و چ گۆڕێک؟

... بیلال دەمرێت.

نەگریام. بە لای گۆڕەکاندا تێپەڕیم و نەگریام. هێشتاش بەنج بووم. بەتەواوی تەڕ بووبوم. هێشتاش باران هەر بە نەرمی و هێمنی دەباری. ئاگام لەوە نەمابوو کە بە تەواوی سەرتاپام تەڕ بووە.

چومە ناو وێستگەی میترۆوە. بە ڕاستی ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ماڵەوەم نەبوو، بەڵام قاچەکانم بەو ڕێگەدا ڕایدەکێشام کە دەچێتەوە بۆ ماڵەوە.

بەنکراو و تەڕ و بێ هەست بووم.

پاشان ئاوازێکی ئاشنا خۆی کرد بە ناو گوێیەکانمدا.

لە سوچێک لە سوچەکانی وێستگەی میترۆ، یەکێک لەوانە دانیشتبوو کە مۆسیقا لێدەدەن و گۆرانی دەبێژن لە شەقامدا، ئەوانەشی کە تێپەڕ دەبن بە لایاندا هەندێک سکە و دراوی ئاسنینیان بۆ تووڕ دەدەن.

دەنگەکەیم ناسیەوە، هەموو کات لە وێستگەکانی دیکەدا دەمدیت. دەنگی خەمناک و گەرمکەرەوەیە. ددانەکانی تێک شکاوە. ڕوخساری هەمووی تێک شکاو و تێک چووە. بەهرەکەی نەبووبوە ڕزگاریکەری لە بەرامبەر ئەوەی قۆز نەبوو. بۆیە ناچاری هاتووەتە سەر گۆرانی وتنی سەر شەقامەکان. لەوانەیە چەندین جار لە دەرگای کۆمپانیا گەورەکانی مۆسیقای دابێت، لەوانەیە گەیشتبێتە زۆرێک لە دەرگاکان.

ئاوازەکە زۆر ئاشنا بوو.. خەریکبوو خۆی دە نێو بیر وهۆشمدا دادەنا، سەرەڕای ئەوەی هێشتاش بەنج بووم.

پاشان نزیک بویەوە و.. وشەکان ڕوون بوونەوە.

زەردەخەنە بکە.

سەرەڕای ئازارەکەی نێو دڵت.

زەردەخەنە بکە..

سەرەڕای ئەوەی دڵت تێکدەشکێت.

تەنانەت ئەگەر هەور لە ئاسماندا هەبوو...

بێگومان تێیدەپەڕێنیت..

ئەگەر لە نێو داخ و پەژارە و ترسەکانتەوە زەردەخەنەت کرد.

زەردەخە بکە..

لەوانەیە سبەی خۆری درەوشاوە ببینیت بە خاترت.

بهێڵە ڕوخسارت بە سوپاسگوزاری ڕۆشن بێتەوە.

شوێنەواری کاریگەری هەر ئازارێک بسڕەوە.

لەوانەیە فرمێسک زۆر لیتەوە نزیک بوبێت..

بەڵام ئەوە کاتەکەیە کە پێویستە هەوڵی تێدا بدەیت..

زەردەخەنە بکە.. چ گەرەکی بە گریان هەیە؟

**دەبینیت کە ژیانی شایەنی هەڵێکە، ئەگەر زەردەخەنە بکەیت..**

**زەردەخەنە بکە..**

**سەرەڕای ئازارەکەی ناو دڵت..**

**زەردەخەنە بکە..**

**تەنانەت ئەگەر دڵت داڕمێت.**

Smile though your heart is aching
Smile even though it's breaking
When there are clouds in the sky, you will get by
If you smile through your fear and sorrow
Smile and maybe tomorrow
You will see the sun come shining through for you
Light up your face with gladness
Hide every trace of sadness
Although a tear may be ever so near
That's the time you must keep on trying
Smile, what is the use of crying?
You will find that life is still worthwhile. If you just smile
That's the time you must keep on trying
Smile, what is the use of crying?
You will find that life is still worthwile, if you just smile

هەستم بە خۆم کرد کە دەمەوێت زەردەخەنە بکەم.

ڕێک لەو ساتەدا، یەکەم فرمێسک لە چاوانم هاتە خوارێ.

یەک فرمێسک.

لە دوای ئەوە دامە پرمەی گریان.

ئەو گۆرانیەم بە زۆرێک لە دەنگەکان بیستبوو کە گوتبوویان، زۆرن..

بەڵام ئەوڕۆ نزیکترین دەنگم لە دڵمەوە گوێ لێ بوو. دەنگی زۆر بریندار بوو.

دەنگە خەمناکەکەی پێی دەگووتم کە تێدەگات بە چیدا گوزەردەکەم و چی دەچێژم. بەنجەکە لە جەستەم ڕۆیی و بەریدام. ئێستا تێدیگەم کە چیم بەسەر دێت. ئێستا تێدەگەم واتای چییە کە دایکێک (کە پێیان گووتوە کوڕەکەی دەمرێت) گوێی لەم گۆرانیە ببێت: زەردەخەنە بکە.

سەر یەکەم شەمەندەفەر کەوتم کە هات. سەرنجی ژمارەکەیم نەدا. هێشتاش هەر دەگریام. ئەو گۆرانیە هێشتر لە ناو گوێیەکانمدا دەزرنگایەوە. وەک ئەوەی هێدفۆنێک بە مێشکمەوە بەسترابێت نەوەک گوێیەکانم.

زەردەخەنە بکە تەنانەت ئەگەر دڵت ئازار بچەژێت. زەردەخەنە بکە هەرچەندە دڵت پارچە پارچە بوبێت.. داخۆ نوسەری وشەکان درک بە ئازاری دایکێک دەکات کە تاقانەکەی دەمرێ؟ توخودا ئاخر زەردەخەنە لەم بارودۆخەدا جێبەجێ ئەبێ.

شەمەندەفەرەکە زۆر قەرەباڵەخ بوو، زۆرینەی ئەوەی لە تەک منا سەرکەوتن شوێنێکیان نەدۆزیەوە بۆ وەستان.

یەکیک لە پیاوەکان هەستایەوە و ئاماژەی بۆ کردم کە لە شوێنەکەیدا دابنیشم. نازانم ئاخۆ سوپاسم کردبێت یاخود نا، وەلێ فرمێسکەکانم وەک بارانی بێدەنگ دەبارین.

هەندێک کلێنکسی دایە دەستم. لێم وەرگرت. ئەم بارەیان گوێم لە دەنگی خۆم بوو کە سوپاسی کرد.

وشەکانی ناو گۆرانیەکە لە نێو زەینمدا بەرزتر بوو لە دەنگی شەمەندەفەرەکەش.

زەردەخەنە بکە.. زەردەخەنە بکە هەرچەندە هەورەکان لە ئاسماندا بن..

زەردەخەنە بکە..

بەڵام بیلال دەمرێ، تاقانەکەم دەمرێ.. بە خۆمم گووت.

گۆرانیەکە بەردەوام بوو( دەیبینت کە ژیان شایەنی هەلێکە، ئەگەر تـەنها زەردەخەنەت کرد).

هەوڵمدا کە زەردەخەنە بکەم..

شکستم هێنا.

پێش ئەوەی لە شەمەندەفەرەکە بێمە دەرێ لە وێستگەی کۆتـایی، وام دە فکرێ دا هات وەک ئەوەی گۆرانیەکە پەیامێک بێـت بـۆ مـن: پێویسـتە وا لـە بیلال بکەم زەردەخەنە بکات و پێ بکەنێت.

♦ ♦ ♦

## ئەمجەد

کریستین سێ ڕۆژ لەمەوە پێش بەجێی هێشتم.

بە تەواوی ڕێک پێش شێست و شەش کاتژمێر پێش ئێستا.

لەو چەند ڕۆژەی پێشوو کێشەی زۆری دەنایەوە.

هیچ هەلێکی لە کیس خۆی نەدەدا بۆ کێشە نانەوە، لە هەر جارێکیشدا توندی و ڕەقی قسەکانی و تۆنی دەنگی زیاد دەکرد، وەک ئەوەی سەبر و ئارامیم تاقی بکاتەوە.

گووتم لەوانەیە کێشەی هەبووبێت لە کارەکەی.

تا توانیبێتم هێمن بووم لە گەڵی. ئەوەش زیاتر هانی دەدا.

لە کۆتاییدا، بە بێ پێشەکی و هیچ شتێک، لە کاتێکدا من خەریکبووم لەسەر سیستەمی خەوەکە ڕادەکشام لە دوای ڕۆژێکی هیلاککەر، گووتی کە گەرەکیەتی بچێتە دەرەوە بۆ چاوپێکەوتنی هاوڕێکانی لە مانهاتن.

پێم گووت کە زۆر هیلاکم و حەز بەوە ناکەم، ئەو دەتوانێت بڕوات گەر ویستی لەسەر بوو.

تەقییەوە وەک ئەوەی هەلە ڕاستەکە کەوتبێتە ناو دەستی.

"تۆ ئارەزووی ئامادە بوونت نییە. نا لەبەر ئەوەی کە هیلاکی، بەڵکو تەنها ناتەوێت چاوت بەوانە بکەوێت کە دەزانیت لە تۆ سەرکەوتووتر و پیاوترن".

"دەمت داخە" یەکسەر گووتم.

شۆک بەسەر ڕوخساریەوە دەردەکەوت لەوەی کە گووتم یاخود بەلایەنی کەوە دەسنەنقەست ئەوەی دروست کرد، بە کاردانەوەیەکی سەرسامیەوە گووتی: چیت گووت؟

بە دەنگێکی بەرزتر دووبارەم کردەوە: دەمت داخە کریستین.

ئەو ڕانەهاتبوو کە بەو شێوەیە بێدەنگی بکەم، هەموو کات ئەو لایەنە بووم کە هەوڵی دەدا هەر کیشەیەک بە هیمنترین وشەکان چارەسەر بکات. پێشبینی ئەوەی دەکرد موناقەشەی لەگەڵ بکەم لەوەی کە گووتی. کە بۆچی ئەوان سەرکەوتووتر و پیاوترن لە من. بەلام من هەلی گفتوگۆم لەدەست خۆم دا ئەمجارە.. پێم گووت: دەمت داخە! هیچ کاتیش تەمای پەشیمان بوونەوەم نەبوو لە گفتەکەم.

بە هیمنی دانیشتم و چاودێریم دەکرد کە هەموو ئەوەی لە ناخیدایە هەڵیدەڕیژێت، زۆر زۆریش بوو.

دەمزانی کەئەو خۆشی ناوێم، نەک تەنها (کەمتر لە خۆم خۆشی دەوێم)، نا.. دەمزانی کە هەر خۆشی ناوێم، دەمزانی کە هەندێک جار لە مامەڵەکردنیدا خراپە لەگەڵم. وەلێ هیچ کات پێشبینیم نەدەکرد کە ڕقی لێم ببێتەوە.

ئێستە زانیم.

بە دڵنیاییەوە مەسەلەکە چونە دەرەوەم نییە لەگەڵی.. ئەو بەهانەیەکی دەویست بۆ ئەوەی جێم بهێڵێت. هۆکارێک وا دەری بخات لەبەر خاتری براندۆن جێی نەهێشتووم.. بەڵکو وای لیبکات وەک پاڵەوانێک دەربکەوێت کە پێی باش بووە بەردەوامی بە پەیوەندیەک نەدات کە دیوەیەتی من (کەسایەتیەکی لاوان)م و (قینم) لە هاوڕێ کوڕەکانیەتی.

خاترجەم بووم لە هەبوونی شتێک لە نێوان ئەو و براندۆن، من هەر تەماشای لایەنەکەی دیم دەکرد.

ئەرێ، من بەڕاستی نەخۆشی دەروونیم هەبوو، نەک وەک ئەو زیادەڕەویەی کە گووتی. بەڵکو بەو. من خۆشم دەویست وەک نەخۆش. وەک هۆگربوونی ماددەی هۆشبەر. من تەنانەت بێدەنگ دەبووم لە بەرامبەر خراپ مامەڵەکردن و سوودوەرگرتنی تەنانەت لەسەر ئەوە شتەیش کە لە نێوان خۆیی و براندۆندا هەیە.

من ئامادەی هەر شتێک بووم تاوەکو بمێنێتەوە.

بەڵام ئەم جارە هەستم کرد کە ئیتر بەسە.

دڵنیابووم ئەو متمانەی هەیە کە شتەکە بەو شێوەیە نیە. تەنها گەرەکیەتی لە دەستم ڕزگاری ببێت یاخود چێژ لە کۆنترۆڵ کردنەکەی بەسەرمدا ببینێت یاخود لەوانەیە کێشەیەکی هەبێت لە کارەکەی یاخود لە نامەی دکتۆراکەی کە زۆری بۆ هێناوە.

کریستین لە ماڵ چوویە دەرەوە. دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە زۆر بە توندی داخست.

چوومە دەست شۆرەکە و تەماشای ئاوێنەکەم کرد، لە دڵی خۆمدا بە دەنگێکی بەرز گووتم: نەکەی پەیوەندی پێوە بکەیت و داوای لێبوردن بکەیت... نەکەیت.

دەترسام کە بیکەم، کە لاواز ببم.

بە خۆمم دەگووت خۆ ئەو هەر جێم دەهێڵێت ئێستە بێت یان دوایی، منیش ئەوە باش دەزانم، دە با ئەوە بە لایەنی کەمەوە لە کەرامەتی منەوە بێت، هەر نا بە لایەنی کەمەوە هەڵوێستێکم هەبێت بۆ خودی خۆم. نەک لەبەر ئەوەی ئەو ویستوەیەتی جێم بهێڵێت.

دەترسام کە لەسەر هەڵوێستەکەم نەمێنەوە. دەترسام کە پەیوەندی پێوە بکەم لێی بپاڕێمەوە کە بگەڕێتەوە. هەر بۆیە هەستام بە سڕینەوەی ژمارە تەلەفۆنەکەی لە مۆبایلەکەمدا، لە هەموو شوێنێک سڕیمەوە کە وام لێبکات پەیوەندی پێوە بکەم و بگەم پێی.

گەرەکم بوو ئەو پەیوەندی بکات.

چومە دەرەوە و لەگەڵ عەبدول خواردمەوە، لەگەڵ ئەوانی دیکەش. گرنگ ئەوەی بیر لەو نەکەمەوە. بەڵام بیرم کردەوە. دەمخواست کە بیبینمەوە لە ماڵ کە بەیانی دەڕۆمەوە. یاخود تەنانەت پەیوەندی بکات.

ڕووی نەدا.

لە بەیانیەکەیدا هەموو ڕۆژەکەم بە وتنەوەی وانە بەسەربرد و گێژ بووم، چاویشم هەر لەسەر مۆبایلەکەم بوو بەڵکو ئامـاژەی هـاتنی نامەیـەک یـاخود هەر شتێک بێت.

هیچ هەر نەبوو.

لە دوای نیوەڕۆوە لەبەر ئەو چێشتخانەیەی کە هـەموو کـات بـۆی دەچێت لە مەودای نان خـواردنی کارەکـەی هەنـدێک کـاتم بەسـەر بـرد، بـەڵکو چـاوم پێی بکەوێت و شتەکان وەک ئاسایی بێت، نەمدۆزیەوە.

شەو زۆر بە خاوی دەرۆشت، مێشکیشم خوتخوتەی ئەوەی بـوو کـە بچمـە ناو فەیسبووک یان my space و ژمارەکەی بدۆزمەوە.

هـەر دە دەقـە جـارێ سـەرێک لـە فەیسـبووکەکەی دەدەم بـەڵکو شـتێک بدۆزمـەوە کـە نوسـرابێت لـە لایـەن ئـەوەوە کـە بـە بێـزاری و پەشـیمانیدا تێپەڕێت، کەچی دەبینم "چێژ بینین لـە ژیـان لەگـەڵ هاوڕێیـان لـە شکسـپیر باڕ".

بەڕاس ئەو دڵخۆشە یاخود دەیهەوێت من چاوبەست بکات.

ڕۆژی دووەم زۆر خراپتر بوو. قوتابیەکانم سەرنجی گێژی و وڕمانەکـەمیان دابوو، داوای لێبوردنم کرد لە بارەی وانەی کۆتاییـەوە، دیسـانەوە ڕۆیشـتمەوە بۆ هەمان شوێن، بەڵام هیچ.

لە شەودا ڕۆیشتم و سەرخۆش بومەوە. هەموو ئاگایم لەسەر تەلەفۆنەکـەم بـوو کـە هـیچ نـەهات. هـەموو پێـنج خولـەک جـارێ دڵنیـام دەکـردەوە کـە مۆبایلەکەم کار دەکات و پاتریەکەی تەواو نەبووە و تۆڕ کار دەکات.

لە ڕۆژی سێیەمدا نامەیەک لەوەوە گەیشت.

بە چاو تروکانێک کردمەوە. نەمدەویست داوای لێبوردن بکات. تـەنها هـەر ئامـاژەیەک بەوە بـدات کـە دەگەڕێتـەوە یـاخود هـەر شـتێک کـە بۆشـاییەکی گەڕانەوە بکاتەوە.

بەڵام نامەکە زۆر جیاواز بوو. تێیدا نوسیبووی کە ئەو چووە بۆ ماڵـەوە و پۆشاک و زۆربەی پێداویستیەکانی بـردووە و، ئەوانـەی مـاوە دواتـر دەیبـات. پێی گووتم کە گرنگی بە کۆپەر بدەم تاوەکو دەتوانێت ئەویش ببات.

کۆپەر!

ئێسـتا پیویسـتە چـاودێری سـەگەکەی بکـەم! پیاسـەی پـی بکـەم و پاشەڕۆکەی هەڵبگرمەوە! کۆپەری پیس کە دەزانیت چەندە ڕقم لێیەتی.

کۆتایم هات بەوەی تەنها ببمە بەخێوکەری سەگەکەی.

هــیچ هــەلێکی نەهێشــتبوویەوە بــۆ گفتوگــۆ. هــەلی هــیچ شــتێکی نەهێشتبوویەوە.

بـە نـاو شـەقامەکاندا دەڕۆیشـتم بـە بـێ هـیچ هۆکارێـک. بـاران دەبـاری و منیش بێ چەتر بووم . وەستام یەکێک لەو CVS انەم کڕی. هـەر بـە ڕێگـادا دەڕۆیشتم و هەستم بە هەژاری خۆم دەکرد. شایەنی بەزەیی بووم. بۆ مـاوەی چەنـد سـاڵانێک هـەر یـەک ئـافرەتم خۆشویسـتووە کـە خۆشـی نەویسـتووم، بوبومە بەردەی ئەو، خۆمم نەدەهاتە پـێش چـاو بـە بـێ ئـەو، خـۆمم بـە بـێ قایل بوونی ئەو پێ قایل نەبوو، هەڵسەنگاندنی خۆمم بەوەوە دەبەسـتەوە بـە شـێوەیەکی زۆر ترسـناک و نابـاش، ئـەو هـەموو ئـەوەی کـە فێـری بووبـو لـە دەروونزانی بەکاریهێنا بۆ ئەوەی زیاتر و زیاتر بەدوایدا بچم و زەلیلـی دەسـتی ئەو بم.

دەڕۆیشتم و هەوڵـمدەدا هـەموو ئـەو خراپیانـەی بەرامبـەر مـن کردوویـەتی بیرم بکەوێتەوە. هەوڵم دەدا خـۆم قایـل بکـەم بـەوەی جیابوونـەوەی لـێم زۆر باشترە بە شێوەیەکی دوور، چەنـد ڕۆژێکـی ئـازار بـەخش و پاشـان ئازارەکـە کەم دەکات، بەرە بەر ڕادێم..

بەزەیم بە خۆمـدا هاتـەوە، هەسـتکردنم بەرامبـەر بـە خـۆم لـە نێـوانی ڕق لێبوونەوە و بەرزەیی هاتنەوەدا بوو.

بەزەیم بە خۆمدا دەهاتەوە لەبەر ئەوەی شکستم هێنا لەوەی وا لە کریستین بکەم خۆشی بوێم یان هەر تەنانەت خوم پێوە بگرێت.

ڕقیشم لە خۆم بوو لەبەر ئەوەی کریستینم خۆش دەویست.

هەر کەسێکی ڕێک و پێگەیشتوو بێت هەرگیز کەسێکی وەک ئەوی خۆش نەدەویست.

بەڵام من وەک هەرزەکارێکی تازەپێگەیشتوو بووم لە تەمەنی سی و شەش ساڵیدا هۆگری ژنێکە کە خۆشی دەوێت، دونیا لە ڕێی ئەوەوە دەبینێت، نا بەڵکو بگرە خۆیشی لە ڕێی ئەوەوە دەبینێت، پاشانیش دوونیا.

لەوانەیە ئەوە پەیوەندی بە پەیوەندیەکەم بە دایکمەوە هەبووبێت. دەشێت شتێک ڕووی دابێت لە منداڵیمدا و وای لێکردبم کە پێشهاتی ئەوە بکەم کە بکەومە نێو داوی پەیوەندیەک وەک پەیوەندی من و کریستین.

دایکم زۆر جددی و کار ڕێک بوو، خۆشەویستیەکەی بە هێندەی ڕێک و پێکی وەرگرتن لە من دەدا پێم، قایل بوونی ئەو کاتە بوو کە شتێکی دروستم دەکرد، لە دوای ئەوەوە نەرم و نیانیەکەی قورس بەدەست دەهات، بەرە بەرەش بووبو بە ئەستەم.

کریستین ــ وەک ئەزموونزانێکی دەروونی ــ ئەمەی زوو لا ڕوون و بووبویەوە و درکی پێکردووە، جارێک یان دوجار باسی ئەوەم بۆ کردووە لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی لە نیوانماندا ڕوودەدات، پاشان بە تەواوی بێدەنگ بوو. ئەوەی وەک چەکێک بەکار دەهێنا لە کۆنترۆڵکردنمدا.

ئازاری ناخم زۆر زۆر بوو. وا هەستم دەکرد وەک ئازارێک بێت لە جەستەمدا. وەلێ ئەوە ئازارێک بوو کە هەموو جەستەمی تەنیبوو. بەوەش نەدەوەستا تا ڕۆحمی دەبرد. شتێک کە بە ئاسایی بڕوام پێی نەبوو. بەڵام ئێستە، ئەم ئازارەش: ئەرێ، ڕۆح بوونی هەیە.. ئەویش پارچە پارچە دەبێت و تەنگ دەبێت.

هیوام دەخواست کە بڕوام بە خودا هەبوویا. خاترجەمم کە ئەوە زۆر سوودی بۆم دەبوو. بێ شک بڕواداران بە خودا سەبووری دەدۆزنەوە کاتێک نوێژ دەکەن و داخوازی پشت و پەنا لەو دەکەن. بێ گومان کاتێک کەسێکی خۆشەویستیان لە دەست دەدەن، خۆڕاگرتر دەبن زیاتر لەوەی کە من هەمە.

بەشی کافر لە من یەکسەر بە دەنگێکی بەرز و بە بێ ئەوەی گوێ بە ئازارەکانم بدات گووتی: هەر بۆیە ئاینەکان وەک بەنج و بێهۆشکەر ناسراون و لە قەڵم دراون.

بەشی شک و گومانیش لە من بە دەنگێکی نائومێدەوە گووتی: ئازارکوژێکی ڕاستەقینە. کە خەیاڵ نییە.

تەماشای ئاسمانم کرد، هیشتاش بە هەورەکان داپۆشرابوو و هەر بارانیش دەباری.

وەک ئەوەی لەگەڵ خودایەکدا بدوێم کە باوەڕم پێی نییە گووتم: ئەگەر هەیت و لەوێیت، نیشانەیەکم بدەرێ.. بەڵگەیەم بدەرێ لەوەی کە هەیت... هەر شتێک بێت.

ئاسمان بە بێدەنگی مایەوە. بە نەرمی دەباری.

بە ناو شەقامەکاندا دەڕۆشتم و دڵم لە خۆم دامابوو، لە ناو شەقامەکانی نیۆرکدا ڕێم دەکرد بۆ چەندین کاتژمێر لە ژێر ئەو بارانەدا، هێندە لە ئۆتۆمبێلەکەم دوورکەوتبوومەوە کە زۆر قورس بوو گەڕانەوە بۆی. لە خۆم ڕامام کاتێک تەواشا دەکەم بیرم لە کۆپەر دەکردەوە. پێویستە بگەڕێمەوە ماڵەوە بۆ ئەوەی خواردنی بدەمێ و بیبەمە دەرێ بۆ ئەوەی خۆی خاڵی بکاتەوە. یەع لە من. گەرەکم بوو قایلی بکەم لە ڕێی چاودێری کردنی کۆپەرەوە. تاوەکو ئێستاش هەر دەمەوێت قایلی بکەم.

ڕووم کـــردە وێســـتگەی میترۆکـــە بـــۆ ئـــەوەی بگەڕێمـــەوە بـــۆ لای ئۆتۆمبێلەکەم. بە ئازارەوە بیرم کردەوە تۆ بێژی هەر بـە خەیاڵیـدا بێـت. بـە فکرمـدا هـات لەوانەیـە ئێسـتا لـە تـەک براندۆن یـاخود هـەر دانەیـە لـە کۆمەڵەکەی بێت، لەوانەیە لە هەر یانەیەک بێـت لـە ناوەڕاسـتی شـار، یـاخود لە هەر شوێنێکی دیکە.

به دڵتەنگیەوە بیرم کردەوە: ئایا بە خەیاڵی دا دێت؟

چومە ناو وێستگەی میترۆکە و وەک تەرمێکی جوڵاو وابووم.

لە کاتێکدا چەترەکەم دادەدایەوە، دەنگێکی خـەمبار بـەر گـوێم کـەوت بـە ئاوازێکی ئاشنا.

ڕۆشتمە ژوورەوە و دەنگەکە هەموو گیـانمی تـەنی، دەنگێکـی خـەمبار کـە خاوەنەکەی یەکێک لەوانەیە لـە نـاو ویسـتگەی میترۆکانـدا گـۆرانی دەبێـژن و ئەوانەی کە بە لایاندا تێپەڕ دەبن هەندێک دراوی ئاسنینیان بۆ فڕێ دەدەن.

بەڕاسـتی دەنگەکـەی زۆر نـاوازە بـوو.. لـە قـوڵایی قوڕگیـەوە گـۆرانی دەگووت، وەک ئەوەی لەسەر تەلی دەنگە ژێیەکانی مۆسـیقا لێبـدات لـە تـەک گیتارەکەیشیدا..

زەردەخەنە بکە.

سەرەڕای ئازارەکەی نێو دڵت.

زەردەخەنە بکە..

سەرەڕای ئەوەی دڵت تێکدەشکێت.

تەنانەت ئەگەر هەور لە ئاسماندا هەبوو...

بێگومان تێیدەپەڕێنیت..

ئەگەر لە نێو داخ و پەژارە و ترسەکانتەوە زەردەخەنەت کرد.

زەردەخەن بکە..

لەوانەیە سبەی خۆری درەوشاوە ببینیت بە خاترت.

بهێڵە ڕوخسارت بە سوپاسگوزاری ڕۆشن بێتەوە.

شوێنەواری کاریگەری هەر ئازارێک بسڕەوە.

لەوانەیە فرمێسک زۆر لیتەوە نزیک بوبێت..

بەڵام ئەوە کاتەکەیە کە پێویستە هەوڵی تێدا بدەیت..

زەردەخەنە بکە.. چ گەرەکی بە گریان هەیە؟

دەبینیت کە ژیانی شایەنی هەڵێکە، ئەگەر زەردەخەنە بکەیت..

زەردەخەنە بکە..

سەرەڕای ئازارەکەی ناو دڵت..

زەردەخەنە بکە..

تەنانەت ئەگەر دڵت داڕمێت.

من ئاشقی ئەو گۆرانیە بووم.

لە هەرزەکاریەوە ئاشقیم. بە دەنگی هەموو ئەوانەی کە گووتویانە. هەموو کۆپیەکانی ئەو گۆرانیەم لە ئاپیادەکەم دانابوو. بە تایبەتیش بە دەنگی سترایساند حەیران دەبووم.

وەلێ ئێستا.. ئەم گۆرانیە و ئەم وشانە بۆ ئێستا دێن.

وشک بووم.

ئایا ئەمە وەڵامدانەوەی ئەو خودایەیە کە بڕوام بە بوونی نییە؟!

ئەمە وەڵامەکەیەتی، کاتێک کەمێک پێش ئێستە لە ژێر باران لەگەڵی دووام، کاتێک داوام لێکرد کە پێم بێژێت ئەو بوونی هەیە؟

بەشی کافری ناو ناخم گووتی: گەمژە مەبە. ئەوە ڕێکەوتە. دەشێت جگە ئەوە هیچی دیکە نەبێژێت. لەوانەیە هەمان لیستی گۆرانی بلێتەوە هەموو ڕۆژێک.

بەشی بە گومانی ناو ناخیشم دەیگووت: بڕۆ و لێی بپرسە!

له بەرامبەری ڕاوەستام. زۆر بە دەرۆزەکەران دەچوو. بەردەوام بوو لە گۆرانییەکە، پاشان زەردەخەنەی کرد و چاوەکانی قوچاند وەک ئەوەی بفڕێت.

دە دۆلاریەکم لە پارەکانم دەرکرد و لە بەردەمیدا دامنا لەگەڵ دراوە ئاسنیە پەرش و بڵاوەکاندا.

زەردەخەنەیەکی سوپاسگوزارانەی کرد و کڵاوەکەی سەری بەرزکردەوە و سەری ڕێزی دانەواند و دانە تێکشکاوەکانی دەرکەوت. بە دڵنیاییەوە بیمەی تەندروستی نییە.

پرسیارم لێکرد: دەتوانم پرسیارێکت لێبکەم؟

گووتی: بە دڵنیاییەوە، بپرسە.

گووتم: ئەم گۆرانیە، زەردەخەنە بکە، ئایا بە بەردەوامی دەیڵێیت؟ ئەوە لە پلانی ڕۆژانەتدا هەیە بۆ گووتن یاخود لەو کۆمەڵە گۆرانییەیە کە بە بەردەوامی دووبارەی دەکەیتەوە؟

گووتی پێم: هەرگیز، لەوانەیە بۆ چەند ساڵێکی زۆر بێت کە نەمچڕی بێت، لەو کاتەوەی کە گۆرانیم لە یانەکاندا دەگووت و کرێیەکم لەسەر گۆرانی گووتنەکەم وەردەگرت.

پاشان بە زەردەخەنەیەکی خەمبارانە و بە دەنگێکی نزم گووتی: ڕۆژێک لە ڕۆژان لە فێگاس گۆرانیم دەگووت. ئەوە پێش سی ساڵ بوو.

سەری سوپاسگوزاریم ڕاوەشاند و خەریک بووم دەڕۆشتم.

بەڵام ئەو بەردەوام بوو: شتێکم لە دڵمدا دۆزیەوە کە پێی دەگووتم بیڵێم. وەک ئەوەی خودا پێی گووتبم ئەوە بکەم. دڵنیا نەبووم کە بتوانم وشەکانیم بیر بێتەوە.. بەڵام ئەو بە ڕێگەیەک یارمەتی دام.

وشک بووم. بە بێ دەنگی و وەستاوی مامەوە.

ئەوە دەچێتە ئەقڵەوە کە بیستم؟

پـێش ئێستە ڕووبەڕوی بومـەوە و داوای بەڵگەیـەکم لێکـرد. پاشـان ئـەم پیاوە پێم دەڵێت کە خودا پێی گووتوم بە تایبەت ئەم گۆرانیە بڵێم.

زەردەخەنەم کرد.

پاشان تێپەڕیم و وشەکانی ناو گۆرانیەکەش لە گوێمدا دەزرنگایەوە.

بەشی کافری ناو ناخم دیسانەوە گووتی: تەنها ڕێکەوتێکـە. هـەر نـەدەبوو داوای بەڵگە بکەیت لە ئەوەڵەوە.

بەشی بەگومانی ناو ناخیشم گووتی: لەوانەیە.. بەڵام خۆ داوات کرد.

زەردەخەنەم کرد.

بیرم کەوتەوە کە چۆن ئەو گۆرانیە بۆم گرنگ بوو لە هەموو کێشەکانمدا، هەروەها چۆنیش لە کاتێکی پێشبینی نەکراودا هات.

ئەریّ، ئاسمانم تەنراوە بە هەوری زۆر، بـەڵام خـۆر هـەر هەڵـدێت، دەزانـم کە ئازارەکەم کۆتایی پێدێت ڕۆژێک. مـن دەسـت لـە خۆشویسـتنی کریسـتین هەڵدەگرم.

شەمەندەفەرکە هات، قەرەباڵەخییەکـە پـاڵی پێـوە نـام و یەکسـەر خـۆمم لەبەردەم شوێن دانیشتنێکی بەتاڵدا دۆزیەوە، تێفکریم. بەڵگەیـەکی دیکـەش؟ دووبارە زەردەخەنەم کردەوە.

بیرم لە بیلال دەکردەوە. لـە هـەردوو بیلالەکـە. بیـرم کـردەوە کـە بیلالـی یەکـەم لـە لای ئومەیـە بـەردە بـوو، ئـەوەی دووهـەمیش بووەتـە بـەردەی شێرپەنجە، هەروەها یەکەم بە بڕواکەی لە دەستی ئومەیە ڕزگاری بوو.

هاتە ناو فکرمـەوە کـە منـیش وەک هـەرتک وام، بـەردەی پەیوەندیەکـەمم لەگەڵ کریستین.

وا هاتە پێش چاووم کە کریستین پتر لە ئومەیە بچێت وەک لە دایکم!

ئاواتم دەخواست کـە پێـی بڵـێم و بـۆی ڕوون بکەمـەوە کـە ئومەیـە کێیـە تەنها بۆ ئەوەی تووڕەی بکەم.

سەرنجی ئافرەتێکمدا کە لە بەردەممدا وەستابوو. وەک پارچەیەکی بەجێهێڵراو لە ژێر باراندا تەڕبوو، زۆر هیلاک و خەمبار و دڵگران دەردەکەوت، پێشم وابێت دەگریا.

منیش خۆم هیلاک بووم چونکە چەند کاتژمێرێک بە پێ گەڕابووم، بەڵام هەستامەوە و ئاماژەم بۆ کرد بۆ شوێنی دانیشتنەکەم. لەبەر خۆیەوە شتێکی گووت پێم وابێ گووتی سوپاس. سەرنجم دا کە بەڕاستی دەگری. فرمێسکەکانی بە بێدەنگی دەهاتە خوارێ، وەک باران.

خۆزگە دەمتوانی (زەردەخەنە بکە)ی بۆ بێژم، بەلام بە دڵنیاییەوە دەنگم وای لێدەکرد ئەوەندەی دیکە بگریەت.

بەوە بەسم کرد کە کلێنسێکی بدەمێ. لە ڕاستیدا کۆمەڵێک کلێنسم دایێ. چونکە وا پێشبینیم کرد کە یەک دانە بەس نەبێت بۆی.

ئەم بارەیان گوێم لێی بوو گووتی: سوپاس.

بەڵام من تەنها زەردەخەنەم کرد.

♦ ♦ ♦

## بیلال

پێشنیار دەكەم بۆ ئەمجەد كە فیلمەكە بە ڕەش و سپی بێت تاوەكو ئەو كاتەی بیلال ئازاد دەبێت.

یاخود ڕەنگەكان تاریک بن بە لایەنی كەمەوە تاوەكو ئازاد دەبێت، پاشان روون ببێتەوە.

پیم وایە دونیا ڕەش و سپی بووە بۆ هەر بەردەیەک... لە نێویشیاندا باپیرانم. ئەوان لە دونیایەكی دوو ڕەنگ دەژیان.

بێ شک بیلالیش هەر بەم شێوەیە بووە.

تاوەكو ئازادكرا.

تاوەكو هەناسەدانی دەشێت ئەوە جیاواز بوبێت.

لەوانەیە ئەگەر ئەوە بە ڕوونی لە فیلمەكەدا دەربخەن زۆر جوانتر ببێت.

◆ ◆ ◆

بۆ من هەموو كات ڕەنگەكان تۆخ بوون. هەموو كات بە ڕەش و سپی.

لەوانەیە پێش پۆلی پێنج هەندێک رەنگ هەبووبێت.

بەڵام لەو كاتەوەی هاتینە ئێرە، رەنگەكان زیاتر بەرەو تاریكی دەچوون، مەگەر جار نا جارێ..

پاشان شێرپەنجە هات.

بۆریەكانی كانۆلا كە زۆر بە سەختی لە ناو دەمارەكانم دادەنرا، دكتۆرەكان جار لە دوای جار هەوڵیاندەدا لەگەڵم..

دەرمانی كیمیایش.. ڕشانەوە.. سەرگێژ خواردن.. هیلاكی.

هەموو كات ڕەنگەكان تاریک بوون.

تاوەكو فیلمەكە هات..

تا ئەو کاتەی هەواڵی ئەم فیلمە هات کە ناوی من هەڵدەگرێت.

ناوەکەم هەموو ئەو شتەیە کە لە باوکمەوە بۆم ماوەتەوە، ئەو باوکە کە هەرگیز نەمدیوە.

هەستم بە ڕەنگێک کرد لەگەڵ هەواڵەکەدا.

ناوێکی گەورە هاتە خەیاڵم لەسەر شاشە..

خەیاڵم کردەوە کە فیلمەکە زۆر سەرکەوتوو دەردەچێت، هەموو کەسێکیش بەوە منیان بیر دەکەوێتەوە کاتێک کە ڕۆشتووم..

لە خەیاڵمدا دەپاڵێورێت بۆ خەڵاتەکانی ئۆسکار، دەشیباتەوە، ئەو ناوە هاتە پێش چاوم کە لە هۆڵێکی گەورەدا دەوترێت، دەنگی چەپڵەکانیش بەرز دەبنەوە..

دەهاتە پێش چاوم کە ناوەکە چی بە هەموو قوتابخانە دەکات.. چۆن ومایک بە تایبەتی..

دیاناشم هاتەوە یاد.. هاتە پێش چاوم کە پەشیمان دەبێتەوە لەسەر گرنگی پێنەدانی بە من..

هەموویان هاتنە پێش چاوم کە لە تاو پەشیمانی ئازار دەچێژن، لە دوای ئەوەی کات درنگ بوو.

♦ ♦ ♦

هاتە پێش چاوم کە باوکم بیری منی دەکەوێتەوە کاتێک پۆستەری فیلمەکە دەبینێت.

دەگەڕێت بە دوامدا..

بەڵام نامدۆزێتەوە..

♦ ♦ ♦

بەڵام دوای کەمێک، هەستم بە گەمژایەتی ئەوە کرد کە بیرم لێکردووەتەوە.

لەوانەیە هەندێکیان هەست بە پەشیمانی و شەرمەزاری بکەن، بەڵام هەموو ئەوەی فیلمەکە دەیکات ئەوەیە کە وایان لیدەکات ئەو کورپە قەڵەوەیان بیر بکەوێتەوە کە زۆر لاواز بووە لە دوای ئەوەی توشی شێرپەنجە بووە.

هەروەها لەوانەیە هەندێکیان بچن بۆ تەماشاکردنی فیلمەکە، گەنمەشامیش بخۆن لە کاتی سەیرکردنیدا، پاشان بە دڵخۆشیەوە بێتە دەرەوە و چێژی لە فیلمەکە دیبێت، وەلێ هەر بیریشی بە لای مندا نەچوبێت..

تەنانەت کە فیلمەکە خەڵاتی ئۆسکار بەدەست دێنێت وایان لێناکات کە بیری منیان بکەوێتەوە..

ئەوەی دایکم نازانێت ئەوەیە کە من ڕێک زانیم بە دەست چییەوە دەناڵێنم، ئەو ڕۆژەی کە پارچە ڕیکلامی فیلمەکە دەرچوو.

دەمزانی کە توشبووی شێرپەنجەم. بەڵام نەمدەزانی چ جۆرێک.

کاتێکیش نازانیت، ئەوە هەموو شتێک ئەگەری هەیە، دەکرێت لەو شێرپەنجانە بێت کە ڕێژەی ڕزگاربوون لێی دەگاتە ٩٠ %، دەشکرێت بگاتە ١٠ %.

ئەو ڕۆژە، گوێم لە بێتی بوو لەگەڵ دایکم قسەی دەکرد. بە چپە پێی گووت، من چاوم داخستبوو.. بەڵام نەخەوتبووم. تەنها زۆر لەوە ماندووتر بووم کە بتوانم چاوەکانم بکەمەوە، ئەوە لە دوای چارەسەر بە تیشکدانەوە بوو.

گوێم لێی بوو.. هەندێک پیتی کورتکراوە هەبوو کە توانیم لەبەریان بکەم..

DIGP

هەروەها دوو وشەی ڕوون و ئاشکراش هەبوون.

Brainstem glioma

دوور کەوتنەوە. دەستم درێژ کرد بۆ موبایلەکەی دایکم. لەسەر مێزەکە جێی هێشتبوو.

چوومە ناو گۆگڵەوە.

زۆر نەگەڕام.

زۆر بە خێرایی سەرژمێریەکەم دۆزیەوە.

سفر لە سەد.

سفر لە سەد.

من دەمرم. بەم نزیکانەش.. بە لایەنی زۆرەوە چەند مانگێک. لەوانەیە ٩ مانگ.

چاوەکانم داخست. پێم وابێ خەوتم. زۆر بیرم نایەتەوە لە بارەی هەستەکانمەوە. لەوانەیە هەر بە بێ هەست بوبێتم. لەوانەیە ئەم جۆرە شێرپەنجە هەستەکان لە ناو بەرێت. لەوانەیە بەشی تایبەت بە هەستەکان بخوات لە مێشکدا. لەوانەیە هەر ئەمە باشترین بووبێت.

هەموو ئەوەی کە بیرم دێتەوە ئەوەیە کە هەستم کرد ئەم ئازارە زۆر ناخایەنێت و زوو تەواو دەبێت.

خەوتم.

کاتێک چاوم کردەوە دایکم شاشەی ئایپادەکەی لە بەردەمم دانابوو.

بە دڵخۆشیەوە گوتی: سەیرکە، ڕیکلامی فیلمی بیلال، ئەمڕۆ دەرچووە. بێگومان فیلمێکی شاز دەبێت.

بیرم کردەوە: لەوانەیە، بەڵام من نایبینم.

◆◆◆

ئەو شەوە، خەونم بە باوکمەوە دی.

زۆربەی کات خەونم پێوە دەبینی، دەبێ ئەو بێت، لەبەر ئەوەی زۆر لەو کەسە دەکات کە لە ناو ڕەسمەکەدایە، جارێکیان خەونم پێوە بینی کە فێری مەلەوانی دەکردم، هەروەها خەونم پێوە بینی کە بردمی بۆ یاری کۆتایی super bowel، زیاتر لە جارێکیش خەونم پێوە دەبینی کە لەتەکماندایە لە ماڵەوە. تەنها هەیە.

ئەم جارەیان خەونم پێوە بینی کە دێتە ناو ژوورەکەم و، پۆستەرێکی گەورەی بەدەستەوەیە و دەیلکێنێت بەو دیوارەی کە بەرامبەر جێگەی خەوەکەمە، هەموو پۆستەرەکانی دیکەی شاردەوە.. ڕێک لەو شوێنەدا داینا کە هەموو پۆستەری وای جی وویزی خستە پشتی خۆیەوە و دایپۆشی، ڕێک لە پۆستەرکەوە دەردەکەوت کە ناونیشانێکی بە دەستەوە بوو بە ناوی (ئاگات لە خۆت بێت)، بەشێک لە پۆستەری یاریزانی بەیسبۆڵ ئەلێکس ڕودریگزیش دەرکەوتبوو.

پۆستەرەکە ناونیشانی فیلمەکەی هەڵگرتبوو. بیلال. بە پیتی گەورە.

پیتەکان لە تاریکیدا درەوشاوە دەردەکەوتن لە بەرچاوم.

باوکم پۆستەرەکەی دانا و ڕۆشتە دەرەوە.

بە ترس و تۆقینەوە خەبەرم بوویەوە شەڵاڵی ئارەقە ببووم. بیلالێک نەبوو، هەموو پۆستەرەکانیش وەک خۆیان بوون.

بەڵام هەستم کرد کە دەبێت زیاتر لە بارەی بیلالەوە بزانم.

ئەوە هەموو شتیکە باوکم بۆی بەجێ هێشتووم.

◆ ◆ ◆

لە هەوڵدام کە چیرۆکەکەی بیلال تێبگەم.

باوکم گەرەکیەتی چی بە من بێژێت.

ئەگەر بیەوێت شتێکم پێ بڵێت.

چی لە ناو ناوەکەیدا هەیە، لە سەرگوزەشتەکەیدا، دەشێت پەیامێک بێت بۆ من.. دەبێت شتێک هەبێت.

بێ گوومان شتێک هەیە.

♦ ♦ ♦

ناوەکەی وەک ناوی منە.

ڕەش پێستە وەک من.

باوکیشی نەدەناسی وەک من.

ڕووبەڕوی توانج و تەشەر دەبوویەوە وەک من.

بەڵام.. چی دیکە؟

ئایا بەردایەتیەکەی هاوشێوەی شێرپەنجەیە؟

بەڵام ئەو سەرکەوت..

من هەلێکم نییە.

تەنانەت یەک هەلیش.

سفر لە سەد.

♦ ♦ ♦

## لاتيشا

شەوەکەی، هیوام دەخواست کە بتوانم حەبێکی خەو بخۆم، دوو دانە، یان سییان و، بۆ ماوەی دە کاژێر بخەوم.

بەڵام دەبوایە ڕووبەڕوی ئەو پرسیارە ببومایەتەوە کە لە دکتۆر تشۆنغم کرد: چی بکەم ئێستا؟

هەوڵمدا کە بە شێوەیەکی سروشتی لەگەڵ بیلال مامەڵە بکەم. خواردنی ئێوارەم بۆ دروست کرد، لە کاتی ئەوەدا فرمێسکەکانم بە زۆر ڕادەگرت، هەوڵم دەدا کە (زەردەخەنە بکە)بهێنمەوە یادم.. دانیشتین پێکەوە بۆ خواردنی ئێوارە. زۆرم لە خۆم کرد کە بخۆم بەڵام حەزم دەکرد بڕشێمەوە.

هەروەها زۆرم لە خۆم دەکرد کە نوکتە بگێڕمەوە و بە سروشتی ڕەفتار بکەم وەک ئەوەی هیچ نەبوبێت، زۆر زیاتر لە سروشتی بە سروشتیانە هەڵسوکەوتم دەکرد!، بێ گومان بیلالیش سەرنجی ئەوەی دا.

خەریکبووم لەوە ڕامدەکرد کە ڕاستەوخۆ سەیری چاوەکانی بکەم، تاوەکو کەشفم نەکات، تاوەکو نەزانێت چی دەشارمەوە.

پاشان ئەمە وەک بروسکە لێیدام: کاتەکەم لە ئێستەوە دیاریکراوە، تەنها چەند مانگێکم هەیە بۆ ئەوەی تەماشای بکەم، بۆ ئەوەی چاوەکانم لێی پڕ بکەم. کەچی من هەلەکە لە دەست خۆم دەدەم بە هەڵهاتن لە تەماشاکردنی.

دابووی لە دڵم کە بیگرمە باوەش و، ماچی بکەم، بەڵام نەمکرد، نا نەوەک لەبەر ئەوەی هەست بە هەبوونی شتێک بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەو کاتەوەی کە گەیشتە تەمەنی دەساڵی، چیدیکە قبوڵی هیچ جۆرە هەست و سۆزێک نەکرد، ماچکردن یان باوەش، هەر وەک خوی هەموو هەرزەکارێک کاتێک حەز بەوە دەکەن جیا ببنەوە لە منداڵیان و هەر شتێک کە پەیوەندی بەوەوە هەبێت.

بـیلال ڕێگـەی لێگـرتم لـە مـاچکردن و لـەباوەش کردنـی، بـە تایبـەت لـە بـەردەم هـەر کەسـێکدا، پاشـان بەرەبـەرە لـە هـەموو شـوێنەکاندا.. تـەنها بۆنەکان نەبێت!

ئەو کاتە بە خۆمم دەگووت وەک دڵدانەوەیەک بۆ خۆم: منداڵەکەم گـەورە دەبێت، ئەو دەبێتە پیاو.

ئێستە دەزانم: گەورە نابێت، کات نادۆزێتەوە بۆ ئەوەی گەورە ببێت.

دەبێت ببینم کە لە دەستم دەردەچێت و، ناتوانم لە باوەشی بگرم!

کاتێـک چـووم بنـووم، پرسـیارەکەی کـە هـەموو کـات خـۆم لێـی وەدوور دەگرت توشی شۆکی کردم.

بە بیلال بڵێم؟

چۆن بیڵێم؟

نەفرتت لێبێت سەعید، هەزار جار نەفرتت لێبێت سەعید.

چی بکەم ئێستا.

بیرم کردەوە کە لەگەڵ دایکمدا قسە بکەم. بەڵکو بیـرم کـردەوە کـە هـەر بچم بۆ لای بۆ سانت لـویس. بـەڵام ئـەوە شـتێکی نـەگونجاو بـوو. مـن نزیـک نەبووم لە دایکمەوە، ئێمە دوو هاوڕێی نزیک نەبووین، بەڵام ئەوە دایکـم بـوو، هەموو کات حەزی بە یارمەتیدان دەکرد، بە ڕاستیش هات بۆ چەند ڕۆژێـک و یارمەتی دام لەگەڵ بیلالدا لە سەرەتای نەخۆشییەکەیەوە، بەڵام هـەموو کـات شتەکان بەوە کۆتاییان دەهات کە من یارمەتی بدەم. ئـەو کـەیفی بـە نیـۆرک نەدەهات لە هـەموو بارەکانـدا، لـە هـەر هەلێکیشـدا ئـەوەی دەردەبـڕی و وای لێدەکردم هەست بە تاوان بکەم.

بە ڕاستی تێلم بۆ کرد، پاشـان دامخسـتەوە پـێش ئـەوەی زەنـگ لێبـدات. بیرم کـردەوە کـە ئـەو وشـانەی دەیـانڵێم زۆر گـران دەبێـت لەسـەرم. دەنگـی خۆمم هاتەوە یاد کاتێک دەڵێم بیلال دەمرێت. حەزم بە بیستنی نەدەکرد کە

دەیڵێم. ئێستا نا. لە زۆربەی بارەکاندا دەهات بۆ یارمەتیدانم، بەڵام من دەمویست کە وەڵامی پرسیاری (ئێستا چی بکەم) بدەمەوە پێش ئەوەی بێت.

دەمهەویست بڕیار بدەم کە چی بکەم، چلۆن بیکەم، پێش ئەوەی یارمەتی لە هەر کەسێ وەرگرم.

بەڵام من حەزم دەکرد لە باوەشی بگرم، دەمهەویست دایکم لە باوەشم بگرێت، بە بێ ڕوون کردنەوە، بە بێ باسکردنی هۆکارەکان. ئارەزووی باوەشێکم دەکرد کە بمگرێتە خۆی. باوەشێک کە لەم کابوسە هەڵبێم.

نەفرەتت لێبێت سەعید. نەفرەتت لێبێت هەزار جار، نەفرەت.

♦ ♦ ♦

پەیوەندیم بە ماگیەوە کرد و، پێم گووت کە ناتوانم لە ڕۆژی دواتردا ئامادەبم.

بێدەنگ بوو پاشان گووتی: بڕوا ناکەم مستەر وید خۆشحاڵ بێت بەوە.

پێم گووت

Diffuse intrinsic pontine glioma

گووتی: چی؟

گووتم: سفر لە سەدا. ڕێژەی ڕزگاربوون سفر لە سەدە.

لە لاکەی دیکەوە هەناسەیەکی بێدەنگکراوم بیست. پاشان بە خێرایی گووتی: خۆم چارەسەری دەکەم.

بەڵام بەیانی کە هەستام ئارەزووی ڕۆشتنم دەکرد.

خۆ هەر شتێکم دەدۆزیەوە لە قوتابخانە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی پرسیاری: چی بکەم ئێستا؟

ئایا بە بیلال بڵێم؟!

له هەموو بەشەکانی ناو ڕۆمانی (جذور)، ئەو بەشەی کە دەبوایە ئەمڕۆ گفتوگۆی لەسەر بکەین لەگەڵ قوتابیەکان بە ئازارترین بوو.

وەک ئەوەی هەر ئەوەم کەم بێت.

چەند پارچەیەکی دیاریکراوم لە ڕۆمانەکە هەڵبژاردبوو، ئەمەش سەرەڕای تەماشاکردنی دوو ئەڵقە لە زنجیرەکە.

ئەمە ئەو بەشە بوو باس لە ئەو گەشتە دەکات کە کۆنتا کینتی و ئەوەی لەگەڵیدا بوون لەوانەی بە کۆیلە کرابوون لە (گامبیا) وە ڕاگوێزرانەوە بۆ کەنارەکانی ئەمریکا، بە نێو زەریای ئەتلەسی.

ئەوە گەشتێکی تۆقێنەر بوو. ئەلێکس هیلی بە شێوەیەکی بەش بەش و ئازار بەخش پەسنی کردووە، بە هەموو ئەو شتانەی کە تێیدایە.

١٤٠ کەس لەوانەی کە ڕفێندران لە گوندە بچوکەکانیان و ژیانی پێشوویان، لە پیاو و ژن و منداڵ، زنجیر بە دەست و قاچیانەوەیە، لە ناو خانەیەکی ئاسۆیی دا دانراون بە بێ بوونی هیچ بۆشاییەک لە نێوانیان، بۆ ئەوەی کەشتیەکە زۆرترین ڕێژەی بار هەڵبگرێت، تانوانن بجوڵێن یاخود دابنیشن، تەنها ڕاکشان، هەموو کاتەکە ڕاکشان، هەریەکێکیش لەوان لکاوە بە ئەوی دیکەوە، پیساییەکان باس لەو بارودۆخە دەکات، پیسایی ڕشانەوە هەموویانی داپۆشیوە، کێچ و ئەسپێ و مشکەکانیش دێن بۆ ئەوەی ئەو جەستەی مرۆڤانە بچرن، ئەو هەموو کێم و پیسایی برینی هەموان هەموویانی تەنییەوە بە شێوەیەک کاتێک لە ڕاکشانەکەیان هەڵدەسێنرێن قاچیان هەڵدەخلیسکێت..

میز و پیسایی و ڕشانەوە بووەتە هەویرێک و هەموو شوێنێکی داگیرکردووە.

بۆ ماوەی چوار مانگ ئەم ئەشکەنجەیە بەردەوام دەبێت.

هەر بۆنەکە بە تەنها بۆخۆی ئەشکەنجەیەکە کە بە وشە دەرنابڕدرێت.

كابوس. هەموو ئەوانەی ڕوودەدەن وەک کابوسێک وان کۆنتا کینتی دەیهەویت لێی بە خەبەر بێت. هەر خوێنەرێکیش هەمان ئاواتی دەبێت.

خواردن بەسەر هەمووواندا دابەش دەکرێ بۆ ڕێگری لە مردنیان، لەبەر ئەوەی مردن دەبێتە خەسارەتمەندی بۆ بازرگانی بەردەکان، لە کاتی دابەشکردنی خواردنی قێزەون لە تام و بۆندا پیاوەکان (تۆبۆب، واتە سپی پێست بە زمانی کۆنتا کینتی) هەڵدەستن بە لێدانی هەمووان بە قامچی بە شێوەیەکی جەرگبڕ، لێدانەکەش زۆرتر دەبێت ئەگەر کۆیلەکە هاوار نەکات.. یەکێکیان تا مردن لێی درا لەبەر ئەوەی سوور بوو لەسەر هاوار نەکردن.

هەموو هەفتەیەک یاخود دە ڕۆژ جارێک هەموویان دەردەهێنران و بە زنجیرەکانیانەوە دەبەسترانەتەوە و هەموو کەسێک بە دراوسێکەیەوە لکاوە و، دەیانبەنە سەر ڕووی سەرەوەی کەشتیەکە بۆ ئەوەی لە هەویری میز و پیسایی و ڕشانەوە پاک بکرێنەوە.. سەرەڕای ئەوەی هەناسە وەرگرتنێک شتێکی باشە، وەلێ لێکردنەوەی ئەو هەویرە لە پێستی پڕ لە کێم و برین زۆر بە ئازارتر بووە.

لەسەر ڕووی کەشتیەکە، ئەو پیاوانەی کە بە بەردە کراون، ژنەکان دەبینین کە بە هەمان شێوەی ئەوان پاک دەکرێنەوە، تۆبۆبەکان داوا لە هەموویان دەکەن هەڵبەزنەوە و سەما بکەن، ژنێکی پیر فەرمانەکەیان جێبەجێ دەکات و گۆرانی دەڵێت، لە کاتێکدا داوا لەوانی دیکەش دەکات کە وەک ئەو بکەن، گۆرانی گووتن لەسەر ڕووی کەشتیەکە هۆکارێک دەبێت بۆ گۆڕینەوەی هەواڵ لە نێوان پیاوان ژنەکاندا، ئا لێرەدا پیاوەکان دەزانن کە ژنەکان هەموو شەوێ لاقە دەکرێن و، شەڕی توند لە نێوان ئەو تۆبۆبانە دروست دەبێت لەسەر نۆرەی لاقەکردنەکە.

گەشتەکە زۆر ترسناکە بە هەموو وردەکارییەکانیەوە..

به ڕێگەیەک لە ڕێگەکان، سەرەڕای ئەوەی هەرچی ترسناکی و ناخۆشیە لەم بەشەدا هەیە، بەڵام هەندێ باری لەسەر سووک کردم.

هەستم کرد کە ئازار و ئەشکەنجەکەم، هەر چۆنێک بێت، ناتوانرێت یەکسان کرێت بە ئەشکەنجەکەی ئەوان.

ئەوە بە شێوەیەک سەبووری بوو.

سەیرترین ڕێگە بۆ سووککردنی ئازار لەسەر دایکێک کە کوڕەکەی بە شێرپەنجە دەمرێت، ئەوەیە کە ئەو بەشەی (جذور) بخوێنێتەوە.

◆◆◆

زۆر ئاسان بوو کە بزانیت کێ ئەرکە دیاریکراوەکەی ماڵەوەی نەخوێندبێتەوە لە کتێبەکە.

ڕوخسارە بێ باک و پێکەنیناویەکانی قوتابیەکان ئەوەی دەردەخست کە چاویان بە هیچ نەکەوتووە.

بێتاقەتی و خەمباری ڕوخساری ئەوانەی داگرتبوو کە خوێندبوویانەوە.

ئەوە زۆر ڕوون بوو. ئەوە تێکەڵ بوو لە سەروچاوێکی گرژ و تووڕەیی لە لای ڕەش پێستەکان، دانەیەکی دیکەش کە دەری دەخست (هەست بە تاوانکردنە) لە لای سپی پێستەکان. ئاسیاییەکان ڕوخساریان بە جدییات تەنرابووە. ئەمە وانەیەکی دیکەیە کە پێویستە لێی دەرچن.

هەوڵمدا کە هەموویان بهێنمەوە سەر خۆیان، بیرم خستنەوە کە ئێمە باسی شتێکی مێژووی دەکەین کە هیچ کەس لێی بەرپرسیار نەماوە بە ڕاستەوخۆیی، هەروەها ئەوەش کە ڕاستیە مێژوویەکان هەرچەندە بە ئازار بن، پێویستە بە شێوەیەک مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت وەک ئەوەی بەشێک بێت لە میراتی ئادەمیزاد بە بێ لۆمە و تاوانبارکردن.

پرسیارێکم ڕووبەڕی هەمووان کردەوە: دەتوانین چ سودێک لەم بەشە وەربگرین لە ڕۆمانەکە؟

خۆ دەمزانی کە خۆم چیم لێ وەرگرتووە، بەڵام ئارەزووی باسکردنیم نەبوو.

لیزا ڕاستەوخۆ گووتی: سوود لەوە وەردەگرین کە دەزانین جیهان چەند شوێنێکی ترسناکە.

ئاە لیزا، زۆر ترسناک، خۆزگە دەتزانی.

بەڵام من وەک مامۆستایەک پێویستە پۆزەتیڤانەتر بم. گووتم: بەڵێ، جیهان شتی زۆر ترسناکی تێدایە.. بەڵام ئەوە دەبێت وامان لێبکات بیوەستێنین.. جیهان تۆقێنەرە زۆربەی جار بەهۆی ئەوەی کە مرۆڤ دەیکات، نەک لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی سروشتی تۆقێنەرە.

لیزا وەڵامی دایەوە: کەواتە ئەوە مرۆڤە کە تۆقێنەرە.

دووبارە گووتمەوە: ئەویش نەک لەبەر ئەوەی لە سروشتدا تۆقێنەرن، وەک سروشت نا، بەڵام بەڕاستی هەندێکیان تۆقێنەرن بە دڵنیاییەوە.

فرێدی گووتی: چۆن مرۆڤ دەتوانێت هەموو ئەمانە بکات؟!

گووتم: هێشتاش ڕوودەدات فرێدی، جیهان ڕووداوی دڵتەزێنی زۆری تێدایە، هێشتاش بنیام ئەمە بە ڕێگەیەک یان ڕێگەیەکی دیکە بە یەکتری دەکەن، لە ژێر ناونیشانی جیاجیاشدا. هەندێک کات لە ژێر ڕێزدارترین ناونیشانیشدا.

فرێدی بە زیرەکانە وەڵامی دایەوە: تێدەگەم ئەو توندڕەوییەی هەیە، ئەنجامی تووڕەبوون یاخود تۆڵە سەندنەوەیە، بەڵام ئەم پلانڕێژییە، ئەم بەردەوام بوونە، بێ گوومان شتێکی هەڵە هەیە لە خۆڕێکخستنەوەی مرۆڤ خۆی.

گووتم: ئەگەر هەمووتان سەرنجتان دابێت، زنجیرەکە هەندێک کاراکتەری سپی پێست دەخاتە ڕوو، هەندێکیان لە کەشتیەکەشدا هەبوون، بەڵام بەشداریان لە هەموو ئەو شتانەدا نەدەکرد، ڕوون دیارە کە ئەوەی ڕوودەدات ئەوان بە هەڵە دەیبینن؟

دەنگی بۆبی لە کۆتایی پۆلەکەوە بەرز بویەوە، ئەو کەمترین بەشداربوونی هەبوو لە هەر شتێکدا: بە دڵنیاییەوە! ئایا زنجیرەکە پەخش یاخود دەردەهێنرا ئەگەر لە نێو کاراکتەرەکانیدا پارێزەری شەیتان دانەنرایە؟

جاکیش لە لایەکەی دیکەوە لە کۆتایی پۆلەکەوە وەڵامی دایەوە: لەوانەیە لینکۆڵنیش پارێزەری شەیتان بوبێت!

دەبوایە بچمە نیویانەوە: بوەستن تکایە .. ڕۆمانەکە ڕووداوەکانی لە چاوی کۆنتا کینتی و نەوەکانیەوە دەربڕیوە، هیچ کاراکتەرێکی دیکەی ڕەش پێستیش نا، بەڵکو تەنها ئەوان، ئەمەش زۆر سروشتییە، ڕۆمانەکە نەوەی کۆنتا کینتی نوسیویەتی لە بارەی باپیریەوە، ئەوەش زۆر نا لۆژیکیانەیە کە نوسەر ئەلێکس هیلی هەستێت بە باسکردنی هەستی کەشتیوانی کەشتیەکە، ئەو هەستانەی کە هەرگیز نەیزانیوە کە هەیە..

بۆبی دیسانەوە وەڵامی دایەوە: ئەو هەستانەی کە هیچ لە بارەیەوە نازانین!

گووتم: بەڵێ هیچ نازانین دەربارەی هەستەکانی ئەم کەشتیوانە بە دیاریکراوی. بەڵام زۆر دەزانین لە بارەی هەستی هەندێک ئەمریکیەکان کە سپی پێست بوون و دژی ئەوە بوون کە ڕوودەدات، بەڵێ زۆرینە نەبوون.. بەڵام خۆ هەبوون، کاراکتەر و کەسایەتی گشتی و کاریگەر هەبوو لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا، واتە لە ماوەیەکی نزیک لە ڕووداوەکانی (جذور)، هەروەها ئەم کەسایەتیانە هەڵوێستەیان هەبووە دژی بەردایەتی، بێگومان بەشێکی دیکەش هەبوون لە سپی پێستەکان، جگە کەسایەتیە گشتیەکان کە هەمان هەڵوێستەیان هەبووە.. ئەرێ کەمینە، لەو کاتەشدا، بەڵام هەر هەبوون.

"من بیروبۆچونێکی جیاوازترم هەیە". دەنگی کێڤن هات.

بێ شک کێڤن بیروبۆچونێکی جیاوازی هەیە، ئەو جیهان بە چاوێکی ئاسیایی دەبینێت، هەموو کات جیاوازە لە هەر گفتوگۆیەکدا.

بفەرموو، کێڤن، گووتم.

گووتی: بە یەک وشە، داروین، یاخود مانەوە بۆ لەبارترینە.

دەنگی بۆڵە بۆڵێکی توڕەییانە بەرز بویەوە لە پۆلەکەدا.

گووتم: کێڤن، ئایا دەتوانیت ڕوونی بکەیتەوە؟

کێڤن بە بێ گوێدانە دەنگە توڕەکان گووتی: لە بیردۆزی داروین لەسەر پەرەسەندنی جۆرەکان، ئەو بونەوەرانەی کە ناتوانم لەگەڵ کەش و هەوای سروست و گۆڕانکاریەکانیدا هەڵبکەن، یاخود ناتوانن ڕووبەڕوی بونەوەرە دڕندەکان ببنەوە یان خۆیان حەشار بدەن لێیان، ئەوە لە ناو دەچن. مانەوە بۆ دەسەڵاتدارەکانە، بۆ ئەوانەی کە دەتوانن خۆیان ڕابگرن.

هەمان شتیش لەگەڵ گەل و میللەت و شارستانیەتەکاندا ڕوودەدات، ئەو گەلانەی کە ناتوانن لە ڕووی زانستیەوە پێش بکەون، ناتوانن خۆڕاگربن لە بەرامبەر ئەو گەلانەی کە پێشکەوتوون، دەبنە نێچیرێک بۆی، دەکرێت ئەوە بەڕاستەخۆیی بە شێوەیەکی ئازاربەخش ڕووبدات وەک چۆن ڕووی دا لەگەڵ کۆنتا کینتی و ملیۆنانی جگە ئەو، دەکرێت لەسەر شێوەی داگیرکردنی ڕاستەوخۆوە ڕووبدات.. یاخود هەر جۆرێک لە جۆرەکانی بەکارهێنان لە قازانجی داگیرکەرەکە.

هیچکەس گوێی بە ڕوونکردنەوەکەی کێڤن نەدا، بەڵکو بۆڵەبۆڵە توڕەییەکان و گفتوگۆ لابەلاکان زۆربوون و بەرز بوونەوە. وشەی (جۆرەکان)ی کە کێڤن گووتی زۆر توندڕەوانە بوو. هەروەها تێگەیشتم وەک ئەوەی باسی جۆرێکی ناسکتر لە جۆر بکات.. ئەمە جۆرەکەی نەبوو.

دەنگم بەرز کردەوە: کێڤن بەهانە ناهێنێتەوە، ئەو تەنها ڕوون دەکاتەوە. ئەو ناڵێت ئەمە هەڵەیە و ئەمە ڕاستە.. بەڵام ئەوە ڕووی داوە و ڕوودەدات

بە داخەوە.. دەوڵەتە بەهێزەکان گەلە لاوازەکان بەکاردەهێنن، نکۆڵیش لەوە ناکرێت کە ئەفریقا زۆر جیاوازتر بووە بە بەراورد بە وڵاتانی ڕۆژئاوایی.. ئەوەش ئاسانە کە ئەفریقا وەک نێچیرێک بکەوێتە چنگ بازرگانانی بەردە.. کێڤن ئەم ڕاستییەی بەستەوە بە داروین و سەرچاوەی جۆرەکان، ئەوە بناغەیە لە بیردۆزێکی ناو زانستی کۆمەڵایەتی کە ناوی (داروینی کۆمەڵایەتی)یە.. ئەوەی داروین باسی دەکات لە مانەوە بۆ بە دەسەڵاتترین، بە هەمان شێوە ڕوودەدات لەسەر ئاستی گەل و کۆمەڵەکان، تەنانەت لەسەر ئاستی چینەکانیش لە یەک کۆمەڵگادا..

ئیدی دەستی بەرز کردەوە، ئەو زۆر شەرمن و کەم دوو بوو، بە چاوێلکەیەکی پزیشکی ئەستوور و زۆریش پڕ بوو، چونکە هەموو کات تووشی ئازار و هێرش دەبویەوە لە لایەن هاوڕێکانیەوە، بابەتەکە لەسەر بێزارکردن بوو کە ئەوانی دیکە هەناسە وەردەگرن لە کێشەکانیان، بە دەنگێکی نزم گوتی: هەر هەمان شتیش ڕوودەدات لەگەڵ تاکەکاندا.

بە ڕاڕایی و دەنگێکی لەرزۆکەوە ئەوەی گووت، ئەو ئەشکەنجەکانی خۆی لە گەشتەکەی کۆنتا کینتیدا دەبینیەوە، ئەوەی کە باسی لێدەکەین لە بارەی ململانێ بۆ مانەوە.

دەنگی جاک بەرز بویەوە بە گاڵتەکردنەوە: بەڵێ ئیدی، مانەوە هەر بۆ شیاوترینە ئەی گەمژە، لەگەڵ ئەمە ڕابێ.. تۆ شیاو نیت.

دەنگی پێکەنین بەرز بوویەوە، لە کاتێکدا داوام لە هەمووان کرد بێدەنگ بن و هەروەها جاکیش ئەو قسانە دووبارە نەکاتەوە.

گوتم پێیان: بەڵێ، هەروەها لەسەر ئاستی تاکەکانیش ڕوودەدات، بەڵام ئەوەی لە سروشتدا لە نێوان بوونەوەرە زیندووەکاندا ڕوودەدات نابێت لە نێوان مرۆڤەکاندا ڕوویدات لەبەر ئەوەی ئەوان بالاتر و پلە بەرزترن، لەبەر ئەوەی سیستەمێکی ئەخلاقی و یاسایی هەیە کە دەبێت پەیوەندی نێوانیان

ڕێک بخات.. ئێمە لە مێژە لە دارستانەکان هاتووینەتە دەرەوە، دەشبێت پابەند بین بەوەوە.. کاتێک ئەمە ڕوودەدات لە نێوان مرۆڤەکاندا، ئیدی مانەوە بۆ شیاوترین دەبێت وەک ئەوەی جاک گوتی، ئێمە پێویستە ڕووبەڕوی بوەستینەوە، پێویستە باسی بکەین و نەیهێڵین..

ئەمەم گووت لە ڕووی جاکدا لەکاتێکدا چاوم بڕیبوویە چاوی، بیری ئەوەشم کەوتەوە کە خوێندومەتەوە و چۆن بێزارکردن کۆتایی پێ بهێنرێت بە یەک وشە لە لایەن قوربانیەکەوە بە ڕووی ئەو کەسەی کە هەوڵ دەدات ئازاری بدات.

لیزا گووتی: ئایا بابەتەکە هاوشێوەیە تەنانەت لەگەڵ توشبوانی شێرپەنجەیشدا؟

لەرزیم، چی هاتووە بە مێشکی لیزادا بۆ ئەوەی ئەمە بڵێت؟ هەموو کات هەوڵمدەدا تا دەتوانم وردەکاری لە بارەی نەخۆشییەکەی بیلالەوە بڵاو نەبێتەوە، ئەوان هەستیان بە هەبوونی شتێک دەکرد کە وام لێدەکات ئامادە نەبم لە وانەکاندا، بەڵام من نەمدەویست هەمووان بزانن، لەوانەیە - بێ ئاگا — بوبێتم، پێم وابوو کە شتەکە زۆر گەورەتر و زیاتر دەبێت ئەگەر هەر سات نا ساتێک بیرم بخرێتەوە.. وەک ئەوەی لە بیرم دەکرد.. سەرەڕای ئەوە، پۆل (ناوچەی ئارامی) بوو بە ڕێژەیەک کە تێیدا هەوڵم دەدا خۆمی تێدا سەرقاڵ بکەم لە بیرکردنەوە لە نەخۆشیەکەی بیلال.. بۆیە نەمدەویست ئەوە تێک بدەم.

گووتم بە لیزا: مەبەستت چییە؟

گووتی: لە ڕۆمانەکەی (هەڵەکە لە هەسارەکەی ئێمەدا The fault of our star)، ڕستەیەکی زۆر زۆر ئازاربەخش هەیە، کە نوسەر ڤان هۆتن ڕوبەڕووی هیزڵ و ئەگۆستۆسی دەکاتەوە، کە توشی شێرپەنجە بوون. پێیان

دەڵێت: ئێوە تەنها زیانن لەو پرۆسەی پەرەسەندنەی کە زۆر گرنگی بە تاکەکان نادات، ئێوە تەنها تاقیکردنەوەیەکی شکستخواردوون لە بازدانە جینییەکاندا.

"You are a side effect," van houten coutinued, "of an evolutionary process that cares little for individual lives. You are a failed experiment in mutation."

لە شوێنی خۆمدا وشک بووم. ئەو ڕۆمانە زۆر بەربڵاو بوو لە نێو هەرزەکار و گەنجەکاندا، فیلمەکەیشی هەروەها، کتێبەکەم لەبەر هیچ هۆکارێک نەخوێندووەتەوە، بیلال توشی شێرپەنجە نەبوبوو، یاخود هێشتا توشبوونەکەیمان دەستنیشان نەکردبوو.. بەڵام من هەر نەمخوێنبوویەوە، ڕاستەوخۆش پاڵێوراو بوو لە لای هەندێک لە هاوکاران بۆ ئەوەی ببێتە یەکێک لەو ڕۆمانانەی کە قوتابیەکان دەیخوێننەوە.

کاتێک نەخۆشیەکەی بیلالیان دەستنیشان کرد، هەردوو فیلم و ڕۆمانەکەشم وەلا نا، دەمتوانی سوود لە ئەزموونی ئەوانی دیکە وەرگرم لە کتێبی یارمەتیدانە خۆییەکان، بەڵام پێویستم بە درامایەک نەبوو کە خۆم تێیدا دەژیام. زۆر بە سادەیی کەیفم بە گوزەرکردن نەدەهات بە ناو گریاندا لە فیلمەکەدا.. ئەسڵەن هێزی ئەوەم هەر نەبوو!

بەڵام بەڕاستی ئەم ڕستەیە زۆر زۆر بە ئازار و توندڕەوانەیە.

تفەکەی ناو دەمم قوتدا و بە لیزام گوت: بە ڕاستی ئەو ڕستەیەی گووتوە؟

لیزا گووتی: بەڵێ، ڕێک بەو شێوەیە گووتم کە لە فیلمەکەدایە، هەر لە مێشکمدا مابویەوە لەبەر ئەوەی زۆر نامرۆڤانە بوو.

ڕێک وابوو بەڕاستی. وا هاتە پێش چاوم کە یەکێک بە بیلالی بڵێت، یاخود بە من بڵێت: کوڕەکەت تەنها هەڵەیەکە لە پرۆسەی پەرەسەندا، زیانی کارلێکردن، هەر کارلێکردنێکیش کاریگەرییەکی لاوەکی بەرهەم دێنێت کە

گرنگیـەکی نییـە.. هاتـە پـێش چاوم یـەکێک پـێم دەڵێت: کوڕەکـەت تـەنها تاقیکردنەوەیەکی شکستخواردووە لە بازدانە جیینیەکاندا.

هەستم بە ڕشانەوە دەکرد. بۆ چەند چرکەیەک بیدەنگ بووم، پاشان هەستم بە خۆم کرد کە بابەتەکە دادەخەم، تێپەڕی دەکەم، وای دادەنـێم کـە ئێستا هیچم نەبیستووە، لەبەر ئەوەی ئەمـە وانەکـە تێـک دەدا، دواتـر لەگـەڵ ئەم ڕستەدا دەجەنگێم.

گوێم بە دەنگی خۆمەوە بوو کە گووتم: چـی زیـاتر کاریگـەری لەسـەرتان هەبوو منداڵەکان؟

جـاک بـە بەرەنگاریەکـەوە گـووتی: ئـەوە سـەرنجی ڕاکێشـام کـە سـپی پێستەکان نەیانـدەتوانی هـەموو ئەوانـە بکـەن، ئەگـەر ڕەش پێسـت یارمـەتی نەدابێتن..

باشـە، تـاوانی سـپی پێسـت وا لـە هەنـدێک دەکـات بـە دوای بەهانـەدا بگەڕێن، حـەتمـەن سـپی پێسـت نەیـدەتوانی ئـەوە بکـات کـە کردیـان ئەگـەر یارمەتیـدەرێک لـە نـاو ڕەش پێسـتەکاندا نەبوایـە، بـەڵام ڕێژەکـەیان چەنـدە؟ هەروەها ئایا ئەوە هەر شایەنی سەرنجدانە؟

لیزا گووتی: ئەو دایکەی کە هەر منداڵەکەی ناو خەیاڵەکانی دەلاوانـدەوە، لە کاتی ڕفاندنەکەدا مرد، بەڵام هەر دەیلاواندەوە و گۆرانی بۆ دەگووت.

ئیمیلی گـووتی: ئـەو کچـەی کـە کەشـتیوانەکە دەسـتدرێژی کـردە سـەری تاوەکو خۆی خستە نـاو ڕووبارەکـەوە و ماسـیە قرشـەکان خواردیـان، ئـەو بـە جـوانی دەیزانـی کـە بێگومـان دەمرێـت، بـەڵام ئـەوەی پـێ خۆشـتر بـوو تاکوبەردەوام ڕووبەڕووی دەستدرێژی ببێتەوە.

بۆبی گووتی: سەرنجی ئەوەم دا کە ئەوان بە تەواوی لێک جودا بوون، بـە ڕێژەیەک کە یەک زمانیش کۆی نەدەکردنـەوە، هـەر هـۆز و چەنـد هۆزێـک بـە زمانێـک قسـەیان دەکـرد و هـیچ شـتێکی دیکـەیان لـە زمانـەکانی دیکـە

نەدەزانی.. هیچ لێک تێگەیشتنێک لە نێوانیاندا نەبوو، سەرەڕای ئەوەی ئەوان دانیشتووی چەند ناوچەیەکی نزیک بوون.. لە کۆتایدا هەموویان خەڵکی گامبیا بوون، دەشێ ئەوە ڕێگە خۆشکەر بوبێت تا ببنە نێچیر.

ئێدی گووتی: ئەوان نەیاندەزانی چی چاوەڕێیان دەکات. ئەوان واتای بەردایەتیان نەدەزانی.. تەنانەت بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە، ئەوان وا پێشبینیان دەکرد کە سپی پێستەکان دەیانخۆن و، ئەوان بۆ ئەو مەبەستە ڕفێندراون.. وا پێشبینیان دەکرد کە سپی پێستەکان (بخۆری گۆشتی مرۆڤ)بن! .. هەموو ئەمانە زۆر بە ئازار بوون.

ئیمیلی گووتی: ئەوان وایان دەزانی کە سپی پێستەکان ژنیان نییە، هیچ ئافرەتێکی سپی پێستییان لەگەڵ کەشتیوانەکاندا نەدیبوو، هەر بۆیە وا پێشبینیان کردبوو کە هیچ ئافرەتێکی سپی پیست بوونی نییە، ئەمەش هۆکاری دەستدرێژی کردنە سەری بەردەوامیانە.

کێڤن گووتی: بە ئاگابوونیان لە جیهان زۆر سنوردار بوو، هیچ کات نەچووبەنە ناو دەریا و سەرەڕای ئەوەی دووریش نەبوون لێیەوە، سەرەتا وایانزانی ئەوە ڕوبارە و زۆر سەریان سوڕما لەبەر ئەوەی لە هەردوو لاوە تەنکایی و کەناراوەکانیان نەدەبینی.. لە سەرەتاوە پێیان وابوو کە ئەوە زەویە دەجولێت کاتێک کەشتیەکە دەستی کرد بە ڕۆشتن.. ئەوە زۆر ئازاربەخش بوو.

ڕایان گووتی: دانانی نیشانە لەسەر پشتیان بە ئاسنی گەرمکراو، نیشانەی (LL)، ئەوان نیشانەیەکی بازرگانیان لەسەر دانابوون، براند، لەوانەیە کڕین و فرۆشتنی مرۆڤ لەوێوە دەستی پێکردبێت، یەکەم جار کاڵایەک بووە کە کڕاوە و فرۆشراوە، پاشان بەرەبەرە بەهاکەی بووەتە ئەو نرخی کاڵایەی کە ئەو کەسە دەتوانێت بیکڕێت (مەزاد). هەر یەکێک لە ئێمە ئێستا نیشانەیەکی لەو شێوەیە هەڵدەگرێت، ئەوانەی کە لافی کڕینیان

لێدەدەن بە گرانترین نرخ و دواتر هەوڵدەدەن دەریان بخەن، ئەوانیش لە ناخەوە هیچ جیاواز نین لە کاڵایەک..

رایان هەر بەو جۆرەیە، ماوەیەکی درێژ بێدەنگ دەبێت پاشان بۆمبێک دەتەقێنێتەوە. هیچم پێ نەکرا جگە دانانی نیشانەی سەرسام بوون نەبێت لەسەر زیرەکییەکەی.

فرێدی گووتی: ئەوان لە ناوەڕاستی دەریاکەدا بوون، کەچی هێشتاش ئومێدیان بەوە هەبوو کە سەربازەکانی هۆزەکانیان دێن و ڕزگاریان دەکەن!

حەکیم گووتی (تاکە موسوڵمانی ناو پۆلەکە): کۆنتا کینتی داوا لە خودای گەورە دەکات کە ڕزگاری بکات، هەروەها بەڵێنیشی پێدەدات کە پێنج جار لە ڕۆژێکدا نوێژی بۆ بکات ئەگەر ڕزگاری ببێت.. ئەوە زۆر ناخۆش و نائومێدانە بوو.

لیزا گووتی: باوەڕەکەی کۆنتا کینتیش سەرنج ڕاکێش بوو، ئەو پەیوەندی بە هاوڕێکەی پاڵیەوە پچڕاند لەبەر ئەوەی گووتبووی پێی کە چیدی بڕوای بە خودا نییە، لەوانەیە باوەڕبوونی بە خودا وای لێکردبێت کە خۆڕاگر بێت، تەنانەت ئەگەریش لە بەردایەتیەکەی ئازاد نەبێت..

لە دڵی خۆمدا گووتم: واو.. لەوانەیە، لەوانەیە ئەرکی بڕوابوون هەر ئەوە نەبێت کە وامان لێ بکات سەر بکەوین یاخود ئازاد ببین یاخود کێشەکانمان کۆتایی بێت.. وەلێ دەتوانێت وامان لێبکات خۆڕاگر و ئارام بین.. نەڕوخێین..

بیری بیلالی حەبەشیم کەوتەوە، باوەڕەکەی وای لێدەکات خۆڕاگر بێت لە ماوەی ئەشکەنجەدان دا، پاشان هەلی ئازادبوونی بۆ ڕەخسا.. بەڵام ئەوە باوەڕەکەی بوو کە وای لێکرد خۆڕاگر بێت..

بیرم لە بیلالەکەم کردەوە: لەوانەیە هیچ هەلی ڕزگاربوونی نەبێت، بەڵام لەوانەیە باوەڕ وا لەم ماوەیەی بکات بە لایەنی کەمەوە باشترین بێت.

فرێدی وانەکەی بە پێکەنین کۆتایی پێهێنا: ئەم بەشەی ڕۆمانەکە وا لە تاقیکردنەوەکەی بیرکاری دەکات وەک پارچە کێکی خاتوو لاتیشا دەربکەوێت.

From: amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

Subject: ڕوانگەیەکی نوێ بۆ دونیا

لە ساڵەکانی دواتردا و، بۆ ماوەی ١٣ ساڵ، بیلال لەگەڵ موسوڵمانە نوێیەکاندا مایەوە لە مەککە.

لە ساڵی پێنجەمدا، کۆچ کرا بۆ حەبەشە لە لایەن ئەو موسوڵمانانەی توشی ئازار و ئەشکەنجە دەبوونەوە، بیلال یەکێک نەبوو لەوان، ئەمەش واتای ئەوەیە کە ئەو ئاستی لاوازییەی تێپەڕاندووە کە هەندێک لە موسووڵمانەکان بە دەستیەوە دەیان ناڵاند سەرەڕای ئەوەی بەردەش نەبوون، ئەوان ئازاد بوون بەڵام لاواز، ئازادی هەموو شتێک نییە، چونکە لەوێدا ئاستی جیاواز هەیە لە بەردایەتی، بە ڕێگەیەکیش لە ڕێگەکان لاوازی ئاستێک بوو لە ئاستەکانی بەردایەتی.

ڕۆیشتنی موسوڵمانەکانە لاوازەکان بۆ حەبەشە هەڕەشەیەکی ترسناک و بەرەنگاریەک بوو بەرامبەر بە سەرۆک هۆزەکانی مەککە، حەبەشە پادشایەکی بەهێزی هەبوو، هەروەها مەککەش بازرگانی گرنگی هەبوو لە حەبەشە، ڕۆیشتنی موسوڵمانەکانیش بۆ حەبەشە کاریگەری دەبوو لەسەر ئەوە، بە تایبەت کە ئەوان ڕۆشتبوونە لای پاشایەکی مەسیحی، ئیسلامیش نزیکتر بوو لە مەسیحیەتەوە تاوەکو بەرد پەرەستییەکەی سەرۆک هۆزەکانی مەککە، ئەوان زۆریان هەوڵدا کە لە لای پاشای حەبەشە جێی خۆیان بکەنەوە تاوەکو ئەو موسوڵمانانەیان ڕادەست بکاتەوە، بەڵام ئەو زۆر بە توندی بەرگری لەمە کرد و قایل بوونی دەرنەبڕی..

جگە لەوان، موسوڵمانەکانی دیکە لە مەککە مانەوەوە و خـزم و دۆسـت و ناسـیاوەکانیان بـۆ سـەر ئـاینی نـویێ بانـگ دەکـرد، هـەرچۆنێک بێـت وەڵامدانەوەیەکی زۆر و ئەوتۆ نەبوو..

لە ماوەی ئەوەشدا موسـوڵمانەکان ئایەتـەکانی قورئانیـان لەبـەر دەکـرد و لەگەڵ یەکتریدا دەیانگۆڕیەوە کە بۆ پێغەمبەر( درودی خـودای لەسـەر بێـت) دەهاتە خوارێ، ئایەتەکانی ئەم ماوەیە باسی لـە گـەردوون و جیهـان دەکـرد، وێنـەی گـەردوونی بـۆ ڕاسـت دەکردنـەوە و دوبـارە دەیکێشـایەوە بۆیـان، بـە چاوی خودای تاقانەوە.

ئـەوە ڕێـک وەک پرۆسـەی سـڕینەوەی بەرنامـە کۆنەکانـە و دابەزانـدنی بەرنامەیەکی سۆفت وێری نوێیە.

بەرنامە کۆنەکە پڕ بوو لە چەنـدەها خـودای جیـاواز، هـەر یـەکێک لەوانـە تایبەت بوو بە شتێکەوە، خودایەک بۆ باران، خودایەک بۆ سـەرما، دانەیـەکی دی بـۆ گـەرما، لـەو لاوە دانەیـەک بـۆ شـیعر، لـەم لاشـەوە خودایـەک بـۆ تەندروستی.. هەر هۆزێک خوداوەندێکی هەبوو کە پێناسـەی بـوو، ڕێـک وەک وڵاتانی ئێستا مارشی تایبەت بە خۆی یاخود یانەیەکی تۆپی پێـی هەیـە کـە وێنای ئەو وڵاتە دەکات، هۆزەکانیش بـەو شـێوەیە بـە خوداوەنـدەکانیان جیـا دەکرانەوە..

هەنـدێک کـات خوداوەنـدەکان ئـارەزووی دژ بـە یـەکیان هـەبوو، هـەروەک چۆن مشـتومڕ و دروسـت دەبێـت لـە نێـوان کۆمـەڵێک کـەس کـە ئـارەزوو و گرنگی پێدانی جیاواز و جۆراو جۆریان هەیە، جیهان زۆر لە شـوێنێکی سـەیر و سەمەرە دەچوو، کە مـەحکومکراو بـوو بـە چـانس و تیروپشک و ڕابـواردن. هـەر بـەم شـێوەیەش خـەڵکی مەککـە لـە ڕێگـەی تیروپشـکەوە دەیانزانی کە خوداوەندەکان چ بڕیارێـک دەدەن.. بـۆ نمونـە بڕیـار دەدەن کـە ئەم کوڕە کوڕی فـلان کەسـە.. یـاخود فلانـە ئـافرەت ئـافرەتێکی چاکـە، یـان چاک نییە.. بە تیروپشک.

جیهانێکی زۆر شپرزە و پەرش و بڵاو بوو، دژ بە یەک، وەک کۆمەڵە هاوێنەیەک بوو، کە ئاستەکانیان جیاوازبێت، بە شپرزی و هەرەمەکیش لە چاوێکدا نراون، هەر بۆیە ئەم هاوێنانە ئەنجامێکیان نابێت جگە بینینێکی نارێک و تەڵخ..

سۆفت وێرە نوێیەکە زۆر جیاواز بوو، هاوێنەیەک کە خودایەکی تاقانە دایمەزراندووە، ئەو ئافرێنەری هەموو شتێکە، بەوەش پەیوەندی نێوان شتەکان بە ناویدا تێپەڕ دەبێت، جیهان زۆر ڕوون دەردەکەوێت و لۆژیکیانەترە.. ئەریَ شەڕخوازی زۆر هەن لەم جیهانەدا، زوڵمی تێدایە، بەڵام ئەوە تاقیکردنەوەیە، کە هەوڵبدەیت شەڕخوازی لە نێو بەریت.. ئازارەکان کەم بکەیتەوە، زوڵم بسرپیتەوە.

شتێکی ئەوتۆ نازانین دەربارەی بیلال لەم ماوەیەدا، هەر خۆی زۆر نازانین دەربارەی کەس لەم ماوەیەدا، ڕووداوگەلێکی زۆر نەبوون کە ناوی کەسەکان ببەستێتەوە بە ڕوداوێکی دیاریکراو..

ئەو ماوەیە ماوەی بنیاتنان بوو، بەڵام ئەوە دروستکردنی دەروونەکان بوو، لە ڕووکاری دەرەوە شتێک بەدی نەدەکرا، بەڵام ئەم کەسانە دوبارە سەرلەنوێ دروست دەکرانەوە.. کارەکە لەسەر ناوەڕۆک بوو، پێشەنگ بوون بۆ ئەو شتانەی کە دێت..

شتێک دەربارەی بیلال نازانین ئەوەندە نەبێت کە یەکێک بوو لەوان..

لەوانەیە، تەنها لەوانەیە، لەم ماوەیەدا و، لە کاتێکدا کە بیلال قورئان دەخوێنێتەوە، پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت) سەرنجی بەهرەکەی دابێت..

ئەو بەهرەیەی کە دەیخاتە نێو مێژووەوە..

◆ ◆ ◆

## ئەمجەد

کۆپەر زۆر گرنگی بە نەبوونی کریستین نەدا.

بەڵکو بگرە وا دەهاتە پێش چاوم کە لە جاران چالاکتر بێت.

ئەوە هەر منم کە هێشتا گرنگی بە نەبوونییەکەی دەدەم.

هێشتا لە لایەکی جێگەکەم دەخەوم وەک ئەوەی لە تەنیشتمەوە نوستبێت.

هێشتاش هەر بە دزیەوە دەچمە ناو پەڕەی فەیسبووکەکەی، تەماشا دەکەم تا بزانم بۆ کوێ ڕۆیشتووە و لە تەک کێ ڕۆیشتووە.

هێشتاش لە لیستی هاوڕێکانم نەمسڕیبویەوە، هەموو ڕۆژێکیش دەچووم لە ترسی ئەوەی ئەو منی سڕیبێتەوە.

بەڵام نا، کریستین من ناسڕێتەوە، دەیەوێت چێژ لە ئازاردانم وەرگرێت، دەنوسێت کە ئەو (دڵخۆشە و چێژ وەردەگرێت لەگەڵ هاوڕێیان)، دەنوسێت لەسەر بارودۆخەکەی کە ئەو ڕابردووی فڕێداوە بە هەموو قەیدەکانییەوە لە پشتیەوە و، بەرەوە ژیانێکی جوانتر دەڕوات.. وا بۆم دەردەکەوت کە ئەو تەنها دەیەوێت ئازارم بدات.. هەوڵ دەدەم کە شتێکی پۆزەتیڤانە لەوەدا بدۆزمەوە.. ئەوەیە کە ئەو هێشتا گرنگی بە من دەدات. هێشتا شایەنی بەزەییم. بەڵام من هەرگیز پەیوەندیم نەکرد.. ژمارەکەیم سڕیەوە دوبارە دوای ئەو نامەیەی کە نوسیبوی پێداویستیەکانی بردووە و کۆپەری هێشتووەتەوە.

کۆپەر، کۆتا هەلم، دەمەوێت لێی بپرسێتەوە، دەڵێم بەڵکو بیکاتە بەهانەیەک بۆ ئەوەی پەیوەندیەکە بگەڕێنێتەوە، هەر شتێک..

جێی بەزەییە، جێی بەزەیی.

◆◆◆

ئەو شەوە، لە نیوە شەودا خەبەرم بویەوە و مۆبایلەکەم کردەوە و چومە سەر پەڕەی فەیسبووکەکەی.

بینیم کە بارودۆخی پەیوەندیەکەی گۆڕیوە.

نوسیبووی: لە پەیوەندیدا.

بە درێژای ئەو ساڵانەی کە پێکەوە بووین و پێکەوە ماینەوە، ئەو بژاردەیەی بە بۆشی جێدەهێشت.

ئەمڕۆ ئەو لە پەیوەندیدایە.

چەند جێی بەزەیی بووم.. یەع لە من.

هەستم کرد کە چیدی سەرخۆشی دەرمانی ئازارەکانم نییە، زۆر بە سادەیی پیویستم بە شتیکی دیکە هەبوو. پێویستم بە لەبیرکردن نەبوو، پێویستم بە ئازارکوژێکی دیکە نەبوو.. من پێویستم بەوە بوو کە ڕووبەڕووی خۆم ببمەوە. پێویستم بەوە بوو هۆگریەکەم بە کریستینەوە لە ڕەگ و ریشەوە دەربێنم.

ئازارەکەم ئەم جارە لە شتێکی زۆر قوڵتر لە جەستەدا بوو. شتێک بوونی هەبوو لەوانەیە ئەوە بوبێت کە ئەوانی دیکە پێی دەڵێن: ڕۆح.

هەستم بەوە دەکرد.

گووتم، ئەگەر ڕۆحێک بوونی هەبێت، کەواتە دەبێت خودایەکیش هەبێت.

ئەگەر خودایەکیش هەبێت، کەواتە دەبێت گوێی لێمەوە بێت.. هەستم پێ بکات..

نازانم چۆن گووتم، بەڵام گووتم..

گووتم پێی، بەو خودایەی کە باوەڕم بە هەبوونی نییە: یارمەتیم بدە. یارمەتیم بدە.

نازانم چۆن گووتم، بەڵام گووتم، گوێم لە دەنگی خۆم بوو کە دەمگووت..

ماوەیەک لە بارودۆخێکدا مامەوە کە وەک بورانەوە وابوو، بە تەواوی نەبورابوومەوە، بەڵام بە ئاگای تەواویش نەبووم.

نـازانم چەنـدێک نوسـتم، بـەڵام بـە سـەر ئێشـەیەکی زۆر خـراپ خەبـەرم بوویـەوە، چوومـە گەرمـاوەوە و دووجـار ڕشـامەوە. هـەرچی لـە گەدەم بـوو ئێقمکردەوە وەک ئەوەی زۆر زۆرم خواردبێتەوە.

کـە لـە بەیانیەکەیـدا هەسـتام زۆر باشـتر بوبـووم وەک ئـەوەی کریسـتین لەگەڵ ڕشانەوەکەدا هاتبێتە دەرەوە لە ناخم، بە لایەنی کەمەوە بەشێکیم لـێ ڕۆی.

لە خۆمم پرسی: هەر بەڕاستی نوێژم بۆ ئەو خودایە کـرد کـە بـاوەڕم بـە هەبوونی نییە؟

هەر بەڕاست ئەوە سوودی بۆم هەبوو؟!

◆ ◆ ◆

پێشـتر پلانـم داڕێـژا بـوو بـۆ دەسـتپێکردنی نوسـین لـە بـارەی مـاوەی کۆچکردنـەوە، لـە چیرۆکـی بیلالـی حەبەشـی ئـەوەش ئـەو کاتـە بـوو کـە موسوڵمانەکان کۆچیان کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە، لەوێ دەسـتیان کـرد بـە دروسـتکردنی کۆمەڵەکـەیان، لـە ژینگەیـەک کـە زیـاتر یەکتاپەرەسـتی تێـدا ڕەنگدانەوەی هەبوو..

ئەوەم وەک نیشانەیەک بینیەوە. نیشانەیەک بۆ دەستپێکردنێکی نوێ..

کۆپەرم بردە دەرەوە، بۆ پیاسەی ڕۆژانە، هـەروەها زیـاتر پێـی ڕاهـاتبووم وەک لە جاران. ئـەویش بـە هـەمان شـێوە. ئـەوەم وەک تۆڵـە سـەندنەوەیەک دەبینی لە کریستین تەنانەت ئەگەر ڕەمـزییش بوبێـت، کۆپـەر ئێسـتا خۆشـی دەوێم، زیاتر لە خۆشەویستیەکەی بۆ ئەو.

بیرم کردەوە کە دەبێت پەڕەیەکی نوێ هەڵبدەمـەوە لـە ژیانمـدا، دوور لـە کریستین بێ ئەوەی بیری لێبکەمەوە.

هەموو ئەو ئامۆژگاریانەم بۆ خۆم ئامادە کردبوو کە لە دوای گەڕان لە گۆگڵدا دۆزیمەوە بۆ ڕێگەی لەبیرکردن و تێپەڕکردنی (خۆشەویستی پێشوو)، ئەو ئامۆژگاریانەی کە یارمەتیت دەدات لە لەبیر کردنی خۆشەویستەکەت، چەندە ئامۆژگاری گەلێکی قورس بوون: یەکەمیان... بۆ ماوەی مانگێک پەیوەندی پێوە مەکە..

کێ دەتوانێت ئەوە بە ئاسانی بکات، چ پێویستیەکی بە ئامۆژگاری هەیە؟

لەگەڵ هاوڕێیان بچۆ دەرەوە، گوێ لەو گۆرانیانە مەگرە کە پێکەوە گوێتان لێگرتووە (ئەمە واتا گوێ نەگرتن لە هەمووی بە نزیکەیی)..

من لە هەموو ئەمانەدا پێشکەوتبووم بەڕاستی.

بەڵام من پێویستم بە شتێکی جیاوازتر بوو. شتێکی بە ڕەگ و ڕیشەتر، پێویستم بەوە نەبوو کە ڕزگار ببم لە دەستی کریستین. بەڵکو پێویستم بەوە بوو کە خۆم ڕزگار بکەم لەو ئەمجەد حەلەوانیەی کە وەک نەخۆشی کریستینی خۆش دەویست.

ئەو ئەمجەدەی کە کەوتبوویە داوی خۆشەویستی کریستینەوە ئەو کەسە بوو کە دەبوایە خۆم لە دەستی قوتار کردایە نەوەک کریستین. لەبەر ئەوەی زۆر بە ئاسانی دەکرێت بکەوێتە ناو پەیوەندیەکی هاوشێوەوە، یاخود وەک منداڵان پێ بخشێنیت بە دوایدا کە دەڕوات.

ئەو ئەمجەدەی کە وا دەردەکەوت کە جگە لە ماددە باوەڕی بە هیچ شتێکی دیکە نەبێت، ئەوەی کە وای بانگەواز دەکرد کە ئاینەکەی پەرەسەندنە و پێغەمبەرەکەی داروینە و گفتەکانی داوکنزە، ئەو ئەمجەدە ماددییە ڕاستەقینەخوازە کردارییە، کە لە ژێر دەمامکی ڕەقەکەیدا لاوازیەکی زۆری حەشارداوە، ئەو کەمییەکی زۆری هەبوو لە شتێکدا، کە کریستین توانی لە ڕێیەوە خۆی بهاوێتە ناوی، ئەسڵەن لەوانەیە خۆی نەهاویشتبێت،

لەوانەیە ئەمجەد هەر خۆی ڕێگەی بۆ ئەمە خۆشکردبێت. بەڵام تێکچونێکی زۆر گەورە لە ناوەڕۆکیدا ڕوویداوە کە بیکاتە قوربانییەک.

ئەریێ، خۆ دەمزانی ئەوە تەنها پەیوەندیەکی شکستخواردوو نەبوو، هەروەها کریستین دەشێت بەو ڕێژەیەش تاوانبار نەبێت من دەمزانی کە ئەم پەیوەندیەی بە هیلاکی بردم و کردمیە بەردە، بەڵگەیە لەسەر کەمیەک، تێکچونێک، برسیەتیەک یاخود پێویستیەک کە لە قوڵایی ناخمدایە.

دەشبوو کە ڕووبەڕووی ئەمە ببمەوە.

کاتێک گەڕامەوە بۆماڵەوە و، کۆمپیوتەرەکەم کردەوە بۆ ئەوەی دەست بە گەڕان بکەم لە بارەی ماوەیەکی نوێ لە ژیانی بیلالی حەبەشی، ئەم ناونیشانەم بەدی کرد: سەرەتایەکی نوێ..

ئەوە بوو کە پێویستم بوو.

♦♦♦

## لاتیشا

دەتوانیت قسە بکەیت لاتیشا... ماثیۆ ئەمەی پێ گووتم، کە سەرۆکی ئەو کۆمەڵەی پشتگیرەییە کە دایمەزراندووە.

هەستامەوە و زەردەخەنەم کرد و گووتم:

" سڵاو، ناوم لاتیشایە، لە پازدە ساڵی پێشوودا، بە زۆر کۆمەڵ لە کۆمەڵەکانی پشتگیریدا تێپەڕیوم. سوودم لە هەموویان وەرگرت.

سەرەتا لە کۆمەڵەی پشتگیری ئەو هاوسەرە ژنانەی کە توشی کێشە بونەتەوە، چ جەستەیی، چ دەرونی.

پاشان دوای ئەوە لە کۆمەڵەی پشتگیری ئەو دایکانە بووم کە بێ هاوسەرن.

ئێستاش لەگەڵ ئێوەم، لە کۆمەڵەی پشتگیری ئەو دایکانەی منداڵەکانیان توشبووی شێرپەنجەن.

ئەوڕۆ دەبێت دەست بکەم بە گەڕان بە دوای کۆمەڵەیەکی پشتگیری دیکە..

سەبارەت بە پشتگیری کردنی ئەو دایکەنەی کە بە دڵنیاییەوە منداڵەکانیان تا مەرگ بەڕێ دەکەن.

بیلال، تەنها چەند مانگێکی ماوە. ڕێژەی ڕزگاربوون: سفر لە سەدە".

چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، بەڵام زەردەخەنەم کرد. ئەوە زەردەخەنەی ڕاستەقینە نەبوو، تەنها دەمەویست کە زەردەخەنە بکەم بۆ ئەو ڕاستەقینە نوێیەی هەموو ڕۆژێک نزیکتر دەبێتەوە. بەڵام نەشمدەتوانی ڕیگری بکەم لە چاوم لە فرمێسک ڕشتن لەگەڵ هەر زەردەخەنەیەکدا.

هاندانی ئیجابیانەی زۆر هەبوون. تێبینی هاوسۆزی و هاوخەمی و ترسم لە چاوی هەمواندا بەدی دەکرد، هاوسۆزی لەگەڵ من، ترسیش لەوەی کە یەکێکیان بێنە شوێنی من جاری داهاتوو، کە بگەڕێت بە دوای کۆمەڵەی پشتگیری کردن بۆ ئەو دایبابانەی منداڵەکانیان چاوەڕێی مەرگ دەکەن.

هەموویان بە نەرمونیانی و دڵدانەوەوە لە باوەشیان گرتم، هەندێک فرمێسکم بەدی کرد، ماثیۆ هەر بە ئاشکرا گریا، من ئەو ئەندامە چالاکە نەبووم کە هەموو کات ئامادە بم، بەڵام ئەوە دوو ساڵ بوو دوای هەموو شتێک. دوو ساڵ کە ئەوانەی ڕۆشتبوون وازیان لە کۆمەڵەکە هێنابوو، هەندێکجار بۆ مردنی منداڵەکە، هەندێک کات بۆ چاک بوونەوەی... هەندێک کاتیش هەندێکیان ون بوون بە بێ ئەوەی هیچ بڵێن.

هەموو کات بیرم لەوانە دەکردەوە کە نایەن، ئەوانەی کۆتاییان بە ئامادەبوونیان هێناوە، هەوڵمدەدا کە خەیاڵ بکەمەوە کە ئەوان دڵنیاییان بەدەست هێناوە کە شێرپەنجەکە ڕۆشتووە بە بێ گەڕانەوە. هەوڵمەدەدا کە خەیاڵی ئەوان بکەمەوە تاوەکو خۆم بخەمە نێو ئەو بارودۆخەیانەوە کە وازم لە کۆمەڵەکە هێناوە چونکە شێرپەنجە وازی لە بیلال هێناوە.

کەیفم بەوە دەهات کە هۆکاری ئەوەیان بۆ ڕوون بکەمەوە، بۆ ئەوەی هیچ کامیان ئومێدی بە چاکبوونەوەی بیلال نەبێت، و وا خەیاڵ بکاتەوە کە بیلال شێرپەنجەی بەزاند.

نەخێر. ئێمە بەزین.. وەک ئەوەی لەگەڵ زۆر کەسدا ڕوودەدات..

هەموو ئەوەی کە هەیە هەبوونی ڕێژەیەکی رزگاربوونە کە وا لە هەندێک دەکات بەردەوام بن، هەوڵبدەن، دەڵێن کە هەلێکیان هەیە بۆ ئەوەی لە نێو ئەو سێ لە دەیا بن.

ئێمە زانیمان کە پێویست بە بەردەوامی ناکات.

سفر لە سەد.

◆ ◆ ◆

بۆ ماوەیەک تەماشای ماگیم دەکرد، پاشان بە نەرمیەکەوە پێی گووتم: بڕیاری چیت داوە لاتیشا؟

لە هۆڵی نان خواردن بووین، نـانی نیوەڕۆمـان دەخـوارد. مـاگی بردبومیـە مێزێکی کەمێک دوور لەوانی دیکـە، لەوانەیـە بـۆ ئـەوەبێ کـە ئـەو پرسـیارەم لێبکات.

لێم پرسی. سەبارەت بە چی بڕیار بدەم؟

" دەزانیت، سەبارەت بە بیلال، ئایا پێی دەڵێیت".

من هەوڵمدەدا کە شتەکە دوابخەم، ئەوە دە ڕۆژێکە من لێی ڕادەکەم.

پێم گووت" لە پشووی کۆتایی هەفتە بڕیار دەدەم".

ماگی زەردەخەنەیەکی کرد و گووتی" لاتیشـا پـێ دەچێـت دیـدارت لەگـەڵ خۆت دانابێت لە کۆتایی هەفتە؟".

دیدارێک لەگەڵ خۆم؟ گومـانم هەیـە خـۆم هـیچ کـاتێکی هـەبێت بـۆ هـیچ یەکبینینێک.

گووتم: بـە نزیکـەیی بـەڵێ، هەڵدەسـتم بـە کردنـی work out و هـەموو ترسەکەم خاڵی دەکەمەوە و، لەو کاتەدا بیری لێدەکەمەوە.

ماگی گووتی: work out؟ کاتێک کە منداڵ بووم، بە خـۆم دەگـووت کـە ۆرک ئـاوت پـەرکەمێکـە و زوو تـەواو دەبێـت، ئومێـدی ئـەوەم دەکـردەوە بـۆ ئەوەی بە ویژدانێکی ئاسودەترەوە بەردەوامی بە ژیان بـدەم، بـەڵام بەداخـەوە هەندێک لە پەرکەمەکان زیاتر لەوانی دیکە دەمێننەوە.. بـەڵام مـن ڕاهـاتبووم لەسەر ویژدانم.

پاشان گووتی: " ئازیزەکـەم مـن زۆر لـە بـارەی work out دەزانـم، وەک خۆت دەزانی، بەڵام من دەمەوێت شـتێک دەربـارەی work in بـزانم.. ئەگـەر لە شوێنی تۆ بومایە- کە دەزانم شوێنەکەت زۆر زۆر قورسە، خـودای گـەورە لە پشتت بێت -ئەگەر لە شوێنی تـۆ بوومایـە، ئـەوە بـە بـیلالم دەوت، ئـەوە هیچ ئاسان نابێت، بەڵام هـەر پـێم گـووت.. پـێم دەگـووت، ئـەو تـەنها چەنـد مانگێکی هەیە بۆ ئەوەی بژیەت، ئـەوەش بـۆ ئـەوەی هـەموو ئەوانـە بژیـەنێت

که تێیدایه، به هەموو دووریەکانیەوە، بە قورسترینیان تێیدا.. هەر چەند مانگێکی هەیە، دەی کەواتە با ئەو چەند مانگە بێت کە هەموو ئەوانەی ئاواتی پێ خواستووە بیهێنێتە دی بۆ بیست ساڵی دیکە یان زیاتر، لێی گەڕێ با ئەوەی دەیەوێت بیڵێت، هەموو هەوڵێکی خۆشت بدە بۆ ئەوەی هەرچی دەیهەوێت بیهێنیتە دی بۆی... هەندێک دەمرن کاتێک هەر هەوڵدەدەن، لێی گەڕێ با بە ئارامی بمرێت مادام جەنگەکە لە قازانجی ئێمە نابێت، بەڵام لێی گەڕێ با بژیەت مادام هێشتا نەیدۆڕاندووە، لێی گەڕێ با ژیانێکی ناوازە بەسەر بەرێت!"

من دەگریام.

" دەزانیت جۆن کیتس چی بۆ خۆشەویستەکەی فانی براون نوسیوە؟ گووتی: تەمەننا دەکەم کە دوو پەپولە بوینایە کە بۆ سێ ڕۆژ زیاتر نەژیاینایە، سێ ڕۆژی هاوینی خۆشبەختی زیاتر تێدایە لە پەنجا ساڵی ئاسایی".

جۆن کیتس لە بیست و پێنج ساڵیدا مرد، تەنها بیست و پێنج، بەڵام ڕێک وەک پەپولە ژیانی بەسەر برد، مرد پێش ئەوەی زۆربەی شاعیرەکانی سەردەمەکەی بمرن، بەڵام شیعرەکەی زۆر زیاتر لەوان ژیا بە ئاست ئاست، ئەوان هەلیان هەبوو کە شیعری زیاتر بهۆننەوە، بەڵام ئەو ئەوەی گرنگ بوو هۆنیەوە، لەنێو شاعیرەکانی سەردەمەکەی خۆی ئەو گرنگترە، سەرەڕای ئەو نیوەی تەمەنی ئەوان ژیا..

پەپولە ژیانێکی زۆر کوورت دەژی لاتیشا، بەڵام زۆر جوان.. زۆر زۆر جوان".

زەنگەکە لێی دا. وەک زەنگی بەخەبەرهاتنەوە وابوو لە ناو مێشکمدا. وەک زەنگی ئاگادارکردنەوە.

ماگی باوەشی پێدا کردم و گووتی: له ناخەوه کار لەسەر ئەوه بکە، لە ناخەوه کاری لەسەر بکە ئازیزم..

Honey work it in, work it in

کاتێک له کۆتایی هەفتەدا ڕامدەکرد، کارم لەسەر ئەوه دەکرد له ناخەوه. زەنگەکەش هێشتا له ناو مێشکمدا لێیدەدا.

◆ ◆ ◆

From: amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

subject کۆچکردن بۆ جیهانێکی نوێ:

دانی پێدا دەنێم بیلال کە من موسوڵمانێکی (باش) نیمە.

لە ڕاستیدا، زۆر قورسە کە هەر بە موسوڵمان دابنرێم.

من لە دایک و باوکێکی موسوڵمان لە دایک بووم، بەڵام من زۆری ژیانم بەسەربرد و ئەوەم نەدەزانی و یاخود تێنەدەگەیشتم لە ماناکەی، ئەوان هەرگیز کەسێکی ئاینی نەبوون، بە هیچ ئاینێکەوە،جگە لە کۆتاییەکانی ژیانیان.

من لێرە نیم بۆ ڕوون کردنەوەی ئیمان یاخود بێ ئیمانی، بەڵام دەمەوێت بڵێم، کە من سەرەڕای بێ ئیمانیم – ئەمە کەمترینە کە بیڵێم ئێستا– ئەوەیە کە من وەک ئەمریکیەک، هەموو کات شتێکم دەدۆزیەوە، لەو کۆچکردنەدا، لە کۆچکردنەکەی موسوڵمانان، لە مەککەوە بۆ مەدینە.

وەک ئەمریکیەک، کە باوەڕی بە ئەمریکا هەیە، نەمدەتوانی لە بەراورد کردن هەڵبێم، لە نێوان ئەو کۆچکردنەی کە ئەمریکای دروست کرد، لە نێو چەندان کەسی جیاواز لە ڕەگەز و زمان و هەموو پارچەکانی جیهان، هەروەها یەکگرتووییەکەیان کە ئەمڕۆ خۆمان پێی دەبێژین (خەونی ئەمریکی)، نەمدەتوانی هەڵبێم لە جیاوازی کردنەکە، لە نێوان ئەو خەونە و، کۆچکردنی موسوڵمانان بۆ شوێنێکی نوێ، کە لە سەرەتاوە دەستپێدەکەنەوە تێیدا، ئەوانیش بە هەمان شێوە جیاواز بوون، لە ڕەگەزی جیاواز، ئەوان ڕۆمیان تێدابوو، فارسی، ئەسیوپی، هەروەها لە هۆزی جیاواز جیاواز بوون ئەو کاتانە هۆز وەک ڕەگەزنامە و ناسنامەی ئێستا وابوو.. هەموویان کۆبوونەوە لەسەر.. ناڵیم یەک خەون، هەروەها ناشڵێم کە شتێک بوو وەک خەونی ئەمریکی وابوو، بەڵام ئەوانیش لەسەر یەک ئیمان و باوەڕ کۆبوونەوە.

خەونی ئەمریکیش بە شێوەیەک لە شێوەکان باوەڕ و ئیمانە.

مـن یـاری بـە وشـە و دەربڕینـەکان ناکـەم لێـرەدا، بـەڵێ لەوانەیـە دوو ئیمانەکە دژ بەیەک بوبن، یان هەر بە لایەنی کەمەوە جیـاواز بـوبن، لەوانەیـە خەونی ئەمریکی باوەڕهێنان بوبێت بە ماددە، کۆچکردنەکـەی موسـوڵمانانیش باوەڕهێنان بوبێت بە غەیب، بە پێچەوانەی ماددە.. بێگومان لەمـە تێدەگـەم، ئەمە جیاوازیـەکی ناوەڕۆکییـە، بـەڵام شـتی لیکچـوو هاوبـەش لـەو نێوەنـدەدا هەن..

لە هـەردوو کۆچەکـەدا، لـە هـەردوو خەونەکـەدا، لـە باوەڕەکـەدا، شـتێکی هاوبەش هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە: باوەڕت بە خۆت هەبێت..

لە خەونی ئەمریکیدا، باوەڕبوون بە خود بناغەیە، بێگومان داینەمۆیە.

لە کۆچکردن بۆ مەککەدا، کە بەوە ڕۆژ ژمێرەکەیان دەستی پێکرد، دواتـر لەوێش بە هەمان شێوە باوەڕ بەخۆبوون هـەبوو، بـاوەڕ بـوون بـەوەی کـە لـە تواناتدا هەیە خۆت قوتار بکەی لە کۆت و زنجیرەکانی پێشوو، جا هـۆز بێـت یاخود ڕەگەز و، لە سەرەتاوە دەستپێبکەیتەوە.

لـە ئـەمریکا، هـەمووان یەکسـانن. وشـەی (مرۆڤ) یاخود (پیـاو) کـە لـە دەستووردا هـاتووە، دواتـر شـی کراوەتـەوە کـە قەسـدی هـەموو مرۆڤێکـە، بـە چاوپۆشین لە ڕەنگی و ڕەگەزی و هەر شتێکی دیکە..

ئەو شتەش لە مەدینەدا هاوشێوە بوو، هەمووان یەکسان بوون، نـە ڕەنـگ نە هۆز نە خێزانی زەنگین یاخود فەقیر.

بـیلال و، پلـە و پایەکـەی لـە لای موسـوڵمانان، لـە کاتێکـدا ئـەو ئەسیوپیەکی ڕەش پێستە.. بەڵگەیەکی مێژووییە لەوەدا.

(دەسپێکێکی نوێ)ش هاوبەشیەکی ڕوونە، لە نێوان هـەردوو خەونەکـەدا، یاخود هەردوو کۆچەکەدا.

هەروەک چۆنیش ئەمریکا جیهانی گۆڕی..

مەدینەش ئەو کاتە، گۆڕانکاریەک بوو کە کاریگەری لەسەر جیهان هەبوو، چونکە شارستانیەتی ئیسلامی لەو کاتە زێڕینەیدا دەستی هەبوو لە باشترکردنی جیهاندا، سەرەڕای ئەوەی دەرەنجامێکی خراپی هەیە لەمرۆژگارەدا.

لێرەدا بەراوردی شتەکە ناکەم، دوو دەربڕینەکە جیاوازن، منیش هەر بڕوام بە ئاین نییە..

بەڵام ناتوانم لە هەندێک خاڵی هاوبەش هەڵێم...

♦ ♦ ♦

ئەو شوێنەی کە موسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆی، مەدینەیە. سەرەتا ناوی (یثرب)بوو.. پاشان پلە بە پلە گۆڕا بۆ مەدینە، ئەوەش واتای ئەوەیە کە بووەتە گرنگترین (مەدینە: شار)، مەدینە لەگەڵ لامی (ناسراو)، بە پیتی گەورە.

مەدینە ٤٠٠ کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە، ئەو ڕێگەیە لەم ڕۆژەدا زۆر دوور دیارنیە، بەڵام بە تەواوی دوور بو بۆ ئەو سەردەمە کە هیچ ئاسایش و پاراستنێکی تێدا نەبوو بە پێی هۆکارەکانی گواستنەوە لەو سەردەمەدا..

ئەی بۆ ڕێک مەدینە؟

لەبەر ئەوەی دانیشتوانی مەدینە، کە لە دوو هۆزی دژ بەیەک پێک هاتبوون، زیاتر بە ئیسلام و بانگەوازی یەکتاپەرەستی و وازهێنان لە بتەکان قایل بوون وەک لە دانیشتوانی مەککە.

ئاینە نوێیەکە لەم شارەدا بڵاو بوویەوە بە شێوەیەک کە ماڵێکی تێدا نەبوو کە کەسێکی باوەڕدار بەم ئاینەی تێدا نەبێت، ئەوەش بەرە بەرە زیادی دەکرد لە ساڵەکانی داهاتوودا وەک لە مانەوە لە مەککە.

هەر بەم شێوەیە ئەو بانگەوازەی کە قبوڵکاری بەرفراوانی نەبوو لە مەککەدا، لە مەدینە سەرکەوتنی دۆزیەوە.. تاوەکو وای لێهات موسوڵمانان زۆرینە بوون تێیدا، هەروەها پێشنیاری پاراستن و پشتگیریکردنی موسوڵمانانی مەککەیان کرد، لە نێویشیاندا پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) موحەمەد و، بیلالی حەبەشی.

بەڵام بۆچی؟ بۆچی لێرەدا ڕووی داو لە مەککەدا ڕووی نەدا؟

یەکەم: هەبوونی گەڕەکی یەهودیەکان (جولەکە) بوو لە مەککە، یەهودییەکان دانیشتوانی ئەسڵی مەدینە بوون، هەروەک ئاسایی لەگەڵ دانیشتووانەکەی دیکەی مەدینەشدا تێکەڵ دەبوون، ئەوانەش لە لایەن خۆیانەوە شتی زۆریان لەسەر بنەما و بۆچونی یەهودیەکان دەزانی، لە بارەی خودای تاکەوە، هەروەها لە خراپی و هیچی بتەکان.

ئەمە وای لێکردن کە زیاتر قایل ببن بە بیرۆکەی تاقانەپەرەستی و وازهێنان لە بتەکان.

بەڵکو بگرە ئەوان تێبینی پێشکەوتنی یەهودیەکانیان دەکرد لە زۆر بابەتدا، هەر بۆیە لەوانەیە ئەم پێشکەوتنەیان بە خۆبەستنەوە و دەستگرتن بە ئاین و کتێبەوە بەستبێتەوە..

ئایا خەڵکی مەککە یەهودیان نەدەناسی؟ هیچ شتێ نازانین دەربارەی دانیشتوویەکی یەهودی لە مەککە، لە بارەی گەڕەکێکی یەهودیەوە هیچ نازانین، مەککە وێستگەیەکی بازرگانی گرنگ بوو، بێگومان یەهودیەکانیش پێیدا تێپەڕیون، بەڵام ڕێژەیەکی گرنگیان نەبووە لە نێو دانیشتوانی مەککەدا، ئەمەش وای لە خەڵکی مەککە کرد کەمتر بە دەم بانگەوازەکەوە بچن و کەمتر تاقانەپەرەستی قبوڵ بکەن، لەبەر ئەوەی کەمتریان لەسەری زانیوە..

گرنگتر لەمە، بە لایەنی کەمەوە بە نیسبەت سەرگەورەکانی مەککەوە، تاقانە پەرەستی هەڕەشەی بۆ سەر پێگەی بازرگانی مەککە هەبوو، لەبەر ئەوەی مەککە (کەعبەی ماڵی ئیبراهیم)ی لە خۆ دەگرت کە سەرگەورەکانی مەککە هەموو بتەکانی عەرەبیان تێدا دانابوو بۆ ئەوەی ڕایانبکێشن لە وەرزی بازرگانیدا.

تاقانە پەرەستی هەموو بتەکانی ڕەت دەکردەوە، بەمەش بازرگانی و قازانجی ڕەت دەکردەوە.

هەر لەبەر ئەمەش خەڵکی مەککە زۆر سلبی بوون لەگەڵ بانگەوازە نوێیەکەدا.

وەلێ خەڵکی مەدینە، قایلتربوون بەو بانگەوازە.

هەر بەم شێوەیە، موسوڵمانەکان دەستیان کرد بە ڕۆیشتن بۆ مەدینە بە نهێنی و، بەرە بەرە، ئەوەیشی کە کۆتا دانە مایەوە لە مەککە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) خۆی بوو، تاوەکو دڵنیا بویەوە لە دەرچوونی هەموو موسوڵمانەکان بۆ مەدینە.

◆◆◆

یەکەم شت کە موسوڵمانەکان کردیان لە مەدینە دروستکردنی مزگەوتێک بوو.

نوێژ ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێت لە ژیانی موسوڵماناندا، ئەوەش وەک کۆرسێکی خۆڕیکخستن و ئەدەب و ڕەوشتە، پێنج جار لە ڕۆژێکدا، ئەوەش زۆر سەیر بوو بۆ عەرەب کە هەموو ژیانیان لە ناڕیکی و ئاژاوەیەکی زۆر گەورەدا بوو پێش ئەوە.

دروستکردنی مزگەوت، شوێنی نوێژ کردن، یەکەم هەنگاو بوو لە دامەزراندنی نوێ، نەک تەنها لەبەر ئەوەی نوێژ گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ

موسـوڵمانان، بـەڵکو هـەروەها لەبـەر ئـەوەی مزگـەوت دامەزراوەیـەکی کۆمەڵایـەتی بـووە، وێسـتگەی کۆمەڵایـەتی، بـا بێـژین کـە وەک یانەیـەکی کۆمەڵایەتی بووە، کە موسوڵمانەکان پێنج جار لـە ڕۆژێکـدا لەوانەشـە کـەمتر یان زیاتر، تێیدا کۆبوبێتنەوە.

ئەم چاوپێکەوتنانە دەستی هەبوو لە توندکردنی پەیوەندیـەکان لـە نێـوان ئەندامـەکانی کۆمەڵگـە نوێیـەکەدا، وای لێـدەکردن نزیکتـرین و زیـاتر دەسـت بەیەکەوە بگرن..

پێنج جار هەموو ڕۆژێک.

♦ ♦ ♦

بەڵام ئایا چۆن کاتی نوێژیان ڕادەگەیاند؟

لێرەدا ڕۆڵی بیلال دێت.. لێرەدا هەلە مێژوویەکە دێت.

لە عەبدوڵای کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە دەڵێت:

کاتێک پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) فـەرمانی کـرد کـە زەنگێـک بهێـنن بـۆ ئـەوەی لێیبـدرێت و خـەڵکی پـێ کـۆ بکرێتـەوە بـۆ نـوێژ ، مـن خەوتبووم و پیاوێک هاتە خەونم کـە زەنگێکـی لـە دەسـت بـوو، پـێم گـووت: ئـەی بەنـدەی خـودا! زەنـگ دەفرۆشـیت؟ گـووتی: چ ئیشـێکت پێـی هەیـە؟ گووتم: خەڵکی پێ بانـگ دەکـەین بـۆ نـوێژ، گـووتی: ئایـا شـتێکی باشـتر و چاکتر لەوەت پێ بڵێم؟! گووتم پێی: ئەی بۆ نا.

دەڵێت: ئەو پیاوە گووتی:

دەڵێیت: اللّٰه اکبر اللّٰه اکبر، اللّٰه اکبر اللّٰه اکبـر، اشـهد ان لا الـه الا اللّٰـه، اشهد ان لا اله الا اللّٰه، اشهد ان محمـدا رسـول اللّٰـه، اشـهد ان محمـدا رسـول اللّٰه، حی علی الصلاة، حی علی الصلاة، حی علی الفلاح، حی علی فـلاح، اللّٰـه اکبر اللّٰه اکبر، لا اله الا اللّٰه.

عەبدوڵا دەڵێت: دوای ئەوە ڕایکێشام و گووتی: پاشان کە هەستایتەوە بۆ نوێژەکە دەڵێیت: اللّٰه اکبر اللّٰه اکبر، اشهد ان لا اله الا اللّٰه، اشهد ان محمدا رسول اللّٰه،حی علی الصلاة، حی علی الفلاح، قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة، اللّٰه اکبر اللّٰه اکبر، لا اله الا اللّٰه.

کاتێک کە ڕۆژ بوویەوە: هاتمە لای پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) و ئەوەی بینیبوم بۆم گێڕایەوە، گووتی: ویستی خودای لەسەر بێت ئەوە خەونێکی ڕاستەقینەیە، هەستە و لەگەڵ بیلال ئەوەی بینیوتە بۆی بگێڕەوە بۆ ئەوەی بانگی پێ بدات چونکە ئەو دەنگی لە دەنگی تۆ پاراوترە، هەر بۆیە لەگەڵ بیلال هەستامەوە و پێم گووت تاوەکو بانگی پێ بدات، دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ئەمەی گوێ لێبوو لە ماڵەکەی خۆیەوە هاتە دەرەوە و چاکەتەکەی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا و دەیگووت: سوێند بەوەی بە هەق تۆی ناردووە ئەی نێردراوی خودا! هەر ئەوەی کە ئێستا دیتم لە خەونیشمدا بینیم! پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)یشگووتی: دەی سوپاس بۆ خودا!"

یەهودیەکان کاتی نوێژەکانیان بە زوڕنا ڕادەگەیاند، مەسیحیەکانیش — کە هێشتا هەر بەو شێوەیە – بانگەکانیان لە ڕێگەی زەنگەوە ڕادەگەیاند.

پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)یش شتێکی نوێ و جیاوازی دەویست، شتێک کە بانگەوازە نوێیەکە لەوانی پێشووتر جیابکاتەوە.

پاشان پێشنیارێک لە یەکێک لە نزیکەکانی پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)ەوە هات.. دەنگی مرۆڤ.

دەنگی مرۆڤ دەربخەن. لێی گەڕێ با ئەو بانگ بدات.

دەنگت بەکاربهێنە.

بیرۆکەکە زۆر ناوازە بوو لە لای پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)، لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە لەگەڵ ناوەڕۆکی بانگەوازەکەدا یەکدەگرێتەوە، بەشداریکردنی مرۆڤ لە کرداری و گۆڕانکاریدا.

بەڵام کاتێک بیرۆکەی دەنگەکەی بۆ هات.

لای کردەوە بۆ لای بیلال.

دەنگەژێیەکانی بیلال ڕای کێشابوو، لەوانەیە پێش موسولمانبوونی، لەوانەیە لەو کاتەدا بوبێت کە ڕادەکێشرێت و دەڵێت (احد، احد).

بەڵام ئاخۆ بۆچی بیلال هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی ببێتە بانگبێژ؟

ئایا تەنها لەبەر ئەوەی دەنگی خۆش و ئارامبەخش و بەهێز بوو؟

یاخود لەبەر ئەوەی وشەکانی ناو بانگەکە، بە ڕاستەقینەتر دەردەکەوێت، کاتێک لە دەنگە ژێیەکانی کەسێکەوە دێتە دەر کە بە بەردایەتیدا تێپەڕ بووە و، لا اله الا اللّٰه هۆکاری ئازاد بوونەکەی بووە؟

ئەو وشەیەی پیغەمبەر لە بارەی دەنگی بیلالەوە گووتی (ندی) یە... وشەکەش واتای ئەوەیە بە ئاوی باران تەڕ بووە، زەویەکی (ندی) ئەو زەویەیە کە بە ئاوی باران تەڕ بووە و، ساز و ئامادەیە بۆ گەشەکردن و بەرگرتن.

ئەوە ئەو زەویە بە پیتەیە، کە ئامادەیە بۆ پێشوازی کردنی تۆ و لە باوەشگرتنی.

هەر بەم جۆرەش بوو دەنگی بیلال، بە پیت، ئامادە بۆ گەشەکردن، بۆ لە باوەشگرتنی بیرۆکەکە.. ئامادەیە بۆ بەر گرتن تێیدا..

هەر بەو شێوەیە، ئەگەر بە جوانی تێبفکرین و بڕوانینە هەر بەهرەیەکی ڕاستەقینە..

هەموو بەهرەیەکی ڕاستەقینە وەک زەویەکی بە پیت وایە.. دەتوانێت بەر بگرێت.. دەتوانێت گوڵ بگرێت..

بەڵام هەموو کات دەکەوێتە سەر ئەوەی چ تۆوێک دەچێنیت..

لەوانەیە گەنم بچێنیت... یاخود ئەفیون..

◆◆◆

## بیلالی حەبەشی

بەڵێ..

تا خەریک بوو دەیکوشتم، کاتێک لە مەککە دەرچووم.

لە پەرۆشیم بۆی خەریک بوو دەمردم.

ئەو مەککەیەی تێیدا ڕاکێشرام، ئەو مەککەیەی تێیدا ئەشکەنجە درام، ئەو مەککەیەی سوکایەتی پێکردم..

ئەو مەککەیەی کە دەبێت دڵخۆشبم بە چوونەدرەوە لێی.

ئەو مەککەی کە دەبێ هەست بە ئازادی بکەم تەنها بە هاتنە دەرەوە لێی.

بەڵام، ئەوەتا من لە تاو تادا عارەقە دەکەمەوە، لەوەتەی بە جێم هێشتووە.. ئەوەتا من شیعر دەخوێنم لە پەرۆشیدا بۆی.

نەدەبوو ئەمە روویدات.

بەڵام مەککە، مەککەی کە بە بەردە بووم و ڕاکێشرام و ئەشکەنجە درام تێیدا، هەر ئەو مەککەیە کە موسوڵمان بووم تێیدا، هەر ئەو مەککەیە کە ئازاد بووم تێیدا، هەر ئەوەی کە تێیدا خۆمم دۆزییەوە.

مەککەی کە ڕۆژێک گاڵتەی پێکردم، ئەوەی کە لە باوکم دووری خستمەوە، هەر ئەوەیە کە تێیدا خۆمم دۆزیەوە، ئەوەیە کە تێیدا جێگرەوەی باوکم دۆزیەوە..

ئەو مەککەیەی کە تەنها (شتێک) بووم کە دەکڕام و دەفرۆشرام تێیدا، ئەوە خۆیەتی کە تێیدا واتای مرۆڤ بوونم دۆزیەوە، ئەوە خۆیەتی کە تێیدا زانیم سپی پێست بەسەر ڕەشت پێست دا پەسەند نییە و ئەویش بەسەر سووردا نییەتی..

مەککەی کە بە ڕەشی ناوزەدی کردم، هەر ئەو مەککەیە کە فێری کردم ڕەشییەکەم ڕێک یەکسانە لەگەڵ سپیەتی پیاوێکی دیکەدا، هەروەها ئەوەش کە دەمکاتە باشتر یاخود خراپتر لەو، ئەوەیە ک لە ژێر ئەو پێستەدایە، ئەوە لە ناخمدایە نەک لە ڕووکارم، ئەوەیە کە لە ژیانمدا دەیکەم نەک ئەو ڕەنگەی پێی لە دایک دەبم و بۆم دەمێنێتەوە بە بێ هەڵبژاردن لە باوانمەوە.

ئەو مەککەیەی کە بیری دەکەم هەر ئەوەیە کە تێیدا گوێم لە قورئان بوو، هەر ئەوەیە کە تێیدا قورئان دڵمی داگیر کرد و لە ناخمدا هەموو شتێکی سەرا و ژێر کرد.. من شیعر تام دەکەم و دایدەڕێژم و پاشان بە گۆرانی دەیچڕم، بەڵام ئەم قورئانە شتێکی دیکەیە، سروشێکی ئاسمانییە کە بۆ لای خۆیمان دەگوازێتەوە، نا، سروشێکی ئاسمانیە کە زەوی باشتر دەکات.. منی باشتر کرد.

مەککەی کە بیری دەکەم، ئەو مەککەیە کە قورئانم تێدا دەخوێند، تێگەیشتم لە کاتی خوێندنیدا دەنگم خۆشتر و قوڵتر و پاراوتر دەبێت..

ئەرێ.. بیری مەککە دەکەم، لە پەرۆشیدا بۆی نەخۆشم، هەر خۆم نیم، ئەبو بەکر، ئەوەی کە ئازادی کردم، ئەویش لە پەرۆشیدا بۆی نەخۆشە، دەڵێن بەهۆی ئەوەوەیە کە کەشو هەوای یەثریب بۆمان گونجاو نییە، بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە بەجێهێشتنی کەش و هەوای مەککە بۆمان گونجاو نییە.

دەزانم کە ڕادێم، دەزانم کە مەددینەم خۆش دەوێت، لەوانەیە ڕۆژێک وام لێبێت لە مەککە زیاترم خۆش بوێت، بەڵام ئێستا، دوور دوور دوورم لەوە.

خەریکم لە خۆشەویستی مەککەدا شیعر دەهۆنمەوە. مەککەی کە خۆمم تێدا دۆزیەوە، مەککەی کە ژیانم تێدا دۆزیەوە واتای ئەوەم تێدا دۆزیەوە کە کێم.

ڕقـێکم لـە دانیشـتوانەکەی لـە دڵـدا نییـە، هـیچ شـتێک جگـە لـە سەرگەورەکانی نەبێت، ئەوان ناچاریان کردین لە مەککە دەربچین.

بەڵێ.. هیچ کیشەیەکم نییە لە ڕق لێبونـەوەیان، ئەمـە دژی باوەڕەکـەم و خۆشەویستیەکەم بۆ مەککە ناوەستێتەوە.

عوتبە و شەیبە و ئومەیە.. ئەو سیانە، خراپتـرین و ستەمکارترین بـوون لە مەککەدا، هیچ بۆشاییەک نەماوەتەوە بۆیان تەنها بـە نـەفرەت کردنیـان .. یان ڕق لێبونەوەیان نەبێت.. ئەوانەن کە وایان لێکردین مەککە جێبهێڵین..

ڕادێم، دەزانم.

لەو تایە ڕزگارم دەبێت و شیفام بۆ دێت.. لەوانەشە مەددینەم لـە مەککـە خۆشتربوێت..

ئەوە دەزانم.

◆◆◆

## ئەمجەد

بێگومان ئەو پرسیارەم لێدەکات.

بێگومان لێم دەپرسێت، بیلال لە بانگدانی نویژدا چی دەگووت.

بێگومان داوای ڕوونکردنەوە دەکات.

لە هەموو شتەکانی پێشووتردا قسەم دەکرد بە بێ ئەوەی هەست بکەم کە دژی خۆم دەوەستمەوە وەک بێ باوەڕێک.

من باسی تاقیکردنەوەیەکی بنیادەمیم دەکرد لە بارەی بانگەوازێکی کۆمەڵایەتیەوە دەدوام کە کاریگەری و ئیجابیاتی لەسەر کۆمەڵگەکەی و جیهان هەبووە. بە شێوەیەک مامەڵەم لەگەڵ ئەو بانگەوازەدا کرد کە ئاین دەرکەوتەیەکی کۆمەڵایەتیە و، لە کۆمەڵگاکەوە خۆی دەردەچێت و، لە ئاسمانەوە دانابەزێت. بیگومان ئەوەم بە بیلال نەگووت، ناتوانرێت ئەوە بە کەسێک بگوترێت کە نزیکە لە مەرگەوە و لە ساڵەکانی یەکەمی هەرزەکاریەکەیدایە.

بەڵام من پێچەوانەی ئەوەم نەگووت. هەوڵمدا کە ئاسایی بم، لەگەڵ تیشک و سەرنج خستنە سەر ئیجبییاتەکان، بەڵام بە بێ ئەوەی باس لە خودا بکەم.. چونکە زۆر بە سانایی دەبوومە درۆزن.

هەموو ئەو ماوەیە حاشام لێدەکرد.

ئێستە دەبێ ڕووبەڕووی ببمەوە.

ئەو پرسیارەی بیلال کە دێت ئەستەم نییە.. پرسیارم لێدەکات لە بارەی ئەو وشانەی کە بیلالی حەبەشی لە بانگبێژیدا دەیگووت، بە چ شتێک دەنگی بەرز دەکردەوە؟

لە وشەکان تێراماوم.

ئەمە داوێکە بۆ من، ناتوام لێی هەڵبێم.

بۆ من هەموو کات "لا اله: هیچ خودایەک نیە" بووە.

ئەو وشانەشی کە بیلالی حەبەشی بانگی پێ دەست پێکرد "لا الە الا اللّٰە: هیچ خودایەک نییە جگە لە اللّٰە" بوو.

لە نێوان (لا الە) و (الا اللّٰە) دا مەودایەکی گەورە هەیە. ناتوانم گوێی پێ نەدەم. ناتوانم بە شێوەیەک دەری ببڕم وەک ئەوەی دەرکەوتەیەکی کۆمەڵایەتی بێت و باس لە ئیجابیاتەکانی ئەم دەرکەوتەیە بکەم و پاشان بڵێم کە (لا الە)..

ئەوەش شتێکە پێشبینی ناکەم باش بێت بۆ بارودۆخی بیلال.

ناتوانم لێی ڕابکەم.

ئایا دەتوانم پرسیارەکەی پشت گوێ بخەم؟

ئایا شتەکە دوابخەم تا پرسیار دەکات.. یاخود خۆم ئامادە بکەم بۆی؟

هەوڵمدا خۆم سەرقاڵ بکەم بە ڕاستکردنەوەی هەندێک پەڕە کە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم لە زانکۆوە. هەروەها چەند جارێک وانەی داهاتووم ئامادە کردبوو، ڕاهێنانم لەسەر گووتنەوەی کردبوو لەماڵەوە، کۆپەرم بردە دەرەوە بۆ پیاسە و بە فیکرمدا هات کە لەوانەیە کرستین لە بیری کردبێت، لەوانەیە هەر بۆ بێزارکردنم کرپیبەتی. هێشتاش بیر لە کریستین دەکەمەوە. هێشتاش دەچمە ناو پەڕەی فەیسبوکەکەیەوە. کەمتر، بەڵام خۆ هێشتا هەر دەڕۆم.

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و تەماشایەکی نامەکانم کردەوە، هیچ شتیکم لە لایەن بیلالەوە پێ نەگەشتبوو.

تۆ بڵێی ئەو پرسیارە بکات.

یاخود چاوەڕێی منە کە بپرسم.

تەماشاکە پرسیارەکە لە منەوەیە، ئەوە منم بە دوای یەکلایی کردنەوەی نێوان (لا الە) و (لا الە الا اللّٰە) وەئەم و بەهانەیەک دەدۆزمەوە لە پرسیارەکانی بیلالدا بۆ ئەوەی بچمە نێو شتانێکەوە کە هەموو کات وام دەرخستبوو یەکلایی بووەتەوە.

هەر بەڕاست یەکلایی بووەتەوە؟

من بێ باوەڕ بووم، یاخود کەسێکی بە گومان کە بە بێ باوەڕ خۆی دەردەخست؟

کریستین دەیگووت کە باوەڕهەبوون بە خودا وەک (پەردەیەکی ئاسایش)ە کە بنیام بەدی هێناوە.

باشە، بۆ منیش بێ باوەڕی هەمان شتە.

بۆ من بێباوەڕی وەک پەردەی ئاسایش بوو. شتێک بوو کە بەسەر خۆمدا دابوو بۆ ئەوەی ڕزگارم بێت لە بێ وەڵامی، لە سەر لێشێواوی.

باوەڕهەبوون و بێ باوەڕی لەوەدا لەیەک دەچن کە یەکلاییکەرەوەیەک پێشکەش دەکەن، ئەمەش خۆی بۆ خۆی پەردەیەکی ئاسایشە.

ئەوەی کە لە ناوەڕستدا بیت، کێشەی ڕاستەقینەی هەیە، ئەوەی کە دڵنیا نەبیت لە هەبوونی خودا یاخود نەبوونی.

نێوەند، ئەو ناوچە بێ لایەنەی کە وەڵامی تێدا نییە، سەرەڕای هەبوونی پرسیار، ناوچەیەکی هیلاککەرە، بەڕاستی وەک ڕۆیشتنە بەسەر شوشەی شکاودا.

کاتێک کە پێم وابوو بێباوەڕم، بە شێوەیەک ئاسوودە بووم وەک لەو بارودۆخە گوماناوییەی ئێستا پێیدا تێپەڕ دەبم، بابەتەکەم قوفڵ کردبوو، دامخستبوو، خودا نییە.

ئەوڕۆ من کە نازانم.

تێدەگەم کە چۆن بێ باوەڕی و باوەڕهەبوون، پێکەوە، بە شێوەیەک پەردەی ئاسایشن.

ئەگەر ئێستا باوەڕم بهێنایە، ئاسوودە دەبووم.

ئەگەریش بگەڕێمەوە بۆ بێ باوەڕی، بە هەمان شێوە ئاسوودە دەبم.

بارودۆخی نێوەند و بێ لایەنی هیلاککەر و تۆقێنەرە.

له پڕێكدا شتێك وەك بروسك دای له مێشكم، لەو كاتەشدا كۆپەر وەڕی وەك ئەوەی درکی پێكردبێت.

ئەگەر كافری وەك پەردەی ئاسایش بێت وەك باوەڕ، ئەگەریش گووتمان دروستكراوی بنیادەمە ڕێك بەدیاریكراوی بۆ ئەوە، ئەدی بۆ هەمان شت لەگەڵ بێ باوەڕێدا ڕوونادات؟

كێ گووتی كە بێ باوەڕی وەك پەردەی ئاسایش نییە؟

ئەو دەربڕینەی داوكنزم بیر كەوتەوە كە تێیدا دەڵێت: شتێكی زۆر بەداخ و دڵتەنگكەرە ئەگەر ژیان ئامانجێكی نەبێت، بەڵام من پێشبینی نانێكی نیوەڕۆی باش دەكەم.

بۆ یەكەم جار تێبینی ئەوەم كرد كە بەڕاستی وەك ئەوەی كریستین گووتی كە بێ باوەڕی هەر وەك باوەڕهەبوون، پەردەی ئاسایشە.

چۆن تێبینی ئەوەم نەكردووە لە پێشوتردا.

هەروەها تێبینی ئەوەشم كرد كە ئەو پەردەیە پڕە لە كون و كەلەبەر.

تێبینی ئەوەشم كرد كە كۆپەر دەوەڕێ، لەبەر ئەوەی دەیەویست خۆی بەتاڵ بكاتەوە.

دەیویست.

پاشان كردی.

نەفرەتت لێبێت كریستین.

♦ ♦ ♦

## بیلال

چەندە گوناحە دایکم، چەند ڕۆژێکە دەیەوێت شتێکم پــێ بڵێـت. ئـەوە لـە چاوەکانیدا دەبینم. بەڵام ناتوانێـت. جـوان دەزانـم کـە دەهـەوێت چـی بڵێـت. دەیەوێت پێم بڵێت کە من دەمرم. دەزانم ئەوە چەندە قورسە بۆی. بەڵام مـن وای نابینم کە مردن بەو خراپییە بێت.

مەبەستم ئەوەیە بەڕاستی دەبێت چی ڕووبدات؟ لـە پڕێکدا ڕووناکیـەکان دەکوژێنەوە و بە زۆر هەست بە هیچ ناکەم، ئەگەریش ژیانێک لـە دوای مـردن هەبێت، ئەوە پێشبینی ناکەم بچمە شوێنێکی خـراپ، خـۆ زۆر باشـتر دەبێـت لە ژووری چارەسەری کیمیـایی. پرسـیار لـە ئەمجـەد دەکـەم لـە بـارەی دوای مردنـەوە، سـەرەڕای ئـەوەی بـە دڵنیاییـەوە ئـەو بـەو تاقیکردنەوەیـەدا تێپـەڕ نەبووە.

هەر بۆیە بـە هـیچ جۆرێـک خـەمبار نـیم کـە دەمـرم. مـردن بـەو شـێوەیە خەمناک و ناخۆش نییە. من تەنها لەبەر خەمباری دایکـم خـەمبارم. ئـەو زۆر بیری من دەکات. زۆر دەگریەت بەڵام هەوڵ دەدات کە بیشـارێتەوە و شکسـت دەهێنێت تێیدا. زۆر باشە کە مامۆستایە و نەبووتە ئەکتەر، بـە زۆری لەسـەر شەقامەکاندا دەماینەوە ئەگەر ئەکتەر بوایە.

هەوڵ دەدات بە شێوەیەک ڕەفتار بکات وەک ئـەوەی هـیچ شـتێک نـەبوبێ و شتەکان هەمووی باش بن، بـەڵام هـەموو ئەوانـەی کـە دەیکـات پێچەوانـەی ئەوە دەردەخات، ئەگەر پێشتر خۆم نەمزانیایە کە دەمرم ئەوا لە ڕۆڵگێڕانـە خراپەکـەی ئـەوەوە تێدەگەیشـتم و دەمزانـی، پـێم وابێـت هـەموو دایکـەکان خـراپن لـە ڕۆڵگێڕانـدا. بـەڵام هـەموو کـات باشـتر دەمێننـەوە لـە باوکـەکان. ئەوانـەی کـە ئامـادەی پرۆڤـەکان نـابن، یـاخود هـەر بەلایـەنی کەمـەوە کۆمبارسەکان.

دەمەوێت پارمەتی دایکم بدەم، دەمەوێت ئەو بارگرانییەی لەسەر شان لابەرم. پێی بڵێم کە من دەزانم. ئەو کاتە پرمەی گریان لێدەدات و لە باوەشم دەگرێت و بەردەوام دەبێت لە ژیان ئەگەر تەنانەت بە خەمباریشەوە بێت، بەڵام نەک وەک پشیلەیەک لەسەر ڕووی پلێتێکی گەرم.

پشیلەیەک لەسەر ڕووی پلێتێکی گەرم.. ئەی لەو دەربڕینە!!.. ئەوە فیلمێک بوو بەشێکیم تەماشاکردبوو لە کەناڵی فیلمە کلاسیکیەکان. بەڵام دایکم ڕێک وەک ئەوە دەردەکەوێت. ئەو زۆر جوانتر لەو ئەکتەرە ڕۆڵ دەبینێت.

دەمەوێت لەسەر ڕووی ئەو پلێتە گەرمە لایبەرم.

دەمەوێت پێی بڵێم کە من دەزانم و شتەکەش بەو خراپییە نییە، ئایا پێی بڵێم کە من دڵخۆشم بەوە بۆ ئەوەی بارەکەی لەسەر سووک بکەم، یاخود ئەوە ڕۆڵگێرانێکی خراپ دەبێت وەک ئەوەی خۆی؟

ئایا دانی پێدا بنێم بۆیی کە من پێشتر داوام لە خودا دەکرد کە بمرم؟ چۆن ئەوەی بۆ شی بکەمەوە، بێگومان زۆر ئاڵۆز دەبێت، پێشبینی کەمتر لەوە ناکەم گەرمایی ئەو پلێتە زیاد بکات کە لەسەری تەپاوتل دەکات.

بەڕاستی هەست بە ترسێکی گەورە ناکەم بەرامبەر مردن.

تەنها کەمێک هەست بە حەسرەت و داخ کێشان دەکەم. دەکرا کە ژیانێکی باشتر بژیەم. بەلام پێم وایە ئەوە وای لێدەکردم کەمتر قایل بم بەو مردنەی کە دوای چەند مانگێک دێتە پێشم.

کەواتە ژیانە خراپەکەم بەو شێوەیە خراپ نەبووە.

◆◆◆

## لاتیشا

"من دەزانم دایکە".

بەم شێوەیە بیلال پێی گووتم بێ ئەوەی چاو بتروکێنێت.

دڵم داکەوت، نانی ئێوارەمان دەخوارد، بۆ هەزارەمین جار شکستم هێنا لەوەی کە پێی بڵێم. شکستم هێنا لەوەی سەری پەتەکە بگرم بۆ دەستپێکردن، بەس بمتوانیایە ئەو پەتە بگرم، ئەوە دەمتوانی پێی رابگەیەنم، بەڵام ئەو پەتە وەک ئەوە وابوو لە ئاگری دۆزەخ دروست کرابێت. من بە بێ وەستان لە بارەی مستەر وید و ماگی و ووبی و قوتابیەکان و هەموو شتێک دەدوام، بە بێ پچڕان دەدوام بۆ ئەوەی هەست نەکات کە من دەمەوێت شتێکی پێ بڵێم.

قسەکانمی بڕی بۆ ئەوەی بڵێت: من دەزانم دایکە.

خوێن لە دەمارەکانمدا وشک بوون. وا دەدەکەوێت کە لە پڕێکدا سپی بوبێتمەوە.

"چی دەزانیت؟"

بە تەواوی ئامادە بوو بۆ ئەوەی نکۆڵی لە هەموو شتێک بکەم، بیلال خۆی پەتەکەم دەداتێ، منیش نکۆڵی لێدەکەم و پێی دەڵێم کە هەڵە تێگەیشتووە و، هەموو شتێک باش دەبێت.

لە پڕێکدا وا دەردەکەوێت کە لە بارودۆخی نکۆڵیکردندا بم، هەروەها لە بەردەم بیلالدا نکۆڵی لە شتەکە دەکەم لەبەر ئەوەی هەر خۆی لە ناخمدا ناتوانم دانی پێدا بنێم. نامەوێت ڕووبەڕوی ببمەوە، ناتوانم بڕوای پێ بکەم.

بیلال بە زۆرزانیەکەوە زەردەخەنەی کرد.

" هەموو شتێک دەزانم، هەموو شتێکم بینی".

تۆ بڵێی ئەنجامی پزیشکیەکەی بینیبێت کە بۆم نێردرابوو؟ چۆن بینیویەتی؟ ئاخر خۆ ڕاستەوخۆ لە بەریدی تایبەتیمەوە سرپیمەوە پاش ئەوەی بۆ بەریدی تایبەتی قوتابخانەکەم نارد بۆ ئەوەی لەوێ لە ئەماندا بیهێڵمەوە، چونکە بیلال وشەی نهێنی ئەوەیان نازانێت.

تەنانەت ئەگەر بینیبێتیشی، خۆ ڕاپۆرتەکە باس لە بارودۆخەکەی ناکات بە ڕوونی، تەنها چەند ناو و ژمارەیەک و چەند شتێک دەدات کە زۆر قورسە شیکردنەوە و تێگەیشتنی بەو شێوەیە.

بە دەنگێکی بە حاڵ بیستراو گووتم: چیت بینیوە؟ هەموو شتەکان باشن... هەموو شتێک زۆر باش دەبێت..

خەریکبووم هەڵدەسامەوە بۆ ئەوەی لە باوەشی بگرم و بگریم کاتێک لەسەر سینگمە بەڵام ئەو بە زۆرزانیەکی زەردەخەنەیەکی کردەوە و گووتی:

" زانیم کە پلان دادەنێیت بۆ بەسەربردنی جەژنی سەری ساڵی نوێ لە دیزنی لاند.. ئەمە جوانترین جەژنی سەری ساڵ دەبێت لە ژیانمدا".

ئۆهههه! کەواتە ئەمەیە.

بە ئاسوودەیی هەناسەیەکم هەڵمژی. بێگومان ئەو نامەیەی دکتۆر تشۆنگی خوێندووەتەوە کە ڕەزامەندی دەربڕیوە لەسەر گەشتەکە یاخود تەماشای دڵنیایی شوێنگرتنەکەی (حیجز) دیتووە کە هاتووە بۆ بەریدەکەم. دەمەویست نشکێو (سوپڕایز)ێک بێت بۆی. ئارەزووم بوو هەموو ئاواتەکانی بۆ بەجێ بهێنم، چەند ساڵانێک بوو کە دەیەویست بچێت بۆ دیزنی لاند، بەڵام لە نێو قەرزاریەکانی زانکۆدا نوقوم بووبوم، لە نێو ئەو قەرزاریانەی زانکۆشدا.. دیزنی لاند خەرجیەکی زۆر زۆر بوو بۆ دایکێکی (بێ هاوسەر).

بەڵام چیدی بەو شێوەیە نییە بۆ دایکێک کە تاقانەکەی دوای چەند مانگێک دەمرێت.

ئەم جارەیان، سەرەڕای خەرجی دوهێندە لە هەموو شتەکاندا بە هۆی وەرزی سەری ساڵی نوێوە، بەڵام ناکشێمەوە و نایەمە دواوە.

دە با هەموو ئەو شتانەی بۆ بەدی بهێنم لە خەونەکانی. پێش چەند ساڵێک دیزنی دەویست، پاشان لێی بێدەنگ بوو. دەزانم کە چوویە نێو تەمەنێکی جیاوازەوە، بەڵام دیزنی هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە گرنگە بۆ هەموو تەمەنەکان.

چوومە نێو جێگە و بە خۆمم دەگووت: خۆزگە شتێکی دیکەی دەزانی و ئەو بارگرانیەی لەسەرم لادەبرد. خۆزگە دەیزانی و دەیگووت کە دەزانێت.

لە بەیانیدا هەستامەوە و نامەیەکم لە بەریدەکەمدا دیتەوە.

♦ ♦ ♦

From: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

To: lateesha.bailey@hotmail.com

subject: دایکی ئازیزم

دایکی ئازیزم.

دەزانم کە شتەکە زۆر لە سەرت قورسە.

بە هەمان شێوە لەسەر منیش قورسە.

من هەموو شتێک دەزانم.

لە بارەی دیزنی لاند و، جەژنی سەری ساڵی نوێوە نا.

بەڵکو لە بارەی ئەوەش کە من دەمرم.

لەوانەیە باشترین دایک بیت لە جیهاندا، بەڵام بە دڵنیاییەوە باشترین ئەکتەر نیت. تۆ هەوڵتدەدا وا هەڵسوکەوت بکەیت کە هەموو شتێک لە شوێنی خۆیدایە و باشە، لەو ڕۆژەوەی کە گەڕایتەوە ماڵەوە و هەموو گیانت تەڕ بوبوو. بەڵام ئەوەی کە دەیکەیت پێچەوانەی ئەوەیە کە دەیڵێیت.

گوێم لێبوو لەگەڵ بێتیدا قسەت دەکرد و گووتت دەسنیشانکردنی نەخۆشیەکە، وەک خۆشت دەزانی گۆگڵ هەموو کات هەیە.

باشە دەمرم.

چیدیکە؟ ناتوانین هیچ شتێک بکەین، هەر بۆیە پێویستی بە گریان نییە (زۆر نا، بە لایەنی کەمەوە). وەک خۆم مردن بەو خراپیە نابینم... بەڵام دەزانم کە بیرم دەکەیت.. منیش هەروەها.. بەڵام، لەوانەیە مردن لە ئێستادا، باشتر بێت لەوەی لە دوای پێنج ساڵی دیکە بمرم بۆ نمونە لە ژێر ئەشکەنجەی دەرمانی کیمیای و تیشک و ڕشانەوە و ئازاری سەر و هەموو ئەمانە.

بە لایەنی کەمەوە ئێمە دەزانین کە دەمرم. خۆ دەکرا لە پڕدا و لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا گیان لە دەست بدەم. دایکە ئێستە هەندێک کاتمان هەیە. هەندێک کاتمان هەیە ئەوە دەزانین، هەندێک دەڕۆن بە بێ ئەوەی ماڵئاوایی بکەن. من دەکرێت کە پێت بڵێم ماڵ ئاوا. ئایا ئەمە باشتر نییە لەوەی بڕۆم بە بێ خوداحافیزی.

تۆ ئێستا دەگریەیت، من دڵنیام لەوە. بەڵام من فرمێسکەکانم گرتووە.

دایکە کوڕەکەت پیاوە پیاو، من ئێستا ناگریەم، من ناگریەم.

تۆ دەتگووت شتەکان باش دەبن کاتێک لە ناکاو وات زانی کە من بە شتەکەم زانیوە، ئەرێ دایکە.. باش دەبن، شتەکان باش دەبن.

بە ڕیگایەک لە ڕێگاکان بە لایەنی کەمەوە.

تێبینی: دەتوانیت لە ئێستاوە ماچم بکەیت و لە باوەشم بگریت هەر کات پێت خۆش بوو، بەڵام تکایە لە پێش چاوی خەڵکیدا نا. زۆر سوپاس بۆ تێگەیشتنت.

♦♦♦

## ئەمجەد

دوبارە لە تاو ئەو دەنگە لە خەو ڕاپەڕیم.

دەنگی بانگدان بۆ نوێژ.

وەک شێت هەڵدەسمەوە و تۆقیوم. دەنگەکە بە شێوەیەک بەرزە کە خەریکە کەڕم دەکات، پاشان نامێنێت.

هەموو شەوێک، بە نزیکەیی هەموو شەوێک.

هەموو گیانم ئارەقە دەکاتەوە، لە ناو ماڵەکەدا دەسوڕێمەوە وەک ئەوەی بە دوای سەرچاوەی دەنگەکەدا بگەڕێم.

دەزانم لە کوێ، دەزانم لە خەونمدا دەیبینم، بەڵام ناتوانم ڕووبەڕووی ببمەوە.

هەندێک کات دەیبینم.

نازانم کێیە، بەڵام ڕەشپێستێکە و دەنگێکی خەمبار و نەرم و نیانی هەیە، گوێم لێیە بانگ دەدات، جارێک بە دەنگی بەرز، لە دورەوە، جارێکیش وەک ئەوەی بڵێیت دەچرپێنێت بە گوێمدا، تەنها بۆ من، لە گوێمدا.

چی ڕوودەدات بە سەرمدا؟

وام لێهاتبوو حەبی خەوم دەخوارد تاوەکو خەوەکەم قوڵتر بێت. ئەنجامەکەشی ئەوەبو کە دەچووم بۆ سەر کار و نیوە خەوتوو بووم، بەڵام هێشتا هەر دەنگەکە هەڵیدەساندمەوە. ئەنجامەکەشی کارکردنێکی خراپ و شپرز و سەر لێشێواو بوو لە ناو وانەکاندا و وەرگرتنی چەند تێبینییەک بوو لە لایەن سەرۆک بەشەوە.. هێشتا هەر دەنگەکە هەڵم دەستێنێ، دێتە سەر سەرم و دەمروخێنێت.

چیم بەسەردا دێت؟

هەندێک کات باوکم دەبینم. لە دوورەوە لێم دەڕوانێ. زۆر لە دوورەوە. دەمەوێت لێی نزیک ببمەوە، بەڵام دەنگەکە لە نێوانماندا دەوەستێت. باوکم.. بەڵام لەو وێنەدا کە من منداڵ بووم.

هەندێک کاتیش کریستین دەبینم. لە بەردەممدا دەوەستێت بەڵام بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکات: کۆپەر، کۆپەر.

وەک ئەوەی بە ناوی کۆپەرەوە بانگم بکات.

پاشان ئەو دەنگە، ئەو دەنگە لە هەموو لایەک دەوری داوم. لە هەموو لایەکەوە دەمگوشێت.

هەروەها ئەم ڕەشپێستە، هەندێک کات زۆر گەورە دەردەکەوێت هەندێک کاتیش کەسێکی لاواز و ناسک. هەندێک جار لە سموئیل جاکسۆن دەچێت، هەندێک جاریش وەک مۆرگان فریمان. جار جارەش وەک ئەو گۆرانیبێژەی ناو میترۆیەکە کە گۆرانی (زەردەخەنە بکە)ی دەگووت، تەنانەت ئەو گۆرانیەش، وا هەستی پێدەکەم کە دەنگەکەیم لە شوێنێک گوێ لێبوبێت،، بەڵکو وا دێتە پێش چاوم کە لە ناو میترۆکەدام و، چاوەڕێی شەمەندەفەرێک دەکەم کە هێشتا نەگەیشتووە.

من چیم لێ بەسەر دێت؟

من گوێم لە بانگدان دەبێت لە خەونمدا؟ من؟!! جار لە دوای جار؟! بیرم نایەتەوە هەر ڕۆژێک لە ژیانمدا بە جوانی گوێم لێی بوبێت. ئەگەریش ئێستە کارم لە ئامادەکردنی چیرۆکی ژیانی ئەو بانگبێژە نەکردایە ئەوە هەر نەشمدەزانی وشەکانیشی چین بە دیاریکراوی. دەزانم ئەوان زیاتر لە یەک دەنگ ئامادە دەکەن بۆ ناو فیلمەکە، هیچ شتێکم گوێ لێنەبووە، هەموو ئەوانەشی ڕوودەدات و ئامادە دەکرێت زۆر لە منەوە دوورە.

من و نوێژ؟! نوێژ بۆ خودایەک کە باوەڕم پێی نییە؟! باوکیشم لە دوورەوە دەوەستێت.. هەروەها دەنگی ئەو بانگدان بۆ نوێژەی کە هەموو شتێکی داگیر کردووە. ئەی کریستین و میترۆکە.

بێ باوەڕێکی وەک من نابێت بەمەدا تێپەڕ ببێت.

یاخود ئەوەیە کە من بێ باوەڕێکی ڕاستەقینە نیم؟

کریستین دەیگووت کە من بێ باوەڕێکی ئەکادیمیم. ئەم جۆرەش لە بێ باوەڕی توشی ئەو توێژەرەوانە دەبێت کە لە سەرەتاکانیاندان و بۆ نزیک بوونەوە لە مامۆستاکانیان و و سەرکەوتن بەسەر پەیژەی ئەکادیمیدا. ئەو جۆرانە لە ئەوەڵەوە بێ باوەڕیکی ناڕاستەقینەن. جۆرێکە لە خۆدەرخستن. بەڵام لەگەڵ کاتدا دەبێتە ڕاستەقینە.

من بێ باوەڕێکی ناڕاستەقینە بووم؟

بیرم کردەوە کە من لەوانەیە پێویستم بە چارەسەرێکی دەروونی هەبێت.

بەڵام ئەو بیرۆکەیە دووبارە کریستینی هێنایەوە ناو خەیاڵم.

ڕیک وەک کابووس وابوو بۆم.

بیلالیش..

دەی بۆ نامەیەک نانێرێت و لێم بپرسێت لە بارەی بانگدانەکەوە و کۆتایی بە شتەکە بهێنێت؟

پێی دەڵێم کە (خودا نییە)، پێی دەڵێم کە هەموو ئەو شتانە چاوبەستکردنە بۆ ئەوەی وا لە خەڵک بکەن باشتر هەڵسوکەوت بکەن. پێی دەڵێم کە شتێک لەوێدا بوونی نییە. هیچ شتێک. هەروەها ئەوەشی پێی دەڵێم کە مردن کۆتاییە. هیچ شتێک.

تۆ بڵێی کاریگەری خراپی لەسەر دروست بکات؟

جا با واش بێت، ئەوە دەکەم.

بەڵام بیلال هیچی بۆ نەناردم.

ئەم پرسیارەی جێ هێشت وەک ئەوەی بیەوێت خۆم بە تەنها ڕووبەڕووی ببمەوە.

ئەوە من چی دەڵێم.. بیلال دەیەوێت؟!

بەڕاستی پێویستم بە یارمەتییە.

بەڵام نەک لە توێژەرێکی دەروونییەوە.

پێویستە ڕووبەڕووی ئەو دەنگە ببمەوە کە هەموو شەوێک هەڵم دەستێنێت.

ئەمە وەک ململانێ بۆ مانەوە دەردەکەوێت لە لام.

یان ئەوەیە ئەم دەنگە بۆ هەتا هەتا ببڕیت و نەمێنێت..

یاخود...

من؟؟؟!!

◆◆◆

## لاتيشا

ماگی پێی گووتم "هیچ کات پێم نەڵێی کە ئەمە خۆزگەی مردنە".

ئەو باسی لە گەشتەکەی دیزنی دەکرد.

بەردەوام بوو: بڵی ئەوە خۆزگەی ژیانە. ئەوە دوبارە بکەرەوە لای خۆت و بیچەسپێنە. خۆزگەی ژیانە.. وای دانێ کە ئێستا بەدی هاتووە.. ئەم گەشتەتان بۆ دیزنی مەبەستنەوە بە مردنەوە. چێژوەرگرتن مەبەستەوە بە مردنەوە. بەڵکو بیبەستەوە بە ژیانەوە. بەستنەوە بە مردنەوە هەم و ئەو دەسوتێنێت و، تۆش هەتا کۆتایی تەمەنت ئازار دەدات.

ئێمە دەڕۆشتین بۆ پۆلەکانمان، من گەیشتم، ئەوەیش هەر بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن و لای کردەوە و دەیگووت: خۆزگەی ژیان، ئەوەت لە بیر بێت.

خۆزگەی ژیان.

وشەی (خۆزگەی مردن)زۆر ناشرین دەردەکەوت. ڕێک وەک ئەو کەسەی دادگایی کراوە بە لە سێدارەدان و داوای دواهەمین خۆزگەی دەکات. کەیفم بەوە نایەت کە بیر لە بیلال بکەمەوە وەک کەسێکی مەحکوم بە سێدارە. بەڕاستی خۆزگەی ژیان باشترە.

خۆمم دۆزیەوە کە لە قوتابیەکانم دەپرسی کاتێک لە شوێنەکانی خۆیان دانیشتن: پێشبینیتان چییە بۆ خۆزگەی ژیانی کۆنتا کینتی؟

ئێمە گەیشتبووینە ئەو بەشەی کە کەشتیەکە دەگاتە ئەمریکا و، کۆنتا کینتی لە مەزادێکی ئاشکرادا دەفرۆشرێت، هەروەها گەشتەکەی لەگەڵ ئەو کەسەی کە کڕیویەتی و، بەردەیەکی ڕەشپێستیش گەیاندونیەتە ماڵەوە و لەو ماوەیشدا لە سندووقێک نراوە. هەروەها هەوڵە خێراکەشی بۆ ڕاکردن لە یەکەم هەلەوە کە بۆی ڕەخساوە، کە ئازادی چەشتووە پێش ئەوەی دووبارە دەستی بە سەردا بگیرێتەوە.

ئـەم بەشـەش بـە دڵنیاییـەوە بەشـێکی زۆر ڕەش و تاریـک بـوو، بـەڵام هێندەی گەشتی دەریاکە نا، خۆ ئـەمیش هـەر بـەو شـێوەیە. ئـەوەش زۆر بـە ڕوونی لەسەر ڕوخساری قوتابیـەکان بەدەردەکـەوت، ئەوانـەی هـەر بـە لایـەنی کەمەوە بەشەکەیان خوێندبوویەوە.

لیزا گوتی، کە هەر دەبوو یەکەم کەس بێت وەڵامی پرسیارەکان بداتـەوە: بێگومان ئازادی، ئاواتی ژیانی ئازادی بوو.

بـۆبی گـووتی: وام بـۆ دەرکـەوت کـە ئـەو دەیویسـت یـەکێک لـە سـپی پێستەکان بکوژێت، ئەوە ئاواتی ژیانی بوو.

جاک وەڵامی ئەو لێدانەی دایەوە: پێم وابێت ئـەوەی یەکـەم هـەوڵی دا بـۆ کوشتنی، ئەو ڕەش پێستە بوو کە لە لای سپی پێستەکە کاری دەکرد!.

فرێدی گووتی: ڕزگاربوون لـە کەلەپچـەکان، بـڕوا ناکـەم مانـای تـەواوەتی ئازادی زانیبێت جگە ڕزگاربوون لە کەلەپچەکان.

کێڤن گووتی: خۆزگەی ژیانی ئەوە بـوو کـە بگەڕێتـەوە بـۆ گوندەکـەی لـە گامبیا.

پێم گووتن: باشە، کەواتە ئێستا با جیـاوازی بکـەین لـە نێـوان خۆزگـەی ژیان و خۆزگـەی مـردن.. بـا وای دابنێـین کـە کۆنتـا کینتـی هەڵبژاردەیـەکی هەیـە، ئـەوەش داواکردنـی یـەک خۆزگەیـە، تـەنها یـەک دانـە، پـێش ئـەوەی بمرێت.. خۆزگەیەک دێتە دی یەک قیچ پێش مردنەکەی..

پێشبینی دەکەن چی بێت؟

لیـزا هاتـە گۆ: ئەگـەر دوای کـەمێک بمرێـت، ئـەوە پێشـبینی ناکـەم کـە ئازادی زۆر گرنگ بێت.

بۆبی گووتی: تۆڵە بسێنێتەوە لە ئەوانەی کە ئەسیریان کرد.

جاک گووتی: لەوانەیە ژەمێکی خواردنی باش.

کێڤن گووتی: دایکی و خوشکی ببینێت، ئەوە زۆر ڕون دیارە.

حەکیم گووتی: ئەوەی کە خودای گەورە لێی خۆش بێت، کۆنتا کینتی پێی وابوو کە هەموو ئەو شتانەی بەسەریدا هاتووە بە هۆی تاوانەکانیەوەیەتی، بەڕای من ئەمە زۆر ئەشکەنجەی دەدات.. زانینی ئەوەی کە خودای گەورە لێی خۆش بووە، یاخود ئەوەی هەموو ئەو شتانەی بەسەری دێت پەیوەندی بە تاوانەکانیەوە نییە.

بە هەموویانم گووت: کەواتە بە بیر و بۆچونی ئێوە جیاوازیەکە چییە، لە نێوان (خۆزگەی ژیان) و (خۆزگەی مردن) دا؟

لیزا ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە: بە ڕای من شتەکە پەیوەندی بە کاتی تەرخانکراوەوە هەیە.. خۆزگەی مردن بۆ کەسێک دروست دەبێت کە دەزانێت دەمرێت، تەنها کاتێکی کەمی هەیە.. هەر بۆیە خۆزگەی بۆ نمونە دروستکردنیماڵێکی گەورە یان هەبوونی خێزانێک نابێت.. بەڵکو شتێک دەبێت وەک ئەوەی بچێت بۆ گەشتێکی چێژ بەخش یاخود لە میوانخانەیەکی حەوت ئەستێرەیی دا بێت..

یاخود هەر شتێک لەو بابەتە.

فرێدی گووتی: خۆزگەی ژیان خۆزگەی هەموو ژیانە.. بەڵام خۆزگەی مردن تەنها بژاردنێکە.. دیاریەکی ڕەزامەندی.

کێڤن گووتی: خۆزگەی ژیان لەوانەیە لەوەدا خۆی ببینێتەوە کە مەزن و کاریگەر بێت وەک واڵت دیزنی، بەڵام خۆزگەی مردن ئەوەیە کە بچیت بۆ گەشتێک بۆ دیزنی لاند!

ئەوە زۆر نزیک بوو، نزیکتر لەوەی کە پێشبینیم دەکرد بابەتەکە بەو ئاڕاستەدا بچێت. لە شوێنی خۆمدا وشک بووم و پێم وابێ لێوەکانم هەڵدەلەرزین. قسەکانی زۆر ڕاست بوون. ماگی دەڵێت با گەشتەکە بۆ دیزنی لاند، خۆزگەی ژیان بێت. ئەم جارەیان ئەو هەڵەیە. ئەوە تەنها هەوڵێکی بێ ئەنجام دەبێت کە خۆمانی پێ دەخەڵەتێنین ، بێگومان خۆشییەکەی زۆر زۆر

دەبێت، بەڵام لە ژیاندا و لە خۆزگە و ئاواتەکانیشدا زۆر زیاتر لەوە هەیە. زیاتر لە خۆشی.

ئەم کێڤنە گۆڵەکەی پێکا... واڵت دیزنی بیت، نەک ئەوەی بچیت بۆ دیزنی لاند..

ئەمەیە خۆزگەی ژیان، ئەم ژیانە شایەنی ئەوەیە کە تێیدا بژیەیت و بیژیەنیت.

بەڵام بیلال، بیلالەکەم، ئەم هەلەی نییە.

هەستم بە گێژبوون کرد، بیلال و بیلالی حەبەشی کۆنتا کینتی و میکی ماوس و(زەردەخەنە بکە)، هەموو ئەوانە لە ساتێکدا بە خێرایی هاتنە ناو مێشکم.

بیری پەپولەکەم کەوتەوە. لە نێو ئەو هەموو هەورە رەشانەدا پەپولەکە بە سەر سەرمەوە نیشتووەتەوە.

دەبێت شتێک بدۆزمەوە لەم ژیانە کورتەدا بۆ بیلال. شتێکی گەورەتر و گرنگتر لە گەشتەکەی دیزنی. تەنها شەش مانگم هەیە بۆ ئەوەی ژیانێکی بۆ بدۆزمەوە شایەنی بێت. شەش مانگ بە ماوەی چارەسەری کیمیایی و ڕشانەوە و ئێشە و سەر گێژ خواردن، شەش مانگ بۆ پەپولەیەکی توشبووی شێرپەنجە.

دەبوو پرسیارێک ڕووبەڕووی قوتابییەکان بکەمەوە.

ڕۆتینیترین پرسیارم ئاڕاستەیان کرد. چی سەرنجی ڕاکێشان لەم بەشەدا؟

لیز خێرا وەڵامی دایەوە وەک ئەوەی مەشقی لەسەر کردبێت، بەڵکو بگرە بەدڵنیاییەوە مەشقی لەسەر کردووە: بێزکردنەوەی لە ئافرەتی سپی پێست، کۆنتا کینتی گووتی کە لە سەری ئافرەتە سپی پێستەکان شتێک هەیە لە (پوش) دەچێت، حەتمەن مەبەستی قژی زەردە. لە شیکردنەوەکەیدا

جێگرەوەیەکی دۆزیەوە بۆ دەست درێژی کردنە سەر ئافرەتەکان لە لایەن سپی پێستەکانەوە، سەرەتا وای دەزانی کە سپی پێستەکان ئافرەتیان نییە، ئێستە کە ئافرەتەکانی بینیوە، وایان دەبینێ کە شایەنی بێزلێکردنەوەن بە شێوەیەک کە سپی پێستەکان دەستدرێژی دەکەنە سەر ئافرەتە ڕەش پێستەکان.

پرسیم: کەواتە ئەمە چیمان پێدەڵێت؟

فرێدی وەڵامی دایەوە: پێمان دەڵێت هەموو کلتورێک پێوەری تایبەتی جوانی خۆی هەیە، ئەوەش کە لە کلتورێکدا جوان و سەرنج ڕاکێش بێت لەوانەیە لە لای کلتورێکی دیکە بێزلێکراو و قێزەون بێت. نەک هەر پێوەری ڕەهای جوانی. لەوانەیە بۆ هەر شتێکی دیکەیش وابێت..

زۆر کەیفم بەوە هات کە فرێدی گووتی:

کێڤن گووتی: بەڵام لەم ڕۆژدا ئەوە چیدیکە ڕاستەقینە نەماوە، عەولەمە پێوەری جوانی کردووەتە ڕەها، مس ئەمریکا بە دڵنیاییەوە لە کامبیاوە سەرنج بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، مس کامبیاش تاوەکو لە توانایدا هەبێت بە دڵنیاییەوە هەوڵدەدات کە لە مس ئەمریکا بچێت، عەولەمە جیاوازی کلتووری نێوان گەلانی نەهێشتوەتەوە و تەنها یەک قاڵب و چوارچێوەی پێشکەش کردووە و هەموو گەلەکانیش دەیانەوێت بچنە ناوی.

خۆمم بۆ نەگیرا: کێڤن بیڵ یان کۆرنێل؟

بە بێ ئەوەی چاوی بتروکێنێت ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە: بەڵکو هارفارد، ڕیزبەندیەکەی یەکەمە لە لیستی قوتابخانە پزیشکیەکاندا. بیڵ لە پلەی حەوتەمدایە، کۆرنێلیش لە هەژدەیەمدا.

ئۆهە، چەندە گێژم. کۆرنێل لە پلەی هەژدەیەمدایە لە پزیشکیدا. ئەمە ناگونجێت بۆ ئارەزووەکانی کێڤن. ئەو کێڤنەی بە تەواوەتی دەزانێت چی گەرەکە. ئەوەی کە کاتی تەواوی هەیە بۆ بەدی هێنانی ئەوەی کە دەیەوێت. هەر وەک ٩٥ لە سەدای تەمەنەکەی ئەو.

بۆ چەند چرکەیەک خەریکبووم بە خۆمم دەگووت کە کێڤن هەموو ئەو شتانەی هەیە کە بیلال نییەتی، نەک تەنها تەندروستی، بەڵکو باوکیش، پاشان بە زۆر خۆمم ڕاگرت.

هیچ ڕەوا نییە کە من مامۆستای قوتابی تەندروست و بەهێز بم، زۆرێکیش لەوان باوکیان هەیە، منیش دایکێکی (بێ هاوسەر) بم بۆ منداڵێکی توشبووی شێرپەنجە. هیچ ڕەوا نییە.

بۆبی گووتی: سەرنجم دا کە لە زنجیرەکەدا تەنانەت خێزانی خاوەنە سپی پێستەکەش بەرگری دەکات لە مافی ڕەش پێستەکان! هیچ شتێکی لەو شێوەیە بوونی نییە لە کتێبەکەدا، تەنانەت تەماشاکردنێکی هاوسۆزانەش.. هیچ نیشانەیەکی یارمەتیدانیش.

جاک تەمای گرتبوو وەک هەموو جار وەڵامی بۆبی بداتەوە، منیش لێم پرسیبا ئەوەمان کرد بۆبی.. کتێبەکە باس لە کۆنتا کینتی دەکات لە بینینی ئەوەوە، تەنها نەبینینی هەبوونی هاوسۆزی یاخود وەستانەوە دژ بە خراپ مامەڵەکردن یاخود بەردایەتی کردنەکە واتای ئەوە ناگەیەنێت کە نییە. بە دۆکیومێنتاری ئەم دژایەتیکردنە سەلمێنراوە، تەنانەت ئەگەر لە سەرەتاشەوە کەم و لاواز بوبێت. با بێژین کە زنجیرەکە بینینێکی بەرفراوانتری لە بینینی کۆنتا کینتی گواستووەتەوە، بەڵام ئەم بینینە بەرفراوانە، ئەو ڕاستییەی کە بەسەر کۆنتا کینتی و هەزارانی وەک ئەودا هات ناسڕێتەوە.. هەروەها گەیشتنی ئەوڕۆکەمان بۆ بارودۆخێکی باشتر، نابێت وامان لێبکات کە لە بیری بکەین چۆن گەیشتووینەتە ئێرە.. هەروەها نابێت ئەوەشمان بیربچێت کە سپی پێستەکان چەندێک قوربانیان داوە.. لە پاڵ ڕەش پێستەکاندا.

هیچ شتێکی دی سەرنجی ڕاکێشان؟

فرێدی گووتی: فرۆشتنی کۆنتا کینتی لە مەزادێکی ئاشکرادا و بەرزبونەوەی نرخی بەرە بەرە، شتێکی زۆر ئازار بەخشە.. هەروەها

هاوارکردن بۆی بە " ڕاستەخۆ لە درەختەکەوە لێی بکەوە" و " وەک مەیمون زیرەکن".

بێدەنگی بۆ چەند چرکەیەک باڵی کێشا بەسەر پۆلدا. ئەوە بەڕاستی ڕستەیەکی زۆر شەرمەزارکەر بوو، هەروەها درێژکراوەی ڕەگەزپەرەستی بە دوای خۆیدا هێنا کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە.

"چیدیکە"ئەمەم گووت بۆ ئەوەی هەوڵ بدەم بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ ببم، مستەر وید دوێنێ گووتی کە هەندێک لە خێزانەکان بێزارن لە کاریگەری (جذور)، هەروەها داوای لێکردم کە بەردەوام ڕوونکردنەوە بدەم بۆ قوتابییەکان تاوەکو کاریگەری نەرێنی نەهێڵێت، من تێبینی هیچ کاریگەرییەکی سلبیم نەکردبوو جگە گفتوگۆیەکی ئاسایی نەبێت.

حەکیم گووتی: هەر سوور بوو لەسەر نەخواردنی گۆشتی بەراز، هەر بە ڕووگەی ڕۆژهەڵاتیشدا نوێژی دەکرد.

جاک گووتی: کۆنتا کینتی سپی پێستەکانی لە دوورەوە بە بۆنەکانیان دەناسیەوە، هەروەها ڕەشپێستەکانیش... وەک ئەوەی هەستی بۆنکردن لەو کاتەدا زۆر بەهێزتر بووبێت بە بەراوردکردن بە کاتی ئێستامان.

ئێدی دەستی بەرز کردەوە و گووتی: کۆنتا کینتی زۆر سەری سوڕمابوو لە ڕاهاتنی ڕەشپێستەکان لەگەڵ بارودۆخەکەدا. لە هەڵنەهاتنیان بە تایبەت ئەو کاتەی کە سپی پێست دیار نەبوو یاخود ئەو کاتە دەست بەستراو نەبوون.. ئەو ئەوەی زۆر بە لاوە سەیر بوو.. لۆمەشی دەکردن... بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە تەنها ئەوانەی ڕادێن، ڕزگاریان دەبێت.

بیرم لە ڕستەی کۆتایی کردەوە، ئاخۆ مەبەستی خودی خۆی بووبێت؟ ئایا جیاوازبوونی و توشبوونی بە زۆرێک لە قسەی ناخۆش و بێزارکەر کاریگەری هەبووە لەسەر گووتنی ئەو ڕستە؟

گووتم: خاڵێکی گرنگە ئێدی، لەوانەیە من ڕام جیاواز بێت لەوەی کە دەڵێت ئەوانەی کە ڕادێن هەر ئەوانەن کە ڕزگاریان دەبێت، ئەوانەی کە (بەتەواوی) ڕانەهاتوون ئەوانەن کە توانیویانە لە دوایدا گۆڕانکاری بکەن..

ئیدی گووتی: بەڵام سەرەتا ڕاهاتوون، پاشان نەوەی دیکە هاتوون و بەرە بەرە ئەو بەربەستانەیان ڕت کردووەتەوە کە لە ناوەڕۆکەکاندا هەیە.

پێم گووت: ڕاهاتنی یەکەم هەڵبژاردن نەبووە، ناچاری بووە لە بری مردن.

کێڤن گووتی: کەلەپچەکان واتای گواستنەوەیان بووە لە جۆری ژیانی پێشووتریان، ئازادی، بۆ ژیانی بەردایەتی، نەک هەر ئەو کەلەپچە دیار و ئاشکرایانەی کە هەیە.. بەڵکو ئەو جۆرە ژیانەی کە تێیکەوتن خۆی بۆ خۆی کەلەپچەدار بوو.

لیزا وەک ئەوەی بڵێی بیر دەکاتەوە بە دەنگێکی بەرز گووتی: جۆری ژیان دەتوانێت هەندێ کەلەپچە دروست بکات کە نابینرێت، هیچ کەسێکیش ناتوانێت تێبینی ئەمە بکات ئەگەر لە نێو هەمان جۆری ژیاندا بێت..

من بەردەوامیم پێدا: بەڵێ ڕیک بەو شێوەیە.. بەردایەتی دەکرێت لە شێوەی جیاجیادا بێت، وەک ئەوەی بۆ یەکەم جار کۆنتا کینتی کەلەپچە ئاسنینەکانی بینی، بە تەواوی سەری سوڕما بوو لێی، تێی نەدەگەیشت، دەکرێت نەبینراو و ڕوون بێت، دەکرێت ڕابێین لەسەری و وەک باری (ئاسای بیگرین).. بەڵام ئەو جۆرەی ژیان دەکرێت لە ڕاستەقینەمان دووربخاتەوە و بمانخاتە نێو چوارچێوەیەکی زۆر بچوکتر لەوەی خۆمان هەین لەسەری بەڕاستی... دەکرێت (خۆزگە و ئاواتی ژیانمان) ئەو دیاری بکات بۆمان، دەکرێت ئاواتەکانمان بکاتە تەنها خۆزگەی مردن، پێش مردن داوای بکەین، وەک جۆرێک لە بژاردن، وەک جۆرێک لە دیاری ڕەزامەندی.

بيرم لەو ژيانە كورتەی پەپولە كردەوە كە دەمەوێت بۆ بيلال، بيرم كردەوە كە پەپولە سەرەتا دەبێت ئازاد بێت.. پێش ئەوەی ژيانەكەی ناوازە بێت.. بۆ ئەوەش ئازاد بێت، دەبێت بزانێت چی گەرەكە.

♦ ♦ ♦

یاریدەدەرەكەی مستەر وید هاتە لام بۆ ئەوەی پێم بێژێت كە كەسێك هەیە دەیەوێت بمبینێت. وام دانا كە باوكی یەكێك لە قوتابیەكان بێت و شتەكە لەوانەیە پەیوەندی بەوەوە هەبێت كە مستەر وید گووتی. پرسیارم لێكرد سەبارەت بە ناوی كچە یان كورە قوتابییەكەی، وەڵامی دایەوە كە شتەكە تایبەتییە.

چومە ژووری یاریدەدەرەكە.

پیاوێك بوو وا دەهاتە پێش چاوم كە شێوەی رۆژهەڵاتی یاخود لاتینی تێدا بێت، بە شێوەیەكی نادیار ئاشنا بوو لە لام.

كە منی بینی هەستایەوە و گووتی: زۆر داوای لێبوردن دەكەم خاتوو لاتیشا كە بە بێ خەبەر هاتم، ناوم ئەمجەدە، ئەمجەد حەلەوانی.

♦ ♦ ♦

## ئەمجەد

لە بری نامەی پرسیارکردن لە واتای بانگدان بۆ نوێژ، کە چاوەڕێ بووم لە بیلالەوە بۆم بێت، شتێکی دیکەم پێگەیشت.

نامەکە لە ئیمەیڵێکی جیاوازتر لە ئیمەیڵەکەی کە هەمیشە بەکاری دەهێنێت هاتبوو. پێی گووتم کە دەزانێت دایکی چاودێری ئیمەیڵەکەی دیکەی دەکات، هەروەها ئەو ئەم نامەیە دەنێرێت لەو ئیمەیڵەوە و دایکی بەمە نازانێت (بۆ ئەوەی بێزاری نەکات).

بیلال چوویە ناو بابەتەکەوە بە بێ پێشەکی، گووتی کە ئەو سۆراغی باوکی کردووە و زانیویەتی کە لە لویزیانا زیندانی کراوە، هەروەها حەوت ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنراوە بە تۆمەتی ئالوودەبوون بە مادە هۆشبەرەکانەوە.

بیلال دەیەوێت بچێتە سەردانی باوکی، پێش ئەوەی بمرێت.

هەروەها داوای لێکردم کە یارمەتی بدەم لە سەردانیکردنی باوکیدا لە زیندان.

پێی گووتم کە کاتی زۆری نییە (لەبەر ئەوەی پزیشکەکە هەندێک پشکنینی کردووە، لە دوای ئەوەش هەندێک گۆڕانکاری کردووە لە پشکنینەکەدا، ئەمەش وای کردووە هەندێک گۆڕانکاری ڕووبدات لە ئەگەری مردنیدا) — بەم شێوەیە گووتی.

هەروەها گووتی: دەتوانیت ڕەتی بکەیتەوە، بەڵام لەم بارودۆخەدا ڕووبەڕووی مەترسی دەبیتەوە کە ڕۆحەکەم هەموو شەوێ ڕاوت دەنێت لە دوای ئەوەی کە دەمرم و وات لێدەکەم ئازاری ویژدانت هەبێت و هەست بە تاوان بکەیت تاوەکو دەمریت.

هەر بەڕاست بەم شێوەیەی گووت. پاشان لە دوای ئەوە بە دێڕێک نوسیبووی: گاڵتە دەکەم.

پێی گووتم کە خۆزگەی مردنەکەی ئەوەیە (پیاوە پیرەکەم بناسم)، پاشان ئەوەشی بۆ زیاد کرد: دڵنیا نیم کە شتەکە شایەنی خۆ هیلاککردن بێت، بەڵام دەمەوێت هەلێک بەو پیاوە بدەم.

هەندێک زانیاری سەبارەت بە باوکی بەجێ هێشتبوو بۆم، کە لە ڕێگەیەوە دەتوانم داواکاری سەردانیکردن پێشکەش بکەم.

پاشان گووتی: ئەو تەنها ٧٢ دۆلاری هەیە.

ئەمە هەموو شتێک بوو.

تەنانەت داواشی لێنەکردم کە بە دایکی نەڵێم. باسی لە مردنەکەی نەکرد.

دەیەوێت هەلێک بداتە ئەو پیاوە!

لە کوێ؟ لە لویزیانا! ئۆکیدیل لویزیانا!

زیندانەکە لە ئۆکیدیل - لویزیانایە، لە دووری ١٤٠٠ کیلۆمەتر! بە دیاریکراوەیی لە ناوەڕستی ئەو هیچەی کە هەموو کات باسی لێوە دەکەن. هەرگیز نەمزانیوە کە شوێنی ئەوها هەیە.

منیش هەرگیز لە ژیانمدا سەردانی زیندانم نەکردووە. کەسێک لە ژیانمدا نەناسیوە کە سەردانی زیندانی کردبێت.

لەوانەیە کەسێک نەناسم کەسێکی ناسیبێت کە سەردانی زیندانی کردبێت.

من ئەکادیمیم! ئەکادیمیەکان ناچن بۆ زیندانەکان تەنها لەبەر خاتری توێژینەوەکانیان نەبێت.

ئـەو توێژینەوەیانـەی کـە وایـان لێـدەکات بەسـەر پـەیژەی ئەکادیمیەتـدا سـەرکەون، بـەڵام سـەردانیکردنی زینـدان لەبـەر چاوپێکـەوتنی کەسـایەتیەکی زیندانی، کەسایەتیەکی دادگاییکراو؟!

چیم بەسەردا دێت! بیلال چیم لێدەکات!

هـەروەها دەڵێـت کـە ڕۆحەکـەی لـە دوای مردنـی ڕاوم دەنێـت بـۆ ئـەوەی ئەشکەنجەم بدات، پاشان دەڵێت کە گاڵتە دەکات. هەر لەمەم کەم بوو. ئـەو منەی کە هەموو شەوێک کابوسەکان ڕاوم دەنێن، سـڵاو لـە شـەبەحی نـوێ و تازە، دە با بێتە ڕیزی یانەی شەبەحەکان کە هەموو شەوێک بـە دووامـەوەن، ئەمەش لـە پـاڵ سـمۆئێل جاکسـۆن و مۆرگـان فریمـان کـە لـە ڕۆڵـی بیلالـی حەبەشی و باوکمدا دەیانبینمەوە.

یەکەم کاردانەوەم ئەوەبو: ئەسڵەن چۆن زانی کە مـن لـە نیـۆرکم؟! ئـاخر چلۆن زانی کە من هەر لە ئـەمریکام؟ هـیچ شـتێکم لـە بـارەی شـوێنەکەمەوە نەگووتبوو. ئەی ئەگەر لە کالیفۆرنیا بومایـە، یـان نیـودلهی. قـاهرە. لـە هـەر شوێنێکی دنیا. چۆن زانی کەمن...

پاشـان هاتـەوە بیـرم کـە بێگومـان دەبێـت لـە ئـای پـی تایبـەت بـە ئامێرەکەمەوە زانیبێتی کە لە نامە ئەلیکترۆنیەکاندا دەردەکەوێت.

هەڵبژاردنێکم نەبوو. بژاردنی ئەوەم نەبوو کە ڕەتی بکەمەوە.

بە هیچ شێوەیەک ڕەت کردنەوەیم پێ نەدەکرا. هێندە هێزم پێ نـەبوو بـۆ ئـەوەی بڵـێم "نـا" بـە منـداڵێکی توشـبووی شـیرپەنجە کـە دەیـەوێت بـاوکی ببینێت لە زیندان.

تەنانـەت ئەگـەر ئـەو شـوێنەش لـە ناوەڕاسـتی هـیچ شـوێنێک بێـت. لـە ئۆکیدیل! وەک ئەوەی پێشتر گوێم لە ناوی ئەو شوێنە بوبێت.

کەمێک گەڕام بە دوای گەشـتەکانی نێـوان نیـۆرک و ئۆکیـدیل! تـەنها بـۆ ئەوەی خۆم بخەمە نێو ئەو ئەگەرانەی کە تێیدا دەبم.

بێگومان گەشتێکی بەردەوام نییە، دەبێت بوەستێت، بە زۆری لە دالاس/ فۆرت وۆرث، پاشان بۆ ناوەڕاستی هیچ شوێنێک، کە دەرکەوت فرۆکەخانەی لێیە. لە پێنج بۆ شەش کاتژمێر چاوەڕوانی. نزیکەی ٤٠٠ دۆلار.

ئەمە هیلاکییەکی زۆر نییە بۆ کوڕێک کە دەزانێت بەم زوانە دەمرێت، و دەیەوێت هەلێک بداتە پیاوە پیرەکە.

هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو لە بارەی سەردانیکردنی زیندان، دەرکەوت کە پێویستی بە پڕکردنەوەی فۆرم دەبێت لە ڕێی ئینتەرنێتەوە، ڕێک وەک پڕکردنەوەی فۆڕم کاتێک پێشکەشی زانکۆیەکی دەکەیت. هەروەها دەرکەوت کە قایل بوون بە داواکاریەکە پێویستی بە یەک مانگ هەیە.

هەروەک پێشبینیم دەکرد، ناتوانم پێنەگەیشتوویەک ببەم لەگەڵ خۆم بە بێ ڕەزامەندی بەخێوکەری یاسایی.

دەبێت بیلال ئەوەی زانیبێت.

دەبێت زانیبێتی کە حەتمەن دەبێت دایکی ئاگادار بکەمەوە.

بەڵام خۆی نەیویست کە پێی بڵێت.

♦ ♦ ♦

ناوی ئەو قوتابخانەیەم دەزانی کە دایکی بیلال تێیدا مامۆستا بوو. ناوی خۆشیم دەزانی، لاتیشا. جارێکیان هەروا بە ڕیکەوت ناوەکەی گووتبوو، هەروەها ناوی دایکیشی.

هەر بۆیە شتەکە زۆر قورس نەبوو.

بابەتەکە تایبەتی و کەسییە، گووتم، کاتێک یاریدەدەرەکە لە هۆکاری سەردانیکردنەکەمی پرسی.

پاشان ئەمەشم بۆ زیاد کرد: پەیوەندی بە کوڕەکەیەوە هەیە.

یاریدەدەرەکـە بـە تێکەیشـتنەوە تەماشـای کـردم، سـەرەڕای ئـەوەی کـە دڵنیام هیچ شتێک تێنەگەیشتووە. هیچ کەسێک نییە کە تـێبگات مـن بۆچی لێرەم.

دوای کەمێک، خاتوو لاتیشا هات.

ئەو بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش جوان بـوو. هـەرگیز پێشـبینیم نـەدەکرد کـە بـەو شـێوەیە جـوان بێـت، بـە نیسـبەت دایکـی کوڕێکـەوە کـە بـەهۆی شـێرپەنجەوە دەمرێـت. چاوەکـانی گەش و گـەورە بـوون، چـاوێکی زیـرەک دەردەکـەوت، خـەمێکی قـوڵ تێیـدا بـەدی دەکـرا. هـەروەها شـتێکی ئاشـنا دەردەکـەوت تێیانـدا. وەک ئـەوەی پێشـتر ناسـیبێتم. وەک ئـەوەی پێشـووتر بینیبێتم.

دەستم درێژ کرد: داوای لێبوردنم هەیە خاتوو لاتیشا، بە هـۆی هـاتنم بە بێ کات دانان، من ئەمجەدم، ئەمجەد حەلەوانی.

چەند چرکەیەک تێپەڕین ئەوەندە درێژ بوو هەستم دەکـرد چـاڵێکی قـوڵی درێژکراوەیە.

پێیدا دەرنەدەکەوت کە زانیبێتـی ئەمجـەد حەلـەوانی کێیـە. منـیش پێمـدا دەردەکەوت کە لە هەوڵوێسـتەیەکی زۆر شـەرمەزارکەردا بـم. کـێ گـووتی کـە بەڕاستی تەماشای بەریدەکەی بیلال دەکات. بیلال ئەوە دەڵێـت. کـێ گـووتی ڕاست دەکات. لەوانەیە هەر هیچ بیرۆکەیەکیشی نەبوبێت لەسەر ئـەو نامانـەی لە نێوانماندایە. بەڵکو لەوانەشە قایل نەبوایە بە ناوەڕۆکی ئەو نامانە.

بێدەنگ مایەوە وەک ئەوەی بیەوێت شتێکی بیر بێتەوە.

پاشان وا دەرکەوت کە بی ئومێد بوو لە بیرهاتنەوە و بە زەردەخەنەیـەکی پیشـەوەرییانەوە گـووتی: بـە چ شـتێک دەتـوانم یارمـەتیت بـدەم بـەڕێز حەلەوا...؟ ببورە... ناوەکەتم باش گوێ لێنەبوو.

گووتم: حەلەوانی، من ئەمجەدم، سیناریستەکە.. فیلمەکەی بیلال.

شێوەی ڕوخساری دەموچاوی ڕاستەوخۆ گۆڕا بۆ سەرسامی، پاشان هاواری کرد: ئۆۆۆو.. بەڵێ، بەڵێ، بەڕاستی ناوەکەت ئاشنا بوو لە لام... ببورە.. زۆر ببورە...

داوای لێکردم دانیشم، بەڵام سەرسامییەکە گۆڕا بۆ سەرلێشێوان کە بە ڕوونی لە ڕوخساریدا دیار بوو.

بەڵێ، سەرلێشێوانێکی بیرساییانەیە، ئەمجەد بوونی هەیە لە دونیای ڕاستەقینەدا، لەو سیناریۆیە جیاوازەدا،، لە پشت شاشەی کۆمپیوتەر یاخود ئایپادەوە. بەڵام لە پڕێکدا لە قوتابخانە لێت دەرکەوێ. بێگومان شتێک هەیە.

دانیشتبوو گووتی: من زۆر سوپاسگوزارم بۆ یارمەتیدانت بۆ بیلال.. داوای لێبوردنیشم هەیە کە پێشووتر نەمتوانیووە سوپاست بکەم.. لە ڕاستیدا منیش گەرەکم بوو کە سەرسامی خۆم دەربڕم بەوەی کە دەینوسیت...

هەستم کرد کە خوێن بە ورووژم دێت بۆ ڕوخسارم. وەک هەرزەکارێک وابووم کە گوێی لە وشەی سەرسامی بێت لەو کچەی کە بە بەردەوامی و بە نهێنی سەرسامی بووە.

ئەو بەردەوام بوو: لە ڕاستیدا، وشەکانت کاریگەری ئەرێنی لەسەر منیش هەیە نەک هەر لەسەر بیلال، هەروەها ڕوونکردنەوەت بۆ چیرۆکێکی مێژوویی وەک چیرۆکی بیلالی حەبەشی زۆر ورد و کاریگەرە.

پێم وابێت زۆر بێمێشکانە دەردەکەوتم. لەوانەیە دەمیشم داچەقاندبێت کاتێک گوێم لە پەسنکردنەکەی دەگرت. من ئەو ئەکادیمییەم کە دوای چەند مانگێک بڕوانامەی دکتۆرا وەردەگرێت (ئەوە بۆ دوو ساڵە هەر هەمان شت دەڵێمەوە، تاوەکو ئێستاش هەر وام، دوای چەند مانگێک بەدەستی دێنم)، دەبێت من هەڵسەنگاندن بۆ ئەو بکەم، نەک دڵخۆشبم بە هەڵسەنگاندنەکەی.

بەڵام لەوپەڕی خۆشیدا بووم کاتێک گوێم قوڵاغ کردبوو بۆ ئـەوەی دەیڵێـت. نقـەم لـێ بڕابـوو. حـەزم دەکـرد گـوێم زیـاتر بێـت. بەڕاسـتی زۆر بێمێشـک دەردەکەوتم.

ئەو بێدەنگ بوو و تەماشای دەکردم لەگەڵ ئەوەشـدا ڕوخسـاری گەڕایـەوە بۆ بارودۆخی سەرلێشێواییەکە. پاشان دوبارە گـوتی: بـە چ شـتێک دەتـوانم یارمەتیتان بدەم بەڕێز حەلەوانی؟

ڕوون و ئاشـکرا بـوو بـۆ ئـەو کـە مـن نـەهاتبووم تـاوەکو گـوێم لـە هەڵسەنگاندنەکەی ئەو بێت بـۆ ئـەوەی کـە دەینوسـم. سـەرەڕای ئـەوەی لـەو کاتەدا ئەوە ئەو شتە بوو کە گرنگ دەردەکەوت.

بێدەنگ بووم من وەک ئەوەی ئـەوەم لـەبیر کردبێـت کـە بـۆی هـاتبم. بۆ چەند چرکەیەک هەر بەڕاستی لە بیرم کرد. پاشان بیرم کەوتەوە.

پـێم گـووت: هـاتم سـەبارەت بـە بـیلال بـدوێم.. ئیمێڵـیکم لـەوەوە پێگەیشتووە، کەمێک جیاوازتر.. هەروەها تێیدا داخوازیەکی دیاریکراوی هەیە کە ناتوانرێت بکرێت بە بێ هەبوونی هەواڵ لای تۆوە.

ڕەنگی ڕوخساری بە تەواوی گۆڕا،وەک ئـەوە وابـوو ئـەویش لـە دونیایـەکی دیکەدابێت و من گەڕاندبێتمەوە بۆ ڕاستەقینە.

بە خێرای گووتی: چ جۆرە داواکاریەک؟

بە تۆزێک دودڵیەوە و دوای ئەوەی هەناسـەیەکم هـەڵمژی وەڵامـم دایـەوە: بیلال دەیەوێت باوکی ببینێت.

ڕاستەوخۆ شتێکی جیاواز لە چاوەکانیـەوە دەرکـەوت. تەماشـاکردنێک کـە هەسـتانێکی جیـاوازی لـە خۆیـدا هـەڵگرتبوو. خـەمناکی هـەبوو، لـە لایـەکی چاوەکانیدا، وەک فرمێسکێکی قەتیسبوو، لەوانەیە هەر لەو کاتەوە بوبێت کە هـەواڵی توشـبوونی بیلالـی بـە شـێرپەنجە زانیبێـت، بـەڵام شـتێکی دیکـەش هەبوو، بەڵکو بگرە شتانێکی زۆر، دڵتەنگیم خوێنـدەوە، بـەڵام شەرمەزاریشـم خوێندەوە، وەک ئەوەی نەیدەویست بیلال ئەو داخوازیە بکات.

تفەکەی قوتتدا و گووتی: بە دڵنیاییەوە ئەوە مافی خۆیەتی. هەر خۆم هەوڵم بۆ ئەوە دەدا لە هەموو بارودۆخەکاندا، نەدەبوو بیلال ئەو داخوازیە لە تۆ بکات و ئەو هیلاکیەت پێ ببڕێت.. شتەکە ئەوەندە ناهێنێت، من ڕێگەم لێنەدەگرت یاخود لە ڕووی بوەستمەوە لە جێبەجێکردنی ئەوەدا بەڕاستی..

ڕوخساری بە تەواوی پێچەوانەی ئەوەی دەگووت.

من وام دەرخست کە باوەڕم پێ کردووە، پێم گووت: بە دڵنیاییەوە، بیلال هیچ شتێکی دیکەی نەگووت، بەڵام نەیویست تۆ سەرقاڵ بکات یاخود بێزارت بکات.

ئەو گووتی: نا هیچ بێزارکردنێک بوونی نییە.. بەڵام بە تەواوی تێنەگەیشتم کە بیلال چۆن دەیهەوێت کە تۆ یارمەتی بدەیت، لەگەڵ ڕێزمدا.

ئەو زۆر دودڵ بوو، سەرەڕای ئەوەی کە هەوڵیدەدا بیشارێتەوە. دودڵییەکەی زۆر جوانتری دەکرد. سەرم لە خۆم دەسوڕما کە چۆن دەتوانم سەرنجی ئەوە بدەم لە ناوەڕاستی ئەوەی لەسەری دەدواین.

پێم گووت: بیلال دەیەوێت بچێت بۆ سەردانی باوکی لە ئۆکیدیل لویزیانا.

بە سەرسوڕمانەوە تەماشامی کرد و دووبارەی کردەوە: ئۆکیدیل لوزیانا!!

ئاشکرا دیاربوو کە ئەویێ بە ناوەڕاستی هیچ شوێنێک دادەنێت، ڕێک وەک من.

پاشان هێرشەکان زیادی کرد: ئەی ئەو بۆ نایەت بۆ سەردانکردنی؟

زۆر جوان دیار بوو کە من شکستم هێنا لەوەی وەک خۆی شتەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە.

پێم گووت: لەبەر ئەوەی لە زیندانە ئەو. ماوەی حەوت ساڵەی بەسەر دەبات. بیلال دەیەوێت سەردانی باوکی بکات لە زیندان.

ئەو بە تەواوی وەک ئەوەبوو بروسک لێی دابێت. پاشان جوێنێکی لە زار دەرپەڕی: ناپاکی بێ ئابڕوو. دەمزانی کۆتایی سەعید هەر زیندانە. هەر بۆ ئەمە دەبوایە بەجێم بهێشتایە، دەبوایە بیلالم لێی بپاراستایە.

شەرمەزار نەبووم. دڵخۆشبووم بەوەی بەشێوەیەک قسەی دەکرد وەک ئەوەی لەگەڵ هاوڕێیەکی دەردە دڵ بکات و جوێن بە هاوسەری پێشووی بدات بە بێ ئەوەی لەسەری بکەوێت.

بەڵام لە ناکاودا تەماشای کرد وەک ئەوەی تێبینی نەبوونی هیچ شتێکی کردبێت بۆ سەلماندنی ئەو شتانەی کە دەیڵێم.

ئایا دەتوانم ئەو ئیمەیڵە ببینم کە بیلال بۆی ناردووی؟

ئەبوایە ئەوە یەکەم شت بوایە کە بیکەم. خێرامکرد و ئیمەیڵەکەم کردەوە لە مۆبایلەکەمدا و، پیشانم دا. جوان لێی ڕووانی لە کاتێکدا کە نامەکەی دەخوێندەوە، دەیەویست کە بڕوا نەکات. دەیەویست گومان لە شتێک بکات. لەبەر خۆیەوە گووتی: کەواتە ئیمەیڵەکە جیاوازە.

مۆبایلەکەی بۆ گەڕاندمەوە.

پێم گووت: پێویستم بە ڕەزامەندی نامەیە لە تۆوە بۆ ئەوەی دەست بە پێشکەشکردنی سەردانیەکە بکەم.. جا ئەگەر هەر ڕەزامەندیتان لەسەری هەبێت.

گووتی: بەڵێ، ڕەزامەندم.. لە ڕووی دەسپێکەوە، مافی خۆیەتی کە باوکی ببینێت.. بەڵام زیندان.. سەردانیکردنی زیندان لەم بارودۆخەدا..

پاشان بە پشکنینێکەوە تەماشای کردم وەک ئەوەی بێژێت پێم: لەگەڵ پیاوێکیشدا کە نایناسم!

پاشان لێیپرسیم: شتەکە بە ئاسایی چەندێک کاتی دەوێت؟ پێشکەشکردنی و وەرگرتنی ڕەزامەندی لەسەر ئەوە.

وەڵامم دایەوە: نزیکەی مانگێک.

پاشان هەستم بە پێویستی ئەوە کرد کە بۆی ڕوون بکەمەوە کە من ئەزموونداری نیم لە کاروباری زیندانیدا: ئینتەرنێت وا دەڵێت، من هەرگیز لە ژیانمدا سەردانی زیندانم نەکردووە.

ئەوەم گووت و زەردەخەنەیەکم کرد، لە کاتێکدا ئەو بە پشکنینەوە تەماشای دەکردم وەک ئەوەی بیەوێت دڵنیای بکاتەوە کە کوڕەکەی نانێرێت بۆ لویزیانا لەگەڵ کەسێکی خاوەن پێشینە.

پێم گووت: من وانەبێژم لە زانکۆی مۆنرۆ، بەم نزیکانەش بڕوانامەی دکتۆرا بەدەست دێنم لە زانکۆی کۆڵۆمبیا.

لە کاتێکدا هەوڵیدەدا خەمخۆر دەربکەوێت لاتیشا گووتی: کۆڵۆمبیا! واو... دکتۆرا لە چیدا بە دیاریکراوی؟

گووتم: مێژوو، مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە دیاریکراوی.

ئەو گووتی: ئۆو، بەڵێ، دەبوایە خۆم ئەوەم بزانیایە.

زۆر دڵ بەداخ دەردەکەوت. داوای لێکردم کە پەڕەی ڕەزامەندی نامەکەی لە لا جێبێڵم بۆ ئەوەی بیری لێبکاتەوە. هەروەها داوای وێنەیەکی ناسنامەکەمی کرد.

قوتابخانەکەم جێهێشت و هەستم دەکرد کە ژیانم، لەو کاتەوەی بیلال یەکەم نامەی بۆم نارد، زۆر گۆڕاوە.

بەردەوامیش لە گۆڕاندایە.

◆◆◆

## لاتیشا

جەژنی سەری ساڵ لە دیزنی لاند — کالیفۆرنیا ئەوەیە کە دەبێت بەسەر هەمواندا ڕوویدات..

تەندروست و نەخۆشەکان، ئەوانەی کە لە سەرەمەرگن یاخود ژیانێکی دوورودرێژ لە بەردەمیاندایە.

جەژنی سەری ساڵ لە دیزنی لاند کالیفۆرنیا، جەژنی سەری ساڵی ڕاستەقینەیە!

تەنها ئەوەندەی کە لە سەرمای نیۆرک لە مانگی دیسێمبەردا رابکەیت بۆ بەهاری کالیفۆرنیا شتێکە کە دەتوانیت بەهێزیت پێ ببەخشێت دژی شێرپەنجە. جا چ بگات بە دیزنی لاند.

دیزنی لاند لە جەژنی سەری ساڵدا یەک سەروەتی پێویستە، بەڵام ئەوەندە دەهێنێت و شایەنیەتی، هەروەها هەندێک جاریش هەستم بە پەشیمانی دەکرد لەبەر ئەوەی ئەوە پێشووتر ڕووی نەدا، لەبەر ئەوەی بیلالم نەهێنا تەنها لەم بارودۆخەدا نەبێت.

هەندێک جار بیرم دەچویەوە، لە تاو خۆشیدا، بیرم دەچویەوە، لە کاتێکدا پشکنینەکانی بیلال و دەرمانەکانی لە جانتاکەمدایە، کە بیلال نەخۆشی شێرپەنجەیە.

ئەوە کاتە ڕێک هەر وەک کاتی پارچەکراو وابوو کە بردبووم بۆ بیرکردنەوە لە هەموو شتێک، نەک هەر شێرپەنجە، بەڵکو بە گەشتی داهاتووی بیلالیش بۆ لویزیانا. تەنانەت گفتوگۆکردنم لەسەری دواخست، دیزنیش هەلێکی زۆر باش بوو بۆ دواخستن. هەلێکی زۆر باش بۆ لە بیر کردن. یاخود تەنانەت بۆ سەرەتایەکی نوێ.

دکتۆر تشۆنگ بەڵگەنامەیەکی پزیشکی دامێ بۆ بارودۆخی بیلال و ناوی نزیکترین ئەو وێستگانەی کە دەتوانن گرنگی بە بارودۆخی بیلال بدەن ئەگەر توشی حاڵەتێکی نەخوازراو بویەوە، هەروەها چەند ئامۆژگاریەکیشی کردم لە ئەو یاریانەی بیلال پێویستە خۆیانی لێ بپارێزێت، ئەویش لیستی قەدەغەکراوەکان بوو کە یاریە خێرا و بەرزەکانە و ئەوانەشی کە شتی لە پڕ و لە ناکاوی تێدایە و بۆ سەر بارودۆخی بیلال ترسناکی هەیە وا لە بارودۆخی دەکات (ناجێگیر) بێت.

کاتێک ئامۆژگاری و چۆنیەتی یاریکردن و قەدەغەکراوەکانم بۆ بیلال خوێندەوە ڕاستەوخۆ گووتی: سوپاس بۆ خودا بەسمە کە Winnie poohو دەنکە هەنارە ببینم، ئایا دەتوانم وێنەیەک لەگەڵ مینی ماوسیشدا بگرم؟

ئەو ڕاستی دەکرد. کوڕێک لە تەمەنی چواردە ساڵیدا ناتوانیت لە چەتەکانی کاریبی قەدەغە بکەیت ئەگەر تەنانەت توشی شێرپەنجەش بوبێت، ئەگەر نا ئەوە دیزنی لاند تەنها ئەشکەنجەیەک دەبێت بۆی.

بەنزیکەیی پابەند نەبووم بە ئامۆژگاریەکانی دکتۆر تشۆنگەوە، جگە لەوەی کە بیلال هەندێک دەرمان بخوات کە ڕشانەوەی کەم دەکردەوە (ئەوەش هەندێک سوودی لاوەکی هەبوو، بەڵام زۆر بەسادەیی نەمتوانی بیر بکەمەوە - تەنها بیرکردنەوە - لەوەی کە ڕیگری بیلال بکەم لە ئیندیانا جۆنز و ماونتن سپەیس و میکی ماوس و مینی ماوس و بلۆتۆ و Winnie poohو دەنکە هەنارە و حەوت کورتە باڵاکەی بۆ بەجێ بهێڵم. وا هاتە پێش چاوم کە زۆر دڵخۆش دەبم بەمانە و، هەر بەڕاستیش دڵخۆش بووم. بەڵام بە دڵنیاییەکەی بیلال نا.

لەم گەشتەدا لە تەک بیلال منداڵیم گەڕاندەوە. نا. بە دیاریکراوی نەمهێنایەوە. بەڵکو ژیاندم. لەم گەشتەدا بە نزیکەیی بۆ یەکەم جار منداڵیم ژیاند. ئەو منداڵیە لە کلارا ئەڤینیو لە سانت لویس هەر منداڵیی نەبوو. بیرم

نایە کە منداڵ بوبێتم و خەونێکم بینیبێت، تەنها خەونێک، بۆ سەردانیکردنی دیزنی لاند.

بیلال لە ئەوپەڕی چالاکی و زیندەییدا بوو، بە لایەنی کەمەوە هەوڵی دەدا دەست بگرێت بەسەر هەموو هەستێکدا کە هەڵی دەکوتایە سەری، لە دوای یەکەم شەو کە لەوێ بەسەرمان برد، زوو هەستایەوە بۆ ئەوەی لە ڕیزی چاوەڕوانیدا بێت چونکە لەو کاتەدا کەمتر خەڵک هەبوون وەک لە دواتر، زۆر کاریگەر بوو پێیان بە شێوەیەک کە لە ژیانمدا نەمدیبوو، لە سەرکەشیەکانی" شاخی بروسک" دا هاواری دەکرد کە هیچ کەس بەو جۆرە هاواری نەدەکرد لە چواردەورمان، لە "شاخی سپلاش" بە شیوەیەک پێدەکەنی کە هەرگیز بەو شێوە نەمدیبوو، هەروەها سوور بوو لەسەر دانیشتن لە کورسی پێشەوە وەک ئەوەی ئینتەرنێت پێی گووتبوو بۆ بەدەستهێنانی گەورەترین بڕ لە چێژ و خۆشی، لە کاتێکدا ئاوەکە لە تەوقی سەری تا نوکی پێی تەڕ کردبوو.

لە پیاسە ڕوباریەکەدا بۆ ناو دارستانەکە بوویەوە بە منداڵێکی هەشت ساڵان کە ئاماژەی بۆ ئاژەڵەکان دەکرد و بە ناوەکانیان هاواری دەکرد وەک ئەوەی زۆر شانازی بکات بە ناسینیان..

لە ناو گەردووندا پیاسەمان کرد و هاوارمان دەکرد لە ناو خۆشی و چێژبینین. کاتێک نزیک دەبووینەوە لە " شاخی ئەستێرەکان"، لە ئیندیانا جۆنز لە ناو تۆقینندا هاوارمان کرد (سەرەڕای ئەوەی هاریسۆن فۆرد بەداخەوە زۆر نزیک نەبوو، تەنانەت جۆنی دیپیش لە ناو چەتەکانی کاریبیدا نەبوو، بیرم کردەوە: سوودی چەتەکانی کاریبی چییە بە بێ جۆنی دیپ؟) بەڵام ئەوە تەنها بۆ من وابوو، بۆ بیلال نا کە هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو لەسەر گرنگیپێدان بە کاریگەرترین پیاو لە جیهاندا، چونکە یارییەکە بۆ خۆی زۆر خۆش و سەرنج ڕاکێش بوو.

هیچ کەسێک بڕوای نەدەکرد، ئەگەر بیزانیایە، ئەو بیلالەی کە بەو هەموو هێز و پەرۆشیە و چێژ وەرگرتنە هاوار دەکات خەریکە دەمرێت بە هۆی شێرپەنجەوە و، ئەگەری ڕزگاربوونی سفر لە سەدە.

تەنها نەبوونی موو لە سەری و ڕوخساریدا وای لێدەکردن کە گومان بکەن.

یاخود ئەوەیە هاواری دەکرد و دڵخۆش و پەرۆش دەبوو لە بری ئەو تەمەنەی کە ناژێت.

لە دوای ئەوەی بیلالی هەرزەکار لە ناخیەوە قایل بوو، هەموو بەرنگاربوونەوە شاخاوییەکان و سەرکەشیە ترسناکەکانی بە سەرکەوتووی بڕی (دوو جار لەو دوو ڕۆژەی لەوێ بەسەرمانبرد ڕشایەوە، بەڵام هیچ سکاڵایەکی لەمەڕ سەر ئێشە یان سەرگێژخواردن نەکرد ، بە لایەنی کەمەوە هیچی نەگووت بۆ ئەوانە)، لە دوای ئەوەی هەموو ئەوانی تێپەڕاند، بیلال تیگەیشتووتر دەردەکەوت لەگەڵ ئەو منداڵەی ناو ناخیدا، شەرمی نەکرد لە ئارەزووی بۆ گەڕان بە دوای" نیمۆ"دا بە ژێرئاوگەڕ، تەنها بۆ منداڵان نەبوو، تەنانەت بە لای منیشەوە زۆر چێژ بەخش بوو، بەڵام پێشتر تەنانەت بیرلێکردنەوەیشی ڕەت دەکردەوە. نیمۆ بۆ منداڵانە، بەو شێوەیە دەیگووت. پیاوە گەورەکەم کە هەرگیز نەمدەتوانی ببینم کاتێک دەبێتە پیاو.

هەروەها داوای کرد، هەر خۆی داوای کرد کە ئامادەی شانۆگەری (عەلادین) بێت، لە کاتێکدا پێشووتر دەیگووت ئەوە بە لایەنی زۆرەوە بۆ پۆلی پێنجە. ئەو زۆر چالاک و بەکاردانەوە بوو لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی تێیدایە، پێشم وابێت هەر شانۆگەریەکە خۆی لەگەڵ هەرزەکاراندا ڕیکەوت و ئاشت بوونەوەیە زیاتر لە ڕیککەوتنی بیلال لەگەڵ ئەو منداڵەی ناو ناخیدا.

هەزاران وێنەم گرتبوو. دەمزانی ئەو شادییەی لەسەر ڕووخساری بیلالە وەک میوانێکە و مانەوەی زۆر ناخایەنێت.

دەشمزانی کە بیلال خۆشی، مانەوەی زۆر ناخایەنێت.

وێنەکان، هەزاران لێی، هەوڵە بێ ئومێدەکەم بۆ دەستگرتن بە هەردوکیانەوە.

بە دڵخۆشی..

بە بیلال..

♦ ♦ ♦

بیلال سەرسامی کردم کاتێک لە کۆتا ڕۆژدا داوای کرد، لە کاتژمێرە کۆتاییەکانمان لە دیزنی لاند، کە بچین بۆ (ساتە مەزنەکان لەگەڵ بەڕێز لینکۆڵن).

هەرگیز پێم وانەبوو کە ئەوە هێندە سەرنج ڕاکێش بێت لە لای بیلال، بەڵام بە بێ دوودڵی قایل بووم، پێشکەشکردنێکی پەروەردەیی و پێشکەوتووی وەک ئەوە هەموو کات بەسوودە، کاتێکیش کوڕێک لە تەمەنی چواردە ساڵیدا داوای ئامادەبوونی دەکات، بە بێ زۆرلێکردن یاخود هاندانی دەرەکی، ئەوە شایەنیەتی کە ڕاستەوخۆ ڕەزامەندی دەرببڕیت، بە لایەنی کەمەوە پێش ئەوەی بۆچونی بگۆڕیت.

پێکەشکردنێکی کورت و جوان بوو، بە شێوەیەک هیچ بێزاربوونی دروست نەدەکرد، بە تایبەت بۆ ئەوانەی لە تەمەنی بیلالدان.

پێشکەشکردنەکە بە گۆرانی (ئەمریکای جوان)ی کلتوری وەتەنی دەستی پێکرد، من ئەو گۆرانیەم کەیف پێدەهات، لێی ڕاهاتبووم وەک چۆن زۆربەی ئەمریکیەکان لێی ڕاهاتوون، بەڵام کاتێک لەگەڵ گۆرانیەکەدا، کەشتی کۆچکەران دەرکەوت، کەشتییەکانی دیکەم بیرکەوتەوە کە بێگومان باپیرم لە یەکێک لەوانەدا بووە، کۆنتا کینتی و گەشتە ترسناک و تۆقێنەرەکەیم بیر کەوتەوە لە گامبیاوە بۆ ئەمریکا. نابێت ئەو کەشتیە و هەموو ئەو ئەشکەنجانەی ناوی کە هەڵی گرتووە لەگەڵ ئەو گۆرانییەدا بێت. هەستم بە بەغیلی دەکرد، هەستم کرد کە ئەمە بەشێکی بچوکە لە وێنەیەکی گەورە، هەروەها ئێمە بۆ ئەوەی بەڕاستی لە جوانی ئەمریکا تێبگەین پێویستە هەموو وێنەکە نیشان بدەین، بە تایبەت کاتێک لە پێشکەشکردنی پیاوێک دەبین کە دەستی باڵای هەبوو لە ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیەی توشی کۆنتا کینتی و باپیرم و ملیۆنانی دیکە بووە.

پاشان ووتەبێژەکە هاتە ناوەوە:

" ئەمە خەونی ئەمریکی بوو. نوێژکردن بۆ خاتری داهاتوو. بەڵام ئەو پلانە ئاڵتونییە بێ نرخ نەبوو. شێوازی ژیانی ئەمریکی لە یەک ڕۆژدا

بەدەستمان نەهێناوە، بەڵکو لە ڕێگەی قورسی و گرانیەکانەوە لە دایک بوو لە نێو جەنگ و ڕووبەڕوبونەوەکاندا گەشەی کرد، کامڵبوونی سەلماند و لە ڕاستی و دروستیەکەی بەڵگەی هێنایەوە لە ڕیگەی تاقیکردنەوە دوور و درێژەکان و دوبارە چاو پیاخشانەوەکاندا.

لە هەموو مێژوویدا، هیچ پیاوێک نەبوو دڵسۆزتر بێت بۆ خەونی ئەمریکی لە سەرۆکی شازدەیەمی نەتەوە یەگرتووەکان، ئەبراهام لینکۆڵن ".

ئەگەر خەونی ئەمریکی ڕەتکردنەوەی ڕەگەزپەرەستی لە خۆ گرتبێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە هیچ پیاوێک لە لینکۆڵن دڵسۆزتر نەبووە، یاخود هەر بە لایەنی کەمەوە لەو زیاتر کەسێ تر نەبوو کە کارپێکەری ئەوە بوبێت. پەیوەندیم بە دڵسۆزیەوە نییە، لەوانەیە هەبێت کە یاسای ڕەگەزپەرەستی بە هۆکاری ئابووریەوە شی بکاتەوە، ئەوە گرنگ نییە بۆم.. ئەو ئەنجامی دا.

پاشان دەنگی لینکۆڵن هات:

باوەڕم هەیە کە خودایەک بوونی هەیە، هەروەها باوەڕیشم هەیە کە ڕقی لە زوڵم و بەردایەتییە، ئەو تۆفانە دەبینم کە دێت، دەستی خوداشی تێدا دەبینم، ئەگەر شوێنێک و کارێکی تێدا بۆ من دانابێت، پێشم وایە کە ئەنجامی داوە، ئەوە من ئامادەم بۆ ئەداکردنی ئەرکەکەم.

وشەکان زۆر کاریگەر بوون لەگەڵ ئەو دەنگە قوڵەی کە وادەردەکەوت لە ئامێری گرامفۆنی کۆنەوە دەردەچێت.. وەک ئەوەی بەڕاستی لینکۆڵن لە قوڵایی مێژووەوە بدوێت.

لام کردەوە بۆ لای بیلال.

وا هاتە پێش چاوم کە فرمێسکێک لە چاوەکانیدا پەنگی خواردووەتەوە.

تێنەگەیشتم لێی.

تاوەکو لە دوایدا، ئەوەم خوێندەوە کە لە ئاپیادەکەیدا نوسیبووی.

لە دوایی ئەوەوە زانیم کە دەبێت لەگەڵ بیلال چی بکەم.

◆◆◆

## نامەیەك لە بیلالەوە بۆ بەڕێز لینکۆڵن

ئازیزم بەڕێز لینکۆڵن.

ناوم بیلالە. من یەکێکم لە نەوەی نەوەی نەوەی ئەو بەردانەی کە تۆ ئازادت کردن. هەست بە ڕەزامەندی و مەمنونی دەکەم لەبەر ئەوەی تۆ ئەرکەکەت بەجێ گەیاند لە کاتێکدا ئەوانی دیکە لەوەدا جیاواز بوون. تۆ ئەو ئازادییەت گەڕاندەوە کە لە باپیرانم سەندرابوو. بەڵام ئەوان بەوە لە دایک بووبوون.

هەر بۆیە، ئەرکەکەت بەجێ گەیاند، سوپاس بۆ تۆ، بەڵام ئەوە ئەرکی تۆیە. ئەوە ئەو شتەیە کە هەمووان دەبوایە بیانکردایە.

ئازیزم بەڕێز لینکۆڵن:

بێگومان تۆ کەسێکی مەزنیت، هەروەها کاریگەریەکی مەزنیشت لە ناو گەلدا جێهێشتووە. منیش شانازیت پێوە دەکەم، بەڵام شانازیش بە بیلالەوە دەکەم، ئەو کەسەی لە نێوی ئەوەوە ناوی منیان ناوە (بیلال)، ئەو وەک باپیرانم بەردە بووە، بەڵام ئەو باوەڕی بە خودای تاقانە هێنا، لە بری ئەو بتانەی کە سەرگەورەکانی باوەڕیان پێی هەبوو، ئەوەش بووە هۆی ئازاد بوونی.

ئەو تۆفانەی کە باست کرد مستەر لینکۆڵن شێوەی جیاوازی هەیە، هەموویان لەسەر شێوەی جەنگی خێزانی نایەن، هەندێک کات باوەڕ وەک تۆفانێک دێت، دەستی خوداش تێیدا وجودی دەبێت.

هەندێک کات تۆفانەکە لە شێوەی دەنکە هەڵاڵەدایە، دەنکە هەڵاڵەش بەر دەگرێتەوە..

بۆ هەر یەکێک لە ئێمە تۆفانێک هەیە.. بە شێوەیەک یاخود هی دیکە، بەڵام هەندێک هەوڵ دەدات کە گوێ لەوە بخەوێنێت.

تۆفانەکەی من بە نزیکەی دوو ساڵ لەمەوبەر هات. بەڵام هێشتا سەرەی خۆمم نەدۆزیوەتەوە. خەریکە کۆتایشم پێدێت.

تۆفانەکەی من شێرپەنجەیە، نازانم ئەو ناوی ئەو نەخۆشیەتان بیستبێت لەو کاتەدا، بەڵام ئەوە نەخۆشیەکی کوشندەیە. بە لایەنی کەمەوە لە حاڵەتەکەی مندا کوشندەیە. من تەنها چەند مانگێکم هەیە. زۆرتر نا.

خۆزگەم ئەوەیە کە سەرەی خۆم بدۆزمەوە. خۆزگەم ئەوەیە کە ئەو ڕۆڵ و شوێنە بدۆزمەوە کە خودای گەورە لەم تۆفانەدا بۆی داناوم کە لە دوایەوە خۆر هەڵدێت، تەنانەت ئەگەر وجودیشم نەبێت لە دوای ئەوەوە.

ئازیزم بەڕێز لینکۆڵن، تۆ دەستی باڵات هەبوو لە ئازادکردنی بەردەکاندا. کارێکی ناوازەیە.

من دەمەوێت دەستم لە شتێکدا هەبێت.

تاوەکو ئێستاش نازانم چییە. بەڵام کاتەکەم بەرەو تەواو بوون دەچێت.

دڵسۆزت

بیلال

♦ ♦ ♦

## بيلال

"با پیاوانە قسە بکەین"

بەم شێوەیە دایکم پێی گووتم. پیاوانە.

زۆر پێکەنیناوی بوو. بەڵام ئەو زۆر بە سووربونەوە گووتی.

" هەموو کات هەوڵمداوە لە ژیانتدا دایک و باوکیش بم بۆت بیلال. هەوڵمداوە. لەوانەیە زۆر لەوەدا سەرکەوتوو نەبوبێتم، بە تایبەت لە رۆڵی باوکدا. بەڵام خۆ هەوڵمدا".

ئەمەی بە بێ بێتاقەتییەوە گووت. منیش سەرکەوتنەکانیم بیرکەوتەوە کە فێری پایسکیل سواری و مەلەوانی و بەیسبۆڵی دەکردم. بیرم کردەوە کە زیاتر لەوەی دێتە خەیاڵەوە وەک باوکێک سەرکەوتوو بووە، لەوانەیە زیاتر لەوەی وەک دایکێک. زیاتر لە سەرکەوتنەکانی لە دروستکردنی بۆرەکی سێودا بۆ نمونە. بیرم کردەوە کە بەوە دڵی بدەمەوە. بەڵام زۆر شەرمەزاکەرتر دەبێت بۆ ئەو.

"تۆ زۆر باش بوویت، دایکە" پێم گووت.

" ئەمڕۆ دەمەوێت بۆ کۆتا جار هەوڵ بدەم.. وەک پیاوێک. دەمەوێت پیاوانە لەگەڵت بدوێم. قسەی پیاوانە. نە بە هەست و سۆزی. نە گەڕانەوە بۆ دواوە"

زۆر بە سووربون و جدییەوە ئەوەی گووت.

دەستم بۆی درێژ کرد: پیاوانە.

گووتی: هەموو کات هەوڵمداوە کە نەبوونی باوکت بۆ قەرەبوو بکەمەوە. ئێستا دەتەوێت ببینیت. ئەمە مافی خۆتە. هەرگیز لە رووی ئەوەدا ناوەستمەوە. دەتەوێت لەگەڵ ئەمجەددا سەردانی بکەیت لە زیندان؟ لە رووی ئەوەشدا ناوەسمەوە سەرەڕای ئەوەی ئێمە ئەمجەد بە باشی ناناسین.. لێم

کۆلێییەوە لەو شوێنەی کە کار دەکات، زۆربەی قوتابیەکانی خۆشیان دەوێت بە پێی پێگەی www.ratemyproffesor.com ، ئەو تاوانبار نییە و خاوەن پێشینەش نییە بە دڵنیاییەوە، هەروەها کۆپیەکم لە ناسنامەکەی هەیە... هەر بۆیە قایل دەبم بەوەی هاوڕێت بێت.. دەچیت بۆ لای باوکت و دەیبینیت. هیوادارم ئەو ڕووبدات. بەلام لە دوای ئەوەوە ئەو پەڕەیە هەڵدەیەینەوە. تێیدا نامێنینەوە. بە تەواوی فڕێی دەدەین. تەماشای ئەوە دەکەین کە ماوەتەوە بۆمان. خۆشت دەزانی کە زۆر نییە". ئەمەی زۆر بە بەهێزی و متمانەوە گووت.

پەڕەکە فڕێ دەدەین، نازانم باوکت چۆن هەڵسوکەوت دەکات، نازانم کە ئایا قایل دەبێت بۆ چاوپێکەوتنت، بەلام داوات لێدەکەم زۆر لە ناو هەلۆێستەکەیدا نەمێنیتەوە، هەرچیەکی کرد.. هەرچەندە باش بێت یاخود خراپ.. تۆ دەڕۆیت بۆ ئەوەی بیبینیت و بیناسیت، بەلام ئەو لە زیندانە، بۆیە ناتوانێت شتێکی ئەوتۆت بۆ بکات ئەگەر بیهەوێت.. تۆ ئەو دەبینیت بۆ ئەوەی ئەو خۆزگەیەت بێتە دی کە خەریکە مەراقی بۆ دەکەیت، لە دوای ئەوەوە، دەبێت هەموو شتەکە تێپەڕ بکەیت، کۆتای پێدێت.

پێم گووت: باشە، ئەی چی دیکە دەبێت لە دوای ئەوەوە؟ چی بکەم؟

" ئەوەیە کە دەمەوێت بۆتی باس بکەم". پاشان پەڕەیەکی دایە دەستم.

تەماشای پەڕەکەم کرد. نامەکەی خۆم بوو بۆ بەڕیز لینکۆڵن.. دایکم لەسەر پەڕەیەک کۆپی کردبوو.

پێم گووت: تۆ باشیت؟ ئێمە بەڕاستی ناتواین نامە بنێرین بۆ بەڕێز لینکۆڵن.. لەوانەیە من دواتر ئەوە بتوانم.. لە دوای ئەوەی کە دەڕۆم... بەلام بە دڵنیاییەوە ئێستا نا.

دایکم نەیتوانی خۆی بگرێت و پێ نەکەنێت.

گووتی: ئەمە بیرۆکەیەکی زۆر باش دەبێت بۆ ئەوەی دواتر دەیکەیت. بەڵام بۆ ئێستا. کاری خێراتر لەوەمان هەیە..

"بەڕێز لینکۆڵن لە قیامەتدا بەریدی ئەلیکترۆنی هەیە کە بتوانین پەیوەندی پێوە بکەین؟" ئەوەم پێگووت و هەوڵم دەدا جددی دەرکەوم.

دەستی خستە ژێر چەناگەی و گووتی: بە جددی قسە دەکەم. پیاوانە.

شانم ڕاوەشاند: کەواتە ڕوونی کەوە.

گووتی: بیلال، تۆ بەهرەی نوسینت هەیە.. تۆ پیت و وشە و ڕۆحت هەیە.. دەتوانیت نامە بنوسیت بۆ هەر کەسێک کە دێتە مێشکت.. بۆ هەر کەسێک کە ناسیبێتت یاخود نەتناسیبێت یاخود هەر شتێک.. هەمویان کۆدەکەینەوە.. نامەکانت ، لە پێگەیەکی تایبەت لە ئینتەرنێت دایدەنێین.. پێگەیەک کە ناوی تۆ هەڵبگرێت.. پاشان جیدەهێڵێت..

چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک و بەردەوام بوو: کاریگەرییەکی کە تۆ جێدەهێڵێت لەم جیهانەدا.. کاریگەریەکەت لە دوای ئەوەی کە دەڕۆیت..

ئەمە یەکەم جار بوو کە دایکم بە ئاشکرا گووتی کە من دەڕۆم.

وەک ئەوەی هێزی گووتنی نەبووە پێش ئەوە تەنها ئەو کاتە نەبێت ئەوەی دۆزیوەتەوە کە کاریگەریەک لە دوای خۆمەوە دروست دەکات.

بیرم لێی کردەوە؟

بیرۆکەکەم زۆر پێ جوان بوو. نامە بۆ هەمووان.

پێم گووت: پێگەکە ناودەنێین چی؟

گووتی: ناوێکی گونجاو دەدۆزینەوە. پێویستە سەرەتا ماددە بدۆزینەوە و، دیزاینێک دابنێین...

پاشان دەتوانیت ناوێکی گونجاو بدۆزیتەوە بۆی.

من ڕاستەوخۆ بیرم لە نامەی یەکەمم دەکردەوە.

## نامەی بیلال بۆ باوکی( تێنوسەکە )

باوکی ئازیزم..

هیچ کات بەو ناوەوە بانگم نەکردوویت، بابە.

پێشتر بە هیچ کەسێکم نەگوتوە.

بەسەر زارمدا نەهاتووە.

بیرم دێت کاتێک لە پۆلی پێنجدا بووم و درکم بەوە کرد کە زۆرینەی منداڵەکان باوکیان هەیە، من نەبێت، هەوڵمدەدا کە وشەکە تاقیبکەمەوە و بیڵێم: بابە، بابە، بابە. هەوڵمدەدا کە بە دەنگی خۆم گوێم لێی بێت. چۆن دەبێت. چۆنم کاتێک کە دەیڵێم.

ئەوەم لە حەمامدا دەکرد، لە بەردەم ئاوێنە، دەشەرمزانی کە کەس وەڵام ناداتەوە. وەڵامێک نایەت بۆم وەک ئەوانی دیکە. هیچ شتێک.

وازم لەوە هێنا کاتێک کەمێک گەورە بووم. بەڵام هەستم بە مردن دەکرد هەر کاتێک کە گوێم لە وشەکە دەبوو. لەگەڵ کاتدا لێی ڕاهاتم. چیدیکە زۆر هەستیار نەبووم بەرامبەری.

یاخود بەو شێوەیە دەرم دەخست.

نازانم بۆچی بۆ تۆ دەنوسم ئێستاکە. لەوانەیە بۆ ئەوەی ئەو پرسیارەت لێ بکەم کە هەموو کات لە زەینمدا بە بێ وەڵامدەسوڕایەوە.

بۆچی ڕۆشتیت و بەجێت هێشتم؟... بەجێت هێشتین؟

لەوانەیە دایکم وای لێکردبێت کە بڕۆیت. هەموو کات بەو شێوەیە پێی دەگووتم. هەرگیز تۆی تاوانبار نەکردووە کە ئەوە تۆ بووی ڕۆیشتیت. هەر بەو بۆنەیەوە ئەو دایکێکی زۆر باشە، هەروەها باوکێکی زۆریش باش بووە.

بەڵام تەنانەت ئەگەر ئەو وای لێکردبێت بڕۆیت، هیچ بیرت لە من نەکردەوە؟ هیچ بیرت لە سەردان کردنم نەکردەوە؟ لەوەی کە نامەم بۆ

بنێریت؟ هیچ کات کەمێک ئارەزووت نەبوو کە بمبینیت؟ هەر یەک قیچ فزولیت نەبوو بۆ ئەوەی بزانیت شکڵ و شێوەم چۆنە؟ بۆ نمونە بیرت کردووەتەوە کە لە فەیسبووک بۆم بگەڕێیت.. هەر تەنها وێنەیەکم ببینیت؟

هەموو کات لە خۆمم پرسیوە، ئەگەر ڕۆیشتنەکەت لەبەر ئەوە بوبێت کە بێزار بویت لە هاوار کردنم و گریانەکانم کاتێک کە منداڵ بووم. ئەوە هەموو منداڵەکان دەگرین. بەڵام زۆربەی باوکەکان هەڵنایەن لە دەستی ئەوە.

زۆرت لەسەر نازانم. هەر نازانم کە دەبێت هەڵوێستم لەگەڵتدا چۆن بێت. ئایا خۆشم بوێیت؟ ڕقم لێت بێت؟ بێگومان ڕقم لێت نابێت.. بەڵام خاترجەم نیم لەوەی کە خۆشم بوییت. فزولیم هەیە بۆ هەستەکانم بەرامبەرت.

سەرلێشێوانێکم هەیە بەرامبەرت.

لە دوای هەموو شتێک، تۆ و دایکم هاتنمتان بۆ سەر ئەم دونیایە هاوبەش کرد.

پاشان ئەوی دیکەت بۆ ئەو جێهێشت.

تەنانەت وشەی ئازیزمی کە نامەکەم پێ دەست پێکرد. نازانم. بەڕاستی نازانم کە ئایا مەبەستم بووە و لە دڵەوەیە.

تۆ وەک هەسارەیەکی ناڕوونیت. تۆ وەک سندوقێکیت کە لە سەربان دۆزراوەتەوە. لەوانەیە شتی زۆر بە نرخی تیدا بێت. لەوانەشە تەنها هەندێک شتی بێکەڵکی لەبیرکراوی تێدا بێت.

لە هەموو بارودۆخەکاندا. دەبێت کە ئەو سندوقە بکەمەوە.

دایکم دەڵێت کە من مەراقی تۆمە و خەریکە دەخنکێم پێتەوە. هەروەها پێویستە کە بتبینم بۆ ئەوەی بتوانم هەناسە بدەم. ڕاست دەڵێت. من بە تۆوە دەخنکێم.

ڕاستە.. بیرم چوو کە پیت بڵێم: من شێرپەنجەی میشکم هەیە. بەم نزیکانە دەمرم. هەر بۆیە دەبێت پێش ئەوە بتبینم.

سوپاس بۆ تۆ.. بۆ هیچ شتێک.

## ئەمجەد

ئەوە منم لەگەڵ بیلال و لاتیشادا لە چاوەڕوانی فڕۆکەی ڕووەو دالاسدابن. وێستگەی یەکەم لە گەشتەکەمان بۆ ئۆکیدیل لویزیانایە.

ئەوە یەکەم جارم بوو کە تێیدا بیلال ببینم. لاتیشا هاتبوو لە تەکیدا بۆ فرۆکەخانە. من داوام کردبوو کە بچم بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆمدا بیهێنم بەڵام ئەو بە تەواوی ڕەتی کردەوە. پێی گووت کە لە لای دەمێنێتەوە تاوەکو فڕۆکەکە دەنیشێتەوە، بیلال زۆر شەرمەزار دەردەکەوت بەمە و ئاماژەی بۆ دەکرد کە بڕوات. بیلال وەک منداڵێک دەرنەدەکەوت کە مردنەکەی نزیک بێت. لەوانەیە پێشووتر نەمبینیبێت، هەر بۆیە ناتوانم بەراورد بکەم. بەڵام هەرگیز پێم نەدەگووت کە ئەو نەخۆشی شێرپەنجەیە ئەگەر بە تەواوی بێ پرچ نەبوایە و هەروەها ئەو بەڵگە پزیشکیانەی کە دایکی لە ناو جانتایەک دایانابوو، ئەمەش سەرەڕای یەک کۆمەڵە دەرمان کە ماوەیەکی زۆری پێچوو تا کار و فرمانی هەر یەکەیانم بۆ شی بکاتەوە.

من زۆر دڵخۆشبووم بەو ڕوونکردنەوانە و هەوڵمدەدا وای دەربخەم کە تێدەگەم و سەرنجم داوەتێ، تەنها لەبەر ئەوە دڵخۆش بووم کە لەگەڵ لاتیشادا دەدوام. پاشان ئاگاداری مەترسی بارودۆخەکە بوومەوە و، هەوڵمدەدا پرسیار لەو شتانە بکەم کە لە دەستم ڕۆیشتووە و باش گوێم لێی نەبووە. ئاواتم دەخواست کە تۆفانێک هەڵبکات و فڕۆکەکە دوا بکەوێت و لاتیشا لەگەڵمان بمێنێتەوە، ئەوە بەڕاستی هەستێکی سەیر بوو، بەڵام ماوەیەکی زۆر بوو خۆشی وام هەست پێ نەکردبوو. من و لاتیشا و بیلال. وەک ئەوەی کۆببووینەوە دوای دابڕانێکی زۆر. لە خۆمم پرسی: من خۆشم دەوێت؟ شتێکی لەو جۆرە بوونی هەیە؟ ئایا من ژنێکم خۆش دەوێت کە نایناسم، هەروەها لە یەکەم بینینیشەوە؟

بەڵام هیچ کات هەستم نەکرد کە ئەوە یەکەم چاوپێکەوتنمان بێت. هەستم دەکرد کە هەموو کات لە ژیانمدا وجودی هەبووە و، تەنها ئێستە دۆزیومەتەوە.

ئەمە لە ژیانمدا ڕوودەدات؟! ئایا نابێت کە ئەوە بۆ هەرزەکاران بێت؟ لەوانەیە من هەرزەکارێک بم لە سی و شەشساڵیدا. لەوانەیە منداڵێک بوبم کە گەشەی وەستاوە لە ئاستێکدا وەک ئەوە کە کریستین پێی دەگووتم. کریستین. چەندە دوور دیارە ئێستا.

چەند دوور دیارە لە لاتیشاوە. سوپاس بۆ خودا.

خودا؟ ئایا شتەکان گەیشتووە بە ئاستێک لە نەبوونی کریستیندا کە سوپاسی خودایەک بکەم کە باوەڕم بە هەبوونی نییە.

زۆر شڵەژاوم. لەوانەیە هەستەکانم بەرامبەر کریستین لە ئەنجامی ئەو شڵەژانەوە بێت. بەڵام بێگومان وەک هەستەکانم نەبوو بەرامبەر کریستین. لەگەڵ کریستین هەستم بە لاوازی دەکرد. هەستم دەکرد کە منداڵێکم و چاوەڕێیە دایکی سزای بدات و ئەویش هەوڵبدات ڕەزامەندی وەربگرێت تاوەکو سزای نەدات.

لەگەڵ لاتیشاشدا هەست دەکەم کە منداڵم، بەڵام منداڵێک کە دەیەوێت سەرنجی ڕابکێشێت. دەیەوێت نیشانی بدات کە بووەتە پیاو.

ئاگادار بوومەوە لەوەی کە بیری لێدەکەمەوە. بە خۆشم گووت کە لە هەردوو حاڵەتەکەدا من نەخۆشم. پیاوێک گەشەی وەستاوە لە هەردوو حاڵەتەکەدا. جارێک بە شێوەیەکی دەست بەسەردا گیراو، جارێکیش بە شێوەیەکی زۆر پۆزەتیڤانە. بەڵام خۆ هەر نەخۆشم.

ئەگەریش وابێت! ئایا خۆشەویستی ئەو جۆرە نەخۆشییەیە یاخود ئەوی دیکە. دەرکەوتەکانی و هۆکارەکانی دەگۆڕێت. بەڵام هەر نەخۆشییە.

بەڵام... من لاتیشام خۆش دەوێت؟ هەر بەڕاست وشەکەم گووت.. بەڕاستی وا دیارە کە من نەخۆشم. من تەنها سەرسامم پێی. زۆر سەرسامم پێی. ئەوە هەموو شتێکە. کەسێکی دیکە وەک من نییە کە بەو خێراییە خۆشەویستی بێتە دڵیەوە. ئەوە زۆر پێنەگەیشتوانەیە.

گوێم لە دەنگێکی پێکەنین بوو لە ناخمەوە: دەی تۆش پێنەگەیشتویت! ئەوە کەی نوێیە؟

بە داخەوە هیچ تۆفانێک داینەکرد و کاریگەری لەسەر یەک جوڵەش نەکرد. لەوانە لە کانونی دووەمدا زۆر ڕوودەدات. خۆزگەم دەخواست گەردەلولێک بێت و هەرسێکمان لە ناو فرۆکەخانەکەدا بەند بکات. بەڵام خۆ دیارە کە من بەد شانسم و پیلانگێریەکی گەردوونیش لە دژی من هەیە. خۆ ئەگەر لەگەڵ کریستیندا بومایە لە فرۆکەخانە و بە تیۆرەکانی و فرۆید و ئێدلەر جەڵدی بکردمایە و مێشکی خستبام ئەوە تۆفانێک دایدەکرد و لەو ئەشکەنجەدانەدا دەیهێشتمەوە لەگەڵیدا بۆ چەند ڕۆژێک. چاودێری لاتیشا دەکەم کە میهرەبانیەکی (زیرەکانە) بە بیلال دەدات. ڕوون دیار بوو کە لە زیادەڕەوی دەترسا لە بەردەم مندا یاخود بەردەم هەر کەسێکی دیکە. ئەو ئامۆژگاری و ڕێوشوێنی دەدایێ وەک ئەوەی لەگەڵ پیاوێکدا قسە بکات و تەنها بیەوێت بیری بخاتەوە و ئەو باش دەیزانێت. ئەوە زۆر سەرسامی کردم. چەندە ئارەزووم بوو کە بەو شێوەیە بکات لەگەڵ منیش. بەڵام ئەوە ڕووی نەدا بەداخەوە. ئەو شێوازەکەی دەگۆڕی لەگەڵ مندا و، زۆر بە ئارامی لە بارەی وردەکاری دەرمانەکانی بیلال و ڕووداوە کتوپڕەکان دەدوا، وەک ئەوەی لەگەڵ یەکێک لە قوتابیەکانی بدوێت.

ئەو لەسەر هەق بوو. من هیچم دەربارەی ئەو دەرمانانە نەدەزانی. پێش ئەوە داوای لێکردبووم کە چاوێک بخشێنم بە پێگەیەکدا کە زانیاری دەدات لە بارەی ئەو حاڵەت و مەترسیانەی کە ئەگەری هاتنە پێشەوەی هەیە لە

كاتی سەفەردا. هەروەها پێشی گووتم کە مەترسی هەیە بەڵام زیاتر نابێت لە مەترسیەکانی دیزنی لاند، ئەوەش کە هێنانە دی خۆزگەکەی بیلال لە بینینی باوکیدا کاریگەریەکی پۆزەتیڤی دەبێت لەسەر هەموو شتێک.

لاتیشا داوای کرد کە لە ئامێری قاوەکە قاوەیەکی بۆ بهێنێت. ڕوون دیار بوو لێم کە دەیهەویست کە بە تەنها لەگەڵم بدوێ. زۆر دڵخۆش بووم بەوە وەک ئەوەی بیەوێت هەستەکانی خۆیم بۆ دەرببڕیت! بەڵام لە ڕاستیدا — هەر وەک ئەوەش کە دەبێت پێشبینی بکرێت —ئەو دەیەویست لە بارەی سەعیدەوە لەگەڵم بدوێت. داوای لێکردم کە پێشبینی زۆری لێنەکەم. ڕەزامەندبوونی بۆ چاوپێکەوتنەکە زۆر ناگەیەنێت. ئەو کەسێکی زوو گۆڕاوە و، زوو هەڵدەچێت و تووڕە دەبێت، سەرەڕای ئەوەی کە دڵی باشە.

لە چاوەکانیدا هەندێک خۆشەویستی ماوە بەرامبەر سەعید دەبریسکایەوە.. ئەوە بریسکانەوەی خۆشەویستیەکی بێ ئومێدانە بوو.. خۆشەویستیەک کە پڕ بوبوو لە برین و لێدان کە ناچاری کردبوو پاشگەزبوونەوە بە باشتر بزانێت. هەستم بە تۆزێک لە قین و دڵگەرمی (غیرە) دەکرد. بە دەنگێکی نەبیستراوەوە بە خۆمم گوت بەڕاستی من نەخۆشم. دەنگێکی دیکەش پێی گووتم: دەی ئەوە کەی نوێیە؟

بە زەردەخەنەیەکی هاندەرانەوە پێی گووتم: بەڕێز حەلەوانی..

پێم بڕی: ئەمجەد، بە ئەرک نەبێت.

لە دوای زەردەخەنەیەکی خێراوە بەردەوام بوو: ئەمجەد، تۆ توانایەکی زمانەوانی بێ ئەندازەت هەیە. پێم گووتبو لە بارەی ئەوەی دەینوسم و ئەو نامانەی کە دەینێرم لە بارەی بیلالی حەبەشی و سیناریۆی فیلمەکە.

وام هاتە پێش چاو کە ڕێک وەک کۆپەرم لێهاتووە کاتێک کلکی دەلەرزێنێت لە خۆشی ئەوەی خەڵاتێکی بردووتەوە.

ئەو بەردەوامی پێدا: تکام وایە هەموو وشە و ڕستەکانت بەکار بهێنیت لە پاڵپشتکردنی بیلال لەم گەشتەدا. هەروەها بە ئاسانی متمانەم بە کەسێکی دیکە نەدەکرد. بەڵام من پێم وایە کە تۆ دەتوانیت یارمەتی بدەیت. لەوانەیە زیاتر لە منیش. بیلال پێویستی بە سێبەری باوکە. بە پیاوێک لەم بارودۆخەدا.

پیاوێک بتوانێت پشتگیری بکات نەوەک هەموو پیاوێک. زۆر هەوڵمدا کە قەرەبووی بۆ بکەمەوە بەڵام شتەکە زۆر لە توانای من زیاترە، لەگەڵ ئەم ڕاستیەدا زۆر نابێت قایل بوومە. هەموو کات ڕەتم دەکردەوە و سووربووم لەسەر ئەوەی کە من توانای ڕۆڵ بینینی پیاوێکی پاڵەوان و ژنێکی پاڵەوان بگێڕم لە هەمان کاتدا. زۆر بە داخەوە، تەنانەت ڕۆڵی ژنێکی پاڵەوانیش بۆ من قورسە و زۆر گەورەیە لەسەرم.

قسەکانیم بڕی و پێم گووت: ئارام بە، تۆ ڕۆڵێکی زۆر باشت هەیە.

ئەو ڕاستەخۆ گووتی: مەبەستم سکاڵا کردن نییە، تەنها ئەوەم لێت دەوێت کە پشتگیری بیلال بکەیت بە هەموو تاکە شێوەیەک ئەگەر سەعید بە شێوەیەکی خراپ مامەڵەی کرد. سەعید کەسێکە ناتوانیت پێشبینی کاردانەوەکانی بکەیت. لەوانەیە ئێستا زۆر خراپتریش بوبێت لەوەی کە ناسیومە. ئەو تەنها چەند مانگێکی ماوە و نامەوێت تێیدا بمێنێتەوە و بچەقێت. دەمەوێت ئەو چەند مانگەی بە باشترین شێوە بەسەر بەرێت.

لێرەدا دەنگی زۆر کاریگەر دەردەکەوت. وەک ئەوەی کۆنترۆڵی لەدەست دابێت و نەتوانێت خۆی ڕابگرێت.

گووتی و فرمێسکێک کە لە چاوەکانیدا نەدەهاتە خوار بەڵام لە دەنگیدا دەردەکەوت: مادام ژیانی بیلال کورت دەبێت، دە با ناوازە بێت.. وەک ژیانی پەپولە.

لەبەر خۆمەوە مینگە مینگم دەکرد وەک ئەوەی شتێکی زۆر دوورم بیر کەوتبێتەوە:" خۆزگەم دەخواست کە پەپولە بوینایە و تەنها بۆ سێ ڕۆژ بژیایینایە، سێ ڕۆژی هاوین لەگەڵ تۆدا خۆشبەختی زیاتری لە پەنجا ساڵی ئاسای تێدایە"... جۆن کیتس بۆ فانی براون..

پێم وابێت وشەکانم گووت وەک ئەوەی ئەدای بکەم. وەک ئەوەی ڕووبەڕوی لاتیشای بکەمەوە. زۆر دراماییانە بوون. وەک ئەکتەرێک کە دەیەوێت ئەدای تاقیکردنەوەیەک بکات بۆ ڕۆڵی شکسپیر.

سەرسوڕمانێک لە تیلەی چاوەکانیدا دەرکەوت. وەک ئەوەی هەستی کردبێت کە وشەکان بە ئەو دەڵێم. یاخود ئەوەی سەری سوڕمابێت لەبەر ئەوەی من سەرچاوەکەم زانیبێت.

لە دوای ئەوەوە هەندێک هەست کردن بە ئاسودەیی و ئارامی لە چاویدا دەرکەوت.

" من دەمزانی کە تۆ گونجاو دەبیت بۆ پشتگیری کردنی بیلال".

دوبارە کۆپەرم بیرکەوتەوە کە کلکی دەجولێنێت و گووتم" هیوادارم بەو جۆرە بم".

ئەو تەماشایەکی بیلالی کرد بە خێرایی بۆ ئەوەی دڵنیای بکاتەوە کە هێشتا دوورە و گووتی:"شتێکی دیکەش هەیە کە دەبێت بیزانیت و ئاگاداری بیت. شتێکی زۆر گرنگ کە نەمویست لە بەرامبەر بیلالدا بیڵێم. وردەکاریەکەم بۆ ناردویت لە بەریدی ئەلەکترۆنیەکەتدا، دەتوانیت لە مۆبایلەکەتدا بیکەیتەوە، وایە؟

سەرم ڕاوەشاند واتە بەڵێ.

لای کردەوە بۆ ئەوەی بزانێت بیلال لە کوێدایە و گووتی: بیلال لە ئان و ساتدا توشی گەشکە دەبێت.. لە ئەنجامی پەستانی ئەو لوە نەفرتیەی کە لە مێشکیدایە. دەرمانەکان کۆنترۆلی ئەوە دەکەن بە شێوەیەکی گەورە، ئەو گەشکانە درەنگدرەنگ دێن. بەڵام هەر ڕوو دەدات. تێبینیشم کردووە کە ئەو

کاتانە دێت کە بیلال لە ژێر پەستانی دەروونی یان سۆزداریەکی گەورەدا بێت".

هەوڵمدا ئەوە بە باشی وەرگرم کە دەیڵێت.

زۆر بە قورسی بەردەوام بوو، چاوەکانیشی هێشتا هەر لای بیلال بوو: قورسییەکەی لەوەدایە ئەم گەشکانە. هەموو ئەوانەی کە لە شێرپەنجەدا ڕوودەدات بەراورد ناکرێت بەم حاڵەتە. بیلال زۆر لە بارەیەوە نازانێت. ئەو وا دەزانێت کە تەنها لە هۆش خۆی دەچێت. هیچ شتێکی لە بارەوە بە بیر نایەتەوە. یاخود بە لایەنی کەمەوە بەو شێوەیە دەری دەخات.

تەماشای بیلالم کرد نزیک بوبویەوە و دوو کوپی قاوەی پێ بوو.

لاتیشا بە خێرایی گووتی: شتێکی دیکەش هەیە... بیلال بەهرەی نوسینی هەیە. بڕیارمان داوە کە پێگەیەک ساز بکەین کە هەموو ئەو نامە و شتانە لە خۆ بگرێت کە دەینوسێت و دێت بە مێشکیدا. هانی بدە بۆ ئەوە..

بیلال نزیکتر بوبویەوە.

ئەو بە خێرایی و بە دەنگێکی نزمتر پێی گووتم: دەمەوێت شتێکی لێ جێ بمێنێت لەم دونیایەدا.

◆◆◆

کارمەندێک هات بۆ ئەوەی لێمان بپرسێت بە ڕێگەیەک کە هەوڵی دەدا پیشەیی بێت: ئایا پێکەوە گەشت دەکەن؟

بیلال بە خێرایی وەڵامی دایەوە: نا، من پێنەگەیشتویەکم و بە تەنها گەشت دەکەم و ڕەزامەندیم لە دایکم وەرگرتووە بۆ ئەوە، هەروەها ڕوونە کە گەشتە ئاسمانیەکانتان، بە پێی پێگەی ڕەسمی، ڕێگەی داوە بۆ ئەوانەی لە سەرووی تەمەنی ١٢ ساڵیەوەن کە گەشت بکەن بە تەنها لەگەڵ گۆڕینی فڕۆکەکەش بە بێ ڕەزامەندی لە بەخێوکەرەکەیەوە. منیش لە سەروی ١٢ ساڵەوەم بە ساڵێک و چەند مانگێک.

زۆر شۆک بووم بە وەڵامەکەی.

بیلال بەردەوام بوو: بەڵام ئەگەر مەبەستت بەڕێز ئەمجەدە، - ئاماژەی بۆ من کرد -ئەوە ئەو هاوڕێیەتیم دەکات بۆ سەردانیکردنی باوکی دادگایکراوم بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە زیندان بە تۆمەتی هێنان و بردنی ماددەی هۆشبەرەوە، هەروەها ئەوەشمان پێیە دەیسەلمێنێت کە ڕەزامەندی بەخێوکەرەکەم هەیە کە لەگەڵمدا بێت هەروەک- منیش - ڕێگەم پێدراوە بۆ سەردانیکردنی باوکم کە پێشتر هیچ کات نە ئەو دیویەتی، نە منیش.

ئەو زۆر بە سادەیی گووتی: تەنها لەبەر ئەوە پرسیم، لەبەر ئەوەی خانمێک هەیە کە دەیەوێت لە لای ڕاڕەوەکەوە دابنیشێت نەوەک لای پەنجەرەکەوە. بۆیە گووتم ئەگەر بە تەنها نەبن، ئەو کاتە یەکێکتان دەتوانن بچنە کورسی لای پەنجەرەکەوە.

بیلال زۆر شەرمەزار دەردەکەوت لە خێرا وەڵام دانەوەی.

پێی گووتم: ئایا دەتەوێت بچیتە لای پەنجەرەکەوە، بەڕێز ئەمجەد؟

یەکسەر گووتم: نا، هەر بەو شێوەیە ئاسودەم.

◆◆◆

پێش ئەوەی هەوڵی باسکردنی هەر بابەتێک بدەم لەگەڵ بیلالدا جا سەبارەت بە باوکی بێت یاخود تایبەت بەوەی کە دەینوسێت، ئەو خێرا ئایپادەکەی دەرهێنا لە ناو جانتاکەی و، گووتی بخوێنەوە.

ئەوە ئەو نامەیە بوو کە لاتیشا باسی کرد.

یەکەمم خوێندەوە. بۆ لینکۆڵنی ناردبوو. بەڕاستی زۆرم پێ جوان بوو. ئەوەشم پێ جوان بوو کە باسی بیلالی حەبەشی دەکات. هەستم بە شانازی دەکرد لەبەر ئەوەی باس و بەراوردی شتێک دەکات کە من بۆم نوسیوە.

پاشان نامەکەی دیکەشم خوێندەوە کە بۆ باوکی بوو. زۆر ڕاستگۆیانە و سروشتییانە بوو. بە بێ هیچ دروستکردنێک. دەربڕینێک بوو بۆ هەر کەسێک کە بە ئازاری نەبوونی کەسێکدا تێپەڕ بوبێت.

پێم گووت: کارێکی مەزنە.

پێی گووتم: ئایا ئەوەندە مەزنە کە بتوانێت مردن ببەزێنێت؟

شڵەژام، زۆر دودڵ دەردەکەوتم لەوەی کە بەو شێوە بچمە نێو ئەو بابەتە لەگەڵیدا.

ئەو بە بێ گرنگیدان بەردەوام بوو: دایکم دەڵێت ئەگەر ئەم نامانە و ئەوانی دیکەش لە پێگەیەک لە ئینتەرنێت دابنێم و، خەڵکی بیخوێنێتەوە، لەوانەیە لە کتێبێکدا کۆبکرێتەوە، ئەو کاتە دەکرێت شێرپەنجە ببەزێنم... یاخود مردن، بە ڕێگەیەک. لەوانەیە ئەو مەبەستی ئەوە بێت کە بەرگری لە لەبیرکردن بکەم... لەوەی کەسانێک هەبن کە منیان بیر بێتەوە.

پێم گووت: بەڵێ زۆریش دەکرێت. هەندێک شتی زۆر سادە دەتوانێت بەهێز بێت بەرامبەر مردن بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر. ئایا ئان فرانک دەناسیت؟

سەری لەقاند: تەماشاکەرێکی باشی هونەر نیم. ئەگەر ئێستاکە پەیوەندی ئینتەرنێتیم هەبووایە ئەوە بێ شک ڕاستەوخۆ لە گۆگڵ دەگەڕام و دەموت دەیناسم. ئایا ئەو گۆرانیبێژ یاخود ئەکتەرە لە نەوەی ئێوە؟

("لە نەوەی ئێوە" وەک ئەوەی بە مانای ئەوە بێت کە دەیناسۆرەکان لە باخچەی پشتەوەی ماڵەکەمدا دێن و دەچن لەوەتەی لە دایک بووم).

گووتم: نا. لە "نەوەی ئێمە نییە" و نە گۆرانیبێژە نە ئەکتەر. ئەو کچێکە کە ڕۆژانەکەی خۆی نوسیوە پێش ئەوەی بمرێت، کاتێک کە نوسی لە سێزدە ساڵیدا بوو، کاتێکیش کە مرد لە پازدە ساڵیدا، پاشان وەرگێڕدرا بۆ هەموو زمانەکانی دونیا و ملیۆنان کۆپی لێ فرۆشراوە.

بيلال گووتی: ئایا ئەو وەک من توشی شێرپەنجەی مێشک ببوو؟

وەڵامــم دایــەوە: لــە ڕاســتیدا نــا.. ئــەو لــە هێــزە ســـەربازیەکانی دەستبەسەرداگرتنی نازیەکاندا مرد. ئەو لەگـەڵ خانەوادەکەیـدا بـەدزییەوە لـە ناو خانوەکەیاندا دەژیان لە ترسی دەستبەسـەرداگرتن، لـەو ماوەیەشـدا ئـازار چەشـتنەکانیانی دەنوسـیەوە، ئـەوجا دەسـتیان بەسـەردا گـرتن و، هـەموویان مـردن جگـە برایـەکیان کـە دواتـر گەڕایـەوە بـۆ ئـەو خـانووەی تێیـدا خۆیـان حەشاردابوو و، ڕۆژانەکەی خوشکەکەی دۆزیەوە..

بیلال وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بکات گوتی: پێم وابێت شتێکی لـەو جۆرەم بینیوە لە فیلمێکدا.

ئـەوجا گـووتی: بـەڵام ئـەو نەیـدەزانی کـە دەمرێـت ئـەو ڕۆژانـەی کـە ڕۆژانەکەی دەنوسیەوە، وایە؟

گووتم:ئەو لە مەترسیەکی حەتمیی مردندا دەژیا، بـەڵام لەوانەیـە ئومێـدی بە ڕزگاربوون هەبوبێت.

بە زەردەخەنەیەکی هێمنانەی خۆبەدەستەوەدانەوە گووتی: کەواتـە ڕێـژەی ڕزگاربوونی سفر لە سەد نەبووە... وەک من؟

گووتم: نا.. پێم وابێت ڕێژەیەکی ئومێدی گەورەتر لەوە بوونی هەبوبێت.

لەبەر خۆیەوە دەیگلماند و تەماشای دەرەوەی دەکـرد لـە ڕێـی پەنجـەرەی فرۆکەکەوە: کەواتە شتەکە جیاوازە.

پێم گووت: لەگەڵ ڕێژەی سفر لە سەددا بۆ نوسین باشترە.

بە سەرسوڕمانەوە لای کردەوە بۆم: چۆن؟

پێم گـووت: لەگـەڵ ڕێـژەی سـفر لـە سـەددا هـیچ هەڵبژاردەیـەکی دیکـەت نییە، پێویستە کە شتێک بـەجێبهێڵیت چونکـە بـە دڵنیاییـەوە بـە خێرایـی و زووی دەڕۆیت.. لەگـەڵ ڕێژەیـەکی گـەورەتر لـەوە بۆشـاییەک دەمێنێتـەوە بـۆ دواخستن.. چاوەڕێ دەکـەیت بـۆ ئـەوەی زیـاتر بژیـت.. ژیـانیش بـە خۆیـەوە سەرقاڵت دەکات لەوەی کاریگەریەک لە ناویدا (ژیان) جێبهێڵیت.

گەڕایەوە بۆ پەنجەرەکە و وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بکات گووتی: لەوانەیە.

دوای ئەوە لە پڕێکدا لای کردەوە:ئەدی تۆ، ئایا شتێک بەجێ دێڵیت؟ یاخود ئەوەیە کە تەنها نەخۆشانی شێرپەنجە دەبێت بیر لەوە بکەنەوە؟

پرسیارەکەی توشی سەرسوڕمانی کردم. شتێک جێدێڵم لە دوای خۆم؟ نەمتوانی شڵەژانەکەم بشارمەوە، شتێکم گووت دەربارەی بڕوانامەی ماستەر کە بە دەستم هێناوە و ئەو دکتۆرایەی کە کاری لەسەر دەکەم و گووتم کە ئاواتم ئەوەیە کە کاریگەریەک جێبهێڵم لە ڕێگەی ئەکادیمیەکان، ئەوانەی کە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەخوێنن لە دوای من.

گوێم لە دەنگی خۆم بوو کاتێک ئەوەم دەگووت و وشەکانم لەسەر ڕوخساری بیلال دەبینیەوە. ئەوەی کە گووتم زۆر بێ مانا و هیچ بوو. هەرگیز بیرم نەکردووەتەوە کە ماستەر یاخود دکتۆرا بە دەست بهێنم بۆ ئەوەی کاریگەریەک لە دوای خۆمەوە یاخود شتێک لەو بابەتە بەجێ بهێڵم. ئەوە تەنها شتێکی ئەکادیمی ئاشکرا بوو کە هەموومان بە بێ بیرکردنەوەیەکی فراوانتر لە بیرکردنەوە لە هەنگاوی دواتر دەیکەین.

بە دەنگێکی هەوڵدەر بۆ ئەوەی بەمتمانەتر دەرکەوێت گووتم: کاردەکەم لە فیلمی بیلال. دەمەوێت دەستم هەبێت تێیدا لە جێهێشتنی پەنجەمۆرێکی جیاواز لە ڕێگەی ئەم فیلمەوە.

هەستم کرد کە عەبدول دەتوانێت ئەو ڕستەیە بە پەرۆشیەوە بڵێت بە بێ ئەوەی درۆگۆیەکی ئاشکرای وەک من بێت. کارەکەم تەنها لەبەر کرێی خانوەکەم وەرگرت، نە زیاتر نە کەمتر. لەوانەیە دواتر بەرەبەرە هەستم بە پەرۆشی کردبێت، بەڵام ئەوە تەنها لە ڕێگەی بیلالەوە بوو، ئەو بیلالەی کە لە پاڵمدا دانیشتووە لەو فڕۆکەیەی بەرەو دالاس دەچێت و پاشان بۆ ئۆکیدیل بۆ ئەوەی باوکە زیندانیکراوەکەی ببینێت.

هەستم کرد کە تاکە شتێک کردبێتم لە ژیانمدا و، ئەوەی کاریگەریەکی لە ژیانیگ ئەوانی دیکەدا جێهێشتووە، ئەو شتەیە کە لەگەڵ بیلال دەیکەم.

ئەوەم پێ نەگووت. ئەویش گرنگییەکی ئەوتۆی بە بابەتەکە نەدا. دوبارە ئایپادەکەی کردەوە و یاری (angry bird)ی دەکرد بە بێ گرنگیدان.

پرسیارم لێکرد: نامەی داهاتوت ئاراستەی کێ دەکەیت، بیلال؟

بە بێ ئەوەی چاوی لەسەر ئایپادەکە لابەرێت گووتی: نازانم.. لەوانەیە بۆ خانەکانی شێرپەنجە بێت.

یاریەکەش گەیشتنی بە ئاستی دواتر ئاشکرا کرد.

◆ ◆ ◆

لە دالاس کاتێک چاوەڕێی فڕۆکەکەمان دەکرد بیلال زۆر دودڵ دەردەکەوت، منیش بە هەمان شێوە بووم. بۆ یەکەم جار دەڕۆم بۆ زیندان تاوەکو کەسێک ببینم کە لە ژیانمدا نەمناسیوە بۆ ئەوەی کوڕەکەی ببینێت کە ئەمە یەکەم جاریەتی ببینێت لە ژیانیدا. بێگومان هەردوکمان دودڵ و سەر لێشێواو دەبین.

بیلال لە بەرچاومدا زۆر شڵەژاو دەردەکەوت. ڕۆشت و ڕشایەوە و دوای ئەوە داوای کرد کە حەبی سەرئێشەی بدەمێ، شڵەژام لە کاتێکدا دەرمانەکانم دەردەهێنا و بیرم چوبویەوە کە کامەیان بۆ ئازاری سەرە و کامەیان بۆ گەشکە. ئەو قوتووە ڕاستەکەی برد و حەبێکی لێ دەرهێنا و قوتی دا پاشان لەو دەبە ئاوەی خواردەوە کە پێی بوو. بۆ یەکەم جار هەستم بە هەست و سۆزێک کرد کە پێم وابێت وەک هەستی باوکایەتی بوو.

پەیوەندیم بە لاتیشاوە کرد، دەمەویست پێی بڵێم کە هەموو شتەکان باشن، بەڵام لە ڕاستیدا دەمەویست هێزی لێوە وەرگرم. ئەوەیش زۆر ڕاڕا دەردەکەوت و دەنگی زۆر خنکاو بوو، خەریک بوو هاواری دەکرد: خودایە،

گووتم بە بیلال کە پەیوەندیم پێوە بکات کاتێک دەگەنە دالاس، دەزانم ئەو بێزار دەبێت کاتێک من پەیوەندی دەکەم بۆ ئەوەی وا دەرنەکەوێت کە من وەک منداڵێک ڕەفتاری لەگەڵ دەکەم لە بەرامبەر تۆدا.

تۆ پەیوەندی بکە بە ئەرک نەبێت.

پاشان بە دەنگێک کە هەوڵی دەدا هێمن دەرکەوێت گووتی: ئەو چۆنە؟

پێم گووت: باشە، بەڵام جارێک ڕشایەوە و، هەست بە ئازاری سەر دەکات و یەک حەبی سەر ئێشەی خواردووە.

بە خێرایی قسەکەی بڕیم: تەنها یەک دانە؟ دووەم دانەی بدەرێ خێرا.

پێم گووت کە بەدڵنیاییەوە ئەوە دەکەم.

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە لێی پرسیم: ئایا هەست دەکەیت کە چاوەکانی شتێکی سەیری تێدایە؟ هاوتا نین؟

تەماشای بیلالم کرد. بەڵێ هەستم بە شتێکی وا کرد.

بە ترسەوە پێم گووت لە کاتێکدا تفەکەم قوتدەدا: بەڵێ وا دەردەکەوێت کە شتێکی سەیری تێدایە. ئەوە واتای چییە؟

بە دەنگێکی یەکلاییکەرەوە گووتی: خێرا دەرمانی گەشکەکەی بەرێ. فیمبات ٢٠٠ میلیگرام. قوتویەکی سپیە بە شریتێکی شین لە ژێریەوە.

بە تۆقینەوە گووتم: توشی گەشکە دەبێت ئێستا؟

وەک ئەوەی ئاگادار بوبێتەوە کە تۆقینەکەم لە قازانجی بارودۆخەکە نییە گووتی: نا پێویست بەوە ناکات، دەرمانەکان کۆتایی پێ دێنێت. هیوادارم خۆڕاگر و هێمن بیت.

زۆر ئاشکرا دیار بوو کە هیچ خۆڕاگر دەرنەدەکەوتم.

وەک ئەکتەرێکی خراپ کە لە بەرامبەر تەماشاکەراندا وەستا بێت و بۆ یەکەم جار ڕۆڵی یولیوس قەیسەر بگێڕێت گووتم: متمانەت هەبێت. بارودۆخەکە لە ژێر کۆنترۆڵدایە. هەموو شتێک باش دەبێت.

ئەو بێدەنگ بوو و هاتە پێش چاوم کە ئەو ساتە بە نەفرەت دەکات کە قایل بوو بەوەی بیلالم لەگەڵ بنێرێت.

بە دەنگێکی سروشتیەوە گووتم: ئەرخەیان بە. نزیک دەبم لە یەکەی پزیشکی، هەروەها گروپی ناو فڕۆکەخانەکە ئاگادار دەکەمەوە، هەموو ڕێوشوێنەکانی تایبەت بەوە دەخوێنمەوە و، تەماشای یوتیوب دەکەم، بێگومان ڤیدیۆیەک بوونی هەیە لەو بارەیەوە.

ئەو ڕستەیەم گووت و لە گێژیەتی خۆی ئاگادار بویەوە پاش ئەوەی گوێی لەوە بوو لێمەوە.

ئەو گووتی: دەبوایە... لەوە ئاگادارت بکەمەوە پێش ئەمە..(وا خەیاڵم کردەوە کە دەیەوێت بڵێت: دەبوایە نەمناردایە لەگەڵت.. دەتەوێت تەماشای ڤیدیۆیەک بکەیت لەسەر چۆنیەتی ڕزگارکردنی کوڕەکەم؟... بەڵام کاتێکی زۆر تێپەڕیوە بەسەر کۆتا گەشکەدا.

پێم گووت: ئەرخەیان بە. دووەم پسپۆڕیم بەکالیۆرۆسە لەپەرستاریدا.

گووتی: ئۆهە، ئەوە چەند باشە.. سوپاس بۆ خودا.

من درۆم دەکرد. پسپۆڕی لاوەکیم زانستی کۆمەڵایەتی بوو. بە داخەوە لێرەدا زۆر بێ کەڵکە.

بەڵام درۆکە بە کەڵک بوو.

تەماشای ڤیدیۆشم کرد لە یوتیوب لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ حاڵەتەکانی گەشکەدا!

♦♦♦

گەشکەکە نەهات.

بەڵام بیلال زۆر زەردتر و خراپتر بوو. جارێکی دیکەش ڕشایەوە لە ناو فڕۆکەکەدا. خەریک بوو منیش دەڕشامەوە. بە دڵنیایشەوە شڵەژاوی و زەردبوونی منیش زیادی کرد.

نزیک بوینەوە.

هەوڵمدا لەگەڵ بیلال لەو بارەیەوەقسە بکەم.

پێم گووت: ئێستە چۆنی پیاو؟ ئەوە نزیک بوینەوە. لە کۆتایدا پیاوە پیرەکەت دەبینی.

سەری لەقاند و لێوەکانی گەست. لە سەرەتاوە بێدەنگ بوو وەک ئەوەی بیەوێت بزانێت وەڵامی ئەو پرسیارە چۆنە.

ئایا ئەو باشە لەبەر ئەوەی بۆ یەکەم جار لەژیانیدا باوکی دەبینێت؟

گوتی: بە دڵنیاییەوە باشتر لە دانیشتنەکانی چارەسەری کیمیایی. فرمێسکێک لە چاوەکانیەوە کۆبویەوە. بەڵام لای کردەوە و زەردەخەنەی کرد.

زەردەخەنەی کرد!

لە ڕوخساریدا تێکەڵەی هەموو شتێک هەیە. ئومێد، ئازار، ترس، هێز، خەمباری ، دڵخۆشی و نزیکبونەوە.

هەموو شتێک.

بە فکرم دا هات: دڵت چۆن بەرگەی هەموو ئەو شتانە دەگرێت بیلال؟

◆◆◆

لە فڕۆکەخانەی لیک تشارڵزی نزیک ئۆکیدیل نیشتینەوە، تەنها یەک گەشت هەیە لەم فرۆکەخانەدا لە ڕۆژێکدا.. بێ شک فەرمانەبەرەکانی کاتێکی خۆش بەسەر دەبەن..

چەندە خۆزگەم بوو کە کاربوبارەکان لە لیک تشارڵز کاتێکی زیاتر بخایەنێت. بەداخەوە خێراترین کاروباری فڕۆکەخانەبوو کە لە ژیانمدا دیبێتم. هەر بە زوویی خۆمانمان لە سەر شەقامەکە دۆزیەوە و لە بەردەممماندا تەکسی هەبوو.

هیچ کات نەهاتووەتە خەیاڵمەوە کە داوا لە شۆفێری تەکسی بکەم کە بمبات بۆ زیندان.

ئەوەتا من دەیکەم.

ڕێگای بەرەو زیندانی ئۆکیدیل لە فرۆکەخانەی لیک تشارلزەوە بە نزیکەیی کاتژێرێک دەخایەنێت.

لە نیوەی ڕۆژدا دەگەین. کات هێشتا گونجاوە وەک ئەوەی پلانمان بۆ دانابوو. کاتی سەردانیکردن لە کاتژمێر سێی عەسر کۆتایی دێت. هێشتا کات ماوە. بیرم لێدەکردەوە لەوانەیە ئێستا سەعید شڵەژا بێت و لە ناو زیندانەکەیدا وەک ئاژەڵێکی لە قەفەس نراو هاتوچۆ بکات و بجوڵێت، یان ئەوەیە هەر گوێیشی لێ نییە و باکی نییە پێی. پێم وابوو کە گرنگی پێبدات بەڕاستی چونکە گەر وانەبووایە دەیتوانی سەردانیەکە ڕەت بکاتەوە. ئەو ڕەزامەند بوو لەسەری.

هەوڵمدا ئەو پەشۆکان و شڵەژانە بشکێنم لە ڕێگەی گفتوگۆکردن لەگەڵ بیلالەوە لە بارەی هەر شتێکەوە بێت، بەڵام ئەو زۆر گرنگی پێ نەدا. لە بارەی فیلمەکەوە دەدوام وەک بڵێی کەسێکی زۆر گرنگ بم لە سازکردنیدا، باسم لە سەرچاوە مێژووییەکان کرد کە کاری لەسەر دەکەم و قورسی و گرانی وەرگێرانەکەی لە زمانەکەی خۆیەوە بۆ سەر ئینگلیزی، هەر شتێک، بیلال کاردانەوەی نەبوو، بەڵام قسەکانم لە بارەی فیلمەکەوە سەرنجی شۆفێرەکەی ڕاکێشا و وای زانی من لە هۆلیۆددا کار دەکەم، بۆیە لێی پرسیم کە ئاخۆ لەگەڵ وێل سمثدا کارم کردبێت؟

زانیم کە خۆمم خستووەتە ناو چ گێژاوێکەوە بۆیە پێم گووت: نا. بیدەنگیش بووم بەڵکو شتەکە لێرەدا کۆتایی بێت.

گووتی: ئەی دینزڵ واشنتۆن؟

پێم گووت: نا. نەمکردووە.

گووتی: ئەدی کام لە ئەستێرە و بەناوبانگەکان؟

گووتم: بۆب گیلدۆف.

تەنها یەک جار لە وانەی ژینگەدا بینیبووم. ئەوە هەموو شتێک بوو.

گووتی: هیچ گوێم لەو ناوە نەبووە، لە هیچ فیلمێکی بەناوبانگدا دەرکەوتووە؟

گووتم: نا ئەو گۆرانیبێژە، چالاکوانی بەشی ژینگەیشە.

شۆفێرەکە شانەکانی بە گاڵتەجارییەوە بەرز کردەوە و گووتی: هیچ کات گوێم لەو ناوە بووە. بێ گومانیش لە دڵی خۆیدا پێی گووتوم کە درۆگۆیەکی گەورەم و منداڵێک بە پلە و پایەیەکی خەیاڵی خۆم دەخەڵەتێنم.

کێشە نییە، لێرەدا کۆتایی هات.

لام کردەوە بۆ بیلال و پێم گووت: ئەمڕۆ یادی مارتن لوثەر کینگە، بیست و سێی یەنایەر، بۆچی نامەیەک بۆ ئەو نانوسیت؟ زۆر کەسێکی ئیلهام بەخشە بە ڕای من، بە تایبەت لە بابەتی بیلالی حەبەشی و هەموو شتێک.

بیلال بە مۆڕەیەکەوە تەماشایەکی کردم و پاشان تەماشای پەنجەرەکەی کرد و گووتی: لەوانەیە بینوسم.

بیرم کردەوە کە بێدەنگ بم باشترە لە ئەوەی بیلال و شوفێرەکە پێکەوە ڕیکبکەون و فڕیم بەنە دەرەوە و خۆیان قوتاربکەن لە دەستی من.

بە ئارامیەوە سێیەم دەنکە حەبی زانکسم بۆ ئەمڕۆ خوارد.

◆◆◆

ئەوە زیندانە؟.

خۆ وەک قوتابخانە و نەخۆشخانە دەهاتە پێش چاوم.

ئەو هەر زیندان نییە.

له بەردەم دەرگاکەی وەستاین، تەماشای بیلالم کرد، زۆر هێمن بوو، هیچ شڵەژانی پێوە دیار نەبوو.

پێم گووت: ئامادەیت؟ دەستیشم بەرز کردەوە بۆ سڵاوکردن.

گووتی: با بڕۆین و بیهێنین. ئەویش بە هەمان شێوەی منی کردەوە.

ڕیوشوێنکاریەکان زۆر خێرابوون. شتەکانم بۆ زیاتر لە کەسێک باسکرد. پەیوەندیم بە بیلالەوە و ڕەزامەندی دایکی و پەیوەندی بیلال بە زیندانیەکەوە.

زیاتر لە جارێکیش پشکنینیان بۆ کردین، دەرمانەکانیشیان برد، گرنگی هەندێکیانم باس کرد لە حاڵەتی خێرادا لە کاتی چاوپێکەتنەکە، بۆیە ڕێم پێدرا کە لە هەر قوتویەکیان دانەیەک ببەم، شتەکەش زیاتر بۆ من تۆقێنەر بوو، چونکە من فرمانەکانیانم بە شێوەی قوتوەکانەوە لەبەر کردبوو نەک لە ناوەکانیانەوە. فەرمانبەرەکە لە هەر یەکیان دەنکێک حەبی لە ناو زەرفێک دانا و ناوی دەرمانەکەی لە سەر نوسی.

بە لایەنی کەمەوە توانیت ناوی دەرمانی گەشکەکە لەبەر بکەم، هیوام دەخواست بتوانم بە بیلال بڵێم کە ئەمجارەیان توشی گەشکە نەبێتەوە بۆ ئەوەی لاتیشا درۆیەکەم ئاشکرا نەکات لە بارەی تایبەتمەندی پەرستارییەوە کە لەگەڵ مێژوودا هەڵی دەگرم.

ئەوە ئێستا ئێمە لە بەردەم هۆڵەکەداین. هۆڵی چاوەڕوانی.

تەماشای بیلالم کرد، زۆر هێمن دەردەکەوت، بەڵام ئەگەر یەک کەم گوێم بە جوانی ڕادێرایە، ئەوە گوێم لە دەنگی ترپەکانی دڵی دەبوو.

هۆڵەکە وەک هۆڵی نانخواردنی قوتابخانە وابوو.

مێزی ژمارە لێدراو، لەگەڵ چوار کورسی جێگیر کە بە چواردەوریەوە بوون.

کامێراکان لە هەموو شوێنێکن. دیواری شوشەیی بوونی نیە لە نێوان زیندانیەکان و سەردانیکەران.

هۆڵەکە نیوە پڕ بوبوو. بەڵام هیچ دەنگە دەنگ و ژاوەژاوێک نەدەبیسترا.

چەند دەنگێکی سروشتی هەبوو کە شڵەژانی کەم دەکردەوە.

ئەوجا ڕوومان کردە مێزی ژمارە ١٩.

چوین و بە بێدەنگی دانیشتین و چاوەڕێمان دەکرد. سەرەڕای دەنگەکە من دڵنیا بووم کە دەنگی ترپەکانی دڵی بیلالم گوێ لێبوو. یاخود لەوانەیە ئەوانەی خۆم بوبێت. نازانم. هەموو شتێک زۆر ئاڵۆز و تێکەڵ دیار بوو. لە ناکاو هات بە مێشکمدا کە سەعید نایە و ڕای گۆڕیوە دوای ئەوەی ئەو هەموو مەودایەمان بڕی. خەریکبووم بە بەرپرسی هۆڵە بڵێم و تەماشام کرد هێشتا دوو خولەک تێنەپەڕیوە بەسەر دانیشتنماندا و، سەعید دوا نەکەوتووە بەڕاستی.

ئەو دوو خولەکە وەک ساڵێک وابوو.

لە بەیانیدا لە نیۆرک بووین، لە جیهانێکی دیکە، ئێستاش، ئەوە ئێمە لە زیندانین و، سەعید لە دووری چەند هەنگاوێکە و، بیلال خۆزگەکە (خۆزگەی مردن)ی دێتە دی.

سەعید هاتە ژوورەوە لە لاکەی دیکەوە. دوو چاودێریش ئەملاولایان گرتبوو.

ڕاستەوخۆ ناسیم. هەستم کرد کە ئەو بێت. تاماشای بیلالیشم کرد. زانیم کە ئەویش ناسیویەتیەوە. گوێیەکانی ڕەنگیان گۆڕا. وەک ئەوەی بەرز بوبێتنەوە. بیلال زۆر شڵەژاو دەردەکەوت وەک ئەوەی تاڵی عودێک بوبێت و ڕاکێشرابێت.

هەنگاو بە هەنگاو سەعید نزیک بویەوە. هەستم دەکرد کە ترپەکانی دڵی بیلال زیاد دەکات. لەوانەیە دڵی منیش بەشداری کردبێت. لەوانەیە دڵی سەعیدیش. نازانم. ترپەکانم لێ تێکەڵ بوبوو. چیدیکە جیام نەدەکردنەوە.

سەعید لە بەرامبەرماندا وەستا. لەوە گەورەتر دەردەکەوت کە خەیاڵم کردبوویەوە. لە من گەورەتر دەردەکەوت. باریک. باڵەکانی بە تاتۆ داپۆشرابوو. چاوەکانی زۆر لە چاوی بیلال دەچوون و لە نێوانماندا یەک رووبار تێدەپەڕی.

هەستامەوە و دەستم درێژ کرد بۆی: ئەمجەد حەلەوانی، هاوڕێی خێزانەکەتان.

دەستی درێژ کرد و بە شڵەژاویەوە تەوقەی لەگەڵ کردم. دەستی زۆر سارد بوو.

بیلال هەر بە دانیشتووی مایەوە و هیچی نەگووت.

سەعیدیش دانیشت بێ ئەوەی یەک وشەش بڵێت. تەماشای بیلالی دەکرد بە بێدەنگی و ئارامی و سەرسوڕمانەوە.

بیلالیش تەماشای باوکی دەکرد بە پشکنین و وردیەوە. بە هێمنیەوە. هیچ شڵەژان و شتێکی پێوە دیار نەبوو. وەک ئەوەی ئارەزووی نەبوبێت لەوەی لاوازی خۆی لە بەرامبەر ئەو باوکەیدا دەرببڕێت کە بەجێی هێشت لە کاتێکدا ئەو هەر چەند مانگێک بووە. وەک ئەوەی بڵێت پێی: بەجێت هێشتم، بەڵام من پێویستم پێت نییە. ساردیەکی سەیر لە تەماشاکردنەکانی بیلالدا دەردەکەوت.

بیلال گووتی: ئەوە منم، بیلال. کوڕەکەت،

تفەکەی ناو قوڕگی قوتدا و ئەوجا گووتی: باوکە.

هەستم بە وشەکە کرد کاتێک دەیڵێت، بیری ئەوەم کەوتەوە نوسیبووی، کە چۆن وشەکەی دووبارە دەکردەوە لە کاتێکدا بچوک بووە بۆ ئەوەی گوێی لێبێت کە لە زمانیەوە دەردەچێت. ئەوە لە کۆتایدا گووتی.

سەعید زەردەخەنەیەکی گەمژانەی کرد و گووتی: چی هەیە برادەر؟

بیلال بە بێ پاشگەزبوونەوە گووتی: لە ڕاستیدا هیچ، بەڵام من شێرپەنجەی مێشکم تووشبووە و لە دوای چەند مانگێک دەمرم. هاتم بۆ ئەوەی بتبینم پێش ئەوەی بڕۆم.

هێندە بە خێرایی گووتی وەک ئەوە وابوو فیشەکێکی تەقاندبێت. من دڵنیا بووم کە مەشقی لەسەر گووتنی ئەوە کردووە. ناتوانرێت ڕستەیەکی لەو شێوەیە بگوترێت بەو خێراییە و بە بێ ئامادەکاری.

شۆکبوون لەسەر ڕووخساری سەعید وەدەرکەوت. چەند چرکەیەکی درێژ بەسەریدا ڕۆیشت بە بێ ئەوەی تێبگات. لە زەردەخەنەیەکی گەمژانەوە گۆڕا بۆ سەرسوڕمان ئەوجا بۆ شۆکبوون. باوەڕی نەدەکرد. تەماشای منی کرد وەک ئەوەی بیەوێت پێی بڵێم بیلال گاڵتەی لەگەڵ دەکات.

سەرم بە هێمنی دانەواند.

سەعید دەستی کرد بە گووتنی: نا.. نا..نا..نا

هەر لای ڕاست و چەپی ئەکرد وەک ئەوەی لە شوێنێکی هەڵەدا دانرابێت.

پاشان ئەوە ڕوویدا کە لە چاوەڕوانیدا نەبوو.

لە بری گەشکەکەی بیلال کە چاوەڕێیمان دەکرد، هیستریای گریانی سەعید دەستی پێکرد.

سەعید دەستی کرد بە گریانێک کە پێشتر گریانی لەو شێوەیەم نەدیبوو. نەک بە دەنگی بەرز دەگریا، بەڵکو هاواری دەکرد. دەیناڵاند. هەموو هۆڵەکە بە دەنگی ئەو پڕ بوبو، هەموو چاوەکانیش لەسەر مێزەکەی ئێمە بوون. دوو چاودێریش بەوریاییەوە لێمان نزیک بوونەوە. سەعید هاواری بۆ بیلال دەکرد بە یەک وشە: لێم خۆشبە، لێم خۆشبە..

بیلال بە وشکیەوە تەماشای دەکرد. هیچ دەربڕینێک لە ڕوخساریدا بەدی نەدەکرا. هیچ شتێک. وەک ئەوەی مردبێت. هیچ شتێک.

لـه كاتێكـدا سـەعيد هـاواری دەكـرد و دەكڕوزايـەوە و دەيگـووت: لـێم خۆشبە، لێم خۆشبە.

پاشـان نزيـك بويـەوە لـە جوڵەيـەكی لـەپڕ و بيلالـی لـە بـاوەش كـرد لـە كاتێكدا هەر بەردەوام بوو لە لاڵانەوە. دوو چاودێرەكە چونـە لای سـەعيد بـۆ ئەوەی دووری بخەنەوە لە بيلال لە ترسی هەر جوڵەيـەكی تونـدوتيژی لـە پـڕ كە لە سەعيدەوە دەربچێت.

سـەعيد داكەوتە سـەر زەويەكـە و دەكڕوزايـەوە و، هێشـتاش هـەر هـاواری دەكرد: لێم خۆشبە بيلال، لێم خۆشبە بيلال..

بيلال هەر هێشتا بە وشكی و بێدەنگيـەوە تەماشـای دەكـرد، بـەڵام نزيـك بوويەوە لێی.

بيلالم دی كە دەستی دەدا بەسەر شانی باوكيدا.

كاتێك كڕوزانەوەكەی سەعيد كەم بوويەوە، بيلالم دی دەيدا بەسەر شـانی سەعيد دا و، دەيگووت پێی: شتەكان باش دەبن باوكە، شتەكان بـاش دەبـن باوكە.

بەڵام هێشتا بە بێ هەستيەوە تەماشای دەكرد.

هيچ گوێشم لێی نەبوو كە پێی بڵێت لێی خۆشبووە.

دوای كەمێك سەعيد هێور بويەوە هەر چەندە بە بێـدەنگی دەگريـا. داوای لێبوردنی لە من و ئەوانەی دەوروبەر كرد. پاشان هەواڵی لاتيشـای لێپرسـيم. بۆيە بيلال وەڵامی دايەوە: دايكم باشە. ئەو ئێستا كار دەكات لە قوتابخانـە و لە نيۆرك دەژين.

سەعيد لە نێو فرمێسكەكانيدا گوتی كە ئەو هەموو كات بيـری لـە بـيلال دەكردەوە و دەيەويسـت باشـترين بێـت كاتێـك دەڕوات بـۆ سـەردانی كردنـی. هەروەها ئـەوەش كـە دەيەويسـت بـيلال شـانازی پێـوە بكـات. بـەڵام هـەرگيز نەيتوانی باشترين بێت و ئەوەتا كۆتاييەكەی لێرەدايە.

هـەمان تەماشـاکردن لـە بیلالـەوە. هـیچ شـتێک. مـن بۆچـونم وایـە کـە قسەکانی سەعید زۆر پێشبینیکراو بوون، لەوانەیە ملیۆنێـک بـاوکی دیکـە لـە هەمان هەڵوێستدا هەمان شتیان گوتبێت. بەڵام لەوانەیە ملیۆنێک باوک ئـەو شین و شەپۆڕی گریانەیان نەکردبێت کە ئەو کردی.

بەڵام تەماشاکردنەکەی بیلال زۆر بەکرێوە و سارد بوو، من شـیم کـردەوە: تەنانەت کارتێکیش لە جەژنی سەری ساڵدا؟ هـیچ بیـرت کـردەوە لـەوەی کـە بزانیت ئێمە لە کوێ دەژین؟

سەعید تەماشای منی کرد و فرمێسکەکانی دەسڕی، پاشان گـوتی:" تـۆ هاوڕێی لاتیشایت؟".

لـە چاوەکانیـدا هـیچ بـەغیلی (غیره) یـەک یـاخود شـتێک لـەو بابەتـە دەرنەدەکـەوت. زۆر لـەوە ڕووخـاوتر و بـێ ئومێـدتر بـوو کـە هێـزی ئـەوەی هەبێت.

سەرم بە نەرێنی لەقانـد، بـیلال خـۆی خۆبـەخش کـرد بـۆ ئـەوەی هـەموو شـتەکەی بـە کـورتی بـۆ بـاس بکـات. فیلمێکـی ئەنیمەیشـن دەبێـت لەسـەر بیلالی (ئەسڵی)— بـەم شـێوەیە بـیلال لـە بـارەی بیلالـی حەبەشـیەوە دووا — ناونیشانی فیلمەکەش (بیلال) دەبێت.

" بە زۆری فیلمەکە ئـەو کاتـە دەردەچێـت کـە مـن ڕۆیشـتووم، هـەر بۆیـە حەزم کرد سیناریۆی فیلمەکە ببینم و نامەم بۆ ئەو ناردووە بەو داواکاریـەوە، ئەویش لەوەدا یارمەتیم دەدات".

سەعید دوبارە بە سەرسامیەوە تەماشای کردم.

پاشـان وەڵامـی دایـەوە وەک ئـەوەی شـتێکی بیـر کەوتبێتـەوە لـە بـارەی ژیانەکـەی دی: بـیلال، بیلالـی کـوڕی ڕەبـاح، بـانگبێژی پێغەمبـەر( درودی خودای لەسەر بێت)؟

سەرم لەقاند لە کاتێکدا دەترسام لە پرمەی گریانێکی دی.

بەڵێ فرمیسکەکان گەڕانەوە بۆ چاوەکانی سەعید، بەڵام نەتەقیەوە بە پرمەیەکی گریانی دیکە بەڵکو لای کردەوە بۆ بیلال و گووتی پێی: باوەڕ بەوە ناکەیت بیلال، من هەرگیز ڕوو لە ئاین نەبووم، هەر ناشزانم کە چۆن نویژ دەکرێت، بەڵام ئەو ڕۆژەی پێش لەدایک بوونەکەت، بە لای مزگەوتێکدا تێپەڕیم کە دەکەوتە ناوەڕاستی سانت لویس، لە شەقامی وێست باین، نزیک زانکۆی سانت لویس، ناوی مزگەوتەکەش بیلالی کوری ڕەباح بوو، ناوەکە سەرنجی ڕاکێشام، بە بێ هیچ هۆکارێک، بۆیە چوومە ژوورەوە بۆ مزگەوتەکە و، لە یەکێک لە فەرمانبەرەکانی ئەوێم پرسی لە بارەی ناوەکەوە، ئەویش لەبارەی ئەوەوە بۆی باس کردم، وردەکاریەکانم بیر نایەت بەڵام هەستم بە شانازی دەکرد لەبەر ئەوەی ئەو یەکەم ئەفریقی بووە کە بچێتە نێو ئیسلامەوە و ئازادیەکەی وەربگرێت، بەو کەسەم گووت کە هاوسەرەکەم خەریکە منداڵی دەبێت و منیش دەمەوێت ناوی کوڕەکەم بنێم (بیلال).

سەعید بێدەنگ بوو، فرمێسکێک لە چاوی داباری، وەک ئەوەی خەونێکی جوانی بیر کەوتبێتەوە کە لە دەستی چووە.

بەردەوام بوو: ئەو فەرمانبەرە بۆی ڕوون کردمەوە کە بیلال بانگبێژ بووە لە ماوەی تەمەنی پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) دا و، بانگی دەدا بۆ نویژ، پێیشی گووتم کە ئەو وشانەی بیلال، کە لە بانگدا دەیڵێتەوە، پێویستە لە گوێی ڕاستی منداڵی تازە لە دایکبوودا بگووترێت.

سەعید فرمیسکەکەی سڕیەوە، منیش دەلەرزیم. بیلالیش هەر بە بەستوویی خۆی مابوویەوە.

گووتی: سووربووم لەسەر ئەوەی ناوت بنێم بیلال، ئەو دەیەویست ناوت بنێت جۆشوا... بەڵام من پێداگریم کرد، ئەو کەسەش هەستا بە لەبەرکردنی ئەو وشانە پێم، لەبەرم کردن بە بێ ئەوەی یەک وشەشی لێ تیبگەم.

سەعید دەستی لەسەر چاوەکانی دانا وەک ئەوەی بیەوێت نەبینێت کە ئێستا لە کوێیە و، تەنها ئەو ڕۆژانەی بیر بکەوێتەوە.

پاشان تەماشای بیلالی کرد و زەردەخەنەی کرد: دوای ئەو ڕۆژە تۆ لە دایک بوویت، هێشتاش ئەو وشانەم بیر مابوو کە بیلال دەیگووت، خستمیتە ناو دەستەکانم و بە گوێچکەتدا چرپاندمن.

فرمیسکەکانی بە بێدەنگی دەبارین و چاوەکانی داخست. هەستم بە شتێکی گەرم کرد لەسەر ڕوومەتم. زانیم کە منیش دەگریم.

بێدەنگی هەمووی داگرت. بیلال لایەکی بۆ من کردەوە و بە ئاگادارکردنەوە تەماشای دەکردم وەک ئەوەی لە قافدا منی گرتبێت: هیچ شتێکت پێ نەگووتم لە بارەی وشەکانی بانگدان بۆ نوێژ؟

بە شڵەژاوییەوە گووتم: بەڵێ، خەریکبووم خۆم ئامادە دەکرد بۆ ئەوە.

کاتی سەردانیکردن کۆتایی هات.

دوبارە سەعید لە باوەشی گرتەوە و ماڵئاوای لێدەکرت، هەروەها گوێم لێبوو دەیگووت: لێم خۆش بە بیلال.

دووبارە هەمان تەماشاکردنم بینیەوە لە بیلالەوە هەروەها گوێشم لێی بوو کە دەیگووت: شتەکان باش دەبن.

لەو دالانەی کە ئاراستەی دەکردین بۆ دەرگای دەرەوەی زیندانەکە، فرمێسکەکانی بیلال بە بێدەنگی دەبارین.

تەماشاکردنەکەی هیچ سار نەبوو.

دەگریا. بەڵام بە بێدەنگی.

لە باوەشم گرت لە کاتێکدا دەڕۆشتینە ڕێوە. ئەوەم پێدەگووت کە بە باوکی گووتبوو.

دەشمزانی ئەوە هیچ مانایەکی نییە.

◆◆◆

نامەیەکم نارد بۆ لاتیشا  بۆ ئەوەی پێی بڵێم کە بیلال باشە و سەعید بەشێوەیەکی هیستیری تەقیوەتەوە لە گریاندا و داوای لێخۆشبوونی لە بیلال کردووە و بیلالیش وەک پیاوێکی ئازا ڕەفتاری کردوو و هەوڵی داوە باوکی هێور بکاتەوە.

ئەو ڕاستەوخۆ پەیوەندی کرد. دەنگی بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە گریاوە لەو مەودایەی نێوان خوێندنەوەی نامەکە و پەیوەندی کردنیدا، لەوانەیە نیو خولەک یان کەمتر بووبێت.

بە پەرۆشیەوە گووتی: بیلال چۆنە؟

من کەمێک پێشکەوتبووم لە بیلالەوە بۆ ئەوەی گوێی لێم نەبێت، پێم گووت: دەتوانیت شانازی پێوە بکەیت. ئەو پیاو بوو. هەرگیز ئەوە نەدەهات بە مێشکمدا کە کردی. بەڕاستی پیاو بوو. هەر باوکی هێور دەکردەوە و پێی دەگووت کە شتەکان باش دەبن و دەستی دەدا بەسەر شانیدا لە کاتێکدا سەعید دەگریا.

لاتیشا بێدەنگ بوو وەک ئەوەی بیەوێت دیمەنەکە بێنێتە پێش چاوی. ئەوجا گووتی: ئەی سەعید، ئەو چۆن بوو؟

هێشتا خۆشت دەوێت؟! یاخود تەنها پرسیارێکە؟

پێم گووت: سەعید هەر وەک ئەوەیە کە باست کردبوو، پێشبینی نەکراوە، لە گریاندا تەقیەوە لە دوای ئەوەی بە بارودۆخی بیلالی زانی، بە نزیکەیش هیچی نەگووت. هەر دەیگووتەوە" لێم خۆشبە، لێم خۆشبە" لە زۆربەی کاتەکەدا. پاشان باسی ئەو هۆکارەی کرد کە وای لێکرد ناوی بنێت (بیلال)، باسی تێپەڕبوونی کرد بە لای مزگەوتەکەدا کە ئەو ناوەی هەڵگرتووە لە ناوەڕاستی سانت لیوسدا و، کەسێک بۆی باس کردووە کە بیلال کێیە و، وشەکانی ناو بانگەکەی فێر کردووە بۆ ئەوەیبیچرپێنێت بە گوێی منداڵی ساوا کە لە دایک دەبێت..

قسەکانمی بڕی: چی؟ ئایا ئەوە جۆرێک لە بۆنەی کلتوریە لە لای موسوڵمانەکان؟!

هیچ شتێکم لە بارەی ئەوە نەدەزانی. هیچ بیرۆکەیەکم بۆ ئەوە پێ نییە. من باوەڕم بە هیچ ئاینێک و هیچ بۆنەیەک نیە و هیچ شتێکی وردەکاری لەو شێوەیە نازانم. بەڵام سەعید بە متمانەیەکی واوە دەیگووت کە وای لە منیش کردبە متمانەوە وەڵامی لاتیشا بدەمەوە: بەڵێ، ڕێک وەک کلتور، وشەگەلێک کە بە منداڵی تازە لە دایک بوو دەگوترێت، باشترە کە باوکەکە بیڵێت (زۆر دڵنیا نەبووم لەوە، بەڵام بە دەنگێک گووتم کە هەوڵمدا متمانەدار بێت).

پاشان بە دڵەڕاوکێوە گووتی: ئایا وشەکان جادوو و سیحر یان شتێکن لەو بابەتەیە؟

بە خێرایی گووتم: نا نا نا هەرگیز، زۆر بە دەگمەن شتی لەو شێوەیە لای موسوڵمانەکان دەدۆزیتەوە، ئەوە تەنها وشەگەلێکن بۆ بانگکردن و ئاگادارکردنەوە بۆ نوێژ. هیچ شتێکی دیکە نییە.

بە گاڵتەجاڕیەوە وەڵامی دایەوە: دیارە زۆر کاریگەرە بە تایبەت کاتێک لە کەسێکەوە دێت کە لە ژیانیدا نوێژێکی نەکردووە.

ئەوجا گووتی: گرنگ ئەوەیە ئێستا بیلال باشە؟

ئەرخەیانم کرد کە باشە.

کەمێک بێدەنگ بوو کە وام پێشبینی کرد پەیوەندیەکە دابخاتەوە بەڵام دەنگی بە دودڵییەکەوە هات: ئایا سەعید تەنها داوای لێخۆشبوونی لە بیلال دەکرد؟ یاخود منیش دەگرێتەوە؟

نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە، پاشان گووتم: گووتی لێم خۆشبە، هەر ئەوەندە.

دوبارە دەنگی هاتەوە بە بەهێزی و گاڵتەجاڕیەوە: بە دڵنیاییەوە، زۆرم لێ بیست، هەر بۆیە ئەم جارەیان تەنها بۆ بیلال بوو.

بێدەنگ مایەوە.

پاشان گووتی: خۆ هەر لێی خۆش نەدەبووم بە هەر حاڵ!

♦ ♦ ♦

بیلال کاتی چاوەڕوانی لە فڕۆکەخانەی لیک تشارڵز بە خەوتووی بەسەر برد وەک ئەوەی هەموو ئەو شتانەی کە ڕوویدا بە هیلاکی بردبێت. کاتێکیش کە هەستا هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو لەگەڵم بە شێوەیەکی خەمهێنەر.

لە فڕۆکەخانەی دالاس بیلال باشتر بوو، لە پڕێکدا شتێکی پێ گووتم وەک ئەوەی شتێکی هاتبێتەوە یاد لە کاتێکدا چاوەڕێی فڕۆکەی دالاس بووین: چۆن وشەکانی بانگدان بۆ نوێژت لەبیرکرد کاتێک لە بارەی بیلالەوە بۆت نوسیم؟

زۆر ڕاستگۆیانەوتم: لە یادم نەکرد، تەنها دوامخست.

بیلال گووتی: بۆچی؟

پێم گووت: وشەکانی بانگدان بۆ نوێژ زۆر قوڵە، دووری تێدایە، با بڵێین فەلسەفییە، بۆیە دەمەوێت بە شێوەیەکی قایلکار دایبڕێژم. ئەوە بابەتەکەیە لەوە زیاتر نا.

بیلال گووتی: بابەتێکی قووڵ، نا؟

گووتم: بەڵێ، هەوڵدەدەم بە پێی توانا سادەی بکەمەوە.

نەمگووت کە هەوڵ دەدەم لێی تێبگەم. هەوڵ دەدەم تێبگەم کە چۆن ڕوونی بکەمەوە و باس لە" لا الە الا اللە" بکەم، لە کاتێکدا من- بە نزیکەی—باوەڕم وایە کە "خودا نیە".

بیلال وەڵامی دایەوە: خۆ گوێت لێبوو کە پیاوە پیرەکەم چی گووت، بە نزیکەیی هیچ شتێکی بۆ نەکردووم — لە هەموو ژیانمدا — جگە لەوەی ئەو وشانەی بە گوێمدا چرپاندووە، دوای چەند مانگێکیش ڕۆیشتووە، هەر بۆیە ئەو وشانە بۆ من گرنگە..

ئەمەشی خستە سەر: بە ئەرک نەبێت.

لە ناو بیرکردنەوەکانمدا نوقوم بوبووم. هەستێکی قوڵ و ناڕوون دایگرتم لەبارەی هەموو ئەو شتانەی ڕووی داوە لە سەرەتاوە بۆ گەیشتن بووە بەم خاڵە. بۆ ئەم دوو ڕێیانەی کە من و ڕێیەکەی دیکە جیا دەکاتەوە، نێوان (لا اله) و (لا اله الا الله).

هەستم کرد کە لاتیشا و سعید هەر بۆ ئەمە بەیەک گەیشتوون، سەعید پێش لە دایک بوونی منداڵەکەی بەلای مزگەوتێکدا تێپەڕ دەبێت کە ناوی بیلالی کوڕی ڕەباحە، بیری دەکەوێتەوە کە ئەو ناوەی پێ خۆشە، بۆیە دەچێتە ژوورەوە تاوەکو لێی بپرسێت و، وشەکان بزانێت، لە بەریان دەکات، لە ڕۆژی دواتردا منداڵەکەی دێتە دونیاوە و ناوی دەنێت بیلال، بە گوێیدا دەچرپێنێت و ، دوای چەند مانگێک دەڕوات.

لە دوای ئەوە بە چەند ساڵێک، منی — بێ باوەڕ — لە فیلمێک دەربارەی بیلالی کوڕی ڕەباح کار دەکەم، لە کاتێکدا بیلال توشی شێرپەنجە دەبێت و، لەو هەموو کەسەی لە ناو گروپەکەدایە نامە بۆ من دەنێرێت، بۆ ئەوەی لە بارەی بیلالی ئەسڵیەوە بۆی بنوسم.. هەوڵ دەدەم کە وشەکانی بانگەکە پشتگوێ بخەم کە دژ بە هەموو باوەڕەکەمە، کەچی خۆم دەدۆزمەوە سەردانی باوکی بیلال دەکەم لەگەڵ بیلالدا، لە زیندان، بۆ ئەوەی ئەم چیرۆکەمان بۆ بگێڕێتەوە..

پاشان خۆم دەدۆزمەوە، لە بەرامبەر ئەگەری ئەوەی بچمە ناویەوە... ئەگەری ئەوەی لە نێوان دوو ڕێیانەکەدا بوەستمەوە، لە کاتێکدا لە ناو گومانە بێزارکەرە هیلاککارەکەدام، لە نێوان لا اله و، لا اله الا الله دا.

هەستم کرد کە هەموو وردەکاری چیرۆکەکە، لە سەرەتاوە، هەر لە زۆر زووەوە، ساز کراوە، بۆ ئەوەی بگەم — بگەین؟ — بەم دووڕیانە، بۆ ئەم خاڵەی کە دەبێت بچمە ناو بابەتی هەبوونی خوداوە. لەوەی کە هەموو کات

خـۆم لێـی دووردەخـستەوە. نـەک هـەر تـەنها لەگـەڵ بیلالـدا، بـەڵکو لەگـەڵ خۆشمدا..

ئایا سەعید بە ڕووداو پێش منداڵبوونی هاوسەرەکەی بـە شـەقامی وێـست باین لە ناوەڕاستی سانت لویسدا تێپەڕیوە و، مزگەوتێکی بەو ناوەوە دیتووە، ئایا بە ڕووداو چووەتـە ژوورەوە بـۆ ئـەوەی بپرسـێت لـە بـارەی ئـەو کەسـەی مزگەوتەکەی بە ناوەوە نراوە؟ ئایا ئەوە ڕووداو بووە کە وای لێکردووە چـاوی بە کەسێک بکەوێت کە بە پەرۆشیەوە قسەی لەگەڵ بکات و باسـی وشـەکانی بۆ بکات کە بیلال لە بانگدانی نـوێژدا گووتویـەتی و ئـەوەش کـە دەبێـت بـە گوێی منداڵی تازە لە دایکبوودا بگووترێت..

ئەوجا سەعید دەیڵێت و، بۆ ماوەی ١٣ ساڵ لە بیلال دووردەبێـت، منـیش یەکـەم دیـداریان تەماشـا دەکـەم و، لـە نێـو ئـەو هـەموو شـتەی کـە دەبێـت بگوترێت، ئەو چیرۆکە بۆ بیلال دەگێڕێتەوە.

بەرەنگاربوونەوەیـەکی گـەردوونـی هەیـە دژم کـە بـۆ ئـەم بابەتـە ڕاپـێچم دەکات. وەک بڵێی هەموو ئەو چیرۆکـە سـاز و دروسـتکراوبێت لەبـەر خـاتری من، چۆن کۆمەڵێک ڕێکەوت دەکرێت بمگەیەنێت بە ئۆکیدیل– لە ناوەڕاسـتی هیچ شوێنێک – بـۆ ئـەوەی شوێنی خۆم دیـاری بکـەم لـە نێـوان (لا الـه) و (لا اله الا اللّه)دا.

چۆن دەکرێت ڕووداوگەلێکی لە دوای یەک بمگەیەنێتە ئێرە؟

شـتێک لـە هـەموو بابەتەکانـدا دەردەکـەوێت وەک ئـەوەی مایسـترۆیەک هـەبێت شـتەکان ڕێـک بخـات، ناکرێـت دەنگـە لـە خۆوەکـانی چۆلەکـەکان سەمفۆنیای دەیەمی بیتهۆڤن دروست بکەن.. ناکرێت کۆمەڵەیەک ئەکتـەر کـە گفتوگۆیەک لەسەر شانۆ ساز دەکەن وەک هاملێت دەربچن.

ناشـکرێت هـەموو ئەوانـەی بەسـەرمندا دێـت، بەسـەر بـیلال، سـەعید، هەمووی تەنها ڕیکەوتێک بن.

هەوڵمدا کە بیردۆزی پەرەسەندن و بەرزبوونەوە جێبەجێ بکەم.. گوێم لـە دەنگێک بوو لە ناخمدا دەیگووت پێم ئەو بیردۆزی پەرەسـەندنەی کـە بـاوەڕم

پێیـەتی بـاس لـە ڕیکـەوت ناکـات، بەڵکـە لـە بەرزبوونـەوە، لـە مانـەوە بـۆ شایەنتر.. ئەوەی کە بەرگە دەگرێت لـە بارودۆخـە گۆڕاوەکانـدا و.. دەتوانێـت بمێنێتەوە..

هێشتاش بڕوام بەمەیە. بـەڵام هەسـتم کـرد کـە قابیـل بـە جێبـەجێکردن نییە.

لـە کاتێکیشـدا لێـرەدا قابیـل بـە جێبـەجێکردن نـەبێت ئـەوە لـە هـیچ شوێنێکی دیکەش جێبەجێ نابێت.

کاتێکیش قابیل بە جێبـەجێکردن نابێـت، ئـەوە هـەموو بابەتەکـە دەخاتـە ژێر پرسیارەوە: ئەی هەموو ئەو شتانەی داناوە لـە سـەرەتاوە؟ ئەسـڵەن کێ شتەکانی داناوە و لێگەڕاوە تـاوەکو بجەنگێت و گەشـە بکـات و بـەرز بێتـەوە یاخود لە ناوبچێت؟

چۆن دەکرێت سەردانی کردنێکی زیندان بۆ ئەمە ئاڕاستەم بکات؟!

"های، ناتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ نیۆرک؟"

بە دەنگی بیلال بە ئاگا هاتمەوە کە قسەی لەگەڵ دەکردم.

"گەشتەکەمان، ئاگاداریان بەرز کردەوە بۆی".

کاتی چاوەڕوانیم لە بیرکردنەوە لەوەی ڕوویدابوو بەسەر برد.

لە کاتێکدا کە سەردەکەوتین بۆ ناو فڕۆکەکە، نامەیەکم بۆ لاتیشا نوسـی: ئەوە ئێمە سەر فڕۆکە دەکەوین، پاش کەمێکی دیکە دەتبینینەوە.

نەمـدەزانی کـە بـیلال، لـە کاتێکـدا مـن نـوقمی بیرکردنـەوەکانم بوومـە، شتێکی نوسیوە کە وام لێدەکات خۆم یەکلایی بکەمەوە لەو دووڕیانەدا.

بە دڵنیاییەوە ڕێکەوت نییە.

گەردوون هەمووی لە دژی من وەخۆ کەوتووە.

یاخود هاوکارمە؟

◆ ◆ ◆

## نامەی بیلال بۆ باوکی – بەشی دووەم ( تێنوسەکە )

باشە باوکە.

تۆم بینی.

شتەکە کەمێک جیاوازتر بوو لەوەی کە پێشبینیم دەکرد. یاخود دەتوانم بڵێم هەر زۆر جیاواز بوو لەوەی پێشبینیم دەکرد. بەڵام، ئەسڵەن من چیم پێشبینی کرد؟ چی پێشبینی دەکرێت لە باوکێک کە لە کوڕەکەی دوورکەوتووتەوە بۆ ماوەی سێزدە ساڵ، پاشان زیندانی کراوە، ئەوجاش کوڕەکەی هاتووە بۆ ئەوەی سەردانی بکات لە زیندان و، پێی دەڵێت کە ئەوە یەکەم و کۆتا جارە کە دەیبینێت، لەبەر ئەوەی بەو زوانە دەمرێت، پێش ئەوەی ماوەی زیندانیەکەی تەواو بکات؟

چی پێشبینیکراوە لەوەدا؟

ئەسڵەن لە پێشووتردا ئەوە چەند جار ڕوویداوە.

هەر لەوانەیە ئەمە یەکەم جار بێت لە مێژوودا ڕووبدات.

پێ دەچێ من ڕابەر بم لەوەدا.

من یەکەم کەسم کە چووە بۆ لای باوکی لە زیندان، کە پێشووتر هیچ کات نەیدیوە و، پێی دەڵێم کە شێرپەنجەی مێشکی هەیە و دەمرێت.

لە میشکمدا دامنابوو کە دەرنەکەویت.

ئەوە گەورەترین ترسم بوو.

ئەوەی کە من ئەو هەموو ڕێگەیەم بڕیبێت لە ناو فرۆکەدا و، لە دووری چەند مەترێکەوە بیت، بەڵام زۆر لەوە ترسنۆکتر بیت کە ڕووبەڕووم ببیتەوە.

ئەمە خاڵیکە بۆ تۆ.

ڕاستە کە لە ناو گریاندا ڕووخایت بە شێوەیەک کە هەرگیز نەمدیبوو، پێشبینیشم نەکردبوو، بەڵام بە لایەنی کەمەوە تۆ پەشیمان بوویت.

دایکم فێری کردم کە نەگریەم. بە لایەنی کەمەوە بەو شێوەیە نا. ئایا دایکی تۆش – ئەنکم – ئەمەی فێر نەکردوویت؟

هەر بەو بۆنەیە هیچ هەستم بە سۆز نەکرد بەرامبەر گریانەکەت، بە نزیکەیی هەستم بە هیچ نەکرد. یاخود لەوانەیە تێنەگەیشتبم. ئەگەر بەو ئاستە پەشیمان بوویت، بۆ هیچ شتێکت نەکرد، ئەگەر تەنانەت بچوکیش بێت، لە ماوەی ئەم هەموو ساڵەدا. پەیوەندیت نەکرد، نامەیەکت نەنارد، پێت نەگوتم کە هەیت، ئەوەی کە بیری منت هەیە یاخود ناومت لەبیرە یاخود هەر بیرت بێت کە منداڵێکت لەو

هاوسەرگیریە بووە کە هیچ دڵنیا نیت لە یادتە یان نا.

دەزانی؟ ئەمە یەکەم جارم نەبوو کە قسەت لەگەڵ دەکەم.

زۆر بۆت گەڕام لە پێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا. فەیس بووک،تویتەر، مای سپایس. نەمدۆزیتەوە. هەر بۆیە خۆم پەرەیەکم بۆ دروست کردیت لە فەیسبووک، بە ناوی تۆوە، بەو تاکە وێنەوە کە لە تۆوە هەمە، هەروەها دەستم کرد بە نامە ناردن لەگەڵتدا، وەڵامی خۆمم دەدایەوە لە جیاتی تۆ. شتی زۆرم بۆ باس کردی لەوانەی کە بەسەرمدا ڕوودەدات و ڕوویداوە، خۆم دەکردە ڕۆڵی تۆوە و وەلامی خۆمم دەدایەوە، هەوڵمدەدا کە بیهێنمە پێش چاوم کە وەڵامی (باوک) چۆن دەبێت لەسەر ئەوەی کە دەیڵێم. بەزۆری وەڵامەکانت پشتی دەبەست بە (ستریۆتایپ) بۆ ئەفریقی ئەمریکی.

بۆ ماوەی چەند مانگێک بەردەوام بوو. لە زۆر شتدا ڕاوبۆچوونتم وەرگرت، باسی شتانێکیشم بۆ کردیت کە بە هیچ کەسم نەگووتبوو، هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد تەنها بە گووتنی، تەنها بەوەی کە وام دادەنا تۆ دەزانیت. ئەمە بەڕاستی نەخۆشی بوو. بەڵام هێندەی شێرپەنجەی مێشک نا. نەخۆشیەکی دیکەش زیاتر یان کەمتر لەوە نابینمەوە کە ئەمڕۆ کردت کاتێک منت دیت. ئەو ستریۆ تایپەی کە من نامەم بۆ دەنارد هیچ شتێکی لەو شێوەیەی نەدەکرد.

رۆژێک، لە ناکاودا، پەڕەکەت نامەیەکی پێگەیشت لە لایەن کچێکەوە کە ناوی مونیرە بوو، دواتر دەرکەوت کە ئەوە پوورمە کە هیچ شتێکی لە بارەوە نازانم، نامەکە دەیگووت: سەعید؟! ئەوە تۆی؟! ئەی لە زیندان نیت؟

وەڵامم دایەوە و، ناچار بووم کە دان بەوەدا بنێم کە پەڕەکە بە ناوی تۆوەیە و منم کوڕەکەت بیلال، بەڕاستی جیی بەزەییە، بەڵام ئەو زۆر تێگەیشتوو بوو، دەیزانی کە من هەم، بەڵام هەرگیز منی نەدیبوو، لەبەر ئەوەی تۆ پەیوەندیت بچڕاندبوو لەگەڵ خێزانەکەتدا لەو ماوەیەی کە من لە دایک بووم یاخود شتێک لەو بابەتە، پاشان گەڕایتەوە بۆ پەیوەندی کردن پییانەوە بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ لە ساڵەکانی دیکەدا، زۆری باس نەکرد لەسەرت بۆم، لەبەر ئەوەی خۆشی هەر زۆری نەدەزانی لە بارەتەوە، بەڵام دەیزانی کە تۆ لە زیندانی لویزیانایت، ئەوەش ئەو دەزووە بوو کە منی بۆ لای تۆ هێنا ئەمڕۆ.

بابەتەکەی پوورم لە دایکم شاردەوە، دایکم هیچ شتێکی لەو بارەیەوە نەدەزانی. هەر نامەم دەگۆڕیەوە لەگەڵی لە ڕێی ئەو پەڕەوە کە خۆت هیچی لە بارەوە نازانی. پورمم خۆش ویست. ئەو زۆر میهرەبان دەردەکەوت. هێشتاش هەر لە سانت لویسە. ئەو کوڕیکی هەیە لە تەمەنی مندا بەڵام بە بێ شێرپەنجە لە هیچ شوێنێکیدا و هەروەها دوو کچیشی هەیە. دانەیەکیان بچوکترەو دانەیەکیش گەورەتر لە من. مێردەکەشی کە باوکیانە لەگەڵیاندا دەژی.

پێی ڕادەگەینم کە سەردانم کردوویت لە بەندینخانە.

ئایا پێی بێژم کە تۆ باشیت؟

نازانم.

تۆ باشیت؟

هیچ وا بۆم دەرنەدەکەوت کە باشبیت.

◆◆◆

دەزانیت، ئێستا شتێکی زۆر ناخۆشت پێ دەڵێم. بەڵام قەیناکە. هەموو ئەوەی کە ڕۆشت بەو شێوەیە بوو.

بە شێوەیەک، هەستم کرد کە ئێمە تەنها ئێستا، یەکسان بووینەوە.

ئێستا لێم بردیتەوە، وەک ئەوەی تۆ پێشتر لێمت بردەوە.

دەزانم ئەمڕۆ زۆر ئازارم دایت، دەزانم کە بوومە هۆکاری ئازارچەشتنت، ناکرێت هەموو ئەوانەی کە کردت ڕۆڵ گێڕان بوبێت.

ئەمڕۆ ئازارم دایت، وەک چۆن تۆ ئازارت دام بە نەبوونت بۆ سێزدە ساڵ.

مەبەستم نەبوو کە ئازاراکە بچەژێتەوە، بەڵام بەو شێوەیە ڕوویدا.

هەروەها هەست بە جۆرێک ئاسوودەیی و پاکبوونەوە دەکەم.

یەکسان بووینەوە.

تەنها ئێستاکە، ئیدی دەتوانین پەیوەندیەکی نوێ دروست بکەین.

بە دڵنیاییەوە ئەوە ڕوونادات. بەڵام دەکرێت ڕوویدات ئەگەر شتەکان ئاسایی بوونایە.

لە دوای ئەوەی یەکسان بووین، ئێستا ئاسایشێک هەیە.

ئێستا زۆر زۆر باشترە.

◆◆◆

ئەو ڕۆژەی دایکم ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر هاتن بۆ زیندان، پێی گووتم، (جا ڕەزامەندیەکەی ئەو پێویست بوو بۆ کاروبارەکانی سەردانیکردنەکە)، گووتی پێم کە دەبێت لە خۆمت دەربکەم، پێی گووتم کە تۆ دەمخنکێنیت، پێویستە بتبینم تاوەکو بتوانم لە خۆمت دەربکەم. گووتی دەبێت کۆتای پێ بێنم تاوەکو بە ڕێگاکەمدا بڕۆم، ئەو ڕێگەیەی کە زۆر درێژ نابێت وەک دەزانیت.

ئەوەی دایکم دەڵێت ڕاستە. بەڵام من لە خۆمت دەرناهێنم. من لەگەڵ تۆ ئاشت بوومەوە. هەر بۆیە ئیدی بە قوڕگمەوە نەبەستراویتەوە وەک پێشووتر. تۆ لە ناخمدا دەبیت. بەڵام ئیدی گیر و بەردی سەرەڕێ نابیت بۆم.

دەزانیت باوکە؟

باوک بە دڵنیاییەوە وجودی هەیە، مادام من هەم کەواتە ئەویش هەیە، تەنانەت ئەگەر وێنەیەکیشی نەبێت، تەنانەت ئەگەر دایکم شتێکیشی لە بارەوە نەگوتبێت، تەنانەت ئەگەر هیچ شتێکی لە بارەوە نەزانیبێت نە ناویشی، تەنانەت ئەگەر وەک بەخشەرێک بێت واژووی لەسەر گرێبەست کردووە بۆ ئەوەی ناوی دەرنەکەوێت. ئەو بوونی هەیە. مادام من هەم، کەواتە ئەویش هەیە.

لەوانەیە دایکم کەیفی بەوە نەیەت کە شتێکی لە بارەوە بزانێت، لەوانەیە گرنگ نەبێت بۆی، لەوانەیە ڕقی لێی بێت، یاخود ڕقی لێی نەبێت، تەنها بیری لێ ناکاتەوە و نایەوێت بێتەوە یادی، بەڵام هیچ شتێک ناتوانێت وای لێبکات کە نەبێت.

خەڵک هەن کە ئەمە پشت گوێ دەخەن. هەن کە نکۆڵی لێ دەکەن. خەڵکیش هەن کە هەر نکۆڵی بوونی خودا دەکەن. بەڵام ئەمە گەمژەییە. بە بۆچوونی من بە لایەنی کەمەوە گەمژەییە. هەردوو شتەکە وەک یەکن. نکۆڵی کردنی هەبوونی باوک، وەک نکۆڵی کردنی هەبوونی خودا. مادام هەیت، ئەوە باوکێک هەبووە کە تۆوەکەی لە لای دایکت جێ هێشتووە، تەنانەت ئەگەر نەناسراویش بێت بە تەواوی. بەڵام هەر هەیە. بەو شێوەیەش بۆ خودایە. مادام تۆ هەیت، ئەوە کەسێک هەیە کە دروستی کردوویت. کەسێک هەیە کە هەموو بارودۆخەکانی ڕێک کردووە تاوەکو لە ئەنجامدا تۆ بێیتە بوون.

چەندە سەیرە پەیوەندی نێوان ئەو دوو شتە. بەڵام خۆ زۆربەی شتەکان لە ژیاندا سەمەرەن..

. وەک ئەوەی باوک هەوڵی دا

بەڕێوبەرایەتی شتەکان بکات، نان بهێنێت تاوەکو بیخاتە سەر مێزەکە، ئەوەی کە ئەو خاوەنی دەسەڵات بێت. خاوەنی وشەی کۆتایی بێت.

خەڵکی زۆر هەست بە لەدەست دانی باوک دەکەن، لەوانەشە هەبێت تووشی گرێی دەروونی ببێت، هەمووی نا، هەندێک ئەوە تێدەپەڕێنن، لەگەڵ بارودۆخەکەدا ئاشت دەبنەوە، بەڵام ئەوە لە زۆربەی کاتدا بە بژاردنی شتێکی دیکە دەبێت، وەک ئەوەی لە بیروبۆچونم دایە، یاخود بە شتێک کە بۆ هەموو ژیانیان هەڵیدەگرن.

نکۆڵی تێدایە، سووربوونی تێدایە لەسەر پێشبینی کردنی ئەوەی کە تۆ بوونت نییە، یاخود تۆ دۆزراویتەتەوە بە شێوەیەکی نادیار کە ناتەوێت بزانیت، سەمەرەترە.

من زۆر وابەستەی ئاین نیم، مەبەستم ئەوەیە کە زۆر نازانم لە بارەی ئاینەوە، بەڵام دەزانم کە خودا بوونی هەیە، زۆری لە بارەوە نازانم، بەڵام ئەو هەیە، وەک ئەوەی تۆ هەیت باوکە، خودا هەر دەبێت هەبێت، وەک ئەوەی تۆ هەیت باوکە، هەیت — ئەو جارە - تەنانەت ئەگەر دوای ئەوەش ڕۆیشتبێتیت.

مادام من هەم لێرە، ئەوە تۆش لە شوێنێک هەیت. تۆ هۆکاریت لەوەی کە من لێرەم.

هەروەها خوداش.

گەشتی ئەمڕۆم بۆ ئەوە بوو کە دڵنیا بمەوە - بە ڕێگەیەک - کە تۆ هەیت.

لە هەبوونی خودا.

ئەوە دۆزیمیتەوە.

دیتمەوە کە تۆ دوای هەموو شتێک، تەنها مرۆڤێکیت.

خودای گەورە حەتمەن شتێکی دیکەیە.

لەوانەیە هەرگیز لە شێرپەنجە چاک نەبمەوە.

لە ڕاستیدا، بە دڵنیاییەوە چاک نابمەوە لێی، نەوەک (لەوانەیە).

بەڵام خۆ هەر بە لایەنی کەمەوە لە تۆ چاک بوومەوە.

ئێستا دەتوانم بەردەوام بم لەوەی کە ماوە.

♦ ♦ ♦

## ئەمجەد

فڕۆکەکە نیشتەوە بۆ سەر زەوی لە فڕۆکەخانەی لاگواردیا لە نیۆرک ڕێک لە هەمان ساتی کە من کۆتایم بە خوێندنەوەی ئەوە هێنا کە بیلال نوسیبووی. فڕۆکەکە زۆر بە توندی دەلەرزی وەک هەموو جارێکی نیشتنەوە. منیش لەرزیم. منیش لە ناوەوە زۆر بە توندی دەلەرزیم. بە هۆی فڕۆکەکەوە نا، بەڵکو بە هۆی قسەکانی بیلالەوە.

بیلال خودا و باوکی بە سادەییەکی زۆر ناوازە پێکەوە بەستەوە، بێگومان باوکت هەیە، کەس گومانی لەوەدا نییە، کەواتە خوداشت هەیە، خودایەک هەیە لەم گەردوونەدا. مەرج نییە خودای ئاینە ئاسمانیەکان بێت، بەڵام خودایەک، خودایەک کە سەرەتاکانی دەستپێکردووە، تەنانەت ئەگەر شتەکان لە دوایدا بە بێ دەست تێوەردانی ئەوەوە بوبێت، بەڵام هێزێک هەیە، کە هەموو شتێکی دەست پێکردووە.. وەک باوکێک کە تۆوەکەی خستووەتەوە، تەنانەت ئەگەر منداڵەکەشی نەبینیبێت، بەڵام هەر تۆوەکەی خستووەتەوە.

من چۆن بیرم لەوە نەکردووەتەوە پێشتر؟

ئایا بیلال ئەمەی لە کلتوری مەسیحیەتەوە وەرگرتووە بەهۆی بەستنی پەیوەندی لە نێوان خودا و باوکدا لە لایەن ئەوانەوە بەهۆی ئەوەی کە دایکی مەسیحییە؟

ئایا گەڕانی بە دوای باوکدا جۆرێکی خۆڕسکانەی سەرەتا بووە لە گەڕان بە دوای خودادا؟

ئایا یاخیبوونی من — و ئەوانی دیکەش— لە خودا، هەروەها لە بیرۆکەی خودا ، دەربڕینی یاخیبوونە لە باوک، لە هەبوونی دەسەڵات، یاخود هێزی یەکەمی لە ژیانماندا، تەنانەت ئەگەر یاخیبوونەکەشمان ئاڕاستەی نەکردبین بۆ جێگرەوەیەکی قاپلپێکەر؟ تەنانەت ئەگەر باشترینمان نەدۆزیبێتەوە؟

ئایا هەموو ئەوانە تەنها گرێیەکی دەروونی بوون؟ خودا ڕەت دەکەینەوە بەڵام مەبەستمان ڕەتکردنەوەی باوکەکانمانە. چەند گرێیەکی دەروونی کە هەڵیدەبژێرین بە دەربڕینە فەلسەفیەکان و بەهانە زانستیەکان بەرگ بگیرێت، ئایا باوکەکانمان ڕەت دەکەینەوە لەبەر ئەوەی خودا ڕەت دەکەینەوە، یاخود ئەوەیە خودا ڕەت دەکەینەوە چونکە باوکەکانمان ڕەت کردووەتەوە؟

کاس بووم، هەستم بە سەرگێژی کرد، لە پڕێکدا هەستم کرد کە پارچەیەک ئاگرم لە تاو تادا، خەونەکانم بیر دەکەوتەوە کە باوکم تێکەڵ دەبێت بە بیلال بە دەنگی بانگ بە سمۆئێل جاکسۆن بە مۆرغان فریمان بە کریستین بە هەموو شتێک. بوبوم بە ئاو لە تاو ئارەقەدا و، تەمام گرتبوو کە پشتوێنی سەلامەتیەکە بکەمەوە و بچم بۆی تەوالێتەکان تەنها بۆ ئەوەی دەموچاوم بشۆم. خاتوونە فەرمانبەرەکە بە ئاگاداریەوە تەماشامی کرد و گووتی کە هێشتا نەوەستاوین بە تەواوی.

دەمزانی کە من وەستام.

دەمزانی لە کۆتایدا گەیشتم.

هەموو شتەکان لە دوای ئەوەوە زۆر بە خێرایی ڕووی دا.

هێشتا من لە حاڵەتی سەرگێژی و سەرسوڕماندا بووم، هەستم بە سڕبوون دەکرد لە پەلەکانمدا، بیلال منی ئاڕاستە دەکرد لە بری ئەوەی من ئەو ئاڕاستە بکەم، هەموو شتێک بە ناو یەکدا بوو، هەستەکانم شێوا بوون، گەشتەکە زیاتر لە نیو ڕۆژی نەخایەند، بەڵام وەک گەشتی تەمەن دەردەکەوت.. وەک ئەوە وابوو کە گەشتەکەمان بۆ زیندانی ئۆکیدیل، لە ناوەڕاستی هیچ شوێنێک، بۆ ڕزگاربوونم بوو لە زیندانی ناوەکی خۆم.. وەک ئەوەی ئەو گەشتە بۆ ڕاگواستنەوەم بوو لە هیچ شوێنێکەوە، بۆ شوێنێک.

لە ناکاو بە ڕوخساری زەردەخەناوی لاتیشا بە ئاگا هاتمەوە لە نێوان کۆمەڵەکەدا، ئەو هاتبوو بۆ پێشوازی بیلال.

دیتم کە بە خۆشەویستی و میهرەبانیەوە لە باوەشی دەگرێت، میهرەبانی دایکی ڕاستەقینە، ئەو دایکەی کە دەیزانی لێکدابڕانی نیوە ڕۆژی ئەمڕۆ کە ڕوویدا تەنها مەشقێکە بۆ لێکدابڕانی درێژ کە دێت. لیکدابڕانی کۆتایی.

بیلالم بینی لە نێو باوەشیدا کە شەرمەزاریەکەی لە نێو بردبوو لە دەرخستنی ئەو هەستانەی کە هەرزەکاری تەمەنی ئەو دەیشارێتەوە وەک هەمیشە. دیتم کە بە توندی باوەشی پێدا کردبوو، وەک ئەوەی پێی بڵێت ئەوە ڕزگاری بوو لە نەخۆشیەکەی باوکی، وەک ئەوەی پێی بڵێت ئەو باشترین دایک و باشترین باوک بووە، هەروەها ئەوەش کە ئەو ڕۆڵێکی باشی هەبووە و پێویستی بە کەس نەبووە و، ئەو نەبوونی باوکی بۆ قەرەبوو کردووەتەوە.

لێیان ڕامام لەو بارودۆخەدا، بەیەکداچوو، وەک ئەوەی لاتیشا بیەوێت بیگێڕێتەوە بۆ ڕەحمی خۆی تاوکو بیپارێزێت لەو شێرپەنجەیەی کە دەیماشێتەوە. خەریکبوو چاوەکانم پڕ دەبوون لە فرمێسک.. خۆمم دۆزیەوە کە هیچ شتێکی دیکە نابینم لەو فڕۆکەخانە قەرەباڵەخەدا جگە ئەوان. من چۆن گەیشتمە ئێرە.. چۆن بوومە بەشیک لەم دیمەنە. چ قەدەرێک ئاڕاستەی کردم لە ژیانی پێشووترمەوە بۆ ئەوەی بەشێک بم لەم خێزانە. هەوڵمدا بیر بکەمەوە من چیم دەکرد پێش لاتیشا و بیلال، هەموو شتێک بینی وەک ڕەنگی خۆڵەمێشی بێت و خەریکە هەمووی لەبیر دەکرێت.

لاتیشا تێبینی بوونمی کرد لەوێدا، بۆیە خۆی دەرکێشایە دەرەوە لە باوەشی بیلال، ڕاست بوویەوە و زەردەخەی سوپاسگوزاری دەربڕی و دەستی درێژ دەکرد تا بڵێت: نازانم چۆن سوپاست بکەم ئەی...

تەواوی نەکرد. خۆمم بینیەوە کە بە توندی باوەشی پێدا دەکەم. نازانم چۆن ئەوە ڕوویدا بەڵام ڕوویدا. بە شتێکی ئاسایم دیتەوە کە دەبێت ڕووبدات. لە باوەشم گرت وەک ئەوەی بمەوێت هەمان خۆشەویستی و میهرەبانیەم بداتێ.

ئاگاداری شۆک بوونی ئەو نەبووم بەوەی کە کردم، بەڵام کاتێک لەباوەشم گرت تێبینی تەماشاکردنێکی سەیرم کرد لەسەر ڕوخساری بیلال، ئەو بە جۆرێک تەماشامی دەکرد وەک ئەوەی تەماشای کەسێکی سەیر و سەمەرە بکات. هەستم بە دەستی لاتیشا کرد کە بەسەر شانمدا دەیکێشا وەک ئەوەی بیلال لەگەڵ باوکی دەیکرد.

بە ئاگا هاتمەوە لە کارە گەمژانەکەم و لە لاتیشا دوور کەوتمەوە. شتێکم لە داوای لێبووردن گووت و ئەوەش کە کاریگەر بووم بە هەموو ئەو شتانەی بەسەر بیلالدا هاتووە ئەمڕۆ.

هەستم کرد کە لاتیشا زەردەخەنە دەکات کاتێک ماڵئاوایی لیدەکردم.

هەروەها بێزار نەبوو لە کارە گەمژانەکەم.

◆◆◆

ڕاستەوخۆ نەچوومەوە بۆ ماڵەوە، لە وێستگەی میترۆکەی نزیک ماڵەوە دابەزیم و، بە ناو شەقامەکاندا پیاسەم دەکرد، دەمەوێت هەموو ئەو شتانە ڕیک بخەم کە ئەمڕۆ هاتوون بەسەرمدا.

پاشان بیرم کەوتەوە کە کۆپەر بە تەنهایە لە بەیانیەوە و ئێستا پێویستی بە بەدەمەوەچوونی سروشتیانەیەتی ئەگەر لە هەر شوێنێکدا نەیکردبێت کە پێی گونجاوە.

شەوەکەی زۆر بە قووڵی چومە ناو خەوەوە، کاتێکیش دەنگی بانگەکە خەبەری کردمەوە ئەم جارەیان، هیچ بێزار نەبووم پێی، بە پێچەوانەوە، کەیفم بەوە دەهات گوێم لە هەموو وشەکان بێت بە وردی تاوەکو کۆتایی...

بە تەواوی نەمدەزانی کە چۆن موسوڵمانەکان نوێژ دەکەن.. هەروەها هەر ناشزانم کە ئایا پێویستە وەک ئەوان نوێژ بکەم یاخود نا..

بەڵام خۆمم دۆزیەوە، بە شێوەیەک، نوێژم دەکرد..

دیاریم نەکرد کە کام خودایەیە نوێژی بۆ دەکەم...

هێشتاش نازانم.

بەڵام خودایەک هەیە..

دروستکەرێکی ئەم گەردوونە بوونی هەیە.

♦ ♦ ♦

# بیلالی حەبەشی

شەوەکەی نەخەوتم.

ئەمە یەکەم بەیانی دەبێت کە بانگ دەدەم بۆ نوێژ.

دوێنێ هەموو شتێک زۆر بە خێرایی ڕوویدا.

پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت) چەند ڕۆژێکە بیر لە ڕێگەیەک دەکاتەوە بۆ کۆکردنەوەی خەڵک بۆ نوێژ. هەندێک پێشنیاری زەنگیان کرد و هەندێکیش زوڕنا. بەڵام ئەوانە زۆر هاوتا دەبێت لەگەڵ ئەوانەی ئاینەکانی پێشووتر.

منیش وەک هەمووان گوێم بۆ پیشنیارەکان دەگرت.. دروستکردنی مزگەوتەکەش چەند ڕۆژێکە تەواو بووە. خەڵکەکەش ئامادە دەبن بۆ کاتەکانی نوێژ بەڵام بە بێ هەبوونی شتێک کە لە کاتی دیاریکراودا لە هەموو دەوروبەری مەدینەوە کۆبکاتەوە. هەندێک جاریش دادەنیشن لە چاوەڕوانی نوێژی دواتردا، ئەوەش زۆر سەرلێشیوێنەر بوو، لەوانەشە زیاتر بۆ ئەوانەی کاروبارەکانیان لە کێڵگەکان یاخود بازاردایە.

هەموو شتێک لە یەثریب زۆر جیاواز بوو، وەک ئەوەی مەدینە دووبارە دروست دەکرایەوە. بەڵکو هەر بەو شێوەیەش بوو، مەدینە خۆی وێرانە بوو لە تاو ململانێی نێوان ئەو دوو هۆزەی کە تێیدا دەژیان، هەر هۆزێکیش لەوان کێبڕکێی دەکرد لەسەر هەبوونی دەسەڵاتی زیاتر، پاشان لە پڕێکدا، هەردوو هۆزەکەت دەبینیەوە کە کێبڕکێیان لەسەر ئەوەبوو کامەیان زۆرترین گەنجی باوەش بەو ئاینە نوێیەدا دەکات کە لە مەککەدا سەری هەڵداوە. ئەوەش دەبێتە تاکە هۆکار و نزیکیان دەکاتەوە لە یەکتری... گەنجەکان وەک ئەوەی دەردەکەوت بە جۆرێکی دیکە بیریان دەکردەوە، ئەوان هەستیان دەکرد کە ململانێیەکە گەشتووەتە ئاستێک کە نە براوەی تێدایە نە دۆڕاو،

تەنها بە هیلاک چوونی هەمووانە.. نزیکبوونیان لە یەهودیەکانەوە وای لێکردبوون کە درک بە گەمژەیەتی پەرستنی بتەکان بکەن، هەر بۆیە بانگەوازە نوێیەکەیان وەرگرت لە کاتێکدا تائیف ڕەتی کردەوە، بەهێزتر و گرنگتر لە یەثریب، هەروەها مەککەش– گرنگترینی ناو هەموو دوورگەی عەرەبی- پێش ئەو ڕەتی کردەوە...

ئەوە ئێمەش لێرەین، لە مەککەوە کۆچمان کرد، بە پیاو و ژنمانەوە ژمارەمان ناگاتە سەد کەس، دەچینە ناو یەثریبەوە و تێیدا نیشتەجی دەبین، پاشان پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) لە دوامانەوە دێت، لە دوای ئەوە دڵنیا بوویەوە کە هەمووان مەککەیان بە ئاسایشی جێهێشتووە، لەگەڵ ئەبوبەکریشدا دێت، ئەو پیاوەی کە لە ئومەیەی کرپیمەوە و ڕاستەوخۆ ئازادی کردم، تەنها بۆ ئەوەی لە ئەشکەنجەکە ڕزگارم بکات...

پاشان دروستکردنی مزگەوتەکە، هەر هۆزێک دەیویست لە گەڕەکەکەی ئەودا بێت، من چاودێریم دەکرد، تا بزانم پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) چی دەکات، ئەگەر پێشنیاری هەر هۆزێکی وەربگرتایە ئەوە دیسانەوە لەسەر قازانجی هۆزەکە ئەژمار دەکرا لە بارودۆخە نوێیەکەدا، ئەوەش دەبووە هۆی دووبارەبوونەوەی هەستیاریەکانی پێشووتر.

باوەڕم بەوە هەبوو کە ئەو ڕێگا ڕاستەکە هەڵدەبژێرێت، تەنها دەمویست پێشبینی بکەم. ئەوە هەڵبێنم ئەو هەڵبژاردنە چییە کە نابێتە قۆرتێک لە پارچە پەڕۆ نوێیەکەدا.

بژاردەکەی زۆر سەرکەوتووانە بوو، نەک تەنها لەبەر ئەوەی نەچوویە بەرەی هیچ هۆزێکەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە هۆکارەکە دەبێتە وێنەدانەوەی ئەو بارودۆخە نوێیەی کە ڕوودەدات..

ئەو گۆڕستانێکی کۆنی چۆڵکراوی کردە بژاردە و، بڕیاری دا کە مزگەوتەکەی تێدا دروست بکات، ئەوەش پێویستی دەکرد کە گۆڕەکان دەربهێندرێت تێیدا..

وەک ئەوەی پێیان بڵێت، پێمان بڵێت، بە هەمووان، ڕابردوو هەر بە تەنها نەمردووە، بەڵکو دەبێت لە ئەژمارەکەشماندا بیسڕینەوە، دەبیت لە گۆڕەکەشی دەریبهێنین تاوەکو لەدەستی ڕزگارمان ببێت... ئەگەر نا، ئەوە هیچ بینایەک دروست نابێت تێیدا.

ئەو وانەیە زۆر گەورە بوو، هەر ئەوەش بوو کە لە ڕاستیدا ڕوویدەدا...

هەموو شتێک سەرلەنوێ دەبوویەوە.

◆◆◆

مزگەوتەکە زۆر سادە بوو، تەنها لە ئەو بەردە دروست کرابوو کە هەیە و، دوو دار خورماش بۆ دەرگاکەی.. دروستکردنیشی هەر دوسێ ڕۆژی خایەند..

لە کاتی دروستکردنیدا ئاوازمان دەچڕی..

"اللّهم لا خير الا الاخرة، فأنصر الأنصار و المهاجرة"...

ئیدی تۆ بێژیت لێرەدا سەرنجی دەنگی دابێتم؟

نازانم.

هەر بۆیە دوای چەند ڕۆژێک ئەوەی دەبوو ڕوویدات ڕوویدا!

◆◆◆

من لەگەڵیان دانیشتبووم، لەگەڵ هەمووانـدا، کاتێک عەبدووڵای کوری زەید، کە یەکێکە لە دانیشتوانی ئەسڵی مەدینە هات و گووتی کە

ئەو لە خەونیدا بانگی دیوە کە بە دەنگ دراوە و، وشەکانی گووت.

من گوێم لەوە دەگرت کە دەیگووت، ئاسوودەییشم لەسەر ڕووخساری پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) بەدی دەکرد، هاتە پێشچاوم، ئەوەی کە مرۆڤ بانگ بدات بۆ نوێژ، بەو وشانەی کە عەبدولای کوری زەید گووتنی..

پاشان..

ئەو ڕوویدا کە چاوەڕوان نەکراو بوو.

لە ناکاو پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) بە عەبدوڵای گووت کە وشەکانم فێر بکات گووتی (بە بیلال بڵێ.. چونکە" دەنگی لە دەنگی تۆ پاراوترە"..

لە پڕێکدا هاتمە نێوەندەوە، باوەڕم نەکرد، من! من بیلال، بەردەکەی پێشوو، ڕەشە باریک و لاوازەکە، ئەم شوێنەی دەست کەوت، ئەو شوێنەی کە گوومانم تێیدا نییە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێدەکەن.

بەڵی بیلال.

هەموو شتێک یەکلایی بوبویەوە، بە بێ هیچ خوتخوتە و دودڵییەک.

بیلال فێربکە.

سەرەتا لێی تێنەدەگەیشتم.

من بانگ دەکەم بۆ نوێژ؟ هەموو ڕۆژیک؟ هەموو ڕۆژێک پێنج جار؟ من بەرز دەبمەوە بەسەر دیواری مزگەوتدا بۆ ئەوەی لە بەرزاییەکەوە بم کە دەنگم بگاتە هەموو شوێنێک؟

ئایا ئەو ڕۆڵە هەر بۆ خۆم دەمینێتەوە؟ یاخود جگە لە من وەری دەگرێت لە دوای ماوەیەک، یاخود کارەکە لە نیوان چەند کەسیکدا بەڕیوە دەچێت.

سەرەتا دڵخۆش و شڵەژاویش بووم.

ئایا پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) سەرنجی دەنگمی داوە لە سەرەتاوە؟ ئایا دەیناسیم پێش ئەوەی موسوڵمان بم؟ ئایا گوێی لێم بووە کاتێک قورئانم خوێندووە؟ یاخود تەنها ئێستاگوێی لێم بوو لەوەی کە دەمانگووت لە کاتی دروستکردنی مزگەوتەکەدا..

نازانم..

بەڵام ئەو من هەڵدەبژێرێت و دەڵێت (دەنگ پاراوتر).

یەكەم جارە هەست بە شانازی دەكەم بە دەنگمەوە. خەڵكی مەككە گوێیان بۆ دەگرتم، بەڵام ئاخر ئەوە زۆر بێ ڕێزانە بوو. دەنگی خۆش بۆ پیاو شتێكی گاڵتەپێكراو بوو. سوكایەتی پێدەكرام.

من دەنگی خۆم خۆش دەویست، هەستم دەكرد كە دەتوانم شتی زۆری پێبكەیەنم لە ڕێیەوە..

بەڵام ئەوان لەوە تێنەدەگەیشتن.

كاتێك كە قورئانم دەخوێند و بە ئاواز دەمچڕی، هەستم كرد كە ئەوە دەكرێت... دەكرێت شتێك بگەیەنم لە ڕێی دەنگمەوە.

بەڵام ئەوە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)ە خۆی دەڵێت كە هەستی كردووە بەوەی من بەهرەیەكم لەو قورگ و دەنگە ژێیەمدا هەڵگرتووە.

ئەم دەنگە هەڵدەبژێرێت، لە نێو ئەو هەموو دەنگە ژێیانەدا، بۆ ئەوەی ئەو بێت كە خەڵكی ڕێنوێنی دەكات بۆ نوێژ.

دونیا زۆر گۆڕاوە ئەی كوڕی حەمامە.

چەندە حەزم دەكرد ڕۆژێك بیدۆزمەوە و، ئەوەی پێ بڵێم كە ڕوویداوە..

ئەو شەوە خەو نەچوویە چاوەكانم، هەروا مابوومەوە چاوەڕێی بەرەبەیانم دەكرد.

ئەوە یەكەم نوێژی بەیانیە كە بانگی بۆ دەدەم..

یەكەم نوێژی بەیانی دەبێت كە بانگی بۆ بدرێت لە مێژوودا..

هەموو ئەوانەی پێشووتر زۆر جیاوازتر دەبێت لەوەی پاشی..

یەكەم شەوی ئازادبوونم بیركەوتەوە..

هەستم كرد كە ئەم شەوە زۆر گرنگتر و مەزنترە لەو.. ئەوە شەوی ئازادبوونی من بوو بە تەنها، هەست دەكەم ئەم شەو بۆ هەمووانە، شتێك كە بۆ هەموو خەڵكی مەدینەی پێ بانگ دەكەم، شتێك كە ئازادیان دەكات، وەك چۆن من بە ڕێگەیەك لە ڕێگەكان ئازاد كرد...

نەخەوتم، هەوڵم نەدا بخەوم، شتەکان زۆر جیاواز بووبون.

هەر بە دەوری مزگەوتەکەدا دەسوڕامەوە وەک ئەوەی دەترسـام بەرەبـەیان نەیەت. دەمەویت بێت، دەمەویت دەنگم بە بەرەبەیانەوە بنوسـێت و ئـەوە بـۆ خەڵکی ئاشکرا بکات..

لەگەڵ نزیکبوونەوەی بەرەبەیاندا، ترپەی دڵم زیاتر گوێ لێدەبوو.. ترسـام کە زۆر لە دەنگی خۆم بەرزتر بێت کاتێک بانگەکە دەستپێدەکەم.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی..

کاتێکیش دەستم پێکرد، نەمدەزانی کە ئایا دڵم هاتووەتە ناو قوڕگمەوە.. یاخود قوڕگم بووە بە دڵم...

♦ ♦ ♦

From: amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

Subject: خودایەک

بیرت بێت بیلال کە من پێم گووتی من موسوڵمانێکی باش نیم.

پاشان دوای ئەوە گووتم کە هەر نابێت بە موسوڵمانم دابنێیت.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە من نیوەی ڕاستیەکەم پێ گووتیت.

من بێ باوەڕم.

یاخود بە لایەنی کەمەوە، بەو شێوەیە بووم کاتێک دەستم بەم پرۆژە کرد. من بێ باوەڕێکی سەرسەختی دەنگ بەرز بووم.

بەشێوەیەکی کەسیش کارکردن لە فیلمێکدا دەربارەی (کەسایەتیەکی ئاینی) زۆر شەرمەزارکەر بوو. شتێک لە ناخمدا پێی دەوتم کە من دووڕووم. بەڵام من پێویستم بە کارکردن بوو بۆ دانی پارەی کرێیەکان و، بە خۆمم گووت کە تەنها بە دوای ڕاستیە مێژوویەکاندا دەگەڕێم و، پەیوەندیم بە بابەتەکەوە نییە لە ڕاستیدا. هەروەها کارەکەشم بە ڕاستی لە فیلمەکەدا.

پاشان نامەکەی تۆ هات بیلال.

نامەکەت خستمیە ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ خۆمدا، زیاتر لەوەی کە لەگەڵ تۆدا بمخاتە ڕوبەڕووبونەوەوە، یاخود لەگەڵ بیلالی حەبەشییدا کە کار دەکەم لەسەر ئامادەکردنی فیلمێک لە بارەی ئەوەوە.

دەمزانی کە نابێت بێ باوەڕیەکەم دەربخەم، ئەوە زۆر قورس نەبوو، لەوەی کە حاشا لە فەرموودەیەک بکەم لە بارەی خوداوە یاخود سروشەوە یاخود باسیان بکەم بە زمانی بێ باوەڕی، وەک شتێک کە بیلال باوەڕی پێ هێناوە، بە بێ ئەوەی بچمە ناو هەڵسەنگاندن یان پەسن کردنی ئەم باوەڕە.

ئەگەر دووبارە ئەوەی نوسیومە بیخوێنیتەوە ئەوە دەزانیت کە بێ باوەڕی نوسیومە، لەوانەیە تێبینی ئەوەت نەکردبێت ئەو کاتە، بەڵام من باسی (باوەڕ)م دەکرد، هەر باوەڕێک، نەک بە دیاریکراوی باوەڕبوون بە خودا، باوەڕم وابوو هێشتاش باوەڕم هەیە کە هەر باوەڕێک دەتوانێت بەهێزترت بکات، ئەوەی کە وات لێبکات ئامانجێکت هەبێت، ئامانجی خێر یاخود شەڕ ئەوە بابەتێکی دیکەیە. باوەڕ دەتوانێت هێزێکی پۆزەتیڤانە بێت، نکۆڵیم لێنەدەکرد، وەک بێ باوەڕێک، کە ئاینەکان ئەو ڕۆژەی دەرکەوتن، کاریگەری پۆزەتیڤیان لەسەر خەڵک و ئەو کۆمەڵگەیە دروست کردووە کە تێیدا دەرکەوتووە، بەڵام ئەم کاریگەرییە پۆزەتیڤانە بەردەوام نەدەبوون و، زۆر بە دەگمەن نەدەبوونە کارریگەری نێگەتیڤ کاتێک پیاوانی ئاینی دەستیان دەگرت بەسەر ئاین و مێشکی خەڵکیدا.

کەواتە دووڕوویم نەدەکرد کاتێک لە بارەی هەموو ئەوانەوە دەمنوسی.. من تەنها ڕاستیەکانم دەگووت.

بەڵام شتێک لە ناخمدا پێی دەگووتم کە تەنها بە نەگووتنی نیوەکەی دیکەی ڕاستیەکە - نیوەکەی کە باوەڕم پێی هەیە - ئاماژەی بۆ هەبوونی کێشەیەک دەکرد لە ناخمدا بەرامبەر ئەم نیوەی دی.

شتێک لە ناخمدا پێی دەگووتم کە شەرمەزاربوون لە گووتنی ئەو ڕاستیەی باوەڕم پێیەتی بیلال، واتا ئەوەی دەگەیاند کە خودی دەروونم لە گوماندایە بەرامبەری.

بە خۆمم دەگوت چۆن بە کوڕێک دەگوترێت (خودا نییە) لە کاتێکدا خۆی لە مردندا دەبینێتەوە؟

ئەوەم زۆر زیاتر لە ئاسایی پێ ڕەقتربوو، بەڵام ئەگەر ئەوە (زۆر) بێت بۆ کوڕێکی سێزدە ساڵە، ئەدی بۆ بە هەمان شێوە نەبێت بۆ هەمووان، ئێمەش هەمووان دەمرین...

ئەو قسەیەی ئەنیشتاینم بیر دەکەوتەوە..

(ئەگەر توانای ڕوونکردنەوەیت نەبوو بۆ منداڵێکی شەش ساڵان، ئەوە تۆ بە پێی پێویست تێی نەگەشتویت)

تۆش لە شەش ساڵیتدا نیت بیلال.

ئەوە زۆر بەگومانی کردم لە تێگەیشتنم بۆ بێباوەڕی.

◆◆◆

پاشان ژیانم لەم دوادواییەدا بە گۆڕانکاریدا تێپەڕی، بێزارت ناکەم بە وردەکاریەکانی، لەوانەیە گۆڕانکاریە کەسییەکان بەسەر زۆر کەسدا ڕووبدەن و، بە شێوەیەکی ئاسایی و ڕۆتینیش، بەڵام بۆ من وای لێکردم زیاتر و زیاتر لە بابەتەکە تێفکرێم، لەوانەیە بابەتی بیلالی حەبەشی دەستێکی باڵای هەبووبێت لەوەدا..

ڕێک بە تایبەتیش وشەکانی بانگدان بۆ نوێژ.

وەک پێشتر وام پیشاندا بابەتەکەم دوانەخستبوو. من لێی ڕامدەکرد. لەگەڵ وشەکانی بانگدان بۆ نوێژ، کە بیلال هاواری پێدەکرد، ئەوەش کە باوکت بە گوێیدا چرپاندوویت ئەو ڕۆژەی کە لە دایک بوویت، هیچ بۆشایی نەماوەتەوە بۆ باوەڕ نەبوون. هیچ بۆشاییەک نەماوەتەوە ئەوە نەبێت کە ڕاستگۆ و ڕوون بم. هیچ بۆشاییەک نەماوەتەوە تەنها ئەوە نەبێت هەڵوێستی خۆم دەربڕم لە بارەیەوە، لە بارەی خودا.

زانیم کە من بێباوەڕیکی ڕاستەقینە نیمە، خەریک بووم نزیک دەکەوتمەوە، لە ڕاستییەکەم لەوەی کە دڵنیا نەبم لە هیچ شتێک. نازانم. ئەوەش قورستر بوو لە بێ باوەڕی. بێ باوەڕی و باوەڕداری بە لایەنی کەمەوە لە یەک شتدا لە یەک دەچن. ئەوەیە کە هەڵوێستەیان دیاری کردووە. بەڵێ یاخود نەخێر. ئەم (نازانم)ە زۆر زۆر قورسە.

بەرەبەرە قایل بووم بەوەی کە بێ باوەڕییەکەی من، لەوانەیە وەک زۆرێک لە بێ باوەڕەکان، بە تەواوی ڕاستەقینە نەبێت، لەوانەیە ڕەتکردنەوەی خودای تێدا بیت وەک ئەوەی ئاینەکان دەریانخستووە، لەوانەیە ئەم ڕەتکردنەوەیە دیار و ئاشکرا بێت و هێشتاش قایل بم پێی، بەڵام ئەمە بێ باوەڕی ناکاتە جێگرەوە.

بەسادەیی بێ باوەڕی جێگرەوەی خودامان پێشکەش ناکات کە ڕەتمان کردووەتەوە. ئەوەمان پێشکەش ناکات کە چۆن چیرۆکەکە دەستی پێکردووە.

زۆرینەی بێ باوەڕەکان، بە منیشەوە، دەچنە نێو وردەکاری چیرۆکەکەوە، بیردۆزی پەرەسەندن و بەرزبوونەوە بایۆلۆجیا و تەقینەوە مەزنەکە، بەڵام هەموومان لە لێوارەکەیدا وەستاوین، هیچ هەوڵ نادەین کە بێژین یاخود تەنانەت بیشپرسین، چۆن چیرۆکەکە دەستی پێکردووە؟

هەموومان لەو پرسیارە هەڵدێین، پشتگوێی دەخەین. بەسادەیی هۆکارەکەی ئەوەیە کە بێ باوەڕی هیچ شتێک ناخاتە ڕوو لەو بارەیەوە.

وەلێ لە هەندێ ساتی دیاریکراوی ژیانماندا، لە ئاستە گوازراوە تایبەتەکاندا، ئەو پرسیارە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە کە لێی هەڵدەهاتین، دەبینین کە هەڵاتن لێی چەندان قۆرت و بۆشایی لە ژیانماندا بەجێ هێشتووە، ئەم بۆشاییانەش، وەک بۆشایی و چاڵ و چۆڵیەکە لە باڵەخانەیەکدا کە ئاو دزەی کردووەتە ژوورەوە بۆ ناویەوە، بەرەبەرەش ئەو دزەکردنە باڵەخانەکەی بە داڕوخان داڕوخاندووە.

هیچ پێشبینیم نەدەکرد کە شتەکە یەکلایی ببێتەوە، بە لایەنی کەمەوە بەشێکی یەکلای بێتەوە، ئەویش لە ڕێگەی تۆوە بیلال.

بە تەواویش لەو گەشتەدا کە لەگەڵ تۆ بەسەرم برد لە ئۆکیدیل.

ئـەو ڕۆژە، لـە ڕێگـەی گەڕانـەوەدا، تـۆ شـتێکت نوسـی لەسـەر بـاوک و نمونەی وەک نمونـەی خـودا، هـەر دەبێـت هـەبێت تەنانـەت ئەگـەر نـەیبینیت یاخود هەموو کات لە ژیانماندا بوونی نەبێت یاخود خۆشمان نەویستبێت.

ئـەو ڕسـتەیەت، وەک ئـەو بـەردە وایـە کـە بۆشـایی و قۆرتەکـەی پـڕ کردووەتەوە.

هەر دەبێت هەبێت. وەک باوک. نوقتە کۆتایی.

لەوانەیە نەک وەک ئەوەی ئاینە ئاسمانیەکان دەیخەنە پـێش، یـاخود وەک ئەوەی تێگەیشتووین.. یاخود بەو شێوەیەی پیاوە ئاینەکان پیشانیان داوە.

بەڵام ئەو بوونی هەیە..

ئێستا دەتوانم لە بارەی بانگدانی نوێژەوە بۆت بدوێم.

ئەوەی کە باوکت بە گوێیدا چرپاندوویت.

♦ ♦ ♦

وشەکان بە دەربڕینی "اللّٰه اکبر" دەست پێدەکات..

دەربڕینەکـە لـەم ڕۆژەدا موسـوڵمانەکان بـە هۆکـار و بـێ هۆکـار بەکاریدەهێنن، زۆربەی جاریش بێ هۆکـار.. ڕاگەیانـدنیش زۆر بەکاریـدەهێنێت لە گاڵتەپێکردنی ستریۆتایپی موسوڵمانەکان..

بەڵام پێویستە ئـەوە لـە بیـر بکـەین، ئێمـە لەگـەڵ ئـەو وشـانەدا مامەڵـە دەکـەین کـە بیلالـی کـوڕی ڕەبـاحی حەبەشـی دەری بڕیـوە و، سـەعید لـە گوێیەکانـدا گوتویـەتی ئـەو ڕۆژەی لـە دایـک بوویـت، پەیوەنـدیمان نییـە بـە سـتریۆ تـایپی بەیەکـداچوو، ئێمـە هەوڵـدەدەین مامـەڵـە لەگـەڵ وشـە ڕاسـتەقینەکە و واتاکانیـدا بکـەین، پێویسـتە ئـەوە بکـەم نـەک وەک تـەنها ئەکادیمیەکی بابەتی زانستی، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئێمە باس لە مـاوەی پـێش ئەم ستریۆتایپە دەکەین، باس لە ماوەی بیلالی حەبەشی دەکەین.

هەموو شتێک لێگەڕێ و بیلالی حەبەشی بهێنە پێش چاوت، دەنگێکی خۆشی گەرم و گوڕ، بەرز دەبێتەوە، لە نێوەندی تاریکی شەودا، بۆ ئەوەی دەستپێکی نوێژی بەرەبەیان ئاشکرا بکات..

بیهێنە پێش چاوت کە مەدینە نوستووە، دەنگێکی گەرم و گوڕ هەڵیدەستێنێت بۆ ئەوەی ئەو وشانە بڵێت.

◆◆◆

اللّٰه اکبر..

اکبر لێرەدا واتای گەورەترین لە قەبارەدا دێت، بە مانای مەزنترینیش دێت، هەروەها گرنگترینیش.

هەموو (واتاکانیش) گرنگن..

گەورەترین لە قەبارەدا بە مانا ڕاستەوخۆکەی نا، لەبەر ئەوەی موسوڵمانەکان باوەڕیان بە خودای دەستلێدراو نییە، بەڵام باسکردنی اکبر لێرەدا بە واتای (گرنگترین) دێت، کاریگەرترین.. ئەو گەورەترە لە هەموو ئەو شتانەی کە قەبارەیان هەیە، ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەبەستێتەوە و، دەیپەرستیت..

اللّٰە اکبر، لەبەر ئەوەی ئەو گەورەترە لە هەموو ئەو شتە ماددی (بینراو)انەی کە مرۆڤ خوی پێوە دەگرێت، گەورەتر لە پارە، لە خۆشەویست، لە منداڵ، لە ویستە کەسییەکان، لە هەموو شتێک.

بانگەکە بەمە دەست پێدەکات، لەبەر ئەوەی ئەوە دەردەخات کە گەورەتر و گرنگتر لە هەموو ئەوەی گەورە و گرنگە لە ژیانی خەڵکیدا، ئەو بنەمایانەیە کە ئەو خودایە وێنای دەکات، بنەماکان نەبینراون، بەڵام زۆر گرنگن لە ژیانی خەڵکیدا، هەر بەو شێوەیەش خودا نەبینراوە، ئەو گەورەترینە - بە بێ نەبینراویەکەی - گەورەتر لە هەموو شتێکی بینراو لەوەی کە خەڵک بە دوایەوەیەتی ...

"اللّـه اكبـر" بيـرت بێـت کـه بـەوە نییـە هـەموو کـات ئـەوەی دەیبینـی گەورەترین یاخود بالآترین یاخود درێژترینه.. یاخود هـەر شـتێک کـه لـه نێـو بازنەی قەبارەی مەتریدایه..

♦♦♦

پاشان ئەو دەربڕینه دێت که وای لێکردم ماوەیەکی درێژ دودڵ بم.

شایەتومان.

بانگی نوێژ شایەتومان دەڵێت، ئەوەش بۆ موسـوڵمانەکان ، کلیلـی چونـه نـاو ئیسـلامه. شـایەتوومان دوو بەشـه، دانەیـەک تایبـەت بـه خـودا، ئـەوەی دیکەش پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت).

یەکەم ئەمەیه "اشهد ان لا اله الا اللّٰه".

ئەو رستەیەش بە کارپێکەری تێوەت دەگلێنیت لـەوەی ببیتـه بەشـێک لـه بابەتەکه.

ئەوەی ببیته (شایەتحاڵێک) لەسەر شتێک که ناتوانرێت به چاو ببینرێت!

شایەتێکی به چاو بینراو، دوو جار.

یەک جاریان شایەتی دانی نەفی. جارێکیش شایەتیدانی سەلماندن.

هەردوو شـەهادەتەکەش، نـەفی و سـەلماندن، هـەردووک تەواوکـەرن. وەک ئەوەی گەشتەکەی من تەواو کامڵ بوو، له بێ باوەڕیـەوە، بـۆ گومـان، ئـەوجا بۆ باوەرهێنان به هەبوونی خودا.

بێگومان ئەوە زۆر ئاسان نییه، ئەوە جۆرێک لـه گـەڕان لـه خـۆ دەگرێـت، پێویسته بگەرێیت، به خـۆت دڵنیـا ببیتـەوە، دەبیـت خـۆت شـایەت بیـت بـۆ ئەوەی شایەتیەکی ساخته نەبێت.

ئاسان نییه که بڵێیت شایەتی لەسەر شتێک دەدەیت که نەتدیوه.

بەڵام ئەمە ڕینوێنیت دەکات بۆ بیرکردنەوە، بۆ گەڕان، تاوەکو خاترجەم دەبیت لە هەبوونی ئەم خودا تاک و تاقانەیە.

◆◆◆

ئایا ئەمە ئەوەیە کە موسوڵمانەکان بیری لێدەکەنەوە کاتێک شایەتومان دەڵێن؟

بە داخەوە وا پێشبینی ناکەم. ئەگەر بەو شێوەیە بوایە ئەوە بارودۆخیان نەدەگەیشتە ئێرە. بەڵام ئێمە باسی واتای وشەکان دەکەین کە بۆ یەکەمجار گووتراوە، کاتێک تازە و نفت بووە، کاتێک کە لە دایک بووە...

ئایا کلتورەکە وا هاتووە کە پێویستە ئەو وشانە لە گوێی ساوای تازە لە دایک بوو بخوێندرێت تاوەکو ئەویش هەموو کات بیخوێنیت وەک یەکەم جار؟ وەک ئەوەی یەکەم جار لە دایک بوبێت.

نازانم. بەڵام هەست بە موچورکە دەکەم کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە. لە ئەمڕۆدا بە بێ بیرکردنەوە دەگوترێت، زۆربەی کات بە عەرەبی دەگوترێت تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەشی دەیبێژێت عەرەبی نەزانێت یاخود واتای ئەوە نەزانیت کە دەیڵێت. وا مامەڵەشی لەگەڵ دەکرێت کە هاتووەتە ناو ئیسلامەوە تەنها بەوەی چەند دەنگێک لە قورگ و دەنگە ژێیەکانی ئەو کەسەوە دێتە دەرێ.

◆◆◆

بەلام شایەتوومان، کاتێک بۆ یەکەم جار بوو، شایەتوومانێکی ڕاستەقینە بوو، لە دوای ململانێیەکی درێژەوە ڕوودەدات لەگەڵ خود و کۆمەڵگادا کە لە سەرەتاوە ئەم شایەتوومانەی پێ پەسەند نەبووە بەڵکو بگرە زۆر بە توندیش ڕەتی کردووەتەوە و ڕووبەڕووی بووەتەوە، وەک ئەوەی لە ئەشکەنجەدانەکەی بیلال دیتمان کە وەری گرت.

شـايەتوومانەکەی ئـەو، هۆکارێـک بـوو بـۆ ئـەوەی تـاوانی ئەشـکەنجەدان دەرهەق بەو ئەنجام بدرێت.

شایەتوومانەکەی، لەو کاتەدا، خـاوەنی نرخێـکی زۆر زۆر بـوو، بـەڵام هـەر شایەتومانیان دەهێنا.

◆◆◆

زۆرم لە خۆم پرسی کاتێک ئەم وشانەم بۆت نوسی..

ئایا ئەم ئاینە نوێیە نەیدەتوانی بـە شـێوەیەک یەکتاپەرەسـتی دەرببڕێـت بە ڕێگەیەک نەبێتە جێی هێرش و پلارتێگرتن؟

بە واتـای: عـەرەب زۆر باوەڕیـان بـە بـت و خوداوەنـدەکان هـەبوو، ئـەوان نکـۆڵی بـوونی خودایـان نـەدەکرد، خـودای ئیبـراهیم، بـەڵام لـە تەکیشـیدا باوەڕیان بە خودای دیکە هەبوو..

ئایا ئەم ئاینە نەیدەتوانی سەرنج بخاتە سەر پەرەستنی خودای تاقانـە و، لـە دڵ و دەروونـی شـوێنکەوتووەکانی بیچەسـپێنێت و، لـە هـەمان کاتیشـدا سومبولەکەی و کلیلی چوونە ژوورەوەکەی کەمتر توند بکردایە؟ ئایا نـەدەکرا بە لایەنی کەمەوە ئەم کلیلە ڕووبەڕوی بتەکان نەوەستێتەوە؟

پاشان تێگەیشتم.

بابەتەکە تەنها لەسەر بت و پەیکەرە روون و ئاشکراکان نەبوو.

بەڵکو بگرە لە بارەی بتەکانی دیکەشـەوە بـوو. ئـەو بتانـەی کـە بـە چـاو نابینرێن.

ئەو بتانەی کە لە ناخدان. ئەو بتانەی کە نازانین بتن. بەڵکو وا مامەڵـەی لەگـەڵ دەکـەین کـە بەشـێک بێـت لـە خۆمـان. بـۆ وێنـا هەسـت و سـۆزە تایبەتیـەکانمان بەرامبـەر کەسـێک، لەوانەیـە ویسـتەکانمان، لەوانەیـە قـەرزەکانمـان، کرێـی خـانوو، لەوانەیـە ئۆتـۆمبێلی نـوێ، یـاخود لەوانەیـە کێبڕکێمان لەگەڵ خێزانی کاک جۆنز دا.

هیچ بۆشاییەک بۆ مشتومرکردن لەگەڵ ئەم بتانە نەماوەتەوە. لەبەر ئەوەی مشتومڕی لەگەڵدا ناکرێت، کاتێک بۆشاییەک دەدۆزیتەوە، ئەوە بزانە دەتوانیت.

هەستم بە موچورکە کرد ئەو ڕۆژەی گەیشتم بەمە.

♦♦♦

ئەم وشانە، بۆ ئەمڕۆ زۆر ڕاستەقینە دەردەکەون، زۆر زیاتر لەو کاتە.

ئەو کاتە لەوانەیە ملکەچبوون ئاسانتر بوبێت. لەبەر ئەوەی ئەو بتانە ئاشکرا بوون، ململانێش لەگەڵیاندا دەرەکی بووە.

بەڵام ئەوڕۆ: پێویستی بە دانیشتنە لەتەک خود و دەرووندا، لە ڕووبەڕوبونەوەی ئەو بتانەدا، هیچ (دۆبلۆماسیەتێک) بە پاساو ناهێنرێتەوە.

بە هەر حاڵ دیبلۆماسیەت ڕووی نەدا.

♦♦♦

هەروەها ئەم شایەتوومانە ڕووبەڕوی بیرۆکەی "خودا نیە" دەبێتەوە.

کاتێک بێ باوەڕ بووم ، هەر وەک ئەوانی دی، کە مشتومڕمان لەگەڵ باوەڕداران بە خودا دەکرد، دەمگووت: کە هیچ بەڵگەیەکی (زانستی) نییە لە بارەی هەبوونی خوداوە.

زۆربەی جار مەبەستمان بەڵگەی ماددی بوو، بەڵگەیەک کە بە چاوی سەر ببینرێت، یاخود چوبێتە نێو تاقیکردنەوەیەکی زانستی ڕاستەوخۆ.

دەکرا سومبولی و کلیلی ئیسلام، شایەتوومان نەبێت، لەبەر ئەوەی دیتن هەرگیز جێبەجێ نابێت، موسوڵمانەکانیش باش ئاگاداری ئەو بوون.

بەڵام ئەو شایەتیدانێکی جیاوازە، شایەتییەک لە جۆرێکی دیکە.

ئەوەیە کە بە زیاتر لە چاوت ببینیت، با بڵێین... بە بینایت ببینیت..

ئەوەیە کە ئەوەی دەیبینیت لە پێشت بەستیتەوە، تاوەکو دەگەیتە ئەوەی نایبینیت، بەڵام هەست بە هەبوونی دەکەیت.

ئەوە وەک خۆشەویستی دایکتە بۆ تۆ، یاخود ویست و ئارەزووت بۆ ناسینی باوکت، ئەو شتانە نایانبینیت، بەڵام خاترجەمیت لە هەبوونیان.

♦ ♦ ♦

شایەتیدانی دووەم، تایبەتە بە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) موحەمەد..

با ڕاستگۆ بدوێم لەگەڵت، زۆر ڕۆنەچووم لە ناو ئەو شایەتیدانەیاندا، تا ئێستاکە نا بە هەر حاڵ.

من هەمو دەردم دڵنیابوونەوە بوو لە هەبوونی خودا، بابەتی ئەوەی کە نێردراو ڕاسپاردە و کتێب دەنێرێت شتێکی دیکە، هێشتا لێیم نەکۆڵیوەتەوە.

هەموو ئەوەی کە دەتوانم لێرەدا بیڵێم، مێژووییانە، ئەوەیە کە بێ شک و گومان لە پیاوە مەزنەکانی مێژوو بووە و، ئوممەتێکی لە هیچەوە دروست کرد و، توانی کە کاریگەری لە ژیانی زۆرینەیەکدا هەبوویت، تەنەها بۆ زانیاریت ئەوەیە کە هەموو شتیک لە دوای تەمەنی چلساڵیەوە دەستی پێکرد و، توانی دەوڵەتێکی مەزن بنیات بنێت لە ماوەی ٢٣ ساڵدا، ئەمە تەنها بەسە بۆ ئەوەی بزانیت کە چ جۆرە پیاوێک بووە.

بێگومان ڕاگەیاندن ئێستا سەرنجی دەخاتە سەر هەندێ بابەتی درۆ و هەندێکیشیان سروشتی بوونە لە بوارە مێژووی و شوێنەواریەکەیدا.

بەڵام ئەو پیاوە بە دڵنیاییەوە، کارێزمایەکی مەزن بووە کە مێژووی گۆڕی.

ئەوە هەموو شتێکە کە دەتوانم لە بارەیەوە بیڵێم.

وشەکانی دیکەی بانگەکە (حی على الصلاة، حی على الفلاح) ە.

بانگدانیش لێرەدا، لەفزێکی تیدایە کە بانگ بۆ ژیانەوە دەدات، بۆ ژیان، نەک تەنها هاتن بۆ نوێژ، بانگەکە دەتوانرا هەموو جۆرێکی بانگدان لە خۆ بگرێت، لە زوبانی عەرەبیشدا دەربڕین و لەفزەکان زۆر زۆرن، بەڵام ئەم دەربڕینەی ئێستا بەستراوە بە ژیانەوە، بە ژیانەوە، وەک ئەوەی چوستی و ژیانەوە ببەستێتەوە بە نوێژەوە.

هەر ئەمە نا، بەڵکو وشەی الفلاح، کە واتای بردنەوە و ڕزگاربوون دەدات، ئەویش دەبەسترێتەوە بە جوتیاریەوە، شەق کردنی زەوی، ئامادەکردنی بۆ چاندن، بە دەربڕینێکی دیکەش : بە کارکردن.

هەردووکیان پیکەوە بەستراون لێرەدا: نوێژ و کار.

وەک ئەوەی نوێژ هێز و ورە و ئیرادەیان بداتێ لە کارەکەی دوای ئەودا.

هەرکەسێک کە لە عەرەب ڕابمێنێت، پێش و پاش ئیسلام، بە بێ بەستنەوەی هەردوو بابەتەکە پێکەوە لێی تێپەڕ نابێت.

ئەوان بە ڕیژەیەک تەوەزەل بوون کە کاری دەستییان ڕیسوا دەکرد، کشتوکاڵ کارێکی سوک بوو، ئاسنگەری ڕیسوا کراو بوو، هەموو کارێکی دەست هێندە گاڵتەپێکراو بوو کە نەیاندەهێشت کوڕەکانیان کچی کەسێک بهێن و هاوسەرگیری لەگەڵ بکەن کە کاری دەستی بکات. شوانی کاری دڵخوازیان بوو، مەڕ و ماڵات و وشتەرەکانت بەرەڵا دەکەیت و، خۆت لێی دەخەوی.

بەڵام هەموو شتێک لە دوای ئیسلامەوە گۆڕا.

پێشبینش ناکەم کە نوێژ دووربوبێت لەم گۆڕانکاریەوە.

◆ ◆ ◆

دەترسێم زۆر وەڕسکەر بوبێتم لەم نامەیەدا.. پیشەکەم وەک وانەبێژێک هەندێ کات بەسەرمدا زاڵ دەبێت!

بەڵام ئەوە ئەو وشانەیە کە بیلال دەیگووت لە بانگدان بۆ نوێژدا.

ئەوە ئەو وشانەیە کە باوکت بە گوێتدا چرپاندویەوتی.

◆ ◆ ◆

## نامەی بیلال بۆ خودا - بەشی یەکەم ( تێنوس )

ئازیزم خودایە

نازانم چۆن بتدوێنم، بەڵام دڵنیام لەوەی کە زۆر گرنگی بە فەرمیبوون نادەیت، بە لایەنی کەمەوە بەو شێوەیە نا کە ئێمە پێشبینی دەکەین، هەر هیچ نەبێت ئەو هەموو فەرمی بوونە بۆ تۆ هیچ ناگەیەنێت.

لەوانەیە کارەکە زۆر ئاسان بوایە ئەگەر پێگەیەکت هەبووایە بۆ نمونە لە فەیسبووک یاخود هەژمارێک لە تویتەر، وەلێ، لە دوای هەموو شتێکەوە، هەموو ڕۆژێک ملیۆنان نامە لە ناو بەریدەکەتدا دەبوو. پێم وابێت ئێستاش بە جۆرێک لە جۆرەکان هەر هەیە، ئەگەر تەنانەت بە بێ فەیسبووک و تویتەریش بیت.

ئەم ڕۆژانە زۆر لە فکرت دام. زیاتر لە هەموو کاتێکی ژیانم. ئەمە لە نیشانەکانی مردن و نزیکبوونەوەیەتی؟ لەوانەیە، بەڵام من بە پێچەوانەوە بیری لێدەکەمەوە، بیرکردنەوەم لە تۆ یەکیکە لە نیشانەکانی ژیان. نیشانەی بەرگریکردنم لە مردن. بەم شێوەیە هەست دەکەم.

لەوانەیە بابەتی بیلالی حەبەشی و وشەکانی کە باوکم بە گوێمدا چرپاندوویەتی وای لێکردبم کە ئەم ڕۆژانە بیر لە تۆ بکەمەوە. لەوانەیە پەیڤەکان بەرێگەیەک لە ڕێگەکان لە نەستمدا مابێتەوە، وەک شتێکی بۆمبڕێژکراو و، ئێستا تەقیبێتەوە.

ئەمە تەنها پێکچونێکی مەجازیە بێگومان، تۆ خۆت ئەوە دەزانیت.

هەروەها دەشڵێن کە تۆ لە کۆتایدا تەنها پێکچونێکی مەجازیت. بەڵام من پێم وانییە وابێت. پێکچونە مەجازیەکان ناتوانن ئەم جیهانە دروست بکەن. هەر بە لایەنی کەمەوە ناتوانن ئەوە دەست پێبکەن. لەوانەیە پێکچوونە مەجازیەکان بتوانن لە بارەی تۆوە دەرببڕن. بەڵام تۆ پێکچونێکی مەجازی نیت. تۆ خودایت.

وای دادەنێم کە تۆ هەموو شتێک بیردێتەوە، لە بارەی هەر یەکێک لە ئێمەوە، هەر بۆیە بە زۆری لە یادت دایە کە من هەموو کات خۆزگەی مردنم خواستووە. تاوەکو قوتارم بێت لە ئازارەکانی قوتابخانە.

باشە. تۆ خواستەکەم دێنیتە دی، بە ڕێگایەک (لە هەموو شتێکدا نا، بیرم دێت کاتێک کە منداڵ بووم داوام لێکردیت کە لووتم یەک تۆز بچوکتر بێت، بەڵام ئێستا زۆر گەورەیە! زۆر گەورەتر لەوەی ئەو کاتە کە داوایەکەم لێکردیت!.. بەڵام ئێستا دەزانم کە ئەوە داخوازیەکی هەر زۆر گەمژانەیە).

بەڵام من ڕێک بەو شێوەیە مەبەستم نەبوو. واتا بەم ڕێگە خاو و بە ئازارە.

بە هەر حاڵ، سوپاس بۆ وەڵامدانەوەی پاڕانەوەکەم. هەروەها ئارەزووش دەکەم ئەوەی کە ماوە کەمتر بە ئازار بێت لەوەی کە ڕۆشتووە، بە ئەرک نەبێت.

هەروەها ئارەزوو دەکەم کە ئەمە لەسەر دایکم سووک بکەیت. ئەو زۆر زیاتر لە من ئازار دەچێژێت.

زۆر حەزم دەکرد پرسیارت لێبکەم: بۆچی شێرچەنجەت دروست کرد؟

بۆ هیشتت باوکم بڕوات. بێگومان دەتتوانی بیهێلیتەوە، وانیە؟

بۆ دەهێڵیت باوکەکان بڕۆن؟

هەروەها ئارەزووشم بو کە لێت بپرسم: بۆچی جۆن و مایکت بەم شێوەیە خراپ دروست کرد؟

بەڵام، لەوانەیە هەر ئەو پرسیارەم بە شێوەیەکی هەڵە کردبێت.. لەوانەیە تۆ شتەکان بەو شێوەیە ڕێک نەخستبێت، بەڵام هەڵبژاردەت جێهێشتبێت بۆ ڕوودان، لەوانەیە هەبوونی شتە خراپەکان لە جیهاندا هەلێک بوبێت بۆمان تاوەکو خۆمان تاقیبکەینەوە، بۆ ئەوەی نرخ و بەهای شتەکانی دی بزانین، باشەکان، جوانەکان..

حەز دەکەم زیاتر بتناسم. مادام من لە ڕێگەدام بۆ لای تۆ (ئایا ئەمە لێکچواندنێکی مەجازیە یاخود ڕاستەقینەیەکی پڕاو پڕە؟).

تۆ هەموو شتێک لە بارەی منەوە دەزانیت، بەڵام من دەمەوێت زیاتر بتناسم.

هیوادارم ئەو کاتەی کە ماوە ڕێگەی زیاتر ناسینتم بدات.

لەگەڵ ڕێزی

بیلال

تێبینی ١: دەمەوێت فیلمەکەی بیلال سەرکەوتنێکی بێ کۆتا بەدەست بێنێت. بێگومان خۆت دەزانی بۆچی.

تێبینی ٢: حەزم دەکرد لێت بپرسم کە ئایا بە ڕاستی بوونت هەیە، چونکە هەندێک دەڵێن کە تۆ لەوێ یان لە هیچ شوێنێکی دیکە نیت، بەڵام ئەوە پرسیارێکی گەمژانەیە، چونکە من لە خۆت ئەپرسم!

♦♦♦

## لاتیشا

بیلال له پرێکدا و له دوای بێدەنگی گووتی " ڕازەکەی بیلال ".

ئێمه خەریکبووین به دوای ناوێکدا دەگەڕاین بۆ ئەو یاداشته تاوەکو ئەو نوسینانەی بیلالیان تێدا دابنێین. بیلال دیزاینەکەی هەڵبژارد له ناو ئەو بژاردانەی که هەیه و، هەندێک گۆڕانکاری تێدا کرد و، هەندێک زانیاریشی تێدا دانا، من هەندێک وێنەی جیاوازم دانا له ئاسته جیاوازەکانی تەمەنیدا، هەستم به ئازارێکی زۆر دەکرد وەک ئەوە وابووم ئازارەکانم ڕووماڵ بکەم له بەرامبەر خەڵکیدا. وەک ئەوەی کۆتا وشەکانی خۆم بڵێم له پرسەی به خاک سپاردنەکەیدا، بەڵام پێش ئەوەی بمرێت.

من هەندێک سەربابەت و ناونیشانم پێشنیار کرد بەڵام بیلال به دڵی نەبوو، پێشنیاری" ڕۆژانەی پەپولەیەکی ڕەش "م کرد گووتی ئەوە زۆر (کچانه)یه، زۆریش لەسەر هەق بوو، هەروەها پێشنیاری " ناوم بیلاله" م کرد، بەڵام شانی به بێگرنگیەوە هەڵتەکاند.

بێدەنگ بووم، وا دەردەکەوت که بڕیاری ناوێکی دیکەی دابێت و ئێستا کاتی ئەوەیە ڕایبگەیەنێت، پاشان گووتی " جفرەکەی بیلال ".

ناونیشانەکەم زۆر پێ جوان بوو، له هەمان کاتدا سەرنجڕاکێش و ناڕوون دەردەکەوت.

لێم پرسی: مەبەستت چییە له جفره لێرەدا؟

گووتی: دەکرێت زیاتر له یەک واتای هەبێت، لەوانەیە ئەو جفرەی جینه بێت که بووەته هۆی ئەو شێرپەنجەیەی توشی بوومه. ئەی هەر شێرپەنجەیەک جفرەیەکی جینی نییە؟

لەوانەشه ئەو جفرەیە بێت که وامان لێدەکات بەرگەی شێرپەنجه بگرین، وامان لێدەکات دەست بگرین به ژیانەوە سەرەڕای ئەوەی که دەزانین له جەنگەکەدا دۆڕاوین و شکست دەهێنین.

لەوانەیە هەر جفرەیەکی دیکە بێت، لە ناخماندا هەڵمانگرتووە و، ئارەزووی ئەوەمان نییە دەری بخەین".

لێی رامام. هەر بە ڕاستی ئەمە منداڵەکەی منە؟ ئەوەندە گەورە بووە بە خێرایی تاوەکو ئەو قسە پێگەیشتووانە بکات؟ ئایا شێرپەنجە بەو شێوەیە گەورەی کردووە؟ ئایا بە خێرایی گەورە دەبێت بۆ ئەوەی بە خێرایی بڕوات. هەستەکەم زۆر لە جاران هیلاکترە، سکاڵای لە هیچ شتیک نەدەکرد. بەڵام من هەستی پیدەکەم. زیاتر لە جارێک تیبینیم کردووە کە ڕێوڕۆشتنی هاوسەنگ نییە و، زۆر زیاتر و زیاتر دەخەوێت، هەندێک جاریش کە لەسەر نان خواردندایە، هەموو ئەمانە لە لیستی نیشانەکانی نەخۆشیەکەدا هەبوو، دەکرا زووتر دەرکەوێت، بەڵام ئەوە ئێستا دەردەکەوێت. بیلال لە دەستم دەچێت.

جفرەکەی بیلال..

هەستم کرد کە زۆر زیاتری پێیە بۆ ئەوەی بیڵێت لە بارەی (جفرەکەی بیلالەوە)... شتێک هەیە لە ناخیدا، لە خاڵێکدایە کە نایهەوێت باسی لێوە بکات.

گووتم: باشە با وابێت.. کەواتە (جفرەکەی بیلال)!

◆ ◆ ◆

پەیوەندییان پێوە کردم لە قوتابخانەکەی بیلالەوە تاوکو پێم بڵێن کە بیلال توشی گەشکە هاتووە و گوازراوەتەوە بۆ نەخۆشخانە.

کاتێک گەیشتم، ئەو باش بووبوو.بە ئارامی خەوتبوو، ئەگەر ئەو برینە و شوێن دورینەوەیە نەبوایە لەسەر ڕوخساری ئەوە هەستم بە ڕودانی هیچ شتێک نەدەکرد، بەڵام ئەو مامۆستایەی کە هاوەڵی کردبوو لەگەڵیدا لە ناو ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنەکە پێی گووتم کە ئەویای شکابوو..

ئەوە یەکەم جاری بوو توشی گەشکە ببێت لە قوتابخانە. بەڵکو بگرە لە هەر شوێنێکی گشتیدا. ئەوە زۆر قورستر بوو بۆی لە گەشکەکە خۆی وەک ئەوەی دەردەکەوت.

بڕیاری بەردەوام بوون لە قوتابخانە بڕیاری ئەو بوو، بەڵام من پێی ئاسوودە و دڵئارام بووم...

لەوانەیە هەر یەکێکی دیکە بێژێت: ئامانج لەوە چییە؟ بەڵام من پێم وابوو، هەروەها ئەویش ، کارەکە بە بێ بوونی قوتابخانە زۆر قورستر دەبوو.

وابزانم ئیدی خەریکە ئەویش قورس دەبێت.

گەشکەکەی لە ناو پۆلدا لێ هاتبوو، وەک ئەوەی دەردەکەوێت لە هیچیش بێزار و دڵتەنگ نەبوو، هەروەها هیچ هەستی بە نیشانەکانی نەکردبوو، چونکە زۆربەی کات هەستی بە هاتنی دەکرد بەڵام ئەم جارەیان لە پڕێکدا هاتبوو، یان هەر بەو شێوەیە گووتی.

وەک ئەوەی مامۆستاکە باسی کرد دیارە کە گەشکەکە زۆر بەهێز بووە، بە زەویدا خستوویەتی و چاوێلکەکەی شکاندووە و برینێکیش لە ڕوخساریدا دروست بووە، دەشێت بە هۆی چاوێلکەکە بووبێت، هەروەها هەوڵیشیدا بە ڕێگەیەکی شیاو بە ئەدەبەوە تێم بگەیەنێت کە بارودۆخەکە تۆقین و ترسناکییەکی زۆری توشی منداڵەکانی پۆل کردووە.

کاتێک گەشکەکەش تەواو بووە بە خۆیدا ڕشاوەتەوە و هەر لەسەر زەوی کەوتووە.

کاتێک چاوەکانی کردەوە منی دیتەوە لە بەرامبەریدا، کەمێک لە بنمیچەکە ڕاما وەک ئەوەی هەوڵبدات ئەوەی کە بەسەریدا هاتووە بهێنێتەوە یاد.

بە زەردەخەنەیەک توشی سەرسوڕمانی کردم و گووتی: خۆم هەر دەمهەویست دانەیەکی نوێم بۆ بکڕیت بە هەر حاڵ.

پێم گووت: چی؟

گووتی: چاوێلکە.

ئەوجا چاوەکانی داخست.

هەروەها لە ڕۆژی دواتریشدا دوبارە توشی سەرسوڕمانی کردم کاتێک سوور بوو لەسەر ڕۆیشتن بۆ قوتابخانە.

بەڵام من کەیفخۆش بووم بە بڕیارەکەی.

پەپولەکەم دەستی کردووە بە فڕین بە باڵە بەهێزەکانی.

◆ ◆ ◆

کاتێک لە نەخۆشخانە بووم لەگەڵ بیلال، نەمدەزانی کە چ کێشەیەک ڕوویداوە لە دوای ئەوەی بە ڕاکردن لێی ڕۆشتم.

ماگی نەیوستبوو پێم بڵێت – لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە بە پێی پێویستم چەشتبوو لەو ڕۆژەدا –، پەیوەندی کرد تەنها بۆ ئەوەی لە هەواڵی بیلال بپرسێت و، پرسیاری لێکردم – بە شێوەیەک کە زۆر ئاسای دەردەکەوت – کە ئایا بۆ ڕۆژی دواتر دێمەوە بۆ قوتابخانە، منیش گووتم کە ئەگەری زۆرە بێم.

لە یەکەم ساتەوە کە چوومە ناو قوتابخانە ڕوخسارەکان جیاواز دەردەکەوتن، هەستم کرد کە شتێکی زۆر گەورە ڕوویداوە.

بە ڕێگەیەکیش هەستم کرد کە من تاوانبارکراوم لەم کێشە گەورەیەدا.

شتێک لە نێو چاوەکاندا ئەوەی پێ دەگووتم.

ماگی بە خێرایی هات: لاتیشا، مستەر وید بانگت دەکات، نەمویست ئەوەی دوێنێ کە ڕوویداوە پێت ڕابگەیەنم، هیچت بۆ نەدەکرا، ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا و تۆش ڕۆژەکەت بە پێی پێویست قورس بوو.

من هەوڵمدەدا کە ئەو بێنمە پێش چاوی خۆم کە چی ڕوویداوە: کەواتە ئێستا پێم بڵێ ماغی، چی ڕوویداوە؟

هێشتا هەناسە بڕکێی بوو گووتی: بۆبی و جاک لە هۆڵی نانخواردندا شەڕیان کردووە، بۆبی لە ڕوخساری جاکی داوە، ئەو مەچەکە ئاسنینەی کە لەبەریدا بووە بووتە هۆی پێکانی چاوی..

بە تۆقینەوە هەناسەم هەڵمژی: (ئۆۆووو ئەی خودایە)، بەڕاستی شتێکی زۆر ترسناک بووە، بۆبی و جاک هەموو کات لە باروودۆخی ململانێ و پێشبڕکێدا بوون هەندێک جار بە نهێنی و هەندێک جاریش بە ئاشکرا.

ماگی بەردەوام بوو: جاک ڕاگوێزراوەتەوە بۆ نەخۆشخانە بێگومان هێشتاش ناشزانین مەترسی باروودۆخەکە چەندێکە، بەڵام زۆر خراپ دەردەکەوت... بەڕاستی هیوادارم وانەبێت.

دوبارە بە دەم خۆمەوە مینگە مینگم دەکرد: ئەی خودایە، نەمدەزانی چی بێژم، دەتوانم بیرۆکەی ئاژاوە و ململانێ پەسەند بکەم و لێی ڕابێم، بەڵام ململانێ و شەڕێک کە ئەنجامەکەی نەخۆشخانە بێت یاخود پەککەوتنی هەمیشەیی!

ماگی تفەکەی قوتدا و گووتی: هێشتا شتی دیکە ماوە لاتیشا.. شتی دیکە کە تایبەتە بە تۆوە.

بە سەرسوڕمانەوە تەماشایم کرد: خۆ من هەر لە کاتی ڕووداوەکەدا بوونم نەبوو لێرە.

سەری لەقاند و گووتی: بە داخەوە شەڕەکە بە هۆی (جذور)ەوە بووە.

دەمم داچەقی: چیی؟!

ماگی گووتی: بە پێی گێڕانەوەی هەمووان، جاک لە کورسی پشت بۆبیەوە دانیشتووە و، بە (توبی) بانگی کردووە، حەتمەن کە بۆبی وەڵامی نەداوەتەوە، لەوانەشە هەر نەیزانیبێت کە جاک مەبەستی ئەوە، ئەوجا جاک

بە دەنگێکی بەرز گوتویەتی: ئایا پێویستە بە (کۆنتا کینتی) بانگت بکەم تاوەکو بزانیت کە مەبەستم تۆیە و لەگەڵ تۆمە!

وشک بووم. وام هەست کرد یەک سۆراحی ئاوی سارد بەسەر تەوقە سەرمدا کراوە.

ماگی بەردەوام بوو: بۆبی ڕاستەوخۆ لای کردووەتەوە و لە ڕوخساری بۆبی داوە، لێدانەکەش بەر چاوی کەوتووە.

ئەی خودایە، ئەی خودایە، ئەی خودایە.

لە ڕۆژی پێش ئەوەدا هەر بە ڕاستی مشتومڕی ئەو بەشەمان دەکرد لە ڕۆمانەکە. کۆنتا کینتی ناوی دەگۆڕدرێت بۆ توبی لە لایەن سپی پێستەکانەوە، ئەویش سوورە لەسەر ئەوەی کە وەڵام نەداتەوە وا پیشان بدات کە تێناگات، دەست دەگرێت بە ناوەکەیەوە چونکە ئەوە تاکە شتە لە ژیانەکەی پێشووتریەوە بۆی ماوەتەوە، هەموو شتێکی لە دەست داوە، ئازادییەکەی، قاچی کە بڕایەوە لە ئەنجامی هەوڵدانی بۆ ڕاکردن. خێزانەکەی، گوندەکەی، تەنانەت یادگاریەکانیش دەستیان کردبوو بە جێهێشتنی ناو یادگەی. تەنها ناوەکەی ماوەتەوە. کەچی ئەوان دەیانەوێت بیگۆڕن.

لە ڕۆمانەکەدا، کۆنتا کینتی لە بارودۆخەکە ڕادێت بەرەبەرە، بە هێواشی، پەسەندی ناکات ڕێک، بەڵکو لەسەر توبی ڕادێت، بەڵام لە ناخیدا هەر کۆنتا کینتی دەمێنێتەوە، بەرەبەرە دەبێتە دوو کەس لە یەک کەسدا.

لە زنجیرەکەدا زۆر دڕندانەتر و درامیانەتر دەبێت: پیاوە سپی پێستەکە کۆنتا کینتی دەبەستێتەوە و بە قامچی لێیدەدات و لێی دەپرسێت: ناوت چییە؟ بە کۆنتا کینتی وەڵام دەداتەوە، پیاوە سپییەکەش بەردەوام دەبێت لە لێدانی و پرسیارەکە دوبارە دەکاتەوە تاوەکو وەڵامەکە دێت و کۆنتا کینتیش لە بەهیلاک چووندایە: توبی.

ئـەو دیمەنـە لـە بـەهێزترین دیمەنـەکانی زنجیرەکەیـە، هـەروەها زۆرتـر دەمێنێتەوە لە یادگەدا، جـۆرێ پێکهـاتووە لـەم دیمەنـەی کـە لـە ڕۆمانەکـەدا نییـە. هـەموو کـات لـە بیـرم دەکـرد کـە ئـەلیکس هیلـی ئـەم دیمەنـەی لـە ڕۆمانەکەدا نەنوسیوە و، لە ڕۆمانەکەدا ئەشکەنجەیەکی زیاتر و مـاوە زۆرتـری ویستووە، بەڵام پێویسـتیەکانی درامـا وای لێکـردووە کـە بـە شـێوەیەکی چـڕ دەربخرێت.

لە پۆلدا مشـتومڕکردنەکە زۆر بەدەمـەوە هـاتنی نـەبوو. هـەر خـۆی بـۆبی چوبوویەوە یەک و زۆر بەشداری نەکرد. جاک دەیگووت جیاوازی نێـوان تـوبی و کۆنتـا کینتـی چییـە، شـتەکە زۆر گرنـگ نییـە. تێبینـی مـۆرەکردن و تەماشاکردنە تیژەکەی بۆبیشم کرد بەرامبەر جاک، بەڵام هیچ کـات پێشـبینی ئەوەم نەدەکرد – ئەسڵەن کەس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد – کـە ئـەم شـتە سەر دەکێشێت بۆ وەها ڕوداوێک. زۆربەی مشتومڕەکانی دوێنێلە نێـوان کـێڤن و فرێدی و لیزادا بوو. باس و خواسـەکە لـە بـارەی ناسـنامە و نـاو و ئـازادی بوو. بارودۆخەکەش بە شێوەیەکی ڕوون ئاڵۆز و بەیەکداچوو نەبوو.

هـیچ کـات نەدەهاتـە مێشـکم کـە ئـەوە ڕوبـدات. هـیچ کـات پێشـبینیم نەدەکرد ئەو بابەتە بۆ ڕووداوێکی لەو شێوەیە پەرە بستێنێت.

ماگی بە هاوخەمیەکەوە دەستی لەسەر شانم دانا: ڕۆژێکـی قورسـی دیکـە دەبێت لاتیشا.. بەهێز بە... خودا لە پشتت بێت.

ئـەرێ، ڕۆژێکـی دیکـەی قـورس، چیـدی بەرگـە نـاگرم. زۆر بـە سـادەیی هەستم کرد کە ئیدی ناتوانم بەرگە بگرم.

دوێنێ بیلال، بەڵکو دوێنێ و یەکەم دوێنێ و سبەی و دوای سبەیش هـەر بیلال.

ئەمڕۆش ئەم شتە.

چیدی ئارامم نەماوە.

خودایە، لە پشتم بە.

◆◆◆

"ئێستا دڵخۆشیت؟"

بەم شێوەیە مستەر وید پێشوازی لێکردم.

وەڵامم نەدایەوە. هەر لە سەرەتاوە بەهانەیەکی دەویست بۆ ئەوەی بیانووم پێ بگرێت. ئەوەتا ئێستا زیاتر لەوەی خەونی پێوە دەبینی هاتووەتە چنگی.

دەمویست پێی بڵێم: وا پێدەچێت تۆ دڵخۆش بیت ئێستا.

هیچ هێزێکم پێ نەبوو بۆ دەمەقاڵێ. تەنها دەمەویست بەشی خۆم لە لۆمە و ئاگادار کردنەوە وەربگرم لە کۆڵم بێتەوە.

"ئاگادارم کردیتەوە، ئاگادارم کردیتەوە لە هەڵبژاردنی ئەو ڕۆمانە". بەو شێوەیەی گووت بەڵام نەک وەک کەسێک کە بترسێت لەوەی چی بەسەر جاکدا دێت. بەڵکو وەک براوەیەک کە سەلماندویەتی ئەو لەسەر هەق بووە ئەگەر تەنانەت ئەوە ببێتە هۆی کۆتای پێهاتنی دونیا.

" ئەوەی ئێستا ڕووی داوە بە دڵت بوو؟ هەست بە تاوان ناکەیت؟" ئەوەی گووت بە ناحەزییەکەوە وەک ڕاوچییەک کە پڕی داوەتە ڕاوەکەی دوای ئەوەی خستوویەتیە ناو تەڵەکەیەوە.

لە ناو مێشکمدا ڕووداوی شەڕەکان دەهاتنەوە پێش چاوم کە لە قوتابخانە ڕوویدابوو لە مانگەکانی پێشوودا و ئەنجامەکەیشی بە نەخۆشخانە گەیشتووە بێ ئەوەی ئەسڵەن کەسێک لە بارەی هۆکاری شەڕەکەوە بپرسێت. هیچ کەسێک لە بارەی شەڕ کردنەکەی وەڵتەر و ستیڤەوە نەیپرسی، یاخود ئەوەی نێوان ویلی و مایکی.

ئەدی بۆچی هەموو کەس لە بارەی هۆکاری شەڕەکەی نێوان بۆبی و جاک دەزانێت؟ بە وردەکاریەکی بێتامیشەوە.

توانام نەبوو وەڵام بدەمەوە. بەڵی زۆر دودڵ بووم، بەڵکو بگرە تۆقیویش لەوەی ڕوویداوە و، هیلاکیش لە هەموو شتێک، زۆر ئاسان بوو چوونە ناو خانەی هەست کردن بە تاوان کە دەیەویست تێیدا بەندم بکات. بەڕاستیش هەستم بە تاوان کرد. بە بێ ئاگایی. بەڵام شتێک لە ناخمدا. لە غەریزەی نێچیرێک بۆ دەرباز بوون، وای لێکردم کە لاوازیم دەرنەبڕم. لە ناوەوە هەڵدەلەرزیم، لە هەموو شتێک دەگریام. دەمزانی کە ئەگەر لە بەردەمیدا لاواز بم ئەوە ئیدی لە نێوم دەبات.

تەماشاکردنێکی خۆڕاگرانەم لە سەر ڕوخساری خۆم بەدی کرد و بە ساردیەکەوە گووتم: مستەر وید، پێم وابێت زۆر زیادەڕەوی دەکەیت..

ئەوجا بەردەوام بووم: هەر وەک هەمیشە.

بە شۆکەوە تەماشای کردم: زیادەڕەوی دەکەم؟! ئایا دەزانیت چی ڕوویداوە یاخود لەسەر کار نەبوونی بەردەوامت لە قوتابخانە وای لێکردوویت نازانیت دوێنێ چی ڕوویداوە کاتێک لە قوتابخانە وەدەرکەوتویت تەنانەت بە بێ مۆڵەت وەرگرتن لە بەڕێوبەرەوە؟

تۆ چەندە بوغزن و خراپیت مستەر وید. دەرچووم لەبەر ئەوەی کوڕەکەم توشی گەشکە هاتبوو. لە ناخی خۆمدا گووتم.

بە لۆمە کردنەوە گووتم: هەر ئەوە ڕویداوە کە سێ بۆ چوار جار لە هەموو ڕۆژێکدا و لە هەموو پۆلێکدا ڕوودەدات. یەک جاریش بیرم نایەت کە لە شەڕکەرەکانمان پرسی بێت لە بارەی هۆکاری ململانێ و شەڕەکەیان. لەوانەیە لەسەر (کوخەکەی مامە تۆم) یاخود (موبی دیک)بوبێت، کێ دەزانێت؟

تەماشـای کـردم و ئـاگر لـە چـاوانی دەبـاری: ڕوونـە کـە تـۆ ڕێـژەی مەترسـیەکە لـە بـەرچاو ناگریـت. دیـارە کـە بـارە تایبەتەکـەت بـێ توانـای کردوویت لە جیاکردنەوەی شتەکان.

گووتم: بە پێچەوانـەوە، بـارە تایبەتەکـەم وای لێکـردووم کـە شـتەکان لـە سوچێکی گەورەترەوە ببینم، بە شێوەیەک زیادەڕەوی ناکەم لە گـەورەکردنی. بارە تایبەتەکەم وای لێکـردووم کـە بـزانم ژیـان کێشـەی زۆر لـە کێشـەی دوو هەرزەکار گەورەتری تێدایە.

ئـەوەم بـە متمانەبـەخۆبوون و سـووربونێکەوە گـووت کـە نەمـدەزانی لـە کوێوە هێناومە.

بە ددان جیڕ کردنێکەوە گووتی: تـۆ نازانیـت کـە لەوانەیـە چـی ڕوویـدات، دەکرێت خانەوادەکەی جاک کێشەکە بەرز بکەنەوە بـۆ دادگا ئەگـەر زیـانێکی هەمیشەیی بە چاوی بگات.

هاتە پێش چاوم. بە هەموو وردەکاریەکانیـەوە زۆر تۆقێنـەرە. ئـەوەی کـە زیـانێکی هەمیشـەیی بەرکـەوتبێت و، شـکایەتێک بـەرز بکرێتـەوە لـە دژی... دژی کێ؟

بە ساردیەکەوە گووتم پێی: شکایەتێکی دادگایی دژی ئـەلێکس هیلـی بـۆ نمونە؟!

هاواری کرد بەسەرمدا: ئەی خودایە تۆ لە چ شتێک دروست کراویت؟

هەستامەوە: لە خۆڵ، هەر وەک تـۆ، بـەڵام خۆڵێـک لـە سـانت لویسـەوە. ئەوە کێشەکەی تۆیە.

ئەوجا چومە دەرەوە. شۆکێکیشم لەسەر ڕوخساری جێهێشتبوو.

بەڵام خۆشم هەڵدەلەرزیم.

◆◆◆

کۆنترۆڵی ڕوخسارمم کرد کاتێک چوومە پۆلەوە، بۆبی بۆ ماوەی هەفتەیەک دابڕیندرابوو، هەروەها باوکیشی بانگ کرا بوو، بەڵام نەمدەزانی کە ئایا هاتووە یان نا.

ڕوانینەکان هەر لە سەرەتاوە بوو، کاتێک هەموو تێبینی کرد کە من بە شێوەیەکی سروشتی هەڵسوکەوت دەکەم، ئارام بوونەوە دودڵیەکەیان ڕۆیی. وانەکە هەر وەک ڕۆژانی دیکەی ئاسایی بوو.

لە تەک ماگیدا ڕوخسارە توند و ڕەقەکەم نەما، دیتم بە تەواوی قایل بووە بەوەی کە مستەر وید شتەکەی گەورە کردووە، بەوەی کە تەنها ئەو قسەیەی وەدەست خستووە کە جاک بە بۆبی گوتووە (بۆبیش ئەوەی گووتبوو لە هۆکاری ئەوەی کردبووی))، هەستابوو بە وەڵام وەرگرتن لە هەموو ئەو کەسانەی لە سەر ئەو دوو مێزە دانیشتبوون و پرسیاری لە هەموویان کردووە لە بەردەم کۆمەڵێک وانەبێژ و قوتابی بە شێوەیەکی ناپیشەیی زیاتر لە جارێک.

" بە نزیکەی وەڵامەکانی فێریان دەکرد، پێی دەگووتن: ئایا جاک بۆبی بە ناوی پاڵەوانەکانی ڕۆمانی (جذور) ناوزەند نەکرد، چ پێویستیان بەوەیە کە ئەوە بڵێن کە دەزانن ئەوە رووی داوە، دەیانگووت: بەڵێ".

" لە کوێ ئەوەی کرد؟" پرسیارم لێکرد.

گووتی" لە هۆڵی نانخواردن، هەر ئەوەندەی جاک بە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنەکە ڕاگوێزرا".

ئەی حەرامزادە. بە ئەسپایی گووتم.

بە دەستی پشتگیری لێکردم: پێشبینیم نەدەکرد کە بگاتە ئەم ئاستە لەگەڵت لاتیشا، من هەوڵمدەدا گومانی باشی پێ ببەم کاتێک باسی ڕق لێبوونەوەیت دەکرد بەرامبەرت. بەڵام هەڵوێستەکەی دوێنێی قسەکانی تۆی بۆ دڵنیا کردمەوە. ناکرێت کەسێک بەو شێوە نا پیشەییە ڕەفتار بکات ئەگەر پاڵنەرێکی کەسی نەبێ".

گووتم: چەپەڵ! هەر لە یەکەم ڕۆژی قوتابخانەوە دڵی بە هاتنی من خۆش نەبوو. ئەگەر هەر قیچەک کاریگەری هەبووایە لەسەر بڕیاری بەشی پەروەردە ئەوە هیچ کات ڕێگەیی بە دامەزراندم نەدەدا. تەنانەت ئارەزووی هەلپێدانێکیشی نییە بە من.

ماگی گوتی: بەهێزیت بپارێزە، پێم وابێت تۆ شڵەژاندووتە. پێشبینی ئەوەی لێنەکردوویت، نەکەی بە لاوازی و شڵەژاوی خۆت دەربخەیت، تۆ هیچت نەکردووە، ئەم شتانە هەموو ڕۆژێک ڕوودەدەن، شتێک نییە کە خوێندنی (جذور) ڕەت بکاتەوە.

پێم گووت: دەمەوێت بڕۆم سەردانی جاک بکەم لە نەخۆشخانە، ئایا دێیت لەگەڵم؟

خێرا وەڵامی دایەوە: نەکەی! هەر ڕۆشتنێک بە تەنها یاخود لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بارودۆخەکە وا شی دەکاتەوە کە تۆ دان بەوەدا دەنێیت هۆکاری ئەوە بوویت کە ڕوویداوە. بە شیوەیەکی سروشتی هەڵسوکەوت بکە. ئەگەر هەمووی ڕۆیشت ئەوە تۆش دەڕۆیت، ئەگەر وانەبوو ناڕۆیت.

ئەو لەسەر هەق بوو.

◆◆◆

## من کێم؟

### (ئەوەی بیلال لە بارەی خۆی نوسیویەتی لە تێنوسەکەدا)

من بیلالم، تەمەنم چواردە ساڵە. لە بڕۆکلین نیۆرک دەژیم. حەز بە ڕاپ و بەیسبۆڵ و نوسین دەکەم. هەروەها شێرپەنجەی مێشکیشم هەیە. لە ماوەی چەند مانگێکی دیکەدا دەمرم.

بەڵام ئەم تێنوسە لە بارەی مردنمەوە نییە، بەڵکو لە بارەی ژیانەوەیە.. ئەوەش بە نزیکەیی ئەو کاتە بوو کە درکم بە مردنی خۆم کرد، کاتێک درکم بەوە کرد بەم زووانە هەموو شت کۆتایی دێت، هەوڵمدا کە بژیم.

هەر لەو ڕۆژەدا کە زانیم من توشی شێرپەنجە بوومە، هەواڵێکم لەسەر بەرهەمهێنانی فیلمێکی نوێوە بیست، کە ناوی من هەڵدەگرێت، بیلال.

ئەمە وای لێکردم تێفکرم، ناکرێت شتێکی ئاوا ڕێکەوت بێت، لەو ڕۆژەی کە دایک بە ڕاشکاوی پیم دەڵێت، لە بارەی ڕاستی نەخۆشیەکەمەوە، لەولاوە لێدوانێکی ڕاشکاوانە لە بارەی فیلمەکەوە دەردەچێت..

هەر لەو ڕۆژەی کە تێیدا زانیم بەم زووانە دەڕۆم، زانیم کە ناوم بۆ ماوەیەکی دورو درێژ دەمێنێتەوە.

ئەمە وەهای لێکردم لە ناوی خۆم تێڕابمێنم، بۆچی باوکم ئەو ناوەی بۆ هەڵبژاردووم.

گەشتی گەڕان بە دوای ناوەکەمدا و واتاکەی، گەشتێک بوو لە ناخمدا.

خۆمم دۆزییەوە، لەم چەند مانگەدا زۆر زیاتر لەوەی کە لە ماوەی ژیانمدا زانیومە کە لە ژیانەکەی پێشوومداا زانیبوم.

ئەوەم دۆزیەوە کە لەوانەیە لەم ژیانەدا هەموو شتێک جفرەی هەبێت. شێرپەنجە، کاتێک لە ناو جەستەمدا دروست بوو و گەشەی کرد، جفرەیەکی هەبوو کە ناوی جفرەی جینیە.

ژیان هەر خۆی جفرەیەکی هەیە، مردن جفرەی هەیە، شێرپەنجە جفرەی هەیە.

هەر یەکێک لە ئێمە جفرەیەکی هەیە.

لە کاتێکدا لە ناوەکەم دەگەڕام، ئەوەم دۆزیەوە. ژیانم تێکەڵ بوو لەگەڵ ژیانی کەسێکی دیکەدا کە لە دایک بووە و ژیاوە و مردووە پێش چەند سەدەیەک و لە قاڕەیەکی دیکەش. بە ناوی ئەوەوە ناو نراوم، چیرۆکەکەیم دۆزیەوە، کە هەموو ئەو جفرانە دەکاتەوە و دەشکێنێت کە چواردەوری داوم لە ژیانمدا.

ژیانەکەی ئەو ژیانی منی جیاوازتر کرد.

هەموو شتێک دوای ئەو جیاواز بوو.

مـن بـیلالم، تەمـەنم چـواردە سـاڵە. لـە نیـۆرک دەژیـم. حـەز بـە ڕاپ و بەیسـبۆڵ و نوسـین دەکـەم. شـێرپەنجەی مێشـکم هەیـە. لـە دوای چەنـد مانگێکی دی دەمرم.

بەڵام دەمەوێت کاریگەریەک جێ بهێڵم لە دوای خۆم بمێنێتەوە.

ئەم تێنوسە، لەوانەیە وا دەربکەوێت لەسـەر ژیـانم بێـت، لـە بـارەی کۆتـا ڕۆژەکانم بێت، وەک ئەوەی ئێستا بەربڵاوە لە یوتیوب، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا لـە بارەی ژیانی ئێوەوەیە، لە بارەی ئەوەوەیە کە لە ژیانتاندا دەیدۆزنەوە.

♦ ♦ ♦

## ئەمجەد

من بە ڕەسمی لاتیشام خۆش دەوێت.

هیچ شتێکی دیکە ناتوانێت ئەوەی کە بەسەرمدا دێت ڕوون بکاتەوە.

بە ڕەسمی خۆشم دەوێت. واتە من ئەوە بە ڕاشکاوانە بە خۆم دەڵێم.

من پێی سەرسام نیم. نا.

خۆشم دەوێت. خ. ۆ. ش. م   د. ە. و. ێ. ت

خۆم دەبینمەوە کە بەردەوام بیری لێدەکەمەوە، ئەوە دەهێنمەوە یادم کە گوتوویەتی، شێوازی ڕوخساریم دێتەوە یاد کاتێک قسە دەکات، لە سەر زاری ئەو وشانە دادەنێم کە نەیگوتوە و دەیهێنمە پێش چاوم کە دەیڵێت.

هەموو شتێک بە ڕیگەیەک ڕوودەدات کە وادەردەکەوێت لە خۆوەوەیە، پەیوەندی دەکەم بۆ دڵنیابوونەوە لە بیلال و، ئەویش هەموو وردەکاریەکانم پێ دەڵێت، پاشان بەردەوام دەبین لە گفتوگۆ، نکۆڵی لەوە ناکەم کە نەخۆشیەکەی بیلال دەقۆزمەوە بۆ ئەوەی پەیوەندیم لەگەڵی هەبێت، بەڵام بیلال بەشێکە لە هەموو شتێک لە سەرەتاوە، بەڵکو هەستەکانم بەرامبەر ئەو لێک جیا نابێتەوە لە ڕوانینم بۆ ئەو هەستانەی بەرامبەر بیلال. لەوانەیە ڕوانینم بۆ نەرم و نیانییەکەی بەرامبەر کوڕەکەی، هۆکاری گڕی سەرسامبوونم بێت پێی.

سەرسامبوون؟ هێشتا لە مەرحەلەی نکۆڵی کردندام.

بەڵکو گڕی خۆشەویستی.

کاتێک لە بارەی گەشکەکەوە کە بەسەر بیلالدا هاتبوو هەواڵی دامێ، بە بێ دەنگی دەگریا لە تەلەفۆنەکەدا. هیچ دەنگێکی لێوە نەهاتە دەرێ. دەنگی نەگۆڕا. بەڵام هەستم بە فرمێسکەکانی کرد بە بێدەنگی دەهاتنە خوارێ. پێم گووت کە من ئێستا دێم بۆ لای بۆ ماڵیان. کاتەکەی زۆر درەنگ بوو. ئەو بە

سووربوونەوە ڕەتی کردەوە، بەڵام شتێک لە ئاوازی دەنگیدا، هەبوونی ئارامی دەردەخست لەوەی کە گووتم دێم.

ئەوە یەکەم جار بوو کە بەربەستە فەرمیەکانمان تێپەڕاند و، هەستم کرد هەر بە لایەنی کەمەوە بووینەتە هاوڕێ.

ئەو شەوە پێویستی بە دەردەدڵ کردنێک بوو لەگەڵ کەسێکدا، بە ڕێکەوت من پەیوەندیم نەکرد، هەر بۆیە ئەو کردی و، باسی هەموو شتێکی بۆ کردم وەک ئەوەی بیەوێت کۆڵ و بارێک لەسەر شانی لابەرێت. سەرەڕای خەمباربوونم بۆ بیلال دڵخۆش بووم لەبەر ئەوەی منی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ئەوەم پێ بڵێت کە گووتی، بۆ ئەوەی دەریبخات.

هیچ شتێک نازانم دەربارەی هەستەکانی ئەو. لەوانەیە تەنها هاوڕێیەک کە دەردە دڵی لابکات. بەڵام ئەوە بەس بوو بۆ ئەم ئاستە، بە لایەنی کەمەوە.

شتێک لە ناخمدا پێی دەگووتم کە هەستەکانم بەرامبەر لاتیشا لە ئەنجامی ئەوەوە بێت کە ئەو بە تەواوی پێچەوانەی کریستینە لە هەموو شتێکدا. ڕێک هەر یەک لەوان لە بارودۆخێکی جیاواز و پێچەوانەدایە. نەک تەنها لە شکڵ و شێوەدا، بەڵکو بگرە لە سروشت و تایبەتمەندیە کەسیەکانیشدا.

وەک ئەوەی بمەوێت کریستین لەوزە پێبکەم.

هیچ کێشەیەک لەوەدا نابینمەوە، هەوڵ نادەم ئەو دەنگە کپ بکەم، ئەگەر من بەو شێوەیەڕزگارم دەبێت لە کریستین ئەوە من بە ڕاستی ئیدی ئەو لاوازیەم بەرامبەری لە کۆڵ خۆم دەکەمەوە، بە هەموو ئەو شتانەوەی وای لێکردووم نەخۆش بم پێوەی، لاتیشا چارەسەرە؟ بۆ نا؟ کێشە لەوەدا چییە.

کاتێــک دوایـــی لـــە بـــارەی کێشـــەکانیەوە پێـــی ڕاگەیانـــدم لەگـــەڵ بەڕێوبەرەکەیدا و، لە بارەی ڕۆمانی (جذور)ەوە کە هەڵیبژاردووە بۆ ئـەوەی بە قوتابیەکانی بڵێتەوە و ڕوبەڕوبونەوەی بەڕیوبەر لـە دژی ئـەوە و، هـەروەها لە بارەی هەوڵدانەکەی بۆ بەکارهێنانی شەڕەکەی نێوان دوو قوتابییەکەی بۆ هەڕهشەلێکردنی و پەستان خستنە سەری، هەستم کرد کە لاتیشا زۆر بەشـی دیکەی لە خۆگرتووە زیاتر لە دایکێکی هەستیاری میهرەبـان. چەنـد بەشێک کە نمونەی هێزی و هەوڵدانێتی پێش توشبوونی بیلال بە شێرپەنجە، کاتێـک لێم پرسی بۆچی (جذور؟)، ئەو باسی جـذورەکانی خـۆی بـۆ کـردم و، چـۆن ئەو ڕۆمانە بووتـە نمونـە لـە کـلارا ئـەڤینیو سـانت لویسـەوە - بـۆ میسـووری نیۆرک.

ئێمە لە دوو ژینگەی تـەواو جیـاوازەوە هـاتبووین، بـەڵام مـن هەسـتم کـرد ئەوەش هۆکارێکی زیاترە بۆ پەیوەندیەکەم پێوەی، شـتێک تـەواو و کامڵمـان دەکـات، زیـاتر لـەوەی لـە یـەک دوورمـان بخاتـەوە. هەسـتم کـرد کـە ئـەو میهرەبانییـە هـەڵقوڵاوە لێیـەوە بەرامبـەر بـیلال بـەو بەهێزیـەوە هەڵـدەقوڵێت چونکە لە سەرچاوەی کەسایەتیەکی بەهێزەوەیە کە لەگەڵ ژیانـدا جـەنگاوە.. کەسایەتیەک کە توانویەتی بمێنێتەوە.

من بە تەواوی دەمزانی مستەر وید چۆن بیر لە لاتیشا دەکاتـەوە، شـتەکە بە تەواوی ڕەگەزپەرەستی نـەبوو، ئـەوە بیرکردنـەوەی پیـاوێکی سـپی نـەبوو بەرامبـــەر ژنێکـــی ڕەش پێســـت، شـــتەکە زۆر لـــەوە ئـــاڵۆزتر بـــوو، ئـــەوە بیرکردنـەوەی نیۆرکی (سـپی بـوو تـا ڕادەیـەک)، بەرامبـەر ئـافرەتێکی ڕەش پێستی هاتوو لە گەڕەکێکی هەژارنشینی ترسـناک لـە سـانت لویسـەوە، ئـەو هیچ کات پێی وانەبوە کە بە تەواوی باش بێت بۆ ئەوەی ببێتە مامۆسـتایەک لە قوتابخانەکەی. لەوانەیە ئەوە بێزاری کردبێت کە لاتیشـا بـۆی سـەلماندووە ئەو هەڵەیە. لەوانەیە بە دوای بەڵگەیەکدا گەڕابێت تـاوەکو بیسـەلمێنێت هـەر ئەو ڕاست بووە لە سەرەتاوە.

لاتيشا لە ژێر پەستان و هەڕەشە و ئاگادارکردنەوەکانی مستەر ویددا دەژیا بەوەی کە کارەکە گەورەتر دەبێت لە ڕێی ئەو سکاڵایەی دایک و باوکی جاک پێشکەشی دەکەن، لاتیشا بە بەهێزی و گرنگی پێنەدانەوە خۆی دەردەخات، بەڵام زۆر دەترسێت لەوەی شتێکی لەو شێوەیە ڕووبدات ئەگەر دەربکەوێت جاک توشی زیانێکی هەمیشەیی هاتووە.

پێم گووت ڕیگاکان لە مستەر وید ببڕیت و، بچێت بۆ لای جاک سەردانی بکات لە نەخۆشخانە و ببینێت بارودۆخەکە چۆن دەڕوات لەگەڵ دایک و باوکیدا و... ڕوبەڕوو لەگەڵیشیان بدوێ ئەگەر کەشەکە لە بار بوو.

لە دواتردا زۆر دڵخۆش بووم کاتێک پێی ڕاگەیاندم کە کردوویەتی و، سەری گرتووە.

♦ ♦ ♦

## لاتیشا

چیدی ئارامم نەماوە لەوەی چاوەڕێ بکەم چی بەسەر جاک دا دێت.

مستەر وید بەردەوام بوو لە قۆستنەوەی بارودۆخەکە، ئەو شۆکەی گرنگی پێنەدانم بە بارودۆخەکەی تێپەڕاند و خەریکە یارییەکی دیکە ئەنجام دەدات، داوای لێکردم بووەستم لە گووتنەوەی جذور، زیاتر لە جارێکیش گووتی کە لەو بارەیەوە لەگەڵ (پارێزەر) دا قسە دەکات، چ پارێزەرێک؟ هەرگیز نەمزانیوە کە قوتابخانەش پارێزەری هەیە!... ئەی بۆچی لەگەڵ پارێزەردا قسە دەکات کە جارێ هیچ کەسێک سکاڵای بەرز نەکردووەتەوە؟

ئەمجەد ئامۆژگاری کردم کە ڕیگاکان ببڕم لە مستەر وید و بچم بۆ نەخۆشخانە بۆ سەردانیکردنی جاک. لە ڕاستیدا هەستم بە تاوان دەکرد کە تاوەکو ئێستا نەڕۆیشتووم. بەشێک لە ناخمدا پێی دەگووتم کە من بەشدارم لەوەی کە ڕوویداوە، بەشی دووەمیش دەیگووت کە من گەمژەم و هیچ پەیوەندیەکم بەوەوە نییە، بەشی سێیەمیش تەنهاهەستی دایکایەتی دەجولاندم، بەشی کۆتایش بە شێوەیەکی زۆر دوور لەمانەوە بیری دەکردەوە. بەشێک لێم بیری لەوە دەکردەوە کە مستەر وید هەڕەشەی پێدەکرد: ئەوەی کە دایک و باوکی جاک سکاڵا بەرز بکەنەوە... لەسەر.. هەر کەسێک.

هەر ئەمەم کەم بوو لە ژیانمدا.

بیلال خەریکە دەگاتە کۆتایی، لە کاتێکدا یەکێکیان سکاڵای یاسایم لەسەر بەرز دەکاتەوە..

گوێ بۆ قسەکانی ئەمجەد دەگرم.

◆◆◆

دایــک و بــاوکی جــاک زۆر ڕێــک و پێــک و بــە ئــەدەب بــوون. هــیچ شڵەژاویەکیان پێوە دیار نەبوو لـە ڕۆیشتن و ئامـادە بـوونم. بـە پێچەوانـەوە زۆر گەرم و گوڕ بوون لە پێشوازی کردنم و گرنگی پێدانم، پرسـیارم کـرد لـە بارەی چاوی جاکـەوە بـاوکی گـووتی کـە پزیشـکەکە دڵنیـایی کردونەتـەوە و هـەموو شـتێک لـە ژێـر کـۆنتڕۆڵ دایـە، لـە دوای چەنـد ڕۆژێکـی دی جـاک برینپێچەکانی لێدەکاتەوە و پێشبینی دەکرێت کە لە دوای سێ مـانگی دیکـە ئاسـەواری شـتەکە هـەر دیـار نـەمێنێت. هـەرچی بەشـی جەسـتەمە بـە ئاسوودەیی هەناسەی دەدا. هیچ زیانکەوتنێکی هەمیشەیـی بـوونی نییـە وەک ئەوەی مستەر وید ئاواتی بۆ دەخواست. چەند جار پرسـیارم لێکـرد کـە ئایـا شتەکان باشن بەڵام ئەو بە ئەنقەست پێی نەگووتم.

هەر لە چوونە ژوورەوەمدا پێم ڕاگەیاندن کـە مـن مامۆسـتای جـاکم بـەڵام ناوی خۆمم نەگووت.. هەندێک دودڵ بووم پاشان پێم گووت: مـن مامۆسـتای وانەی ئینگلیزیم. لاتیشا.

زەردەخەنـەی کـرد و گـووتی: بـەڵێ، زۆر گـوێم لـە نـاوت بـووە، خۆزگـەم دەخواست لە بارودۆخێکی باشتردا چاوم پێت بکەوتایە.

هیچ پێوەی دیار نەبوو کە لە بارەی بابەتەکـەوە شـت بزانێـت. بـە لایـەنی کەمەوە تاوەکو ئێستا.

ئەرمونیانییەکەی هێزی دامێ: ئایا دەزانیت بۆچی بۆبی لە جاکی داوە؟

سەرسـوڕمانی پێـوە دیـار بـوو لـە پرسـیارەکە پاشـان گـووتی: بـەڵێ، بێگومان دەزانم.

جاک و بۆبی دوژمنایەتی هەمیشـەییان لـە نێوانـدایـە، ئـەوان هـەموو کـات پێشبڕکێ دەکەن لەوەی کـە ڕاهێنـەری تـۆپی باسـکە کامیـان هەڵـدەبژێرێت. ئەمەش هەندێک جار هەڵدەگەڕێتەوە بۆ کاری ناشرین وەک تێبینـی دەکـەیت، بەڵام ئەوان هەر هەرزەکارێکن و هیچی دیکە.

کۆمەڵەکردنێکی زۆر هەن کە مستەر وید تێیانی پەڕاندووە لە بابەتەکەدا، ئەوەم دەزانی.

زیاتر هاندرام و بەهێز بووم: لەوانەیە هۆکارێکی ڕاستەوخۆی دیکە هەبێت، هیوادارم بێزارت نەکات ئەگەر پێتی ڕابگەیەنم.

بە گرنگی پێدانەوە گووتی:بە دڵنیاییەوە، چییە؟

پیم گووت کە جاک بۆبی بە (توبی) بانگ کردووە و ئەوەش سوکایەتی بووە بۆ بۆبی.

تێنەگەیشتن بە ڕوخسارییەوە دیار بوو: بۆچی وشەی توبی سوکایەتی بووە بۆ بۆبی؟

بۆم ڕوون کردەوە کە توبی کێیە و جاک چی دیکەشی گووتوە.

ڕاستەوخۆ ڕەنگی گۆڕا و زۆر شەرمەزار دەردەکەوت.

ناچار بووم خێرا بۆی ڕوون بکەمەوە، بە ڕاشکاوانە پێم گووت کە بەڕێوبەر بابەتەکە دەجوڵێنێت تاوەکو دژی من بووەستنەوە چونکە من ڕۆمانی جذورم هەڵبژاردووە و، ئەو هەر لە سەرەتاوە دژی ئەوە و دژی منیش بووە، پێم گووت ئەم ڕووداوانە هەمووکات ڕوودەدەن و بابەتەکەش وەک ئەوەیە کە خۆی گووتی (هەرزەکارن و هیچی دیکە).

بێدەنگ بوو لە کاتێکدا ڕەنگی هەر گۆڕاو بوو، پاشان مۆڵەتی لێوەرگرتم و ڕۆیشت تاوەکو هاوسەرەکەی بدوێنێت.

دیتم کە بە تەنها لە ڕاڕەوەکەدا قسە دەکەن. دیتم ڕەنگی پیاوەکەیشی بە تەواوی وەک ڕەنگی خۆی لێدێت. لە پرێکدا وەک خوشک و برا دەردەکەوتن نەوەک دوو هاوسەر. بەو شێوەیە پەسنی دوو هاوسەر دەکرێت کە هەموو تەمەنیان پێکەوە بەسەر بردبێت، بەرەبەرە هەر یەک لەوان شتێک لەوی دیکە وەردەگرێت و زۆر نزیک دەبنەوە لە شێوەدا بە شێوەیەکی سەیر. شتێک کە من تاقیم نەکردووەتەوە بە هەر حاڵ.

هاوسەرەکەی هات و بە ڕوخساریەوە نیشانەی جددی بوون بەدی دەکرا، پێشبینیم کرد کە هەڕەشەم لێبکات یاخود دەرم بکات یاخود شتێک بڵێت دەربارەی ئەو (پارێزەر)ەی کە پەیوەندی لەگەڵ دەبەستێت لەو بارەیەوە، لە بری هەموو ئەوانە، باوکی جاک گووتی کە ئەوان بەڕاستی داوای لێبوردنیان لەوە هەیە کە جاک بە بۆبی گووتوە و، بە دڵنیاییەوە ئەو مەبەستی نەبووە کە بەو شێوەیە تێگەیشتوون لێی و، بە هەر حاڵ جاک خراپەی کردووە.

من بە تەواوی شۆک بووبوم، ئەوان داوای لێبوردن دەکەن.

دایکەکە گووتی: هیچ کات نامانەوێت بابەتەکە گەورە ببێت.

باوکەکەش بە ڕوون کردنەوەوە گووتی: جاک لەوانەیە بەخششی خوێندن وەربگرێت بە هۆی بەهرەکەیەوە لە تۆپی باسکەدا، دەزانیت کە زانکۆکان بە دوای یاریزانانی بەهرەداردا دەگەڕێن بۆ ئەوەی لە نێو قوتابیەکانیاندا بن، جاک هەلێکی لەو شێوەیەی هەیە و، ئێمەش نامانەوێت لە دەستی بچێت، هەبوونی هەر نیشانەیەکی (ڕەگەزپەرەستی) لە تۆمارەکەیدا لەوانەیە ئەو هەلەی لێ دوور بخاتەوە.

گفتێکی زۆر ئاقڵانە و لۆژیکیانەیە.

دایکەکە گووتی: بۆ مستەر ویدیش، ئەرخەیان بە، نامانەوێت بابەتەکە هەر بکرێتەوە و، جاکیش باشە، لە ماوەی چەند مانگێکدا باش دەبێت وەک ئەوەی پزیشکەکە گووتی. بەڵام هیچ شتیکمان ناوێت لە تۆمارەکەیدا. ئەوان تەنها شەڕێکیان کردووە. تەنها هەرزەکارێکن.

زۆر بەگەرمی سوپاسم کردن و، دڵنیام کردنەوە کە سەردانیکردنەکەم بۆ ئەو بابەتە نەبووە بەڵکو بۆ ئەرخەیان بوون بووە لە بارودۆخی جاک.

ئەوان هێندە میهرەبان بوون کە بە بڕواپێکردنم خۆیان دەرخست.

بەڵام من بەڕاستی ڕاستگۆ بووم لەگەڵیان.

هەروەها دڵخۆشیش بووم: لە ناوم بردیت مستەر وید.

◆◆◆

## بیلالی حەبەشی

پێی گووتم" ئەی کوڕی ڕەش پێست".

بەرەبەرە بەربەرەکانێمان زیادی دەکرد، بەڵێ، بە گڕ یەکدا چووین. دەنگمان بەرز بوویەوە. دەنگی ئەوانە بەرز بوویەوە کە دەیانەویست هێورمان بکەنەوە.

پاشام پێی گووتم: ئەی کوڕی ڕەش پێست.

ئەوەی گووت و دنیا کش و مات هەڵگەڕا. هەمووی وشک بوو. بێدەنگی بە جۆرێک بوو وەک گۆڕستانەکان بوو.

وەک بروسکە بوو لێم بدات. هەروەها لە ڕوخساری ئەویشدا دیار بوو کە توشی شۆک بوو لەوەی گوێی لێبوو لە دەمیەوە دەرچوو.

هەمووان شۆک بووبون.

من کشامەوە.

هەندێک ویستیان بێنە پێشم.. نازانم کێ؟ ... چیدیکە ڕوخسارەکانم جیا نەدەکردەوە... دەنگێکم گوێ لێبوو کە بە بەهێزیەوە هاواری دەکرد: بیلال، بیلال.

دڵنیا نیم کێ. چیدی جیام نەدەکردنەوە، نازانم چۆن ڕێگاکەم گرتە بەر. بەڵام من بڕیم و گەڕامەوە بۆ ماڵەکەم. لە خۆم ئاڵا بووم. داوای لێخۆشبوونم لە خودا کرد. چەندین جار داوای لێخۆشبوونم کرد، زیاتر دەچوومەوە بە ناو خۆمدا و لە خۆم دەئاڵام. برینەکانم بە ئەسپایی دەلێسایەوە. هیچکات پێشبینیم نەدەکرد کە ئەوە لە لایەن (باوەڕدار)ێکەوە ڕووبدات. ئەو وشەیە و (زۆر خراپتر لەوەش) بوو کە هەموو ڕۆژ بەرگوێم دەکەوت بە هۆکار و بە بێ هۆکار کاتێک بەردەیەک بووم لە نێو بەردەی بتەکان، ناوزەند کردنم بە دایکم، بە ڕەنگەکەی، کە هەمان ڕەنگی منە، شتێکی زۆر ئاسایی بوو لە لای عەرەب کە بە کەمتر لەخۆیان تەماشای ڕەش پێستان دەکرد.

بەڵام، لەگەڵ ئاینە نوێیەکەدا، لەگەڵ باوەڕداران پێی به لایەنی کەمەوە، شتەکان گۆڕان، چیدیکە ڕەنگی ڕەش شتێکی ڕیسواکەر نەبوو، سپی بوونیش شتێکی شانازی هێنەر نەبوو. پێوانەکان گۆڕان. پێوانە کۆنەکان ڕەت کرانەوە و، پێوانەی دیکە شوێنیانی گرتەوە کە تەماشای ڕەنگ و ڕوخساری نەدەکرد... بەڵکو تەماشای کاری مرۆڤی دەکرد، زۆر بەسادەیی ئەو شتانەی کە دەیکات.

پێشبینیم کرد کە شتەکە هەر بەو سانایییە بێت لەگەڵ هەمووواندا.

پێشبینیم کرد کە باوەڕ بتوانێت هەموو شتێکی کۆن لە دەروون و ناخی باوەڕداراندا بشۆرێتەوە.

ئەو ڕۆژە، کاتێک بە دایکم ناوزەندی کردم، بە ڕەنگم و ڕەنگی، تێگەیشتم کە شتەکە زۆر قورسترە، لەوەی ورێنەم بۆ دەکرد.

گوومانم لە باوەڕەکەی نەبوو...نا.. هەرگیز.

ئەوم دەناسی... دەشمزانی کە ئەو خێرا هەڵچووە و کاردانەوەی خێرایە.. بەڵام گوومانم لە باوەڕەکەی نەکرد..

بۆی پاڕامەوە، لەوانەیە بۆ ئەوەی ئازارەکە لە خۆم کەم بکەمەوە دوعام بۆ کرد.

کاتێک تەپا و تلم دەکرد لە نێو پێخەفەکەمدا و بیرم دەکردەوە تێگەیشتم کە شتەکە چەندە قورسە. چەندە قورسە ڕزگارت بێت لە هەموو شتێکی پێشووتر کە باوەڕت پێی هەبوو، لەوانەیە بۆ من زۆر قورس نەبوبێت چونکە من بەردە بووم و، باوەڕ ئازادی کردم، بۆیە هەموو شتێکم فڕی دا و خۆم قوتار کرد لێی بە گوێرەی خۆ قوتارکردنم لە بەردایەتی خۆی...

ئەو شەوە زۆر ئەملا و ئەولام کرد، کاتێکیش خەو بردمیەوە، خەونم بە کۆترێکی ڕەشەوە دیت کە لەسەر شانم نیشتبوویەوە پاشان بۆ ئاسمان فڕی... ئومەیەش، گەورەی پێشووم، ئەوەی کە ئەشکەنجەی دام و بە

قامچی لێیدام و بەردی لەسەر سنگم دانا... لە سوچێکی دوورەوە وەستابوو بە ڕوخسارێکی فێڵبازانەوە زەردەخەنەی دەکرد.

خەبەرم بوویەوە و لە واتای کۆترکە تێگەیشتم.

ئەوە دایکمە، ئەوەی کە بەو ناوزەندی کردم، ڕاستە ڕەشە، بەڵام دەفڕیت بە ئاسماندا...

بەڵام لە هەبوونی ئومەیە تێنەگەیشتم.

کاتێک بەرەبەیان نزیک بوویەوە، ڕۆیشتم بۆ ئەوەی بانگ بدەم بۆ نوێژ.

دەنگم زۆر بریندار و شکێنراو بوو.. هەموو ئەو خەمەی هەمبوو دەری دەخست و دەیخستە سەر بەڕەوە..

♦ ♦ ♦

پاشان زانیم کە شتەکە گەیشتووەتە لای پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت).

هەروەها ئەو ئاگاداری کردووەتەوە، پرسیاری لێکردووە. ئەوەت کرد؟ بە دایکی ناوزەندت کرد؟

ئەویش دانی بەوەدا ناوە کە کردوویەتی.

پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)یش وشەیەکی پێ گووتوە، کە هێشتاش لە مێشکم و ویژدانمدا دەزرنگێتەوە..

پێی گووتووە تۆ پیاوێکیت هێشتا نەفامی لە دەروونتدایە!

نەفامی یەک جار.

دەربڕینێکی زۆر بەهێزە، ئاماژەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە تێپەڕین لە سەردەمی شیرک و بت پەرەستی، دەڵێت شتەکە تەنها ئەوە نییە واز لە پەرەستنی بتەکان بهێنیت، بەڵکو ئەوەیە لە دەروونتدا هیچ شتێک لەو بنەمایانە نەهێڵیتەوە کە ئەوی ڕۆژ باو بووە لە سەردەمی بت پەرەستیدا.

ئەو وشەیە هەر لە ناخمدا مابوویەوە، واملێهاتبوو چاودێری خۆمم دەکرد: ئایا لە نەفامیەکەی منیش هیچ ماوەتەوە؟

ئەو وشەیە، کە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) گووتبووی، وای لێکردم تێبگەم بۆچی ئومەیە لە خەونی ئەو شەوەدا دەرکەوت..

لە هەر یەکێک لە ئێمەدا ئومەیەیەک هەیە، کەم لەو لە زۆرێک لە ئێمەدا هەیە، ئومەیە، نەفامی، ئومەیەی کوفر، ئومەیەی کەزیاد و کەم دەکات... کەمێک لە ئومەیە هەیە، تەنانەت لای ئەوانەش کە ئومەیەیان نەناسیوە.

بەو شێوەیە لە خەونەکەم تێگەیشتم..

بەو شێوەیەش تێگەیشتم لەوەی پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) بە ئەو هاوەڵەمی گووتبوو کە بە دایکم ناوزەندی کردبووم (ڕەش پێست).

تۆی پیاو، شتێکت لە ئومەیە تێدایە.

ئەوجا کاتێک بانگم دا بۆ نوێژ، یەکەم جار دوای ئەوەی زانیم پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) چی گووتووە، هەستم کرد کە دەنگم بە بەهێزی هاتەوە، چالاک، پڕ لە وزە و، ئومێد.

♦♦♦

From: Amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

Subject: ساڵەکانی مەدینە

لەو ماوەیەی دواتردا کە بیلال لە مەدینە بەسەری برد، ڕووداوگەلێکی زۆر نەبوون، تەنها ڕووداوێکی گرنگ نەبێت کە لە ساڵی دووەمی کۆچیدا ڕوویدا ئێستا دێینە سەری.

مەدینە بۆ دە ساڵی دوای ئەوە گەشە دەکات و، گەورە دەبێت و، ڕۆڵی گەورەترین دەبینێت لە دوورگەی عەرەبیدا تاوەکو دواتر سەردەکەوێت و دەسەلمێندرێت و دانی پێدا دەنێنێت.

بیلال لە لای خۆیەوە، گەورە دەبێت وەک بەشێک لەو کۆمەڵگایەی کە گەشە دەکات.

شتێکی ئەوتۆی لێ نابینین لێرەدا، بەڵام هەموو ڕۆژێک بوونی هەیە، لەگەڵ هەموو نوێژێکدا، پێنج جار لە ڕۆژێکدا، شاهیدی گەشەکردنی ئەم کۆمەڵگە و هێزەکەیەتی..

تەنها سێ ڕاستەقینە ئاماژە بۆ بارودۆخی بیلال دەکەن وەک بەردەیەکی ڕەشی پێشوو لە ناو کۆمەڵگا نوێیەکەدا.

ڕاستی یەکەم، کاتێک بیلال لەگەڵ یەکێک لە باوەڕدان بە شەڕ هات، ئەویش ئەبو زەڕی غەفاریە، جوێنی پێدا و گووتی: ئەی کوڕی ڕەش پێستەکە، دواتریش پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) ئاگاداری کردەوە و پێی گووت" تۆ پیاوێکیت نەفامیت تێدا ماوە"، ئەوەش واتای ئەوەیە هێشتا بێ باوەڕیت تێدا ماوە کە بە باوەڕ لانەچووە، بێ باوەڕی بەستراوە بە ڕەفتار و بنەماکانەوە نەک پەرستن و سومبولەکان.

تێبینی دوو شت دەکرێت لێرەدا، یەکەم ئەوەیە ئەو ڕووداوە بەشێوەیەک باسکراوە وەک ئەوەی ڕووداوێکی زۆر گەورە بێت و گەیشتووەتەوە بە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)، ئەوەش مانای نائاسایی و نامۆبوونی دەگەیەنێت، بە نزیکەیی کۆتایی پێهێنراوە.

دووەمیش ئەوەیە کە ئەوەی ئەم چیرۆکەی گێراوەتەوە بیلال نەبووە، بەڵکو ئەو کەسەی کە جوێنی پێدا! ئەوەش لە کاریگەری ئەوەی کە کردوویەتی گێڕاویەتیەوە پاشان چۆن ئەو ڕاستەقینەیە ڕەفتاری گۆڕیوە لەگەڵ هەمووواندا.

ڕاستەقینەی دووەم ئەوەیە کاتێک بیلال داوای کچێکی کرد بۆ براکەی لە یەکێک لە ماڵە بە ڕەگەز عەرەبەکان، ئەوەش شتێکە کە ناکرێت ڕووبدات یاخود هەر بیریشی لێ بکرایەتەوە لە پێشووتردا، بیلال ئەمەی پێگووتن:«من بیلالم، ئەمەش براکەمە، ئێمە دوو پیاوین لە حەبەشەوە، ئێمە ون بوبوین، خودا ڕێگەی نیشانداین، خاوەندار بووین خودا ئازادی کردین، ئەگەر کچەکەتان لێ مارەکرد ئەوە ئەلحەمدولیلا، ئەگەریش ئێمەتان گەڕاندەوە ئەوە سوبحانەڵا».

لە شوێنێکی دیکەشدا دەڵێن کە گووتویەتی پێیان:

«من بیلالی کوڕی ڕەباحم، ئەمەش براکەمە و مرۆیەکی خراپ ڕەفتار و ئاینە، جا ئەگەر ئارەزووتان لێبوو کچەکەتانی لێ مارە بکەن ئەوە مارەی بکەن، ئەگەریش نەتانویست ئەوە لێی گەڕێن» ئەوانیش گووتویانە: کێ برای بێت ئەوە پێی دەدەین ئەوجا پێیان داو مارەی کرد.

لێرەدا تێبینی دەکەین کە مارەکردنی (ڕەش پێست)، بەردەی پێشوو، لە کچێکی سپی پێست بووتە شتێکی ئاسایی، هەموو ئەمانەش تەنها لە ماوەی چەند ساڵێکدا، لە کاتێکدا کە ڕەش پێست پێش ئەوە سوکایەتی پێدەکرا، بەڵام وەک دەزانیت، ئەو شتە چەند دەیەیەکی ویست، بەڵکو بگرە سەدەش، تاوەکو بووە شتێکی ئاسایی لە ئەمریکا.

هەروەها تێبینی ئەوەش دەکەین کە بیلال مشتومڕکار نەبووە، بە براکەی گووتوە ڕەفتاری خراپە! چووە بۆ ئەوەی داوای کچ بکات، بێگومان کێشەی ڕەنگ و ڕەگەز هەبووە لەو نێوەندەدا، بەڵام ئەو دەڵێت کە ڕەفتاری خراپە.

ئەم سیفاتە لە بیلالدا، زۆر گرنگ دەبێت لە ژیانیدا و لە دواتردا..

ڕاستەقینەی سێیەم ئاماژە بەوە دەکات کە بیلال پۆستێکی گرتووەتە دەست کە لە پۆستی وەزیری ئازۆقە یان ڕاسپاردەی شتومەکەکان بووە لە سەردەمی پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت)دا..

لە عەبدوڵاوە دەگێڕنەوە دەڵێت: پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) (ﷺ) چوویە ژوورەوە بۆ لای بیلال کە سەبەتەیەک خورمای لە لا بووە، پێی گووتوە: « ئەمە چییە بیلال؟» گووتویەتی: ئەی پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێت)ی خودا، ئەمە بۆ تۆ و میوانەکانت، فەرموی: «ئایا ناترسیت هەڵمێکی لە ئاگر هەبێت؟ ببەخشە بیلال! مەترسە لە خاوەن عەرش کە کەمی بکاتەوە».

ناکرێت ئەوە تەنها لەبەر ئەمانەت پارێزیەکەی بێت، هەروەها بیلال بەرپرس بووە لە دابەشکردن وەک ئەوەی ڕوونە لە ڕاستەقینەکەوە.

بەڵێ ئەو ئەمانەت پارێزە، بەڵام دەیشیتوانی چاودێری بارودۆخەکان و پێویستی و خوێندنەوەی داواکاریەکانی داهاتوو بکات.

ئەوە پێگەکەی بوو.

◆ ◆ ◆

## لاتيشا

تێنوسەکەم بڵاو کردەوە لەو ڕۆژەوەی ڕوون و ئاشکرا دیار بوو کە بیلال بینینی بەرەو خراپ بوون دەچوو.

لە بەردەممدا دەڕۆیشت بۆ چێشتخانە و خۆی بە دەرگاکەدا کێشا.

شێوەی چاوی دەستی بە گۆڕان کردبوو بە تەواوی. دەچوونە ناوەوە.

ماوەیەکە شتەکان بە تێکەڵی دەبینێت، هەمووی نا، تەنها نزیکەکان، جارێکیان کردیە گاڵتە لەگەڵمدا و گوتی شتەکە بەو خراپیە نییە، چونکە ئەو من بە دووان دەبینێت.

خۆزگە من دوانم لەو دەبینی.

بەڵام هەر یەک دانەیە و، خەریکە لە دەستم دەڕوات.

تەنها یەک دانە و بە شتەکاندا دەکێشێت و، هیلاکی و بێهێزی بە خێرایی لێی دەردەکەوێت تەنها بە قسە کردنیش، تەنها یەک دانە و خەریکە بە باشی نابینێت و، قوتدانی خواردن بۆی قورس بووە، ئەوەش لە خواردن و خواردنەوە و هەموو شتێکدا.

تەنها یەک دانە و لە دەستم دەڕوات.

بەڵام هیچ کاتم نییە بۆ ئەوەی لە ئاخ و ئۆف هەڵکێشاندا بەسەری ببەم، بە زۆری هەموو ژیانم دەبێت بۆ یاد کردنەوە و ئاخ و ئۆف کردن. ئێستا پێویستە سەرنج بدەمە ئەو ژیانە کەمە ماوەیەی پەپولەکە کە ماوەتەوە.

دەبوایە شێوەی ژیانمان بگۆڕم بە پێی گۆڕانی بەردەوامی بارودۆخی تەندروستی بیلال، هەموو ئەو شتانەی کە ئەگەری ئەوەی هەبوو سەرەڕێگە بێت بۆی لە ڕێگەکەی لامبردووە، ڕووناکیەکانی ماڵەکەم زیاد کرد بە شێوەیەک هیچ شتێک بینینی نەشێوێنێت، گۆچانێکیش زیاد بوو بۆ یارمەتیدانی لە ڕۆیشتندا، بە تەواوی قایل نەبوو بە بەکارهێنانی، بەڵام وای

دەرخست کە شتەکە شادی هێنەرە و لە کاریگەریەکانی فیلمی (ترۆن) دەچێت.

دەمزانی کە بەم زوانە لەسەرم پێویستە کە کورسیەکی جوڵاو بکڕم..

کورسیەکی جوڵاو بۆ تاقانەکەم، بۆ پەپولە ڕەشە بێ هاوتاکەم کە دەمەوێت بفڕیت.

بەڵام بیلال سەرەڕای هەموو شتێک، زۆر بەهێز، پۆزەتیڤ بوو، هەندێک جار توانجی خەندە ئامێزی دەکرد، دەیگووت کە پێش مردن هیچ خراپ نییە و، لەگەڵیدا یاری و دیاری دێنێت! (مەبەستی گۆچان و کورسیە جوڵاوەکە بوو).

هەر سوور بوو لەسەر ڕۆیشتن بۆ قوتابخانە، ئەوە بە لای منەوە وەک بەرەنگاربوونەوەیەکی کەسی بوو لە نێوان خۆی و خۆیدا، وەک ئەوەی دەیەوێت بۆخۆی بسەلمێنیت کە نەخۆشیەکەی وەک بەهانەیەک بەکارناهێنێت بۆ نەچوون بۆ قوتابخانە.

دەمزانی کە شتەکە ئاسان نابێت لە سەری.

بەڵام هەر پێداگری کرد.

◆◆◆

گۆرانی (هەورەکان) ی زاک سوشیبم، وەک باکگراوندی پێگەکە دانا.

زاک کوڕێک بوو کە توشی شێرپەنجەی ئێسک بووبوو لە کاتێکدا چواردە ساڵ بوو، هەر بەرگری دەکرد لە نەخۆشیەکە بۆ ماوەی چوار ساڵ کە تێیدا دە نەشتەرگەری و بیست چارەسەری کیمایی بۆ کراوە، بەڵام نەخۆشیەکە بڵاوبووتەوە بۆ حەوزی و، تەنها ئەو بژاردە لە بەردەمیدا بووە کە نەشتەرگەریەک بکات و قاچی ببڕنەوە و، گەرەنتی وەستانی نەخۆشیەکەی نەکرێ، یاخود ئەوەیە بۆ چەند مانگێک بژی بە قاچەکانیەوە و، شتەکان زۆر لە ژیانی ئاسایی بچێت.

زاک بڕیاری دا کە بە ئاسایش بژی بێ ئەوەی قاچی ببڕنەوە و، هەوڵیدا ئەو چەند مانگەی کە ماوەتی وەک ئەوەی خۆی پێی خۆشە بژی، بۆیە گروپێکی مۆسیقای دروس کرد و، چەند گۆرانیەکی نوسی، یەکێک لەوانە (هەورەکان) بوو کە باس لە مردنە نزیکەکەی دەکات.

لە ڕۆژی بە خاک سپاردنەکەیدا، ئەو گۆرانیە یەکەم گۆرانی دەرچوو لە itunesدا..

ئەو گۆرانیە زۆر گونجاو بوو بۆ تێنوسەکەی بیلال، وەک پەنجە مۆرێک بوو کە زاک لەم جیهانەدا جێی هێشتبێت پێش ئەوەی بڕوات.

ڕێک وەک ئەوەی بۆ بیلال دەمویست.

◆◆◆

" سەرکەوتم لە قایلکردنی دایک و باوکی جاک بۆ ئەوەی دژی قوتابخانە نەجولێنەوە" مستەر وید بە لووت بەرزیەکەوە گووتی.

تەنانەت هەوڵی خۆدەرخستن بە باوەڕکردنم نەدا.

" حەتمەن ئەوە کارێکی زۆر قورس بووە مستەر وید، تۆ بەهرەت هەیە لە وتوووێژکردندا کە دەتوانیت بیقۆزیتەوە بۆ ئێف بی ئای".

هەوڵمدەدا بە جددی خۆم دەربخەم، بەڵام لەگەڵ ئەو ڕستەیەی گووتم خۆدەرخستنەکە بێ سوود بوو.

" مس لاتیشا، هیچ هەست ناکەم کە تۆ نرخی ئەوە بزانیت کە بۆم کردویت، ئەم بابەتە کاریگەری لەسەر تۆماری پیشەییەکەت دروست دەکرد و لە بەردەمت دەوەسایەوە لە گەڕان بە دوای هەر کارێی دیکەدا".. بە قین و ڕقێکەوە گووتی.

" ئەگەر بیانویستایە دادگاییانە بجولێنەوە لە دژی قوتابخانە، ئەوە کاریگەریەکی گەورەتری لەسەر تۆمارەکەی تۆ جێدەهێشت مستەر وید".

پاشــان بــه شــێوەیەکی قینــاوی وەک ئــەوەی خــۆی: " لەوانەیــە خانەنشینییەکەتی خێرا بکردایە".

کۆنترۆڵی میشکی لەدەستدا کاتێک ناوی خانەنشینی هات، بە تورەییـەوە گـووتی: هـیچ شـتێک کاریگـەری لەسـەرم نـەدەبوو، هـەر لـە سـەرتاوە پـێم گووتی (جذور) بیرۆکەیەکی خراپ بوو.

سـەری گـوێ پێنـەدانم لەقانـد، مـن دەمزانـی کـە دایـک و بـاوکی جـاک ئەسڵەن ئارەزووی هیچ جوڵەیەک ناکـەن لـەو بابەتـەدا، لەوانەیـە ئـەو هـەوڵی هاندانی دابێتن بەڵام شکستی هێناوە، بۆیـە ویسـتویەتی وەک سـەرکەوتویەک مامەڵە بکات.

" بـە گشـتی، لیژنـەی قوتابخانـە دوێنـێ کۆبویـەوە و بڕیـاری وەسـتاندنی گووتنەوەی ڕۆمانی (جذور) ی دا".

"چی؟" بە نزیکەیی هاوارم کرد.

هەستی بە سەرکەوتنی کرد بۆیە هەموو ڕستەکەی بـە هێواشـی گووتـەوە وەک ئەوەی تامی هەموو ئەو وشانە بکات کە دەیڵێت.

"ناتوانیت ئەمە بکەیت مستەر وید" بە دەنگێکی بەرز گووتم.

"من نا، ئەوە بڕیاری لیژنەی قوتابخانە بوو"، دەنگی پێدرا و زۆرینە ٧ بـە ٤ بوو، ئەوە بڕیاری من نەبوو... ئیدی (جذور) نییە لە پۆلدا مس لاتیشا".

" ناتوانن ئـەوە بکـەن" بـە شـێوەیەک گـووتم وەک ئـەوەی لەگـەڵ خۆمـدا قسە بکەم.

" ئەوە کردمان".

بە یەکلایی کردنەوە گووتی.

◆◆◆

بـە گـوێرەی ڕێکـار و ڕێسـاکان، لیژنـەی قوتابخانـە دەتوانێـت ئـەوە بکات"...ماگی بە تێگەیشتنەوە گووتی.

" به بێ ئاگادار کردنەوەی من؟"... پرسیارم کرد.

" وا دەردەکەوێت، شتەکە تەواو بووە بە بێ ئەوەی مستەر وید ناوت بێنێت یاخود ئامـاژەت بۆ بکات، ئەم جارەیان بە زیرەکانە یارییەکەی کردووە، هەر بۆیە هیچ لایەنگیریەکی کەسی لە بابەتەکەدا نەبووە، سەرەتا هەموو بەڵگەنامەکانی پێشکەش کردووە کە ئەلێکس هیلی تاوانبار دەکات بە دزینی ئەدەبی لە ڕۆمانێکی دیکەوە، دەشزانی کە شتەکە یەکلایی بووتەوە لە دادگا دژی هیلی و، سەرنجی خستووەتە سەر ئەوەی هیلی شتەکەی بە شێوەیەک پێشکەش کردووە وەک ئەوەی چیرۆکێکی باپیری بێت، لە کاتێکدا ئاشکرا بووە کە هەندێک بەشی لە ڕۆمانێکی دیکەوە بردووە کە پێش ئەوە نوسراوە.. وید دەربارەی ئەو پەیامە ئەخلاقییە دەدوا کە پێشکەش بە قوتابی دەکرێت بە ریکلامکردن بۆ دزینی ئەدەبیات".

بێدەنگ بووم، وید زۆر باش دەیزانی کە من پێشتر ئەوەم بۆ قوتابییەکان ڕوون کردووەتەوە، باس لە ڕۆمانەکە دەکەین، نەوەک یاداشتە باوەڕپێکراوەکان.

ماگی بەردەوام بوو: پاشان ئەو بەڵگەنامانەی پێشکەش کردووە کە دەیسەلمێنێت هەموو ئەو شتانە بەو خراپییەش نین!

ئۆو خودایە! پێم گووت: ئایا کەس هەبوو یارمەتی بدات یاخود تەنها وانەیەک بوو لە یەک لاوە؟

ماگی گووتی: وانەیەکی بێزارکەر و ئامادەکراو، باسی هەبوونی زۆرداری و چەوساندنەوەیەکی زۆری دەکرد بەرامبەر ڕەش پێست پاشان دەهاتەوە دەیگووت شتەکان بەو شێوەیە نەبوون کە لە ڕۆمانەکەدا باس کراوە، بەوەش زۆر بابەتییانە دەردەکەوت...

ئەوجا چوویە سەر بابەتی شەڕەکەی جاک و بۆبی، تەنانەت لەو مەسەلەیەشدا زۆر بابەتی دەردەکەوت، گووتی ئەوە تەنها شەڕێک بووە و

هـەموو ڕۆژ ڕوودەدات، بـەڵام "بـۆ دەبێـت خۆمـان بخەینـە مەترسـیەکەوە بـۆ کارێکی ئەدەبی کە هەموو ئەو کێشانە لە خۆ دەگرێت".

هەر بەو شێوەیەش ٧ بە ٤ دەنگی بەدەست هێنا..

بۆچی ئاگادارت نەکردمەوە ماگی؟ بە دڵتەنگییەوە لێم پرسی.

گـووتی: پـێش کۆبوونەوەکـە بـە بابـەتی دەنگدانـە پێشـنیارکراوەکەم نەدەزانی، دوای ئەوەش کە زانیم، نەمویست بێزارت بکـەم... سـوودی هـەموو ئەو شتانە چییە؟ زۆر باش دەزانم کە تۆ دەتویست بەشی یەکـەمی ڕۆمانەکـە پێشـکەش بکـەیت، کـە تایبەتـە تـەنها بـە کۆنتـا کینتیـەوە، تـۆش خەریکـە تەواوی دەکەیت، ئەی ئیدی بـۆچی کێشـە دروسـت بکرێـت کـە تـۆ پڕیـت لـە کێشە، تۆ ئێستا بە پێی پێویستت هەیە لاتیشا".

ئەرێ، خەریکبوو کۆنتا کینتیم تەواو دەکرد، لەوانەیـە تـەنها بـە ٣ وانـەی دیکە، بەڵام هیچ وەک ئەوە نییە کە لە لایەن لیژنەی قوتابخانـەوە ڕابگیرێـت. هەسـتم کـرد کـە کۆنتـا کینتـی لـە گۆڕەکـەی دێتـە دەرەوە و دەسـتی دەبەستنەوە، هەستم کرد کە دووبـارە قـامچی لێدەدەنـەوە و لێـی دەپرسـن: ناوت چییە؟

ئەرێ بە خودا ڕاستە، من پـڕم لـە کێشـە، بـەڵام ئایـا سـەرقاڵ بـوونم بـە بیلالەوە و بارودۆخی تەندروسـتیەوە دەبێتـە بەهانـە بـۆ ئـەوەی واز لـە کۆنتـا کینتی بێنم ببەسترێتەوە و بە قامچی لێبدرێتەوە سەرلەنوێ!.

هەر ڕاس ئەوەبوو کە ڕوویدا.

پـێم گـووت: " ئایـا دەتـوانم داواکاریـەک پێشـکەش بکـەم بـۆ لیژنـەی قوتابخانە کە ڕیگەم پێ بدات بە تەنها یەک وانـەی دی، بـۆ ئـەوەی بابەتەکـە بە کورتی تەواو بکەم؟".

" بـەڵێ، ئـەوە زۆر ژیرانەیـە بـە بۆچـوونی مـن، زۆر قورسـە کەسـێک بدۆزیتەوە لە دژت بووەستێتەوە لەمەیاندا".

"بێجگە لە مستەر ویـد" مـاگی ئـەوەی گـووت بـە زەردەخەنەیـەکی بەدکارانەوە.

« هەورەکان »

دارِشتن و گووتنی زاک سوشیب
کەوتمە خوارەوە
بۆ ئەم چاڵە تاریک و ترسناکە
ئیدی کەسێ نەماوە
تا گرنگیم پێ بدات لەمەودوا
دەبوایە رِێگەیەکم بدۆزیایەتەوە بۆ ئەوەی سەرکەوم و
دەست بگرم بە لێوارەکەوە
تۆ لەوێ بوویت
بە دەستیشتەوە پەتێک هەبوو.
ئێمە بەرز دەبینەوە بۆ سەرەوە
بەڵام من کەمێک بەرزتر دەفرِم، بۆ ئـەو شـوێنەی کـە دیمەنـەکان کـەمێک جوانترن.
بۆ سەرەوە ئازیزەکەم
زۆر ناخایەنێت ئێستا، زۆر ناخایەنێت ئێستا
کاتێکیش دەگەرِێینەوە بۆ زەوی
هەلەکەم بە دەست ناهێنم
من ئامادە دەبم بۆ ژیان، بەلام لە بندا دەستم دەبردرێت.
لەوانەیە رِۆژێک بچین بۆ گەشتێک
دەفرِین بۆ سەرەوە..
هەموو شتێک باش دەبێت

بەرز دەبینەوە بۆ سەرەوە

بەڵام من کەمێک بەرزتر دەفڕم

دەچمە نێو هەورەکان، دیمەنەکان لەوێ جوانترن

زۆر ناخایەنێت ئێستا، زۆر ناخایەنێت ئێستا.

تەنها ئەگەر کاتێکی زیاترم هەبوایە

تەنها ئەگەر کاتێکی زیاترم هەبووایە لەگەڵت

دەتوانین بڕۆین بەرەو سەرەوە

بچین بۆ گەشتێک، دەستی یەکدیش بگرین

هەموو شتیک باش دەبێت

لەوانەیە ڕۆژێک دووبارە بتمبینمەوە

هەر بە هەورەکاندا دەفڕین

هەرگیز کۆتایش نابینین

◆◆◆

From: amjadhelwani@bilalmovie.org
To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com
Subject: تۆڵەسەندنەوە

لە ساڵی دووەمی دوای کۆچکردنی بڕواداران بۆ مەدینە، شەڕێکی گەورە ڕووی کە ئەنجامەکەی مەزن و کاریگەری هەبوو لەسەر ئەو شتانەی کە دواتر ڕوویانـدا، بیلالیش ڕۆڵێکی گرنگی تێدا هەبوو، ڕۆڵێکی گرنگ لەبەرەپێشچوونی شەڕەکە بەباشی و لە قازانجی باوەڕداران، کە ڕووشیدا کارگەریەکی زۆر مەزنی لەسەر ژیانی کەسی بیلالدا هەبوو.

بێ باوەڕەکان لە مەککە هەموو ماڵ و موڵکی ئەو باوەڕدارانەیان دەرکێشابوویە دەرەوە کە لە مەککە چووبونە دەرێ، هەندێکیش لەو موسوڵمانانە زەنگین بوون، ئەوانەی دیکەش هەژار بوون، بەڵام بێ جیاوازی ماڵ و سەروەتی هەموویانیان بردبوو.

ئەمەش بەهانەیەکی بەس بوو بۆ ئەوەی باوەڕداران هەوڵی بژاردنی ئەوە بدەن کە بێ باوەڕەکان لێیان بردبوون، ئەمەش بە ڕێگری کردن لەو قافڵە بازرگانییەی ماڵ و موڵکەکانیانی هەڵگرتبوو، کە لە شامەوە دەهاتن و، وەک ئەوەی دەردەکەوت بە نزیکی مەککەدا تێدەپەڕین، یاخود هەر بە لایەنی کەمەوە بە ناوچەیەکی سنووردارکراودا کە بۆ باوەڕداران ئابڵۆقە خستنە سەریان ئاسان بوو.

باوەڕدارەکان خۆیان ئامادەکرد و چوونە دەرەوە کە نزیکەی سێ سەد پیاو دەبوون، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو قافڵەیە و بەدەستهێنانەوەی ئەو شتانەی کە قەرەبووی ماڵ و موڵکە براوەکەیانی بۆ دەکردنەوە.

بەڵام ڕابەری قافڵەکە، کە پیاوێکی زیرەک بوو، بە دەرچوونی باوەڕدارەکانی زانی تاوەکو بگەنەوە بە قافڵەکە، هەر لەبەر ئەمە بە خێرایی

ئاراستەکەی گۆڕی بـە شـێوەیەک زۆر قـورس بـوو باوەڕدارەکـان بگەنـەوە پێیاندا، لە هـەمان کاتیشـدا نێردراوێکـی بـۆ مەککـە نـارد تـاوەکو ئاگاداریـان بکاتەوە کە ماڵ و سامانیان کەوتووەتە مەترسـی و ئەسـتاندنەوە و پێویسـتە لەسەریان لە مەککە بێنە دەرەوە بۆ هاوکاری.

هەر بەم شێوەیە لەبری ئەوەی باوەڕدارەکان خۆیـان لەبـەردەم قافڵەیـەکی ئاسان بەدەست هێنراو ببیننەوە.

خۆیان لەبەردەم سوپایەکدا دیتەوە کە ژمارەیان سێ هێندە بوو.

ئەو کاتە پێغەمبەر( درودی خودای لەسەر بێت) توانی پلانێک دابنێت کە قـەرەبووی کـەمی باوەڕدارەکـان بەرامبـەر بـێ باوەڕەکـان بکاتـەوە، هـەروەها توانیشی وورەی سوپاکەی بەرز بکاتەوە و، گروپێکی نـاردە نێـوان ڕیـزی بـێ باوەڕەکانەوە، ئەمەش هەمووی بووە هۆی سەرکەوتنی سـوپاکە کـە کـەمترین بوون لە ژمارەدا و کەمترین ئامادەکاریان کردبوو و، بە هیچ شـێوەیەکیش بـۆ جەنگ نەهاتبوونە دەرێ، ئەمەش بەرامبەر سوپایەکی ئامادەکراو و ژمـارە زۆر کە هاتبوونە دەرێ و دەشیانزانی بۆ جەنگ دەڕۆن.

ئـەم سـەرکەوتنە پێشـوەختە دەوڵـەتی تـازە پێگەیشـتووی کـردە نێـو بارودۆخێکی نوێوە لە نەخشەی هێزی دوورگەی عەرەبیدا، وای کرد لە هـەموو هۆزەکـانی عـەرەب، کـە مەککـەیان بـە گرنگتـرین و بـەهێزترین دادەنـا، بـە شـێوەیەکی جیـاوازتر تەماشـای مەدینـە بکـەن، هـەروەها نەخشـەی ئـابووری نمونـە لـە هێڵـی ڕۆیشـتنی قافڵـە بازرگانیـەکان لـە شـام و یەمەنـەوە بـەوە کاریگەر بوو.

پەیوەندی بیلال چییە بە هەموو ئەمانەوە؟

بیلال پەیوەندیەکی زۆر چڕ و پڕی بەمەوە هەیە.

چونکە بیلال ئومەیەی سەرگەورەی کوشت.

سەرگەورەکەی پێشووی و، یەک لە گرنگترین سەرکردەکانی مەککە..

ئەوانەی کە کوژران بویە هۆی شکاندنی مەککە و سەروەریەکەی لە نێو عەرەبدا.

بیلال ئومەیەی کوشت.

ئەوەی کە بە بەردەکە ئەشکەنجەی دەدا.

بیلال ئومەیەی کوشت، ئەوەی کە گەنجەکانی مەککەی هاندەدا بۆ ڕاکێشانی بیلال بە شەقامەکاندا..

ئەوەی کە ئازار و ئەشکەنجەی دەدا لەسەر لمە گەرمەکەی دوای نیوەڕوان.

بیلال ئومەیەی کوشت..

هەروەها ڕستەیەکی بە ناوبانگیش دەڵێت: سەری کوفر و بێ باوەڕی ئومەیە، رزگارم نابێت گەر تۆ لە مردن ڕزگارت ببێت.

ئەوجا کوشتی!

♦ ♦ ♦

## بیلالی حەبەشی

لە دوورەوە سوپاکەیان دەبینم.

لە خۆم دەپرسم..

تۆ بڵێی لەوێ بێت؟ لەگەڵیان هاتووە؟ یاخود لە مەککە دەرنەچووە؟

ئایا دەبێت کەسێک لەوپەڕی دوژمنایەتی بوبێت لەگەڵ ئیسلامدا و دەرنەچێت؟...

لە دوورەوە، کە ئێمە لە چواردەوری بیرەکانی بەدرداین، دەنگی دەهۆڵ و زورنامان گوێ لێیە، گوێمان قۆڵاغی سەدای گۆرانی و هەڵاهەڵایانە...

ئەوان هاتوون تاوەکو شتەکە تەواو بکەن، هاتوون تاوەکو بە تەواوی لە نێومان بەرن، ئەوەیان دەوێت لە بەدر، ئەوەتا ئاهەنگی سەرکەوتنیان دەگێڕن پێش ئەوەی جەنگەکە دەست پێبکات..

ئەی بۆ وا بیر نەکەنەوە؟ لە کاتێکدا ژمارەیان سێ هێندەی ئێمەیە؟

هەروەها جەنگاوەری دە هێندەی ئێمەیان هەیە..

قامچیەکانیم هاتەوە یاد. هاتەوە بیرم کاتێک جەڵدی دەکردم. بیری بەردەکەم کەوتەوە کە هەرگیز لە یادم ناچێت.

حەتمەن دەبێت ئومەیە لە تەکیان هاتبێت.

حەتمەن دەبێت هاتبێت تاوەکو ئەوە تەواو بکات کە دەستی پێکردبوو، ئەم جارە هاتووە بەردەکە بخاتە سەر سینگی هەمووان و بۆ ئەبەد هەناسەیان ببڕێت...

دەبێت ئەو لەوێ بێت لە لایەکی دیکەوە.

◆ ◆ ◆

هەرگیز ئومەیەم لە یاد نەکردووە، بۆ چەند ساڵێکیش بە ئازادی لە مەککەدا ژیام، کە ئەویش تێیدا دەژیا، چەند جارێک دیتومە، لە بازاڕ، لە

ڕێگادا، لەبەردەم دار الندوة دا... هیچ قورس نەبوو کە بەڕیکەوت چاومان بە یەک بکەوێت من و ئەو کاتێک لە شارێکی وەک مەککەدا بووین.

هەموو کات هەوڵمداوە ڕاستەوخۆ تەماشای چاوی بکەم. چەندە خۆزگەم دەخواست کەمێک پەشیمانی لە چاوەکانیدا بەدی بکەم لەوەی پێی کردم، یاخود هەر لەبەر وەفایەک بۆ ئەو ساڵە دوور و درێژانەی کە لە خزمەتکردنیدا بەسەرم بردبوو.

هیچ.

بە پێچەوانەوە، جار لە دوای جار کینە و ڕق و ڕەتکردنەوەی زیاترم لێ دەدیت. جار لە دوای جار پەشیمانی زیاترم لێ دەبینی لەسەر ئەوەی شتەکەی تەواو نەکرد، لەبەر ئەوەی کە نەیکوشتم... هەموو جارێک وا دەردەکەوێت پێیدا کە شکستەکەی لەبەرامبەر مندا بیر دەکەوێتەوە، بیری دەکەوێتەوە کە من فەرمانیم بەجێ نەهێنا، بەرەبەرە گوێم لیوەی دەبوو کە جوێنی بە پێغەمبەر ( درودی خودای لەسەر بێت) دەدا یاخود ئەو بارودۆخەی کە لە مەککەدا بە هۆی ئەوەوە (بە گووتەی خۆی صابیء) ڕوودەدات... زیاتر لە جارێک دیتومە تف لە زەوی بکات، لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە من بە ئازادی بەسەریدا دەڕۆم.. وەک ئەو..

مەککەم جێهێشت.

بەڵام لە یادم نەکرد.

تەماشاکردنەکانی، جوێنەکانی، بە قامچی لێدانەکانی، هیچیانم لە بیر نەکرد.

بە هەمان شێوە بەردەکەش.

لە یادم نەکرد.

لە یادم نەکرد.

کاتێکیش ئەبو زەڕ جوێنی پێدام، گووتی ئەی کوڕی ڕەش پێستەکە، زانیم کە ئومەیە، هەر بە لایەنی کەمەوە شتێک لەو، دەکرێت لە ناخی ئێمەدا خۆی حەشاردابێت..

لەوانەیە تەنانەت لە منیشدا..

جەنگانم لەگەڵ ئومەیەدا ئیدی جیاواز بوو.

بووە نیشانەیەک کە دەبوو لێی ڕزگار ببم.

بووە نیشانەیە بۆ هەموو لاوازییەک، بۆ هەموو توندڕەوییەک، هەموو نەفامیەک، هەموو خۆ بەزلزانیەک، هەموو ستەمێک..

ئومەیە ببویە پەیکەرێک، بتێک، کە لەوانەیە لە ناخمدا هەبێت، بە لایەنی کەمەوە شتێک لەو..

بوبویە شتێک کە دەبوو خۆمی لێ ڕزگار بکەم.

♦ ♦ ♦

لەوێ بوو، لە دووری چەند هەنگاوێکەوە.

دەبینرا.

لە سەربازگەی دووژمندا.

نا. نەمدیت. بەڵام هەستم بە بوونی کرد. دەبێت لەوێ بێت. نەدەکرا ئومەیە ئەم هەلە لەدەست بدات، شوێن و پلەو پایەی لە مەککەدا ڕێگەی نەدەدا کە نەیەت بۆ لەناوبردنی ئاینە نوێیەکە...

لەوێ...

ئومەیە لە دووری چەند هەنگاوێکەوە...

لێرەش..

ئومەیە، ئەگەر کەمێکیش بێت لەو، لە نێو زۆربەماندا هەیە.

♦ ♦ ♦

بۆ چەند ڕۆژێک بوو هەر خۆزگەم دەخواست کە چاوم پێی بکەوێت، بەڵام ئەم جارەیان وەک جەنگاوەر.

ئەم جارەیان مۆڵەتی خودام پێیە کە چەک هەڵبگرم.

هەروەها بۆ چەند ڕۆژێکیش، هەوڵمدەدا بەڕاستی لە خۆم تێبگەم.

ئایا دەمەوێت بیکوژم لەبەر خاتری خۆم، بۆ تۆڵەسەندنەوە! یاخود دەمەوێت ئەوە بکەم لەبەر ئەوەی کە دوژمنی خودایە! لەبەر ئەوەی ستەمکارە! لەبەر خاتری ئەوەی دوژمنی هەموو ئەو شتانەیە کە باوەڕم پێیەتی، هەموو ئەو شتانەش کە باوەڕم هەیە دادپەروەریی و هەقن؟

ئەگەر بمهەوێت تۆڵە لە ئومەیە بکەمەوە لەبەر ئەوەی ڕۆژێک ئازاری داوم، ئایا ئەوە ناگەیەنێت کە بەشێک لەو لەمندا هەیە؟ ئایا ئەوە ئومەییەی ناو ناخم نییە کە هانم دەدات بۆ ئەو کارە؟ ئایا شتێک لە نەفامی لە مندا نییە کە هانم بدات بۆ تۆڵەسەندنەوە؟

ئایا منیش پیاوێک نیم کە نەفامی تێیدا ماوە؟

زۆر لەگەڵ خۆمدا جەنگام...

دەستم لەسەر شمشێرەکەمە... چاویشم لەسەر سەربازگەکەی ئەوان..

وا دڵیشم خەریکە دێتە دەرەوە..

دەیبینم..

ئەم جارەیان لە گۆڕەپانی جەنگدا.

چەکی بەدەستەوەیە، منیش چەکم بەدەستەوەیە..

ڕێک و ڕاس یەکسانین، نەک وەک پێشووتر کە بووین...

بەڵام ئەم جارەیان، ناچار دەبێت کە دانی پێدا بنێت بەوەی کە یەکسانین..

ئەم جارە، لە کۆتایدا، هیچ هەڵبژاردەیەکی لەبەردەستدا نابێت جگە لەوەی دانی پێدا بنێت.

بیلال..

بەردەی پیشووی.. یەکسانە لەگەڵی...

♦♦♦

لە خۆم ترسام.

نەک لە ئومەیە.

ترسام لەوەی کە ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەم هەبێت وەک کەسێک، ترسام لەوەی لەبەر خۆم تۆڵەی لێبکەمەوە، نەوەک لەبەر ئەو بەها و بنەمایانەی باوەڕم پێیەتی... نەوک لەبەر خودا!

ترسام لەوەی کە ئەوە ئومەیەی ناو ناخم بێت کە دەیەوێت ئومەیە بکوژێت... ترسام لەوەی گەر ڕیگە بدەم ئومەیەی ناو ناخم ئومەیەی دەرەوە بکوژێت، دواتر ئومەیەکەی ناوەوەم سەر بکەوێت بەسەرمدا..

لەو ئومەیە ترسام کە لە ناخمدا هەیە، ئومەیەی کە نمونەی نەفامییە و دەکرێت پارچە و بەشی لە ناو هەر یەک لە ئێمەدا هەبێت، زۆر زیاتر لەو ئومەیەی کە پیاوێکە و لەوێدا وەستاوە و شمشێری هەڵگرتووە...

♦♦♦

جەنگ دەستی پێکرد.

چاوەکانم وەک چاوی هەڵۆ دەجوڵان و دەگەڕان بە دوایدا.

ئەوجا دیتم.

بەڵام نزیک نەبوومەوە.

هەر جارێک کە تەمای ئەوەم دەگرت کە نزیک ببمەوە و دەستم لەسەر شمشێرەکەم دادەنا، شتێک لە ناو ناخمدا بە توندی دەیهەژاندم: بە نیەتەکەتدا بچۆرەوە، ئایا دەتەوێت بیکوژیت لەبەر ئەوەی دوژمنی خودایە یاخود لەبەر ئەوەی سەرگەورەی پێشووتە و خراپترین جۆری ئەشکەنجەی داوی.

هەر جارێک ئاوڕم لێدەدایەوە ئەو دەجەنگا، شمشێرەکەم ڕایدەکێشام، بەڵام دڵم تەپەتەپی دەکرد و پێی دەگووتم: خاترجەمیت؟ ئەگەر کوشتت لەبەر ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەشکەنجەی داویت ئەوە ئیدی هەرگیز ناتوانیت ئەو بەردە لاببەیت کە ئەو لەسەر سینگی داناویت..

لە بەدردا دوو جەنگ هەبوون..

جەنگێک لە نێوان ئێمە و ئەوان، باوەڕداران و بێ باوەڕەکان.

جەنگێکی دیکەش لە ناخی مندا...

جەنگی نێوان من و ئومەیەی ناو ناخم، ئەو ئومەیەی ناو ناخم کە بەرەو کوشتنی ئومەیەی دەرەوە ڕینوێنیم دەکات وەک تۆڵەسەندنەوەیەک تاوەکو خۆی لە ناخمدا بۆ ئەبەد بژی.

بە شمشێرەکەی دەستمەوە دەجەنگام، بەڵام لە ناوەوە جەنگێکی دیکە هەبوو کە لە دڕندەییدا هیچی کەمتر نەبوو.

بە ناخمدا دەمچرپاند: ڕزگارت نابێت ئەگەر ئەو ڕزگاری ببێت.. ڕزگارت نابێت ئەگەر ئەو ڕزگاری ببێت...

بەڵام دەشمزانی، کە ڕزگارم نابێت ئەگەر لەبەر هۆکاری کەسی و تایبەتی خۆم بیکوژم، لەبەر تۆڵەسەندنەوە، گەر بمکوشتایە لەبەر ئەو شوێن برینانەی کە هێشتاش لەسەر پشتم ماوە، ئەوە تا کۆتایی تەمەنم دەبوایە هەڵم بگرتایە، جەستەیەکی مردوو، کە ویژدانم قورس و نائارام دەکات.

ڕزگارت نابێت ئەگەر ئومەیە ڕزگاری ببێت بیلال.

ئەرێ.

ڕزگارت نابێت ئەگەر ئەو ڕزگاری بوو.

بەڵام ڕزگاریشت نابێت بیلال ئەگەر بیکوژیت لەبەر ئەوەی پێش چەند ساڵێک ئازاری داویت.

ئەوکات زۆر نزیک دەبیت لەو و وەک ئەو دەبیت.

شمشێرەکان تەقەیان دەهات. تیغ لەسەر تیغ.

لە دەرەوە و ناویشەوە...

♦ ♦ ♦

وا خەریکن دەشکێن..

ئاشکرا دیار بوو کە سەرکەوتن بەشمان دەبێت..

چاوەکانم بەوپەڕی سەرنجەوە بە دوایدا دەگەڕا... دڵیشم زۆر بە توندی لێی دەدا... ئایا هەڵدێت بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت؟

ڕزگارت نابێت گەر ڕزگاری ببێت. ڕزگارت نابێت گەر ڕزگاری ببێت بیلال.

بە دوایدا دەگەڕێم. ئەوە لە تەک کوڕەکەی (علی)دایە، کە هاوتەمەنی منە، ئەوە چی دەکەن؟

وا دەردەکەوێت کە دەیانەوێت بکشێنەوە لە جەنگە دۆڕاوەکەیان.

ئومەیە هەر ئومەیەیە وەک هەموو کات، واز لە شتێک دەهێنێت تەنها لەبەر قازانج و ویستی خۆی.

بەڵام نا.

ئەم بارەیان نا.

ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت. ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت.

بە درێژایی جەنگەکە ئەوەم بە گوێی خۆمدا دەچرپاند.

بەڵام ئەم جارەیان وەک هاوار بوو: سەری کوفر و بێ باوەڕی ئومەیە.. ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت.

دەنگی خۆمم زۆر بە بەرزی بیست لەسەر زەوی بەدر... ئەوانەی دیکەش گوێیان لێوەی بوو..

ئـەوەی گـووتم کۆمـەڵێک لـە ئەنسـاری بـە ئاگـا هێنایـەوە، لـە خـەڵکی مەدینـە، شـێوەی ئومەیـەیان نـەدەزانی، پێشـتر نـەیانبینیوە، بـەڵام ناویـان بیستبوو، ستەمەکەی، بێ باوەڕییەکەی... لەوانەیە ئەوەیان بیستبێت کە بە منی کردووە... نازانم... بەڵام لـە پڕێکدا سـەرنجی ئـەوەیان دا کـە گـووتم و بەرەو ئەو ڕۆیشتن و شمشێرەکانیش لە دەستیان..

بە بێ ئەوەی هەستی پێبکەم دووپـاتم کـردەوە: ئـەی ئەنسـارانی خـودا.. سەری کوفر و بێ باوەڕی ئومەیەی کوڕی خەلـەف، ڕزگـارت نابێـت گـەر ئـەو ڕزگاری بێت...

وەک ئەوەی گوێی لێم بوبێت، لای دەکردەوە بۆ دواوە، ئایا منـی دیـت؟ ئایـا ئـەو بیلالـەی بینـی کـە ئەشـکەنجەی دەدا و سـوکایەتی پێـدەکرد لـە مەککەدا؟ ئایا دیتی کە ئێسـتا شـتەکە بـە کـوێ گەیشـتووە؟ یاخود جیـای نەکردمەوە لە دوورەوە و تەنها ئەنسارەکانی بینی کە ڕووبەڕووی دەڕۆن؟..

نازانم.. لە پڕێکدا درکم بەوە کرد کـە ئـارەزووم بـوو بگـەم پێـی، بـۆ ئـەو ڕووبـەڕە قورسـەی کـەمێک پـێش ئێسـتە لەگـەڵ خۆمـدا دەجـەنگام بـۆی، دەترسام لە تۆڵەسەندنەوەی خۆم ئومەیە بکوژم، بـەڵام ئـەوەتا ئەنسـارەکان، بە بێ ئەوەی هەسـت بـە جەنگەکـەی نـاو نـاخم بکـەن، چارەسـەری دەکـەن، دەیکـوژن، هـیچ بەهانـە و هانـدانێکی کەسیشـیان نییـە تێیـدا، هـیچ ڕۆژێ سوکایەتی پێیان نەکردووە، نەیبردوونەتـە دەرەوە بـۆ بیابانەکـەی دەوروبـەری مەککـە بـۆ ئـەوەی لـەوێ ئەشـکەنجەیان بـدات، بـەردی نەخسـتووەتە سـەر سـینگیان تـاوەکو ئاینەکـەیان بگـۆڕن، هـیچ کـات وای نـەدیووە کـە خـاوەنی ئەوان و دڵ و ئەقڵ و ئاوەزیان بێت بە شێوەیەک کە مافی بینینـی شـتێکیان نەبێت جگە لەوەی ئەو دەیبینێت..

بە سوکایەتی و جوێنەکانی گەورە نەبوونە..

هیچ شتێکی تایبەتیان دژی نەبووە.

ئەسڵەن پێشتر نەیانبینیوە.

ئەگەر منیش ناویم نەگووتایە، ئەوە تێبینی هیچ شتێکیان نەدەکرد...

چواردەوریان دا... منیش بە خۆمم دەگووت.. هەموو شتێک بە خێرایی کۆتایی دێت.. احد.. احد..

زیاتر لێی نزیک بومەوە..

کوڕەکەی یەکەم جار کوژرا... هیچ ڕۆژێک لەو باشتر نەبووە... احد.. احد..

گوێم لە یەکێک لە باوەڕداران بوو کە داوای لێدەکرد خۆی قوتار بکات و شایەتوومان بێنێت، گووتی پێی کە هەموو ئەو شتانە تەواو دەبێت گەر بیڵێت... ئەوەی کە پەشیمانی خۆی ڕابگەیەنێت لە هەموو ئەو شتانەی کە کردوویەتی..

کات لای من وەستا، هەستم کرد دڵم لە لێدان کەوت تاوەکو گوێم قوڵاغ بێت، هەستم کرد کە دونیا هەمووی وەستاوە تاوەکو گوێ ڕادێرێ داخۆ ئومەیە سەری کوفور و بێ باوەڕی، موسوڵمان دەبێت! موسوڵمان بوونی ڕادەگەیەنێت، ئەگەر تەنانەت بە دووڕوویش بێت، تەنها بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت..

کات وەستا وەک بیرێکی لە بن نەهاتوو، هەستم کرد کە گوێیەکانم بەرز بوونەتەوە و درێژبون تاوەکو ئەوە ببیستێتکە ئومەیە دەیڵێت..

چاودێری خۆشم کرد.. ئایا قایل دەبم بەوەی هەموو شتێک کۆتای پێدێت بە ڕزگاربوونی...

چاوەڕێم دەکرد..

دڵیشم وەک دەهۆڵ لێی دەدا.

بەڵام ئەو نەیگووت، هیچی نەگووت.

سـەری بـێ بـاوەڕی، تەنانـەت کـە لـەم بارودۆخەشـدایە، زۆر لـەوە خۆبـەزلزانتربوو شـتێک بێژێـت کـە پێشـووتر بەردەیـەکی ڕیسـوای وەک مـن گوتوویەتی..

پاشان گوێم لە هاوارەکەی بوو، هاوارێکی هێندە بەرز کە وەک ئەوەم بەر گوێ نەکەوتبوو.

کوشتیان، ئەوە کوشتیان.

سەدای هاوارەکەی هەر دەنگی دەدایەوە.

ئەوجا..

گوێم لێی بوو یەکێک گووتی" احد، احد"...

لە پڕێکدا، هەموو ئەوانەی گۆڕەپانەکە هاواریان دەکرد"احد، احد"..

نازانم کێ دەستی پێکرد، بـەڵام بێگومـان لـە مەککە بـووە، دیتـومی کـە دەیڵێم وەک ئەوەی جگە لەوە هیچ شتێکی دی نەزانم..

وەک ئەوەی ناوم بێت..

احد، احد هەموو هاوار دەکەن، وەک ئەوەی سومبولی سـەرکەوتنی ئـەمڕۆ بێت..

احد، احد..

ئەرێ... احد، احد...

سوجدەم بۆ خودا برد و دەمچرپاند: احد، احد..

ئێستا بەڕاستی بەردەکە لابرا.

ڕزگارم بوو.

ڕزگارم بوو.

# بیلال

پێش ئەوەی بنوم ئەوەم خوێندەوە کە ئەمجەد بۆمی نوسیبوو لە بارەی بیلالی حەبەشی و ئەوەی کردی لەگەڵ سەرگەورەکەیدا.

ئەو شەوەم لەوێ لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا بەڕێ کرد.

نازانم داخۆ خەونەکەم هەموو شەوەکەی بۆخۆی بردبێت یاخود ئەوەیە ئێمە خاوەنی کاتژمێرەکانمان نین لە کاتی خەودا.

بەڵام وام هەست کرد کە شەوەکەم هەمووی لەو جەنگەدا بەسەر بردووە.

دەمێک بیلال بووم و وەک ئەو هەستم دەکرد.

دەمێکیش یەکێک بووم لەوانەی پێشتر ئومەیەی نەناسیوە بەڵام گوێیان تێوەی بووە ئەوەش بەس بوو تاوەکو لێی بچنە پێشەوە و خۆیانی لێ ئامادە بکەن.

جارێکیش ئومەیە خۆی بووم کە شمشێرەکانم بەردەکەوت، وەک ئەوەی بمەوێت خاترجەم بم لەوەی کە مردووە، تۆزێک دەبم بەو و تۆزێکیش دەمرم تەنها بۆ ئەوەی دڵنیا ببمەوە، بۆ ئەوەی دواتر بچمە لای بیلال و بە گوێیدا بچرپێنم: ئەوە مرد!

بوومە بیلال زیاتر لە جارێک ، جارێک کە بەردەکە لەسەر سینگیەتی و خەریکە دەیخنکێنێت، قامچیەکانیش بوونەتە دێوەزمە بەسەر پشتیەوە و هەموویان ڕنیوە و، ئەویش دەڵێت احد، احد..

جارێکیش کە بە شەقامە تۆزاویەکاندا ڕادەکێشرێ و هەر دەڵێت احد، احد..

جارێکیش کە لە سوجدەدایە لە ناو گۆڕەپانی جەنگدا، چرپاندنەکانیشی احد، احد..

نازانم خەونەکە چەندی خایاند، بەڵام تەنها ئەوە دەزانم کە هەستامەوە هەستم دەکرد هەموو ئێسکەکانی جەستەم تێک شکاون و هەستم بە هیلاکیەکی زۆر دەکرد.

ئـەم جارەیـان ئـەوە نیشـانەیەک نـەبوو لـە نیشـانەکانی شـێرپەنجەی نەفرەتی.

بەڵکو ئەوە نیشانەکانی بیلالی حەبەشی بوو.

من لەگەڵیدا بووم لە جەنگەکەدا.

♦ ♦ ♦

لە قوتابخانە، دارەکەم دەبرد لەگەڵ خۆمدا، بەڵام زۆربەی کات هەوڵمـدەدا تا بتوانم بەکاری نەهێنم.

سەرەڕای هیلاکی و شەکەتی هەستم بە پێویستی ئەوە نەدەکرد.

لـە ڕاسـتیدا هەسـتم بـە پێویسـتیەکەی دەکـرد، بـەڵام پـێم وابـوو زیـاتر پێویستیم بەوەیە کە بەهێز بم.

خۆمم گرت.

بەڵام بە شێوەیەکی شێواوتر دەمبینی.

هــەموو شــتێک تێکئــاڵاو دەردەکــەوت، باخچــەی قوتابخانــە تێکئــاڵاو دەردەکەوت، هـەروەها هـەموانیش، هـەموو شـتێک ئـاڵۆز بەیەکداچووبوو بـە شـێوەیەکی شـێواو و شـێواوتر، دەرگـای قوتابخانـە، ڕاڕەوەکـە، لۆکـەرەکان، هەموو شتێک.

هەوڵمـدا بـە هێواشـی ڕێ بکـەم، یادگـەم بـەکاربهێنم لـە دیـاریکردنی هەنگاوەکانم، لە ڕاڕەوەکەدا سەرکەوتوو بووم، بەڵام لۆکـەرە ڕیزکراوەکـان بـە پــەنای یەکــەوە زۆر تێکــەڵ و پێکــەڵ بــوون، هەنــدێکیان کرابوونــەوە و هەندێکیان داخراو، نەیشم ئەتوانی لە کراوەکـان خـۆم لابـدەم، ڕوخسـارم زۆر بە توندی کیشای بـە دەرگـای لۆکەرەکـەی پـێش خۆمـدا، لـە کاتێکیشـدا وام دەزانی کە دەرگای دووەمە لە بەردەمم خۆمم دەکێشا بـە دەرگایـەکی دیکـەی لۆکەردا.

بە زەویدا کەوتم.. هەندێک پێکەنینی بە زۆر بیستراو هەبوو، هەشبوو کە هەوڵیدەدا یارمەتیم بدات تاوەکو هەستمەوە سەرپێ.

لەوێدا دەنگەکەی هات.

" تۆ ئەی سمت قەڵەو، لەوانەیە چیدیکە سمتت قەڵەو نەبێت وەک پێشتر، بەڵام هێشتا هەر سمتنیت".

ئەوە جۆن بوو.

وەستام، تەماشایم کرد، وەک هەموو شتێک دەردەکەوت، دووان لەو، دووان لە جۆن، لەگەڵ دوو زەردەخەنەی خراپەکارانە، هەر دانەیەک لەسەر ڕوخسارێک.

چەند ساڵ لەمە جۆن؟ چەند ساڵ؟

تێفکریم.

لە پڕێکدا خەونەکەی دوێکە شەوم هاتەوە یاد: بیلال و ئومەیە، هەموو ئەو ئەشکەنجانەی بیلال لەگەڵ ئومەیە، قامچییەکان و بەردەکە و پاشان ڕووبەڕووبونەوەی کۆتایی.

هەروەها هەموو ساڵەکانی پێشووم بۆ گەڕایەوە، لە یەکەم جارەوە کە جۆن یەکەم ناوناتۆرەی لێم نا، لە یەکەم جارەوە کە هەموو پۆلی هێنایە پێکەنین لێم، لەو یەکەم دانانی ڤیدیۆوە کە لە تەوالێتی کچان ڕام کردە دەرەوە لە ئینتەرنێت.

هەموو ئەو شەوانەم هاتەوە یاد کە خۆزگەم دەخواست بەشەودا بمرم تاوەکو بە هۆی جۆن و مایکەوە نەچم بۆ قوتابخانە.

لە پڕێکدا گوێم لە بیلال بوو دەیگووت: ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت.

خۆشم دۆزیەوە هەمان شت دەڵێمەوە: ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت.

ڕێگە نادەم ئەم جارەیان لەدەستم دەرچێت.

گوێم لە بیلال بوو دەیچرپاند بۆم: ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت. ئەم بارە وا دەردەکەوت کە ئەوە بە من بڵێت، هانم بدات.

خۆمم دۆزیەوە بەرەو جۆن دەچم. هێشتا هەر دووان لەو هەبوون.

هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێشەوە ڕۆیشتم، تەماشاکردنی سوکایەتی پێکردن و بەرەنگاربوونەوە لەسەر هەردوو ڕوخسارەکە بوو، هەردووکیان هی جۆنە.

تەماشاکردنێک کە واتاکەی: چی دەکەیت؟

بیلالیش بە ئەسپای دەیگووت پێم: ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت،ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت... ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت.

منیش نزیک دەبوومەوە. هەموو هێزەکەم کۆدەکردەوە تاوەکو بیکەمە ناو دەستمەوە. هەموو ئەو ئەشکەنجە و ڕیسواکردنەی ساڵانی پێشوو کە جۆن ببووە هۆکاری لە ناو مشتەکۆڵەی دەستم دا دامنا.

بیلالیش هێشتا هەر دەیچرپاند: ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت... ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت.

باشە. مشتەکۆڵەکەم ئامادەیە. ڕزگارت نابێت گەر ئەو ڕزگاری ببێت.

بەڵام دوو ڕوخسار لە بەرامبەرمدایە، مشتەکۆڵەکەم بۆ کامیان بوەشێنم؟

هاتە پێش چاوم کە چەندە شەرمەزاری دیکەم بۆ دروست دەبێت ئەگەر بکێشم بە ڕوخسارە نادروستەکەدا و مشتەکۆڵەکەم بە هەوادا بڕوات.

بە خۆمم گووت: احد، احد..

مشتەکۆڵەکەم بە خێرایی بەرز کردەوە و بەرەو ڕوخسارەکەی لای چەپم وەشاند.

به نزیکەیی چاوم چوقاندبوو، دڵنیا نەبووم لەوەی دەستم بەر شتێک کەوتووە.

بێدەنگی هەموو جێگایەکی داپۆشی. دڵنیا نەبووم کە دەستم بەر هیچ کەوتبێت.

ئێستا هیچ جۆنێک نییە لەبەرامبەرمدا.

هاوارێکی زۆر گەورە بەرز بوویەوە، هاوارێکی سەیر کە ئاشنای نەبووین لە جۆنەوە، بەڵام ئەوە دەنگی بوو کاتێک ئازاری دەبوو، هیچ کەس پێشووتر گوێی تێوە نەبوبوو کە ئازار بچەژێت.

تەماشای خوارەوەم کرد: جۆن ڕاکشابوو بە زەویدا و لە ناو ئازار تەپا و تلی دەکرد و لوتی گرتبوو، خوێنیش لە هەموو ڕوخساری بڵاو بوبویەوە.

دەنگی دیکەش هەبوو: ناوی منیان بەرز دەکردەوە، دڵخۆش بوون بە سەرکەوتنەکەم بەسەر جۆندا.

بەڵام بەرزترین دەنگ لە ناو گوێمدا ئەو دەنگە بوو کە هەموو گۆڕەپانی جەنگی داپۆشی کاتێک ئومەیە کوژرا..

احد، احد..

♦ ♦ ♦

## لاتيشا

پەیوەندیەکی تەلەفۆنیم لە قوتابخانەکەی بیلالەوە پێگەیشت.

ئەم جارە پەیوەندیەکە جیاواز بوو، هیچ کەس نەیگوت کە حاڵەتێکی پزیشکی بەپەلە هەیە وەک هەموو جارێک کە بارودۆخی خراپ دەبوو.

بەڵکو پێم گووترا کە بێم بۆ مشتومڕ کردن لە بارەی (شتێکەوە).

بەپەلە چووم بۆ قوتابخانە.

شتەکە بە ڕوونی دیار بوو کە جیاوازە ئەم جارە. هۆکارەکەی تێنەگەیشتم، بەڵام پێم گووترا بیلال باشە.

بەڕێوبەری قوتابخانەکە پێشوازی لێکردم، مستەر تۆمسۆن، پیاوێکی میهرەبان بوو کە هەموو کات ئەوپەڕی یارمەتیدانی پێشکەش کردووە.

ئەم جارەیان کەمێک شێواو و تووڕە بوو.

دوای ئەوەی پێشوازی لێکردم پرسی: ئایا بیلال هیچ جۆرە دەرمانێک دەخوات کە دڕندە یاخود توندڕەوی بکات؟

ئەو پرسیارەم پێ سەیر بوو. بیلال دڕندە و تووڕە؟

پێم گووت کە بیلال دەرمانی زۆر زۆر وەردەگرێت، دەکرێت هەندێکیان کاریگەری لاوەکی هەبێت، بەڵام کەس ئاگاداری نەکردوومەتەوە لەو جۆرە کاریگەریانە، هەروەک چۆن کەسیش ئاگاداری نەکردوومەتەوە کە بیلال ئەو کاریگەری و نیشانانەی هەیە.

بە هێمنی دەدوام، بە ئاوازی« لە ڕاستیدا و ڕاستیەکەی ئەوەیە»، پاشان بە ئاگا هاتمەوە لە پرسیارەکەی مستەر تۆمسۆن کە دەبێت هۆکارێکی دیکەی هەبێت جگە مشتومڕ کردن لەسەر دەرمانەکەی بیلال.

لێم پرسی: دەتوانم لە بارەی هۆکاری ئەم پرسیارەوە بپرسم؟

پێی گووتم: بیلال هەڵکوتاوەتە سەر هاوپۆلێکی و لێی داوە.

له دوایه‌وه گووتم: به لێدان؟

گـووتی: بـه‌ڵێ، بـه لێـدان، لێدانه‌کـه‌ش بووه‌تـه هـۆی شـکانی لـوتی هاوپۆله‌که‌ی.

پێم وابێت ده‌مم تا خواره‌وه کرایه‌وه و گووتم: بیلال ئه‌وه‌ی کردووه؟

مسته‌ر تۆمسۆن جۆره ته‌ماشایه‌کی کـرد وه‌ک بڵێـی ئیـدی به‌سـه چونکـه پێشـــتر کاردانـــه‌وه‌ی هاوشـــێوه‌ی زۆری دیـــوه و بـــه ته‌لـــه‌فۆن له‌گـــه‌ڵ سکرتێره‌که‌یدا دوا، پێی گووت ک، بیلال و جۆن بانگ بکه‌نه ژووره‌وه.

چه‌ند چرکه‌یـه‌ک و بـیلال هاتـه ژووره‌وه و که‌سێکی زۆر قـه‌باره گـه‌وره‌ش له‌گه‌ڵیدا هاته ژووره‌وه، لووتی پێچرابوویه‌وه به برین پێچ.

نه‌متوانی نێوان دیمه‌نه‌که و ئه‌وه‌ی که تازه گوترا به‌یه‌که‌وه ببه‌ستمه‌وه.

بـیلال له‌سـه‌ر ده‌موچـاوی ماسـکی گرنگیپێنـه‌دانی نه‌خشـاندبوو، هـه‌روه‌ک ئه‌وه‌ی هیچ کات نه‌یناسیبێتم.

ته‌ماشای به‌ڕێوبه‌ره‌که‌م کرد و ده‌مه‌ویست تێبگه‌م.

مسته‌ر تۆمسۆن گووتی: بـیلال دوێنـێ لـه هاوپۆله‌کـه‌ی داوه کـه جۆنـه و لووتی شکاندووه.

بـیلال ته‌ماشـای جـۆنی کـرد وه‌ک ئـه‌وه‌ی یه‌کـه‌م جـاری بێـت لـه ژیانـدا ببیبینێت. وا ده‌هاته پێش چاویشم که له ژێر لێوه‌وه پێده‌که‌نی.

هه‌وڵمده‌دا شته‌کان له مێشکمدا کۆبکه‌مه‌وه و گـووتم: « جـۆن لـه هـه‌مان پۆلی بیلاله، له پۆلی هه‌شته‌م؟».

مسته‌ر تۆمسۆن به به‌ڵێ سه‌ری له‌قاند.

«بیلالیش لێیداوه و لوتی شکاندووه؟».

دووباره مسته‌ر تۆمسن به به‌ڵێ سه‌ری له‌قانده‌وه.

ته‌ماشای بیلالم کرد، به‌و قه‌باره بچوکه‌یـه... ئـه‌م جۆنـه زه‌باله‌حـه‌ش کـه ده‌توانێت به ئاسانی وه‌ک پاسه‌وانی تایبه‌ت کـاری ده‌سـت بکـه‌وێت... سـه‌رم لادا له نێوانیان.

زۆر به قورسی کۆنترۆڵی خۆمم کردبوو تاوەکو لـه پێکەنیـندا نەتەقمـەوە، دەشمزانی سزای ئەوانە بە تەواوی چییە.

بەڵام نەمدەتوانی تێبگەم کە چۆن ئەوە ڕووی داوە، یاخود تەنانەت بـیلال چۆن توانی ئەوە بکات.

چی ڕوویدا؟

ئەوەم گووت و بە زۆر خۆمم گووتبوو تاوەکو پێنەکەنم.

مستەر تۆمسن گووتی: پێویستە بیلال ڕوونی بکاتەوە کەچی ڕوویداوە.

لام کردەوە بۆ بـیلال و پرسـیم لێـی: بـیلال بـۆچی لـە - خـەریکبوو بڵـێم مستەر جۆن، پاشان خۆمم گرت و گووتم — جۆنت داوە.

بـیلال دووبـارە تەماشـای جـۆنی کـردەوە وەک ئـەوەی یەکـەم جـاری بێـت ببینێت.

ئەوجا تەماشای کردم و گووتی: لێی بپرسن بزانن چی پێ گووتوم.

دوبارە مسـتەر تۆمسـن بـە تەماشـاکردنی — ئیـدی بەسـە - وە تەماشـای ڕوخساری جۆنی کرد و گووتی: جۆن چیت پێ گووتووە؟

هەسـتم کـرد ئـەم لێپێچینـەوە گونجـاو نییـە و، لەوانەیـە بـیلال برینـدار بکات، هەر بۆیە خۆمم خستە نێو قسـەکان و وشـەکانم ڕووبـەڕوی کـردەوە و کەسـیەتی مامۆسـتام هێنایـەوە بـەرخۆم: جـۆن هەرچیـەکی گوتبێـت بـیلال، کێشەکان بەو شێوەیە چارەسەر نابێت.

پاشـان ڕووم کـردە بەڕیوبـەر: تـۆ بـارودۆخی تەندروسـتی بـیلال دەزانیـت مستەر تۆمسـن، لەگەڵـیدا دەدوێم و تێیدەگـەم کـە چـی ڕوویـداوە و بـەڵێنت دەدەمێ کە دووبارە نابێتەوە.

ئامـاژەی بـۆ کـردن کـە بـڕۆن و ئـەوجا ڕووی کـردە مـن: تـەنها ئـارەزووی ئـەوەم هەیـە دڵنیـا ببمـەوە کـە بـیلال کـردی لـە ئـەنجامی ئـەو دەرمانانـەوە نەبووە کە وەری دەگرێـت. ئەگـەر بەوشـێوەیە بێـت ئـەوە دووبـارە دەبێتـەوە،

ئەگەریش بیلال توانیبێتی ئەوە بەسەر کەسێکی زەبەلاحی وەک جۆندا بهێنێت، ئەوە دەشتوانێت زیاتر لەوە بە قوتابیەکانی دی بکات.

ئەو لەسەر هەق بوو.

دڵنیام کردەوە کە دووبارە نابێتەوە و لە هۆکار و پاڵنەرەکان دەکۆڵمەوە و لەگەڵ پزیشکان قسە دەکەم بۆ ئەوەی دەرمانەکە بگۆڕن یان زیادی بکەن ئەگەر شتەکە لە هۆکاری دەرمانەکەوە بێت. مستەر تۆمسن گووتی: دەتوانیت ئەوە بکەیت لەو هەفتەیەی دورخستنەوە کە بیلال وەری دەگرێت.

" ئەم جۆنە ماوەی سێ ساڵە ئازارت دەدات و من هەواڵم لێی نییە؟ ناشزانم تاوەکو ئەو کاتە نەبێت کە لووتی دەشکێنیت؟!"

ئەوەم گووت بە بیلال و شۆک بووم لە دوای ئەوەی چیرۆکی جۆن و مایکی بۆ گێڕامەوە لە یەکەم ڕۆژەوە.

شتەکە چیدی بۆ من ئەوە نەبوو کە بیلال لووتی جۆنی شکاندووە. بەڵکە ئەوەبو بیلال توشی ئازار بووەتەوە لە قوتابخانە بۆ ماوەی سێ ساڵ و بە منیشی نەگووتوە.

چۆن ئەوە ڕوویدا؟ چۆن تێبینیم ئەوەم نەکرد؟ چەند جارێک گوومانم برد... بەڵێ، لە چەند ئاستێکی دیکەشدا لێم پرسی، بەڵام ئەو نکۆڵی دەکرد و هەموو کات لێی ڕادەکرد.

" ئایا بارودۆخەکە ئەوەیە کە من توشی ئازار بوومەتەوە یاخود ئەوەیە کە لووتی جۆنم شکاندووە؟" بیلال بە بێ ئارامیەوە پرسی.

لە ڕاستیدا لووتی جۆن گرنگ نەبوو بۆم. ئەگەر ئێستا جگە لەوەم دەربخستایە ئەوە شتەکە زۆر قابلکەر نەدەبوو.

« چۆن ئەوەم پێ ناڵێیت کە ڕووبەڕووت بووەتەوە بیلال»سەرم سوڕمابوو ، هەوڵمدەدا تێبگەم لە کەم و کوڕیم، هەوڵدەدەم تێبگەم ئەگەر باوکی وجودی هەبووایە شتەکەی دەگۆڕی!

«ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا، ئەو کات نەمتوانی بیڵێم، هیچ پەشیمانیش نیم لەوەی دوێنێ ڕووی داوە. بەڵکو بگرە ئەمە هەر دەبوایە لە یەکەم ڕۆژەوە ڕوویبدات» بیلال بە متمانەوە گووتی.

من قایل بووم بەوە، ناتوانم ئەمە بە ئاشکرا دان پێدا بنێم، لەوانەیە بە ئاستی لوت شکانیش نا. بەڵام ئاگایم لەوە هەیە کە وەستانی منداڵێک بە متمانەوە و لە سەرەتاوە دژی ئەوەی ئازاری دەدات هەر ئەوەیە وا لە هەرزەکارەکانی دیکە دەکات لە گاڵتە پێکردن بووەستن.

«ئەدی بۆچی ئێستا؟ بۆچی پێشتر نا؟» پرسیم لێی، حەزم نەکرد ئەمەی بۆ زیاد بکەم: بۆچی کاتێک کە تۆ لەم بارودۆخە تەندروستیەدایت؟

بە هێمنییەوە تەماشای کردم، ئەوجا گووتی: ئەوەت نەخوێندەوە کە ئەمجەد لە بارەی بیلال و ئومەیە ناردبووی؟

بە شەرمەزاریەوە پێم گووت: نا، نەمخوێندووەتەوە.

هێشتا دانم پێدا نەناوە کە دەچمە ناو ئیمەیڵەکەیەوە و ئەوەی تێیدایە دەیخوێنمەوە.

ئەو دەزانێت و منیش دەزانم کە دەزانێت، بەڵام هێشتا دانمان پێدا نەناوە.

گووتی: ئەوەی نوسیویەتی بیخوێنەوە و، دەزانیت بۆچی ئێستا ڕوویداوە.

◆ ◆ ◆

ئێستا دەمزانی کە ئەوەی بیلال کردوویەتی، هیچ پەیوەندیەکی بە کاریگەری لاوەکی دەرمانەکانەوە نەبوو وەک ئەوەی مستەر تۆمسن پێشبینی کردبوو.

بەڵکو پەیوەندی بە لێدانی دەرزیەکی چالاک کەرەوە هەیە کە ئەمجەد بە بێ ئەوەی بزانێت بیلالی پێ کوتیوە.

هەروەها نەشم دەزانی، ئەوەی ئەمجەد نوسیویەتی لە بارەی بیلال و ئومەیەوە، دەرزیەکی چالاککەرەوە دەبێت و منیشی پێ دەکوترێ.

♦ ♦ ♦

ڕۆژی دواتر بەشی کۆتای ڕۆمانی (جذور) بوو.

لیژنەی قوتابخانە ڕەزامەند بوو بەوەی تەنها یەک وانەم بداتێبۆ ئەوەی پێشکەشکردنی ڕۆمانەکە بە پایان بگەیەنم. قایل کردنیان هێندە گران نەبوو. هێشتا هەر تووڕەبووم لە کۆتایی پێهێنانی جذور بەو شێوەیە، ڕەزامەندبوونیش لەسەر داوایەکەم کە کردبووم هیچ لە تورەبوونەکەمی نەڕەواندبوویەوە، هەر تووڕەدەبووم تەنانەت ئەگەر بڕیاری لیژنەی قوتابخانە بە وەستاندی ڕۆمانەکە ڕاس دوای تەواو کردنی ڕۆمانەکەش بووایە.

شتەکە دەربارەی بنەمای پێشینە بوو.

من دەمویست چەند شتێکی سەرەکی پێکەوە ببەستمەوە، ڕاو بۆچونی قوتابیەکان گوێ لێبگرم لە مەرحەلەی ژیانی کۆنتا کینتی، کە بەرەبەرە خەریکبوو دەبوویە تووبی.

کۆنتا کینتی هاوسەرگیری لەگەڵ بیلدا دەکات، ئەویش چێشت لێنەرێکی ڕەش پێست بوو لە لای مستەر والتەرەوە، ئەو چاودێری دەکرد کاتێک قاچیان بڕیبوەوە، ئەوەیش کە چێشت لێنەر بوو، واتە پلە و پایەیەکی جیاکراوەی هەبوو لە نێوان بەردەکانی دیکەدا، هەروەها واتا کە ئەو (ئەمانەت پارێز بووە) لە لای گەورەکەی و خێزانەکەی، سەرەڕای ئەوەی کە ئەوە قەدەغە بوو لە ڕەش پێستەکان، بەڵام بیل خوێندنەوە و نوسینی بە ئینگلیزی زانیوە.

بێل و کۆنتا کینتی کیزیان دەبێت، کینتی قایل دەبێت لەسەر پیرۆزکردن و خاوێنکردنەوەی وەک خاچپەرەستان بەڵام بە نابەدڵی. کیزی گەورە دەبێت و کچێکی جوانی لێدەردەچێت کە ئان کچی برای خاوەنە سپی پێستەکە

خۆشـی دەوێـت ، هـەر لەبـەر ئـەوەیش کـە ئـان زۆر بـەنازە، هـەر بۆیـە بـە نزیکـەیی کیـزی لـە مـاڵی گەورەکەیـدا دەژی و، فێـری نوسـین و خوێندنـەوە دەبێت و، زۆر نزیـک دەبێتـەوە لـەو خێزانـەی کـە خـاوەنی دایکـی و بـاوکین، ئـەوەش بەشـێک دەبێـت لـەو پەرەسـەندنە سروشـتیەی کـە کۆنتـا کینتـی و هاوسەرەکەی ئارەزووی دەکەن.

بەڵام کیزی کە نوسین و خوێندنـەوە شـارەزایە، هەڵدەستێت بـە مۆڵـەتی وەرگرتنـی سـاختەی گەشـتکردن بـۆ نـوح، ئـەو بـەردەیـەی کـە وەک ئـەو گەورەکەی خاوەنیەتی و خۆشی دەوێت، چونکە بۆ بـەردە نـەبوو دوورییـەکی زۆر ببڕێت و گەشت بکات بە بێ مۆڵەتی نوسراو لە لایەن خاوەنەکەیەوە.

زۆر دوور نەکەوتبوویەوە پێش ئەوەی دەستی بەسـەردا بگیرێـت، دانیشـی پێدا نا کە کیزی مۆڵەتە ساختەکەی نوسیوە.

خاوەنەکەیشی ڕاستەوخۆ سزای کیزی دەدات بە فرۆشتنی، بەمەش کۆنتـا کینتی و بێل هەموو ئومێدیان بە هـەموو شـتێ لەدەسـت دەدەن. ژیانیـان بـە شێوەیەک کۆتایی پێدێت و ڕۆمانەکە لـە کۆنتـا کینتـی تـەواو دەبێـت کاتێـک ئـەو بەردانـە بـە هـەوادا فڕێـدەدات کـە لـە هـەموو ژیانیـدا کـۆی دەکـردەوە، ئـەوەش واتـای هـەر مانگێـک دەگەیـەنێت کـە بەسـەریدا تێپـەڕیوە لـە دووری گووندەکەی لە ئەفریقا.

ژمارەی ئەو بەردانەی کە بە زەویدا پەرش و بڵاو بووبویـەوە شـەش سـەد و شەست و دوو بوو.

کۆنتا کینتی پەنجا و پێنج ساڵی تێپەڕاندبوو لە تەمەنیدا.

کە ١٨ ساڵ وەک (کۆنتا کینتی) ژیاوە، کە لـە جۆفـۆری گامبیـا لـە دایـک بووە.

ئەوەی دیکەش کە ژیاوە بە (تۆبی) بانگیان کردووە، تۆبی بەردە.

لێرەدا بەشی تایبەت بە کۆنتا کینتی کۆتایی دێت، ئەلێکس هیلیش بەردەوام دەبێت لەگەڵ کیزی کە لەیەکەم شەوی لای خاوەنە نوێیەکەوە ڕووبەڕووی دەست درێژی کردنەسەر دەبێتەوە.

من لە مێشکمدا بوو کە هەریەک لە قوتابیەکان چی دەڵێن: لیزا باس لە ماڵئاوایی کردنی کیزی و دایک و باوکی دەکات، کیزی هاواری یارمەتی دەکات لە دایک و باوکی، یاخود هاوار دەکات بۆ یارمەتیدانی لە لایەن خاتوو ئانەوە، وا دەزانێت کە پەیوەندییە تایبەتیەکەیان لەوە دەکات کە کردوویەتی.

ئیدی لە بارەی ئەو ساتانەوە دەدوێت کە کۆنتا کینتی ئەوە هەست پێدەکات چیدی ناوی هاوڕێکانی منداڵی بیر نایەتەوە لە جۆفۆر. لە بارەی بە ئاگاهاتنەوە لەپڕەکەی، کە لە سی ساڵیدایە بە نزیکەیی.

کێڤنیش لێرەدا توانجی ئەوەیە کە لەبیرکردن ئالیەتی بەرگریکردنە لە خود زیاتر لە لەبیرکردنێکی ئاسایی کە دەکرێت بەسەر هەر کەسێکدا ڕوویدات.

بە زۆری کێڤن دەڵێت کە بەرەبەرەی لەبیرکردنی کۆنتا کینتی بۆ زمانە ئەسڵیەکەی خۆی لەبەر ئەوە نییە کە وازی هێناوە لە بەکارهێنانی، یاخود لەبەر ئەوەی کەس نەبووە لەگەڵی بدوێت بەو زمانە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە وازی لە بیرکردنەوە هێناوە لێی لە ناخی خۆیدا، لەبەر ئەوەی بە تەنها بیرکردنەوەش لێی ئازاری دەدات.

حەکیم باس لە چاوپێکەوتنی کۆنتا کینتی دەکات لەگەڵ کەسێکی وەک خۆی، لە ئەفریقاوە هاتووە، نەک ئەوەی لە ئەمریکا لە دایک بووبێت و لە دایک و باوکێک و باپیرانێکەوە هاتبێت کە لە ئەفریقاوە هاتبن، کۆنتا کینتی ئەوە لە یەکەم ساتەوە دەزانێت، بێ ئەوەی پیاوەکە یەک وشەش لە دەمی بێتە دەرەوە، دەچێت بۆ لای بەو شێوەیە سڵاوی لێدەکات کە لە گوندەکەی

خۆیان سڵاوی پێدەکەن، ئەوە دەڵێت پێی کە لە دوای ڕفاندنەکەیەوە لە گوندەکەی پێش چەند ساڵانێکی زۆر کە بە کەسی نەگووتوە: السلام عليكم.

پیاوەکەش بە بێ ویستی خۆی، لەوانەشە ئەویش یەکەم جاری بێت دوای ساڵانێکی زۆر، گووتی: عليك السلام.

هەروەها حەکیم باس لەوەش دەکات کە چۆن کۆنتا کینتی وازی لە نوێژ هێناوە و، بە نزیکەیی هیچ ئاین و بیروباوەڕەکەی نەپاراستووە تەنها لە خواردنی گۆشتی بەرازدا نەبێت.

هەموو ئەمانەم پێشبینی کرد، پێشبینی کاردانەوەکانیشیانم کرد بەرامبەر یەکدی.

بەڵام هەرگیز پێشبینیم نەدەکرد کە بچمە هۆڵی خوێندنەوە و مستەر وید لەوێ بدۆزمەوە.

مستەر وید لەسەر کورسیە تایبەتەکەی من دانیشتبوو، هەروەها ڕایشیکێشابوویە سوچێکەوە و، لە ژێر ئاڵای ئەمریکادا دانیشتبوو، قاچیشی لەسەر قاچ دانابوو.

قوتابییەکان بە سەرسامیەوە تەماشای منیان دەکرد.

ڕاستەوخۆ گووتی: خاتوو لاتیشا، سەرسوڕماو دەرەکەویت، لەوانەیە نەزانیت کە بڕیاری لیژنەی قوتابخانە بە ڕەزامەندبوون بە وانەی کۆتایی لە جذور بەو مەرجە کراوە کە یەکێک لە ئەندامانی لیژنەی قوتابخانە لە وانەکەدا ئامادە ببێت.

نا. خەبەرم لەوە نەبووە.

سوپاس بۆ خودا کە من سپی پێست نەبووم، لەبەر ئەوەی گەر بەو شێوەیە بوومایە ئەوە هەموو کەس تێبینی دەکرد کە خوێن بە ورووژم بۆ ڕوخسارم دێت و وەک تەماتە سوور بووەتەوە.

هەستم کرد کە کەسێک زللەی لێداوم. هەر بەڕاست هەستم بە زللەکە دەکرد لەسەر ڕوخسارم.

دەیەوێت بە ئاشکرا سوکایەتیم ڕووبەڕوو بکاتەوە. دەیەوێت خاوەن وشەی کۆتایی بێت لە مەسەلەکەدا.

وانەی کۆتایت دەوێت لە جذور؟ باشە، بەڵام من بەشداری دەکەم تێیدا. دەست درێژی کردنەکەی سەر کیزیم بیرکەوتەوە، هەستم کرد ئەمجارە بە ئاشکرا دووبارە دەکرێتەوە. لەوانەیە زیادەڕەوی بکەم. نازانم. بەڵام هەستم کرد کە ڕەنگی پێستم پاراستمی لەوەی بەو شێوەیە دەربکەوم. هەستم کرد کە مستەر جۆن ڕۆڵی ئومەییەی دەگێرا لەگەڵ بیلالی حەبەشیدا، ڕۆڵی جۆنی هەبوو لەگەڵ بیلالەکەمدا ..

بێ ئەوەی تەماشای ڕووخساری بکەم پێم گووت: بە خێر بێیت لە هەر کاتێکدا بێت.

تەماشای ڕوخساری قوتابیەکانم کرد. هاوسۆزی و تێگەیشتن لێم بە ڕوونی بە ڕوخساریانەوە دیار بوو.

هەستم بە پشتگیری کرد لە لایەن ئەوانەوە. بیرم کردەوە ئەگەر ئێستا یەک وشەش نەڵێم، ئەگەر هۆڵی خوێندنەکە جێبهێڵم و بڕۆمە دەرەوە، ئەوە ئەوانیش وەک پشتگیریکردن دەهاتنە دەرێ لەگەڵم.

بەڵام نا.

ئەوان پشتم دەگرن، منیش پشتیان دەگرم، شەرمەزاریان ناکەم.

وشەی کۆتایش بۆ وید جێناهێڵم.

ئەوڕۆ، وانەی کۆتایی لە جذور پێشکەش دەکەم و، وانەیەکی چاکیش دەدەمە وید.

پێم گووتن: دەزانن کە ئەوڕۆ پێویستە وانەی کۆتایی بێت لە ڕۆمانی جذور، لەوانەشە زۆربەتان بەشی تایبەت بەم وانەیەتان خوێندبێتەوە یاخود

هەر بە لایەنی کەمەوە تەماشای زنجیرە تەلەفزیۆنیەکەتان کردبێت، بەڵام مـن ئەوڕۆکە بە باسکردنی کۆنتا کینتی دەست پێناکەم...

بەڵکو بە باسی بەردەیەکی دیکە دەست پێدەکەم. ڕۆمانەکە تایبـەت نییـە لەسەر کەسێک، لە بارەی باپیرەی ئـەلێکس هیلیـەوە نییـە، بـەڵکو لـەبارەی بەردایەتیەوەیە، ئەو بەردایەتیـەی کـە ناتوانرێـت لاببرێـت بـە یاسـای نوسـراو یاخود دەنگدانی گشتی... بەردایەتی زۆر قوڵترە لە سومبول و یاساکان.

باسی بەردەیەکتان بۆ دەکەم کە نێوی بیلالە، بیلالی حەبەشی، کوڕەکـەم کە بە شێرپەنجەی مێشک دەمرێت، بـەو نـاوەوە نێـو نـراوە، لـە نـاوی بیلالـی حەبەشیەوە، ئەو یەکەم ئەفریقی موسوڵمان بووە، ئـاین لێـرەدا گرینـگ نییـە زۆر چونکە من موسوڵمان نەبووم هـەر لـە سـەرەتاوە، بـەڵام باسـەکە لەسـەر بارودۆخێکی مرۆییانەیە..

بیلال بە بەردەیی لە دایک بووە، وەک کۆنتا کینتی نا کـە بـە ئـازادی لـە دایک بووە و پاشان بە بەردە کراوە، بەڵام توانی ئازادیەکەی وەربگرێـت، ئـەو یەکـەم بـەردە بـووە کـە بـاوەڕی بـە تاقانـە پەرەسـتی هێنـاوە، لـە کاتێکـدا دوورگەی عـەرەبی هـەمووی بتـی پەرەسـتووە، هـەر لەبـەر ئـەوەش لـە لایـەن گـەورە و خاوەنەکەیـەوە ئەشـکەنجە دراوە، پاشـان بـاوەڕداران هەسـتاون بـە کڕینی و ئازادکردنی، بەمەش باوەڕ هۆکاری ئازادبوونەکەی بووە.

لـە دواتـردا، بـاوەڕ بوویـە بنـەمای نێـو کۆمەڵگەکـە، ئـەم بـاوەڕە سـەرنج دەخاتە سەر ئەوەی کە نرخی بنیادەم بە کـار و کردوویـەتی نـەک بـە ڕەنگـی پێستیەوە. گرنگ نییە ڕەش بێت زەرد بێت یاخود سپی... گرنگ ئەوەیـە کـە دەیکات.

بیلال بەوە قایل بوبوو. زیاتر لەویش دەتوانن پێـی قایـل بـبن، بـەڵام ئـەو پێی وابوو کـە هـەموو بـاوەڕداران بـە پێویسـتیان زانیـوە و هـەرچی لـە دڵ و دەروونیان هەبووە لە بنەما کۆنەکان دەریان کردووە.

جارێکیان، لە نێوان ئەو و یەکێک لە باوەڕداران ناحاڵیبوونێک ڕووی داوە، ناحاڵیبوونێکی ئاسایی لەوانەی کە هەموو ڕۆژ ڕوودەدەن، بەڵام ئەمجارە توندی مشت و مڕ و دەمەقاڵێکە زیاد دەکات، زمانی ئاخاوتنەکەشیان توندتر دەبێت، هەروەک چۆن دەکرێت هەموو ڕۆژ ڕووبدات، پاشان پیاوە باوەڕدارەکەی دیکە بیلال بە ڕەنگی دایکی ناوزەد دەکات، پێی دەڵێت ئەی کوڕی ڕەش پێستەکە.

بیلال شۆک دەبێت ، ئەو پێی وابوو کە ئەو شتانە لە ڕابردوودا بوو، پێی وابوو کە تێپەڕیوە وەک چۆن بتەکان شکان تێپەڕین، بەڵام شتەکە زۆر ئاڵۆزتر بووە، بت پەیکەرێکی ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام بەردایەتی یاخود ڕەگەز پەرەستی، یاخود هەر ناوێک بێت، لە شێوازی بیرکردنەوەکەدایە، لە ڕووانیندایە بۆ ژیان...

کەمێک بێدەنگ بووم بۆ ئەوەی ڕێژەی گرنگی پێدان ببینم لەسەر ڕووخسارەکان، ئەوان تێدەگەیشتن کە بە کوێ دەگەم. لام نەکردەوە بۆ ناوچەکەی وید بەڵام هەستم کرد کە تەمای قسەکردنی گرتووە.

ئەوجا بەڕاستی وید گووتی: هەموو ئەمانە پەیوەندیان چییە بە بابەتی وانەکەوە خاتوو لاتیشا؟

لام نەکردەوە و وەڵامم نەدایەوە. تەنها درێژەم پێدا.

«لۆمەی ئەو کەسە کرا کە بە شێوەیەکی ئاشکرا ئەوەی بە بیلال گوتبوو، پێی گووترا کە نەفامی لە ناخیدا هەڵگرتووە، نەفامیش پەرستنی بت و هەرشتێکە کە وەک ئەو بێت لە بنەما و ڕەفتار و تیۆری ڕەوشتدا...

ڕەگەزپەرەستیش بەو شێوەیە، ئەگەر لەم سوچەوە بۆی بڕوانین، بە هەمان شێوەی پەرەستنی بتە، بەستراوە بە شێوەی دەرەوە بە ئاستێک کە بەرگی دەرەوە دەکاتە گرنگترین لە هەموو پێکهاتەیەکدا.. ڕەگەزپەرەستی، ئەوەیە کە سەر بە هەر ڕەگەز بوونێکت بکەیتە بتێک کە قەرزاری دڵسۆزبوونی بیت..

تفەکەم قوتدا و ئەمەش بوویە هەلێک بۆ وید تاوەکو بە دەنگێکی بەرزتر و توندتر دووبارەی بکاتەوە: هەموو ئەمانە پەیوەندی بە جذورەوە چییە؟

دووبارە لام نەکردەوە و بەردەوام بووم و بە توونـدی دانـم بـە هـەر وشەیەکدا دەنا کە دەمگووت: بیرۆکەکە لێرەدا ئەوەیە کە یاسا زۆر ئاسانترە لەو هاندەرەی کە لە ناخدا هەیە بۆ ئەوەی بتە بچوکەکان لابەرێت، کە نابینرێن، لە ناختدان... جەنگی قورست لەگەڵ یاسادا نییە کە بەردە ئازاد دەکات، بەڵکو لەگەڵ خۆتدایە، لەگەڵ ئەو بتە بچووک و گەورانەدایە کە لە ناختدایە، وات لێدەکەن کە هێشتا بە شێوەیەکی کەمتر لە خۆت، لە بەردەیەک بڕوانیت کە ئازادکراوە... لەوانەیە ناوی بنێن ڕەگەز پەرەستی... جەنگان و ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵیدا زۆر قورسترە لە ڕووبەڕوبونەوەی یاساکانی یاساکانی بەردایەتی، چونکە زۆر بە سادەیی نەبینراوە».

ئەمجارەیان بێدەنگ بووم بۆ ئەوەی هەلێک بدەمە وید تاوەکو ئەوە بڵێتەوە بۆ ئەوەی پشتگوێی بخەمەوە، گوێم لێی بوو: خاتوو لاتیشا، تکایە بگەڕێوە سەر بابەتی ڕۆمانەکە.

بە دەنگی بەرز گووتم، زۆر بەرزتر لە دەنگی ئەو: کۆنتا کینتی خۆی بە ئازاد دەبینی، سەرەڕای هەموو شتێک هەوڵیدا کەرامەت و شکۆی بپارێزێت، کیزی کچی فێری زمانە ئەسڵیەکەی خۆی کرد، ماندینگا، سەرەڕای ئەوەی جگە ئەو کەسی دی زمانەکەی نەدەزانی، لە ناخیدا وای دەبینی کە ئازادە بەڵام کەوتە ناو ئەسیرییەوە، ئەوانی دیکە قایل بوون بە بەردایەتی بوونیان، کۆنتا کینتی دەیگووت ئەگەر خاوەنەکەیان جێیان بهێڵێت، بە بێ چاودێری یاخود بەستنەوە و کەلەپەچەکردنێک، پاشان دوای ساڵێکی ڕەبەق بێتەوە، ئەوە دەبینێت کە لە زەویە کشتوکاڵیەکاندا هەر کار دەکەن وەک چۆن بەجێی هێشتوون.

له لایەکی دیکەشەوە، لە ناو سەرگەورەکاندا، هەبوو کە ڕەزامەند و قایل نەبوو بەم بارودۆخە، بگرە هەر سپییەکانیش خۆیان، تێیاندا بوو کە هەڵسوکەوتی باشتری دەکرد لەگەڵ بەردەکاندا، پێیان دەوتن، زبڵە سپییەکان..

کاتێک یاسا دەگۆڕدرێت، تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی تەواو و لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵکەندراوە بێت، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەوەی لە دەروونیشدا هەیە گۆڕاوە... چونکە چەند شتانێکی شێوە جەلاتینی هەن، نابینرێن، دەست دەگرێت بەسەر جێبەجێ کردنی ئەم یاسایەدا..

لێرەدا لایەکم کردەوە بۆ مستەر وید و تەماشایەکی ساردم کرد، ئەوجا گەڕامەوە بۆ ناو پۆلەکە و بە نێویاندا دەگەڕام و هاتووچۆم دەکرد: با هەوڵ بدەین تەماشایەکی سەرژمێریەکان بکەین لەو بارەیەوە، تەنها ڕەشت پێست ئەم سەرژمێریەی نەکردووە، بەڵکو ڕەش و سپی پێکەوە، چونکە شتەکە پەیوەندی بە ڕەنگی پێستەوە نییە، بەڵکو بەوەی چی لە نێویدا هەیە...

کاتێک ژیاننامە کەسیەکان (سيرة الذاتية: CV) پێداچونەوە دەکرێت لە داواکاریەکانی کاردا، جگە لە ناوەکان کە ئاماژە بۆ سەر بە هەر ڕەگەز بونێک دەکات، ڕەش پێستەکان بە ڕێژەی % ٥٠ کەمتر پەیوەندیان پێوە دەکرێتەوە.. هیچ یاسایەک نییە ڕێگری بکات لەمە... چونکە بڕیار دەگەڕێتەوە بۆ خاوەن کارەکە یاخود یارمەتیدەرەکەی...

شۆفێرە ڕەش پێستەکان، دوو هێندەی شۆفێرە سپی پێستەکان دەستیان لێرادەگیردرێت...

وەکیلەکانی خانوبەرە، کاتێک لەگەڵ کڕیارە ڕەش پێستەکاندا مامەڵە دەکەن، کە دەیانەوێت خانوویەک بکڕن، ئەوە بە ڕێژەی لە سەدا بیست کەمتر خانوویان پێشکەش دەکەن وەک لەوەی سپی پێست بێت... چونکە ئەوان زۆر بە سادەیی دەیانەوێت هەندێک ناوچە بە سپیەتی بمێنێتەوە...

سپی و ڕەش پێست بە هەمان ڕێژە ماریگوانا بەکاردێنن، بەڵام ڕەش پیستەکان چوار هێندەی سپی پێستەکان بەو تۆمەتەوە دەستگیر دەکرێن!

ڕەش پێستەکان بە شەش هێندە فەرمانی زیندانی کردنیان بۆ دەردەچێت وەک لە سپی پێستەکان...

تەنانەت پزیشکەکانیش، نەخۆشە ڕەش پێستەکانیان ئاگادار ناکەنەوە لە حاڵەتی نەشتەرگەری دڵی بەپەلەدا، بەو ڕێژەیەی کە سپی پێستەکانی لێ ئاگادار دەکەنەوە..

پڕۆژەدارە سپی پێستەکان وەڵامی داواکاری یاخود نامەیان نەداوەتەوە بە ناوێک کە خاوەنەکەی ڕەش پێست دەربکەوێت، بە ڕێژەیەک کە بەرزترە لە وەڵامنەدانەوەی نامە و داواکاری سپی پێستەکان...

دووبارەی دەکەمەوە، ئەوانەی ئەم سەرژمێریانەیان کردووە ڕەش پێست نەبوون بەڵکو هەموو ڕەنگەکان بوون، هەر ڕێک وەک چۆن لە شەریعەتی یاسای ئازادکردنی بەردەکاندا هاتووە لە پیاوێکی سپی پێستەوە کە ناوی ئەبراهام لینکۆڵنە.

چوومە لای تەختەکە و ناوی خۆم نوسی: لا.. تی.. شا..

ئەوە ناوی منە: لا.. تی... شا.. ناوێک بە سێ بەش، ڕاستەوخۆ ئاماژە بەوە دەکات کە من ڕەش پێستم، ڕەش پێستێک لە گیتۆی ڕەش.. ناوێکی ئەبنۆسیە، جگە ڕەش پێستەکان کەسی دیکە ئەو ناوە بەکارناهێنێت.. هەروەها من لە گەڕەکێکی هەژارنشین و پڕ لە تاوان و هەرچی ئێوە حەزی پێناکەن هاتووم..

لام کردەوە بۆ مستەر وید و قسەکان ڕووبەڕووی ئەو کردەوە:

هەر لەبەر ئەوەشە وا دەزانن من هەرچیەک بکەم ناتوانم بە پێی پێویست باش بم بۆ ئەوەی ببمە مامۆستایەک لە قوتابخانەیەکی ڕێک و پێکدا، هەرچەندە ئەنجامی قوتابییەکانم باش بێت لە تاقیکردنەوە گشتیەکاندا،

تەنانەت ئەگەر سەرکەوتنم بەو ڕێژە سەرکەوتنەی قوتابیەکانم بەسەر مامۆستاکانی دیکەدا کە ناوی دی هەڵدەگرن... بەڵام لە چاوی هەندێکدا من هەر بە زبڵ دەمێنمەوە، کە لە زبڵدانێکی گەورەی خاشاکەوە هاتووە..

ئەوجا تەماشایەکی مستەر ویدم کرد ڕیک وەک ئومەیە دەهاتە پێش چاوم، بیرم کەوتەوە کە ئەمجەد چی نوسیبوو و بیلالیش چی گووت، بیلالی خۆشمم بیرکەوتەوە کە چۆن وانەیەک دەداتە جۆن و لووتی دەشکێنێت..

بە ویدم گووت: گرنگ نییە کە چۆن هەندێک کەس لێم دەڕوانن، گرنگ ئەوەیە چۆن دەڕوانمە خۆم، لە ناخەوە، هەروەها چۆن چۆنی قوتابیەکانیشم لێم دەڕوانن... تەنها ئەوە گرنگە..

تەماشای قوتابییەکانم کرد. ئەم جارەیان بە ڕاستی پشتگیریانم پێویست بوو.

جاک هەستایەوە، ئەمە دووەم ڕۆژی بوو لە قوتابخانە لە دووای ڕووداوەکەی بۆبیەوە، برین پێچەکانیش هێشتا بە چاویەوە بوون: ئێمە پێمان وایە کە باشترینی.

لیزا هەستایەوە: تۆ باشترینی خاتوو لا.. تی.. شا.. بە توندی دانی دەنا بە بەشەکانی ناوەکەمدا.

کێڤن هەستایەوە، حەکیم، بۆبی، هەموویان هەستانەوە و دەیانگووت: تۆ باشترینی.

تەماشای مستەر ویدم کرد: لە واتای سەرکەوتنی بیلالی حەبەشی بەسەر ئومەیەدا و بیلالی خۆم بەسەر جۆندا تێگەیشتم. زۆر شکاو و تورە دەردەکەوت، ڕوخساری بە تەواوی سور هەڵگەڕابوو.

هەستایەوە سەر پێ و جوان لەوە تێگەیشتبوو کە ڕوویدا و لەبەر خۆیەوە دەیبۆڵاند: ئەم شتە بە تەواوی لە کۆنترۆڵ دەرچووە، ئاشکرایە تۆ هەندێک شتت بە کەسی و زۆر تایبەتی وەرگرتووە..

پێش ئەوەی بگاتە لای دەرگاکە وەستاندم: مستەر وید، وشەی کۆتای بێزەحمەت.

بە تووڕەیی لای کردەوە بۆم: چی؟

بە هێمنیەوە پێیم گووت: ئایا دەزانیت کە کیزی، کچەکەی کۆنتا کینتی، لە دواتردا گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی دایک و باوکی کۆچی دواییان کردووە و لەوێ بوون؟

سەرسوڕمانی پێوە دیار بوو: چی؟

بەردەوام بووم: ئەی دەزانیت چی کرد کە گەیشتە ئەوێ؟

خەریکبوو دەرگاکەی دەکردەوە و لە نێوان دانەکانیەوە گووتی: کاتم نییە بۆ...

نەمهێشت تەواوی بکات، گووتم: چوو بۆ لای گۆڕەکەی باوکی و، دیتی کە لە سەری نوسیویانە (تۆبی)، سڕیەوە و، ناوە ڕاستەقینەکەی نوسی..

نوسی کۆنتا کینتی، ئەوە ناویەتی، هەر بەو شێوەیەش خۆی دەبینی، هەر بەو شێوەیەش دەمێنێتەوە تا کۆتایی..

لەوانەیەک بە شێوەیەک ئەوەم گووتبێت کە هەموو پۆلەکەی هێنایە جۆش و خرۆش، دیتم بە دەنگێکی بەرز لەگەڵمدا دەڵێنەوە: کۆنتا کینتی، کۆنتا کینتی، کۆنتا کینتی..

(احد، احد)ەکەی بیلالی حەبەشیم هاتەوە یاد..

هەروەها هاندانی قوتابیەکانم بیر کەوتەوە کە کاتێک بیلال لە جۆنی دابوو.

منیش ئومەیەم لە ناو برد.

♦ ♦ ♦

## ئەمجەد

بە هیلاکی گەڕامەوە لە دوای ڕۆژێکی درێژ، لە زانکۆ خشتەیەکی زۆر قەرەباڵەغ و چاوپێکەوتنێکی دوور و درێژم لەگەڵ پرۆفیسەر میللەردا هەبوو، وا دیارە خەریکە ڕەزامەندی دەردەبڕێت بۆ بڕوانامەکەم، تێبینیەکانی ئەم جارە لە سێ پەڕە تێنەدەپەڕی.

لە ڕێگەی هاتنەوەمدا لاتیشا دوواندمی، دوێنێ زۆر پەیوەندیم پێوەی کردبوو بەڵام وەڵامی نەبوو، پاشان نامەیەکی نارد کە تێیدا نوسیبووی دواتر پەیوەندی دەکاتەوە، دڵنیاشی کردمەوە کە هەموو شتەکان باشن.

دەنگی زۆر شاد دەردەکەوت بە شێوەیەکی جیاواز، پێی گووتم: باوەڕ ناکەیت دوێنێ و ئەمڕۆ چی ڕووی داوە.

هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە کە چی ڕوویداوە دوێنێ لەگەڵ بیلالدا و، چی زانیوە و، ئەمڕۆش چی ڕوویداوە بەسەریدا لە قوتابخانە.

پێم گووت: کەواتە بیلال لوتی جۆنی شکاندووە و، تۆش سەری وید!

بە دڵخۆشیەوە گووتی: ئەرێ، شتێکی لەو شێویە.

ئەوجا پێیشکەنی پێکەنینێکی جیاواز، پڕ بوو لە خۆشی و پەرۆشی. زیاتر پێکەنینی سەرکەوتن بوو تاوەکو پێکەنینی خۆشی.

پێم گووت: ئەمە تەندروستە؟

ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە: زۆریش تەندروستە.

پێم گووت: لەگەڵ وید بە دڵنیاییەوە، بەڵام بیلال لوتی جۆنی شکاندووە لاتیشا، ئەوە توندڕەویە.

بە ئاخاوتنێکی لۆمەکردنەوە گووتی: باس لە نمونەیی بوون مەکە بۆم ئەمجەد، دەزانیت ئەو کێشانە چارەسەریان نییە جگە ئەوەی ئەو کوڕە بوەستێنێت کە ڕووبەڕووی بووەتەوە و، کۆتایی پێبێنێت.

هەرچۆنێک پێت خۆشە. دەمزانی کە ئەو لەسەر هەقە، زۆر سەرم سوڕ مابوو لەوەی بیلال کردوویەتی لە کاتێکدا ئەو لەو حاڵەتە تەندروستیەدایە، زۆر دڵخۆش بووم کە ئەو زیاتر لە جارێک دووبارەی کردەوە ئەوەی نوسیومە لە بارەی بیلال و ئومەیەوە کاریگەریەکی گەورەی هەبووە لە هەڵوێستەکەی بیلال و ئەوەی خۆیشیدا.

دڵشاد بووم لەبەر ئەوەی ئەو کاریگەریەم هەیە لەسەر ژیانی.

بەڕاستی هیلاک بووم و دەمویست بخەوم، بەڵام کاتێک لە ناو ئەسانسۆرەکەدا بووم بیرم کەوتەوە کە پێویستە کۆبەر بەرمە دەرەوە تا پیاسە بکات، لە دڵی خۆمدا کریستینم بە نەفرەت دەکرد. ئەوجا بە ئاگا هاتمەوە کە دوای چەند هەفتەیەک ئەمە یەکەم جارە ئەوم بە بیر دێتەوە، هەروەها چەند هەفتەیەکیشە ناچمە هەژمارەکەی لە فەیس بووک یاخود مای سپەیس. هەستم بە سەرکەوتن کرد.

◆◆◆

"سوپرایز!".

هەر ئەوەندەی دەرگام کردەوە کریستین بەو شێوەیەی گووت.

ئەو لەوێ وەستا بوو، متمانەی بە خۆی بوو، بە عەزیەکی سووری کورتەوە، کە باڵەکانی دانەپۆشیبوو.

بێدەنگ مامەوە.

" ئەو خواردنەشم بۆ دروست کردوویت کە حەزت پێیەتی".

ئەوەی گووت و ئامازەی بۆ سەر سفرەکە دەکرد.

دوو مۆم هەبوون لەسەر مێزەکە، شوشەیەکی شەرابیش (خۆم هەر هەمبوو، نەوەک ئەوەی ئەو کڕیبێتی)، پاستایەکیش کە وا دەردەکەوت ئامادە کراو بێت وابزانم هەر خۆم هەمبوو یان ئەوەیە لە دووکانەکەی ژێر بیناکە کڕیویەتی.

تێبینیم کرد کە مۆسیقایەکی ئارامیشی داناوە.

بێدەنگ مامەوە. نەجولام. تەنها کۆبەر جولا. هات و لە بەردەممدا وەستا و کلکی بادەدا وەک ئەوەی بیەوێت بزانێت چی دەکەم.

ئەو دیمەنە بەڕاستی هیلاککەر بوو. هەزاران جار لە فیلمەکاندا بەکارهێنراوە. کریستین هێشتا هەر بە متمانە بەخۆبونەوە وەستا بوو. پێی وابوو هێشتا من بە ئەو نەخۆشم. پێی وایە کە من شتەکان لەبیر دەکەم، پێی وایە لێیدەبوورم تەنها بەوەی کە هاتووە و پاستایەکی لەسەر سفرەکە داناوە.

هەر لە شوێنی خۆم مامەوە، لەو دیمەنە گەمژە و هیلاککەرە ڕامابووم. نەدەکرا هەندێک نوێکاری تێدا بکەیت کریستین؟

کریستین شڵەژا. درکی بەوە کرد کە بارودۆخەکە وەک ئەو سیناریۆیە ناڕوات کە لە مێشکیدا دایینابوو.

نزیک بویەوە لێم و زەردەخەنەی دەکرد، پێی وایە زەردەخەنە کردن بە ڕوومدا بابەتەکە چارەسەر دەکات.

گووتی: هیچ ناڵێیت؟

هەر بێدەنگ بووم. نەدەجولام. هەموو ئەو شەو و ڕۆژانەم وەبیر هاتەوە کە بە هۆی ئەوەوە ئازارم چەشت. بەڵی من لە تۆ چاک بوومەوە، بەڵام ئێستا لەوانەیە هەلێکم هەبێت بۆ ئەوەی لێدانەکەت بۆ ئاڕاستە بکەمەوە، بۆ ئەوەی تۆڵە بستێنمەوە. لەوانەیە لەبەر ئەوە هاتبێت کە براندۆن بەجێی هێشتووە یاخود خراپەی بەرامبەر کردووە یاخود دەیەوێت تورەی بکات. یاخود لەبەر ئەوەی تاکە پەیوەندی کە دەیدۆزێتەوە لە ژیانیدا تەنها لەگەڵ کەسێکدایە کە دەتوانێت بەکاریبهێنێت. براندۆنیش لەو جۆرە نەبووە.

هاتووە و متمانەی بە خۆیەتی کە وادەزانێت هەموو شتێک بە هاتنی چارەسەر دەبێت.

وا دەزانێت کە موڵکی ئەوم، وا دەزانێت من بەردەی ئەوم.

تەنها ئەو پێشبینیانەش بۆمن سوکایەتی بوو.

ئومەیە، دووبارە.

باڵی لەسەر شانم دانا و هەوڵی دەدا لە باوەشم بگرێت. وەک ئەوەی لەگەڵ منداڵێکدا قسە بکات دەیگووت: پشەکە زمانی خواردووی؟ شتێک بڵێ خۆشەویستم..

باڵیم لابرد. شۆک بوو.

شتێک بڵێم؟

بەڵێ دەبێت شتێک بڵێم.

بە دەنگێکی ئارام وەک ئەوەی لە بارەی کەش و هەوای دەرەوە بدوێم گووتم: " پێویست بوو کلیلەکە بگۆڕم".

کەمێک کاتم دایە تا تێبگات لەوەی کە گووتم.

هەوڵیدەدا تێبگات کە چیم گووتووە.

گووتی: چی؟

بە دەنگێکی بەرزتر دوبارەم کردەوە، هەروەها دانم بە وشەکاندا دەنا وەک ئەوەی لەگەڵ کەسێکی کەم بیستدا بدوێم: دەڵێم، پێویست بوو کلیلە گەمژەکە بگۆڕم.

بە خێرایی هەناسەی دەدا، ڕەنگیشی گۆڕا: چی دەڵێیت؟ چۆن دەوێریت ئەوە بڵێیت؟ خۆت بە چی دەزانی؟

بە دەنگێکی ئارامەوە و دەڕۆیشتم بەرەو سفرەکە گووتم: بینیت؟ باشتر بوو کە کلیلەکە بگۆڕم، بە لایەنی کەمەوە ناچار نەدەبوویت ئەو کات گوێ بۆ ئەوە بگریت کە توڕەت دەکات.

کەوچکێکم ڕاکێشا و ڕاستەوخۆ لە قاپی پاستاکە کەمێک دەرهێنا بە بێ ئەوەی بیکەمە نێو قاپی تایبەتەوە، ئەوە شتێک بوو کە هەموو کات کریستین وای دەردەخست کە بێزی لێدەکاتەوە. ئێستا زیاتر بێزی لێدەکاتەوە.

هەندێک لە پاستاکەم جوی و دواتر تفم کردەوە ناو قاپە گەورەکە و گووتم: ئەگەر کلیلەکەم بگۆڕیایە ناچار نەدەبووم ئێستا ئەم شتە بخۆم.. خودایە، تەنانەت ئیدی ناتوانی پاستاش بە باشی دروست بکەیت.

خەریکبوو دەبورایەوە ئەوەندە بێزی دەکردەوە، لەوانەیە ئەم جارە بە ڕاستی بێزی کردبێتەوە وا پیشان نەدات وەک ئەوەی پێم وابوو.

گووتی: خۆت بە چی دەزانیت ئەمجەد.

بە خێرایی وەڵامم دایەوە: ئەمجەد حەلەوانی، خانمەکەم. ئەو ئیدی بەردەست نییە وەک ورێنەت دەکرد.

گووتی: چەندە لووت بەرز و هیچیت، وا دەزانیت هاتووم بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لات؟

گووتم: نا، بۆ پاستاکە هاتوویت. بەڕاستی جێی بەزەییە.

بە بەرەنگاریەکەوە گووتی: لەبەر کۆپەر هاتم. پێشم خۆش بوو وەک هاوڕێیەک نانی ئێوارە بخۆین. زیاتر نا.

بە گاڵتەجاڕیەوە و بە توندی پێکەنیم و گووتم: بەڵێ بە دڵنیاییەوە. شاژنە کریستین ناکرێت " نا" وەک وەڵام وەربگرێت، بەڵام من پێت دەڵێم، بەم نانی ئێوارە هاوڕێیانە ڕۆمانسیانە دەڵێم: نا، نا.

پێشبینی نەکەیت بێیت بۆ ئێرە و ئەمجەدە کۆنەکە لە چاوەڕوانیت دا ببینیەوە، ئەمجەدی کۆن بوونی نییە، کۆپیە نوێیەکەی تۆ ناخوێنێتەوە... هەر ڕێک وەک ئەو پاستا قێزەونەی کە ئێستا تفی کردەوە.

من تۆم تف کردەوە، هەروەک پاستاکە... تۆش ئێستا خۆت دێیت بۆ ئێرە، ئەوە منیش دەرت دەکەم... تفت دەکەمەوە...

شاژنە کریستین ت.. ف.. ت.. دەکەمەوە.

هەر ڕێک وا دەردەکەوت کە بە ڕاستی تفم بەسەر و چاویدا کردبێت.

لای کردەوە بۆ کۆپەر و گووتی: دەی کۆپەر.

پێم گووت: ئەگەر دەتەوێت کۆپەر بەریت بۆ ئەوەی پیاسەی پێ بکەیت، ئەوە کێشە نییە، بەڵام مافی ئەوەت نییە بیبەیت، پێویستە لێی گەڕێیت هەڵبژێرێت لە نێوانماندا..

" وا دیارە تۆ شێت بوویت، بە دڵنیاییەوە من هەڵدەبژێرێت، تۆ بۆ ئەو ناشێیت".

" کۆپیە کۆنەکەی من بۆ ئەو نەدەشا و بۆ تۆ دەبوو، ئێستا پێچەوانە بوونێک ڕوویداوە".

" کۆپەر، دەی بڕۆین" بە متمانە و بەرەنگاربوونەوەوە گووتی وای دەزانی هەر بە لایەنی کەمەوە لێرەدا دەیباتەوە.

" کۆپەر، وەرە بۆ ئێرە" بە دەنگێکی یەکلاییکەرەوەوە گووتم، بەڵام کەمێک دەترسام. باس لە وەفای سەگ دەکەن، لەوانەیە زیاتر بەوەفا بێت بۆ ئەو وەک لە من.

کۆپەر تەماشایەکی منی کرد پاشان تەماشای ئەویشی کرد.

" کۆپەر، دەی یەڵا" بە دودڵیەوە گووتی وەک ئەوەی تەنها یەک شکستی دیکە و وای لێبکات تێک بشکێت.

کۆپەر تەماشایەکی کردم، ئەوجا هاتە پێشەوە بەرەو من و لە پەنامدا وەستا و سەیری ئەوی دەکرد.

"ئافەرین کوڕی باش" ئەوەم گووت و دەستم بەسەریدا دەهێنا.

تەماشای کریستینم کرد: دەبینی؟ پێچەوانە بونێک ڕووی داوە لە نێوان تۆ و کۆپەر. من زۆر خۆشحاڵم بە ئەنجامەکەی.

کریستین گەورەترین سوکایەتیەکانی ژیانی وەبەر گوێ دەکەوت.

ئومهی‌یە بوو دەکوژرا.

◆◆◆

From: Amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

Subject: سەرکەوتن

ساڵەکانی دواتر سەرکەوتنی زیاتر بۆ مەدینە هاتە پێشەوە، ناوچەی دەستبەسەردا گرتنەکانیشیان فراوان بوون، هەروەک چۆن شکستێکیان بینی و ئابڵۆقەیان خرایە سەر کە بە سەرکەوتنیان کۆتایی پێ هات.

لە ساڵی شەشی کۆچیدا، گرێبەستێکی ئاشتی لە نێوان موسوڵمانان و بێ باوەڕەکاندا بەسترا، گرێبەستەکە وەک شەڕ ڕاگرتن بوو بۆ ماوەی دە ساڵ، کە پێویستە هەردوو لا و شوێنەکەوتەکانیان هیچ شەڕ و جەنگ و هەڵکوتانە سەر لایەنەکەی دیکە بەرپا نەکەن، بەڵام گرێبەستەکە خاڵێکی تێدابوو کە بۆ لایەنی موسوڵمانەکان قورس بوو، ئەوەیە کە ڕێگەی بە بێ باوەڕەکانی مەککە دا ئەو بێ باوەڕانەی مەککە بگەڕێنێتەوە کە چوونەتە ڕیزی باوەڕدارەکانەوە لە مەدینە، ڕێگەش بە باوەڕدارەکان نادات بە هەمان شت.

لەوە بەدەر، ئەم گرێبەستە باوەڕدارەکان نابەستێتەوە بەوەی مەودایان فراوان نەکەن لە دەرەوەی مەککە و شوێنکەوتووانی.

گرێبەستەکە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ باوەڕداران ئەگەر چیش لەسەرەتاوە زۆر کەس لەمە تێنەگەیشتن.

ئەوەی بیویستایە لە بێ باوەڕەکانی قورەیش موسوڵمان بوبوایە، ئیدی پێویستی نەبوو بچێت بۆ مەدینە، بەڵکو بوبوە یاسایەکی دەرەوە کە هەڕەشەی بۆ سەر قافڵەکانی قورەیش و بازرگانیەکەی هەبوو، بە بێ ئەوەی ببێتە دەرچوون لە گرێبەستەکەی بێ باوەڕەکانی مەککە لەگەڵ باوەڕداران بەستبوویان، لەبەر ئەوەی ئەوانە بە کرداری نەچوونە لای باوەڕدارەکان، مەککەیان جێ هێشت، بەڵام نەچونە ڕیزی باوەڕداران.

گـەورەترین قـازانج کـە لێـرەدا کرابێـت باوەڕدارەکـان کردیـان، چونکـە توانییان بانگەوازەکەیان بڵاو بکەنەوە لە بارەی خودای تاقانەوە بـۆ ئـەو هـۆز و تیرانەی لەگەڵ قـوڕەیش دا نـەبوون، بانگەوازەکـەیان بـە شـێوەیەک فـراوان بوو کە گەیشتە شوێنانێک هەرگیز پێی نەدەگەیشتن ئەگـەر لـە ژێـر سـێبەری جەنگی بەردەوام دا بوونایە لەگەڵ مەککە، هەروەها شـەڕ ڕاگرتنەکـە هـەلێکی زۆر باش بـوو بـۆ بـەهێزکردنی سـوپاکەیان لـە ڕووی بازرگـانی و ئابووریـەوە، هـــەروەها مەدینـــە جێگرەوەیـــەکی ســـەرکەوتووی پێشـــکەش کردبـــوو، جێگرەوەیەک کە یاسای جیاواز لە خۆدەگرێت و دادپەروەری و گەشەسـەندنی ئابووری لە خۆدەگرێت نەک ئەوەی تەنها بتی  تێدا نەپەرسترێت.

بێ باوەڕەکانی مەککە بەرەبەرە خۆیـان دۆزییـەوە کە چـواردەور دراون لـە ناو ئەو تەڵەیەی خۆیان بۆ خۆیان دروست کردبوو بە بێ ئەوەی بـزانن، دوای دوو سـاڵ، هەڵکوتانــە ســەرێک ڕوویــدا لــە لایــەن یــەکێ لــە هۆزەکــانی هاوپــەیمانانی مەککـە بەسـەر هـۆزێکی هاوپــەیمان لەگـەڵ باوەڕدارەکانـدا، ئەوەش شکاندنی گریبەستەکە و کۆتایی هێنان بوو بە ئاگربەستەکە.

باوەڕدارەکان چوونە پێشەوە، بە سـوپایەکی زۆر مەزنـەوە بـە پێوانـەکانی ئەو سەردەمە، دە هەزار جەنگاوەر، بەرەو مەککە.

سەرکردەکانی مەککە دیتیان شـەڕکردن هـیچ سـوودێکی نییـە، هـەر بۆیـە ناچار بوون خۆیان بەدەستەوە بدەن بە بێ ئەوەی خـوێن بڕێژرێـت، هـەر بـەو شێوەیەش بوو.

لە ماوەی هەشت ساڵ لە هاتنە دەرەوەیان بـە نهێنـی و تـرس و جیاجیـا، بـاوەڕداران بــە ســوپا مەزنەکەیانــەوە گەڕانــەوە مەککــە و، ســەرکەوتن و، مەککەیان فەتح کرد.

باوەڕدارەکـان چوونـە نێـو کەعبـەوە، ئـەو ماڵـەی کـە یەکـەمجار ابـراهیم پێغەمبـەر بونیـادی نـا تـاوەکو ببێتـە یەکـەم مـاڵ کـە خـودای تاقانـەی تێـدا

بپەرسترێت، ئەوەش کە بێ باوەڕەکان بە چواردەوری و لە ناوەوەی بتیان دانابوو، کە ژمارەیان بە پێی ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ بوو، بەمەش موسوڵمانەکان* هەستان بە تێکشکاندنیان یەک لە دوای یەک..

ئەوجا، لە دوای ئەوەی هەموو بتەکان تێکشکێنران لە دەوری کەعبە..

پیغەمبەر هات تاوەکو بچێتە ناو کەعبەوە..

تەنها دوو کەسیش لەگەڵی چوونە ژوورەوە.

یەکێکیان ئوسامە، زڕ کوڕی کە دەکاتە کوڕی کوڕەکەی کە لەخۆی گرتبوو.

ئەوی دیکەش... بیلال!

ئەو پلە و پایە، کەسە گەورە کەسایەتی و درەوشاوەکانی دەورەی پیغەمبەری نەگرتەوە، هەرچەندە زۆرێکیشیان نزیک بوون و لە گرنگەکان بوون..

بەڵام نا.

تەنها ئوسامە، (نەوەکەی) بە گرتنەخۆ..

هەروەها بیلالیش، ئەو ڕەش پێستەی کە تا پێش چەند ساڵانێکیش بەردە بوو.

بیلال گەیشتە ئەو پلەیە.

نەک لەبەر ئەوەی ڕەش پێستە، نەک لەبەر ئەوەی کە هەست کردنی"سپی پێست" بە تاوان بوونی هەیە.

بەڵکو بە کارەکەی... بەوەی کە کردی.

بەڵام تەنها ڕۆیشتنی بۆ ناو کەعبە هەموو شتێک نەبوو..

♦ ♦ ♦

پاشان بیلال چوویە سەربانی کەعبە و بانگی دا

خالیدی کوڕی ئوسەید گووتی: ئەو دەنگە چییە؟

گووتیان: دەنگی بیلالی کوڕی ڕەباحە.

گووتی: بەردە حەبەشیەکەی ئەبوبەکر؟

گووتیان: بەڵێ.

گووتی: لە کوێ؟

گووتیان: لەسەر پشتی کەعبە.

گووتی: لەسەر چاودێرگای کوڕی ابو تەڵحە؟

گووتیان: بەڵێ؟

گووتی: چی دەڵێت؟

گووتیان دەڵێت: اشهد ان لا اله الا اللّٰه، و اشهد ان محمدا رسول اللّٰه

گووتی: خودا کەرەمی لەگەڵ ابو خالید دا کرد لەوەی ئەم دەنگە ببیستێت، واتە باوکی، ئەو لەوانە بوو کە لە شەڕی بەدردا لە نێوان بێ باوەڕەکاندا کوژرا.

هەروەها..

نیوەڕۆی ڕۆژی فەتح هات و پێغەمبەر فەرمانی بە بیلال کرد تا بانگ بدات لەسەر پشتی کەعبە، قورەیشیش هەڵاتبوون و لە ترسی ئەوەی بکوژرێن خۆیان شاردبوویەوە، تیایاندا هەبوو داوای پاراستنی کردبوو، هەندێکیش باوەڕیان هێنابوو. کاتێکیش بیلال بانگی دا تا توانی دەنگی بەرز کردەوە و کاتێک گەیشتە: اشهد ان محمد رسول اللّٰه.

جورەیەی کچی ئەبو جەهل گووتی: بە گیانی خۆم ئەوە نێوت هات، بۆ نوێژیش ئەوە نوێژ دەکەین، بە خودا هیچ ئەوەمان خۆش ناوێت کە خۆشەویستمانی کوشت، ئەوەی بە پێغەمبەری بۆ محمد هات بۆ باوکیشم هات بەڵام ڕەتی کردەوە پشت بکاتە هۆزەکەی.

خالیدی کوڕی ئوسەیدیش گووتی: سوپاس بۆ خودا کە ڕەحمی بە باوکم کرد و ئەم ڕۆژەی نەبینی، ئوسەید پێش فەتحی مەککە لە ڕۆژی (بەدر)دا مرد..

حاریسی کوڕی هیشامیش گووتی: دایکم ڕۆڵەڕۆم بۆ بکات خۆزگە بمردمایە پێش ئەوەی گوێم لە بیلال بێت کە دەسەڕێنێت لەسەر کەعبە.

حەکەمی کوڕی عاسیش گووتی: ئەمە بەڕاستی ڕوداوێکی گەورەیە کە بەردەیەکی هۆزی جەمح لەسەر بینای ابو تەڵحە بسەڕێنێت.

سوهەیلی کوڕی عەمروش گووتی: ئەگەر خودا ئەمەی پێ ناخۆش بێت، بێگومان هەر وا نایهێڵێتەوە (دۆخەکە دەگۆڕێت).

ئەبو سوفیانی کوڕی حەربیش گووتی: بەڵام من هیچ ناڵێم!

◆◆◆

بیلال چوویە سەر بانی کەعبە.

پیرۆزترین شوێن لە مەککەدا.

ئەو شوێنەی کە تەنانەت گەورەترین سەرکردەکانی مەککەش بە قاچەکانیان پێی نەگەیشتبوون.

بەڵام، ئەوە بیلالە، سەردەکەوێت بەسەر دیوارەکانی کەعبەدا، دەگاتە لوتکەکەی، وەک ئەوەی وانە بداتە هەمووی، ڕۆژی سەرکەوتن، ئەگەر ئێوە ڕیسوای دەکەن، ئەگەر سوکایەتی پێ دەکەن، ئەوەی کە کردبووتانە بەردە، ئەوڕۆ ئەو پلە قورس و بە بەهایەی وەرگرتووە...

پێش چوونە ژوورەوەی سوپاکە بۆ ناو مەککە، سەرکردەکانی مەککە هاتن بۆ لای بڕواداران، بۆ ئاشتی، بۆ پارێزگاری وەرگرتن، لە کاتێکدا بۆ چەندان ساڵی قورس دژی بڕواداران بوون.. بەڕاستیش بەڵێنی پاراستنیان وەرگرت، بەڵام سەرکەوتنی بیلال بۆ سەر کەعبە، دەنگ بەرز کردنەوەشی بۆ

بانگدان، که ئەو وشانەی تاقانەپەرستی لە خۆدەگرت کە ئەوان دژیاتییان دەکرد، زللەیەکی زۆر گەورەتر و پێشبینی نەکراوتر بوو بۆ سەرکردەکانی مەککە.

لەوانەیە پیشبینی شکاندنی بتەکانیان کردبێت، لەوانەیە دڵنیا بوبێتن لەوە، لەبەر ئەوەش رێک نەکەوتن کە هیچ کام لەوان گەورەی بتەکان لە کە (هوبەل)ە لەماڵی خۆیدا هەڵبگرێت و لە شکان بیپارێزێت. هیچ یەکێکیش لەوان هەوڵی نەدا بتەکان رزگار بکات کە لە ماوەی ژیانیاندا پەرەستوویانە..

بەڵام هیچ کات ئەو لێدانەیان پێشبینی نەکردبوو.. ئەوەی کە بیلال بەرز ببێتەوە - بەردە رەشە حەبەشیەکە - لەسەر پشتی پیرۆزترین شت لە لایان، هەروەها دەنگیشی بەرز دەکاتەوە - کە ئەو لە چاویاندا بەردەیەکی هیچ بوو — بەو وشانەی کە ببوە هۆی رەتکردنەوەی ئاینە نوێیەکە لە لایان..

ئەوان قایل دەبوون بە شتەکە ئەگەر یەکێک لە عەرەبەکان، لە هۆزێک کە سەر بەوانە، بچوایەتە سەر کەعبە و ئەو وشانەی گوتبا..

بەڵام ئەو بتە، بتی رەگەز پەرەستی، دەبوایە بشکێنرایە..

نەشدەتوانرا بشکێندرێت تەنها لە رێگەی ئەم وانە پراکتیکیەوە نەبێت.

◆ ◆ ◆

## بیلالی حەبەشی

بەرز ببمەوە بۆ کەعبە!

بەسەریدا بڕۆم!

کاتێک پێی گوتم بانگ بدەم بۆ نوێژی نیوەڕۆ، چاوم گێڕا بە دەوری کەعبەدا، لە خۆمم دەپرسی: تۆ بڵێی لە کوێدا بوەستم؟ لە کوێدا بوەستم تاوەکو دەنگم بەرز بکەمەوە؟

ئەو پرسیارەکەمی دەزانی بێ ئەوەی هیچ بڵێم: بۆیە ئاماژەی بۆ کەعبە کرد.

هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی.

بەسەر دیوارەکانی کەعبەدا سەرکەوم، من، بە دیوارەکانیدا سەرکەوم و، بگەمە لوتکەکەی... ئەوجا لەوێدا بوەستم؟

من؟!

لە نائارامیدا هەناسەم هەڵدەکێشا. ئاخر ئەوە زۆرە، بە خودا زۆرە. ئەگەر پێم گوترابا کە دەچمە سەر مانگ و بەسەریدا ڕێ دەکەم زۆر پێم ڕاستەقینەتر بوو تاوەکو ئەوەی بچمە سەرەوە بۆ سەر کەعبە.

ئەوانەی چواردەورم هانیان دەدام. تێگەیشتبوون کە چ بارێک خراوەتە سەر شانم. ڕاستەخۆ تێگەیشتن کە چ هەستێکم هەیە. لە چاوم هەندێک فرمێسک بارین. دڵنیا نەبووم چ جۆرە فرمێسکێکە. خۆشی... سوپاسگوزاری.. ترس. نازانم. دەمویست بۆ چەند ساتێک بوەستم تاوەکو شتێکیان پێ بڵێم. بەڵام نا. کاتی نوێژە. دەبێت سەرکەوم. دەبێت بە دیوارەکانی کەعبەدا سەرکەوم.

خۆم لە کراس و جلەکانم ڕزگار کرد و تەنها شەرواڵەکە مایەوە، نەمدەتوانی بە دیوارەکەدا سەرکەوم بەو هەموو جلەوە. پاشان بیرم کەوتەوە

که پێسته ڕەشەکەم زیاتر دەرکەوت کاتێک جەستەمم زیاتر دەرخست. وەک ئەوەی لەوەدا ڕەنگەکەم بیرخستنەوەیەک بێت بۆ هەمووان و بە چ پلەیەک دەگەم ئێستا.

دەستم گرت بە پەردەکانی کەعبەوە، خودایە لەگەڵم بە، شتەکە لێرەدا ئاسان نییە چونکە هیچ پەتێک بوونی نییە، بەڵام نایەڵم شتەکەم لە دەست بڕوات، دەبێ جێی متمانەی ئەو بم، ناتوانم شەرمەزاری بکەم، یاخود خۆم شەرمەزار بکەم.

لە سەرەتاکەیەوە زۆر قورس بوو، بەڵام هەر ئەوەندەی بە هەردوو باڵ بەرز بوومەوە تاوەکو جوڵەم خێراتر و بە متمانەیەکی زیاترەوە بوو. تەکبیراتم دەست پێکرد، گوێم لێیانەوە بوو هاواریان دەکرد: اللّه اکبر، اللّه اکبر...

ئەوە هێزی پێدام و خێراتری کردم لە بەرز بوونەوەکەدا، هەستم کرد کە خودا لەگەڵمە، ئەوانیش لەگەڵمن بە هەمان شێوە، لەگەڵم دا بە دیوارەکانی کەعبەدا بەرز دەبنەوە، ئەوانەی کە هەر لە سەرەتاوە باوەڕیان هێنا کە هیچ خودایەک نییە جگە لە خودای تاقانە..

لە نیوەی مەوداکەدا بیرم کردەوە کە تەماشای خوارەوە بکەم، کە لا بکەمەوە، ئەو ئارەزووە هاتە دڵمەوە، بەڵام نا، کات نییە بۆ ئەوە، کات نییە بۆ تەماشا کردن بۆ دواوەوە، چاوم لەسەر لوتکەی کەعبە جێگیر کرد، لوتکە ئەو شوێنەی کە دەبێت پێی بگەم، ئەو ساتە لوتکەی کەعبە بۆم وەک ئەو بەهەشتە وابوو کە باوەڕداران هەوڵی بۆ دەدەن. وەک ئەوەی فیردەوسی ئەعلا بێت..

لەگەڵ هەر باڵێکدا کە بەرزم دەکردەوە تەکبیرەکان بەرزتر و بەرزتر دەبوونەوە و خێراتریش دەبوون، هەستم دەکرد کە هەناسەکانیان لەگەڵ منە لە تەکبیرەکاندا، وەک ئەوەی بەرز بونەوەم بە دیوارەکانی مەککە جەنگێکی

دیکـە بـێ و دەیانـەوێت سـەرکەتنی تێـدا بەدەسـت بێـنن، وەک ئـەوەی سەرکەوتنەکەم بەسەر دیوارەکەدا فەتحێکی دیکە بێت، هاوکات لەگەڵ ئەو فەتحەی کە کەمێک لەوەو پێش ڕوویدا...

دەشـمزانی کـە هەیـە خۆزگـە دەخوازێـت بکەومـە خـوارەوە، ئەوانـەی کـە ئەوڕۆ هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە هەر ئەوەنـدە بکەومـە بەردەسـتیان... ئـەوان کەوتنی من و شکست هێنانمیان بە سەرکەوتنێک دادەنا ئەگەر چیش ڕەمـزی بێت بۆ ئەوان، لەوانەیە وایان بیر بکردایەتەوە دەستی ئەو بتانەی تێدایـە کـە ئێستا شکێنران..

لەگـەڵ بـەرز بوونـەوەم بـاڵ لـە دوای بـاڵ، هەناسـەکانم خێراتـر دەبـوون، تەکبیراتـەکانیش زیـاتر دەبـوون، منـیش بـە هـەمان شـێوە لەگـەڵ نزیـک بوونەوەدا.

مەککە هەمووی چاودێری دەکات... لە نێوان ئەوەی کـە دەیـەوێت بگەمـە لوتکە و دەبینێت کە من نمونەی ئەوم و پێستم ڕێگر نییە لەوە و، ئەوەشـی کە دەیەوێت بکەوم و کەمێک سەرکەوتنی ئەو خودایانەی هەست پێبکـات کـە شکستی هێناوە.

لەگەڵ بەرزبوونەوەم بـاڵ بـە بـاڵ، کـەعبـە لـە بـاوەش دەگـرم وەک دایـک چۆن منداڵەکەی لە باوەش دەگرێت.

هەناسەکانم دەپچڕێن، بەڵام تەنانەت هەواش تامێکی دیکـەی هەیـە تـا لـە لوتکـە نزیـک دەبمـەوە... هـەموو شـتێک جیـاواز دەردەکـەوێت لەگـەڵ هـەر باڵێکی نزیک لوتکەوە...

ئەوە گەشتمە لێواری سەرەوە.

بە دەستم بۆ شتێک دەگەڕێم تا دەستی پێوە بگـرم و بتـوانم خـۆم بـەرز بکەمەوە بۆ سەرەوە.

پـەتێک دەدۆزمـەوە، پـێم وابێـت پـەردەکانی مەککـە لـە خۆدەگرێـت و بـە یەکیانەوە دەبەستێت، خۆمی پێوە دەگرم و خـۆم کـێش دەکـەم بـۆ سـەرەوە و، کۆمەڵەکە هەموویان هاوار دەکەن: (اللّٰه اکبر) لە پەرۆشیدا.

قاچی چەپم بـەرز دەکەمـەوە بـۆ ئـەوەی لەسـەر سـەرەوە دابیبینـێم. یـەک جوڵە و نیوەی جەستەم لە سەر کەعبەیە.

جەستەم ڕاست دەکەمەوە و دەوەستمە سەر پێ.

تەکبیراتەکان دەگەنە ئاسمان. ئەو کۆترەی بەسەر کەعبەوە بـوو دەفڕێـت چونکە بوونی من دەیترسێنێت و پێی ئاسایی نییە.

یەک کۆتر دەمێنێتەوە کە گرنگی پێ نادات.

نا، وا دیارە کە تەماشای من دەکات... وەک ئـەوەی مابێتـەوە بـۆ ئـەوەی دایکمم بیر بێنێتەوە.

ئاە حەمامـە، دایکـە، بـەس گەشـتەکەمت ببینیایـە.. خۆزگـە دەتزانـی بـە کوێ گەیشتووم..

تەماشـای مەککـەم کـرد... یەکـەم جـارە لـەو بەرزیـەوە دەیبیـنم.. ئـەوە شەقامەکانە، ئـەوە بازاڕەکەیـە، ئـەوە دارونەدوەیـە کـە سـەرگەورەکان لـەوێ کۆدەبوونـەوە بـۆ ئـەوەی دژمـان بوەسـتنەوە.. ئـەوە مـاڵی ئومەیـەی کـوڕی خەلەفە کە کارم تێدا دەکرد.. ئەوەش ماڵێ پێغەمبەرە..

لەوێ ڕایانکێشام بە شەقامەکاندا، کچە هـەرزەکارەکان بـەردیان تێـدەگرتم و پێدەکەنین پێم، تۆ بڵێی ئێستا لـە نـاو ئـەم کۆمەڵـەدا بـن، دەمبیـنن؟ تـۆ بڵێی باوەڕیان بەوە هێنابێ کە من لە پێناویدا ئازارم دەچەشت..

لـەوێیش، لـەو بیابانــەی کـە لێـرەوە بـە ئاشـکرا دیـارە.. ئەشـکەنجەم دەخوارد، بەردەکـە لەسـەر سـینگم بـوو، خـەریکبوو هەناسـەکانمی دەبـڕی و، منیش دەمگووت: احد، احد..

ئەم احد احدەش، لە ژێری بەردەوە هێنامیە سەر کەعبە.

سوجدەم بۆ برد.

من بەردەیەکی ئومەیە بووم، پاشان بومەیە بەندەی خودا، هەر ئەویش منی لەژێر بەردەکەی ئومەیەوە هێنا تاوەکو بمهێنێتە ئێرە، بۆ سەرماڵەکەی خۆی...

خۆزگەم دەخواست کە خودا ئەگەر بۆ چەند خولەکێکیش بوایە ئومەیەی زیندوو بکردایەتەوە..

تەنها بۆ ئەوەی بمبینێت کە لێرەدام..

هەستم کرد کە ئومەیە نەمردووە ئەمرۆ نەبێت..

لە لێوارەکە نزیک بوومەوە و، هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی وەک ئەوەی دەنگم بکەمە تیرێک و هەڵی بدەم بە هەموو چواردەوردا..

ئەوجا دەستم پێکرد..

اللّٰه اکبر، اللّٰه اکبر.

◆◆◆

## لاتیشا

پێنج ڕۆژی زۆر قورس بوو.

بیلال توشی لە کارکەوتنی سییەکانی بوبوو وەک نیشانەیەک لە نیشانەکانی شێرپەنجەکە.

شتەکە زۆر بە خێرایی ڕوویدا، یاخود لەوانەیە زۆر خێراش نەبوبێت بەڵام بیلال سکاڵای تەنگەنەفەسی نەدەکرد بە ئاشکرایی.

بەڵام من سەرنجی تەنگەنەفەسیەکەیم دا لە کاتی خەودا، شتەکە هەر چەند خولەکێکی خایاند لە کاتێکدا من پەیوەندیم بە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنەوە دەکرد حاڵەتەکەی بەرەوە خراپتر و خراپتر دەڕۆیشت.

بیلال خەریکە بە ڕاستی دەخنکێت.

پێشبینیم کرد کە شتەکە ئێستا ڕوبدات، کاتی ڕۆیشتنی هاتووە بەم شێوەیە.

لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا، هەر بە لایەنی کەمەوە توانیان ئەوە بوەستێنن.

پەیوەندیم بە ئەمجەدەوە کرد، کاتێکیش گەیشتینە نەخۆشخانە لەوێ چاوەڕێی دەکردین.

دوو ڕۆژی یەکەم زۆر بە قورسی تێدەپەڕی، هەندێک لە دەرمانە ڕۆژانەییەکان دەکرا ببێتە هۆی خوێن بەربوونی بیلال لە مێشکیدا. هەر بۆیە زۆر بە وردی ئاگاداری دەرمانەکانی دەبووم بەڵام زۆر بە هێواشی کاریگەری دەردەخست لەسەر بیلال.

لە کارکەوتنەکەی بیلال لە قاچیەوە گوازرابویەوە بۆ سی ڕاستی و، سێ بەشی سیەکەی لە کار کەوتبوو.

لە ڕۆژەکانی دواتردا بەرەبەرە بارودۆخی بەرەو جێگیری دەڕۆیشت، بەڵام زۆربەی کات خەوتبوو، وا دەردەکەوت کە بە هێواشی جەنگەکە دەدۆڕێنێت.

لەسەر پێخەفە سپیەکە، لەگەڵ ئەو هەموو بۆرییانەی لێیەوە دەهاتنە دەرێ و دەچوونە ناو، ئەو هەموو شاشانەش کە هەموو شتێکی دەگواستەوە کە لە جەستەیدا ڕووی دەدا، ئەو جەستەیەی بەرەبەر لاوازیەکەی زیاد دەکات، هەروەها بەو ڕوخسارەیەوە کە بە بێ موو دەردەکەوت، جا بڕۆ بێت یاخود تەوقە سەری... وا دەردەکەوت بۆم کە جەنگەکە دەدۆڕێنێت.

بەردەوام لە تەواوی ئامادەکاریدا بووم بۆی، چیدی زۆر گرنگیم بەو وردەکاریەکان و ڕوون کردنەوەیان نەدەدا، تەنها کاتی زیاترم دەوێت لەگەڵی.

ئەمجەدیش هەبوو، تاو نا تاوێک دەردەکەوت، هێشتا تازە هەستم بە نەمانی دەکرد کەچی دەگەڕایەوە، لە هەبوونی ڕاهاتبووم و هەستم بە جۆرە ئارامیەک دەکرد. ئەو بە ڕاستی خەمی بیلالی بوو. زیاتر لە جارێک بە خۆمم گووتبوو، ئەوە چ ڕێکەوتێک بوو کە کۆی کردینەوە، چ قەدەرێک بوو وای لە بیلال کرد نامەی بۆ بنێرێت.

لەو ماوەیەدا بەتەواوی لە دونیا پچڕابووم، لە یەکەم ڕۆژدا پەیوەندیم بە ماگیەوە کرد تاوەکو خەبەر بداتە قوتابخانە، بەڵام ئەو دوبارە پەیوەندی کردەوە و کاتێکیش وەڵامم نەدابۆیەوە هات بۆ نەخۆشخانە، پەیوەندیم بە دایکیشمەوە کرد، پێم گووت کە بیلال لە نەخۆشخانەیە و ئەویش ڕاستەخۆ لێی پرسیم: ئایا ئەو مردووە و دەتەوێت هەواڵەکەم پێ بگەیەنیت؟

نا... لەوانەیە ویستبێتم بە خۆمی بڵێم دایکە.

ئیدی گرنگ نەبوو بۆم کە لەگەڵ هیچ کەسێکدا پەیوەندیم هەبێ و قسە بکەم، لەو دوو ڕۆژەدا ماغی هات بۆ نەخۆشخانە بۆ دڵنیا بوونەوە، بەڵام هیچ گرنگیم نەدا بە مۆبایلەکەم، شەحنیشم تێ نەکردەوە، ناشزانم کەی بوو کە بە تەواوی لە شەحن بڕا.

بەڵام من پەیوەندیم نەکرد، لە ڕۆژی چوارەمیشدا هیچ گوێم تێـوەی نـەبوو کە پەیوەندی بۆ بێت.

لە نیـوەڕۆی ڕۆژی پێنجـەم، ڕۆژی یەکشـەممە بـوو، بـیلال بەرەبـەرە بـاش دەبوو، شۆربای خوارد و زەردەخەنەی کـرد و توانجێکیشـی لێدام بـەوەی کـە من دەتوانم ڕۆڵێک بەرمەوە لـە فیلمی (البؤسـاء) دا، بڕیـارم دا کـە تەماشـای تەلەفۆنەکەم بکەم و دیتم کە شـەحنی بـە تـەواوی بـەتاڵ بووەتـەوە، بـە بـێ گرنگیەوە لەسەر شەحن دامنا، تەنها دەمەویسـت کـاری سـبەینێ ڕێـک بخـەم لەگەڵ ماگی یـان ووبـی. لەسـەر شـەحن دامنـا و بـۆ مـاوەی کاتژمێرێـک یـان زیاتر لە بیرم کرد.

پاشان بیرم کەوتەوە ئەوجا کردمەوە.

♦ ♦ ♦

دیتم زیاتر لە شەست پەیوەندی وەڵامنەدراوەم هەیە. هەندێکیان لە مـاغی و دایکمەوە بوو هەندیکیشیان لە چەند ژمارەیەکەوە کە نەناسراو بوون.

سندوقی بەرید و نامە دەنگیەکانم پڕ بووبون بە تەواوی، هـیچ کـات ڕووی نەدابوو کە بیکەمەوە و زیـاتر لـە سـێ نامـەی دەنگی تێدا بێـت، ئـەم جـارە سندوقەکە گەیشتبوویە زۆرترینی: ٢٠ نامە.

چـی ڕوویـداوە، ئەگـەر تەنانـەت دایکـم بمردایـە ئـەو هـەموو پەیوەندیـە نەدەکرا، پاشان ئەو خۆی نەمردووە، ئەوەتا لە ڕیزی پەیوەندی کەرەکاندایە.

هیچ کاتی ئەوەم نەبوو تاوەکو گوێ بگرم لە ٢٠ نامەی دەنگی، بڕیـارم دا پەیوەندی بکەم بە ماگیەوە تـاوەکو لـە بـارەی ئـەو شـتە مەزنـەوە پرسـیاری لێبکەم، لەوانەیە هەموو ئەو پەیوەندیانە بە هۆی یەک هۆکارەوە بێت.

پێش ئەوەی دەست بکەم بە پەیوەندیەکە، ماغی خۆی پەیوەندی کرد.

وەڵامم دایەوە، گوێم لێی بوو هاواری دەکرد: لاتیشا لە کۆتایدا، ئەمە کۆتا هەوڵم بوو پێش ئەوەی بێم بۆ نەخۆشخانە.

پێم گووت: چی ڕوودەدات؟

هاواری کرد:لاتیشا، بیلال لە هەواڵەکاندایە!

تێنەگەیشتم. بیلال لە هەواڵەکاندایە. چی ڕوودەدات. بە بێ دەنگی مامەوە و دەمەویست تێبگەم.

ماغی دووبارە هاواری کردەوە: لاتیشا، سەرکەوتی.. بیلال لە تەلەفزیۆندایە، تێنوسەکەی لەم سێ ڕۆژەی پێشوودا وەک ڤایرۆس بڵاو بووەتەوە، ئەو ئێستا لە هەموو هەواڵەکاندایە لە بەیانیەوە. هەموو وێستگەکان، ئێڵ ئەی بی سی، سی بی سی، ئێن بی سی..

ماغی تۆزێک بێدەنگ بوو تاوەکو هەناسەکانی ڕێک بخاتەوە، ئەوجا بەردەوام بوو: ئەو نامانەی بیلال نوسیبووی ئێستا لە هەموو شوێنێکە، دوێنێ جەیمس کۆردن نامەکەی کە بۆ تۆیە خوێندووەتەوە لەسەر پەخشی ڕاستەوخۆ... ئەمڕۆش ڕۆبن ڕۆبێرتس نامەکەی کە بۆ شێرپەنجەیە خوێندووەتەوە لە "بەیانیت باش ئەمریکا".

هەردووکمان بێدەنگ بووین. ماگی دەگریا. منیش.

بە دەنگێکی خنکاوەوە گووتی: ئەوە ڕوودەدات لاتیشا، پەپولەکەت خەریکە کاریگەری جێدیهێڵێت لەسەر ئەم دونیایە..

◆◆◆

هەر ئەوەندەی پەیوەندیەکەم لەگەڵ ماغی داخستەوە، هەروەها پێش هەوڵدانم بۆ ئەوەی لەوە تێبگەم کە ماغی گووتی ئەمجەدم لە بەرامبەرم دیتەوە کە هەناسەبڕکێی بوو قژیشی شێواو بوو، وا دەردەکەوت کە تازە هەستابێت لە خەو: لاتیشا، نەمتوانی پەیوەندیت پێوە بکەم، تەلەفۆنەکەت

داخـراوە، نەشـمەتوانی پەیوەنـدی بـە نەخۆشـخانەوە بکـەم... بـیلال لـە هەواڵەکاندایە لاتیشا!

پـێم گـووت کـە مـاغی ڕاسـتەوخۆ پەیوەنـدی پێـوە کـردووم و دەیـان پەیوەندی نەناسراو لە سنودقی نامەکانمدا هەیە و نامەی دەنگیەکانیش پڕە.

پێـی گـووتم: بـە زۆری ئـەوەی پەیوەندییـە لـە بەرنامـەکانی بـەیانیانی یەکشەممان، دەیانـەوێت هاوبەشـیت پێبکـەن یـاخود چاوپێکـەوتن لەگـەڵ تـۆ یان بیلالدا بکەن.

یەکسەر تەلەفۆنەکە زەنگی لێدا، ژمارەیەکی نەناسراو.

پەیوەندیەکە لە لایەن گروپی بەرنامەی" The view" ەوە بوو، دەیانـەوێت میوانداری من و بیلال بکەن لەگەڵ ڕاپۆرتێک لە بارەی بیلالەوە.

ڕاسـتەخۆ دوای ئـەو پەیوەندیـەکی دیکـە: لـە ڕۆژنامـەوانی گۆڤـاری (ئۆو)، چاوپێکەوتنی دەویست، دەشی گووت کە ئۆپێرا وینیفری خۆی زۆر گرنگی بە چیرۆکەکە دەدات.

لام کردەوە بۆ ئەمجەد: چـی ڕویـداوە لـە مـاوەی ئـەم دوسـێ ڕۆژەدا، لـەو ڕۆژەی پێش لە کارکەوتنی سیەکانی بیلالـەوە نەچوومەتـە نـاو تێنوسـەکەوە، بەڵام خۆ زیاتر لە ١٨ کەس و بینەر — کە زۆربـەیان هـاوڕێ و هاوکـار بـوون — تێنەدەپەڕی، زۆربەی توانجەکانیش لەسەر نامەکان بە هەموویەوە زیاتر لـە دە دانە نەدەبوو کە لە کەسی نەناسراوەوە بوو. چی ڕوویداوە؟

ئەمجـەد زەردەخەنـەی کـرد: نامـەی سـۆزداری دڵتـەنگی تێدایـە بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا ئومێـد (و بەرەنگاربونـەوە)ش لـە خـۆ دەگرێـت، بیلالـیش بـە شێوەیەکی زۆر جوان بەهێز و کاریگـەر هەسـتەکانی دەردەبڕێـت، خـەڵکی بـە گشتی بە شێوەیەکی گەشبینانە کاردانەوەی لەگەڵ ئەم جۆرە شتانەدا هەیە.

خەریک بووم تێنوسەکەم دەکردەوە لە مۆبایلەکەمـدا، خودایـە، ١٠٠ هـەزار کەسـی تۆمـارکراو لـە پێگەکـەدا، هەنـدێکیش لـە نامـەکان زیـاتر لـە هـەزاران هاوبەشی پێکەری هەیە لە فەیسبووک و تویتەر.

خودای من، دەمگڵماند، چۆن ئەوە ڕوویدا؟

ئەمجەد وەڵامی دایەوە: گرنگ ئەوەیە ڕوویدا! تۆ ئەوەت دەویست! ئەوەی کە بیلال کاریگەریەک جێ بهێڵێت، ئەوەی کە نامەکەی بە جیهان بگات.

" خانمەکەم، ڕووبەرووی ڕووداوێک دەبینەوە لە دەرەوە". دەنگی بێتی پەرستار هات.

" چ جۆرێک لە ڕووداو؟" بە شڵەژاویەوە گووتم. خۆم زیاتر لە پێویست ڕووداوم بەسەرەوەیە.

" دەتوانیت بێیت تاوەکو خۆت ببیبنیت".. بە زەردەخەنە هەمیشەییەکەیەوە گووتی.

لەگەڵیدا ڕۆیشتم و هەوڵمدەدا بزانم چییە، بێتی بەرەو دەرگای چوونەدەرەوەی نەخۆشخانە دەرۆیشت و ئێمەیش بە دوایەوە، لە پیش دەرگای پیشوازی کردنەوە پێی گووتم: زۆرمان هەوڵدا ڕێگری لە هاتنە ژوورەوەیان بکەین، بەڵام نەمانتوانی ڕێگر بین لە گەیشتنیان..

دەرگاکەی کردەوە.

لە چرکەیەکدا، هەرچی کامێرا و مایکرۆفۆنی ناوازەیە لەوانەی کە دەیناسم و ئەوانەشی نایناسم لە وێستگە و کەناڵی تەلەفزیۆنی لە دەورم کۆبوونەوە..

سێرک هاتووە بۆ نەخۆشخانە.

♦♦♦

## ئەمجەد

لاتیشا هەرگیز نازانێت کە ئەو کەسە نەناسراوانەی تێچنیان لە تێنوسەکەدادەنوسی لە ڕۆژەکانی سەرەتادا، هەموویان تەنها کەسێکی نەناسراو بوون، ئەویش من بووم.

ئەوانەم بۆ پشتگیری و هاندان دەنوسی، بەڵام ڕاستگۆش بووم لەوەی کە دەمنوسی، نامەکانی بیلال لە چاو تەمەنیدا زۆر کاریگەر و هەستیار بوو.

بەڵام کاتێک بیلال توشی لە کارکەوتنی سیەکان بوویەوە، هەستم کرد کە کاتژمێرەکانی کۆتایی نزیک بووەتەوە و، جەنگەکە لە کۆتایی نزیک بووەتەوە.

هەر بۆیە بڕیارم دا هەوڵی بۆ بدەم تاوەکو نەیدۆڕێنێت.

وام لێهات تێنوسەکە و نامەکانیم لە هەموو شوێنێک بڵاو دەکردەوە، چەند هەژمارێکم دروست کرد کە دەگەیشتە دە دانە، هەرچی لە لیستی هاوڕێیەتیمدا بوبێت بۆم نارد، هاوڕێ و هاوکار و مامۆستای زانکۆ و قوتابی و هەر کەسێک کە ڕۆژێک لە ڕۆژان نامەم لەگەڵی گۆڕیبێتەوە.. هەروەها دەچوومە پێگە گشتیەکانی فەیسبووک، بە تایبەت ئەوانەی چیرۆک و پشتگیری منداڵانی نەخۆش و نەخۆشانی شێرپەنجە دەکەن بە گشتی، لینکی تێنوسەکەشم لەگەڵیاندا دەنارد تاوەکو کاریگەر و سەرنج ڕاکێش بێت... بەم شێوەیە گۆگڵ پێی گووتم کە بیکەم.

وەڵامدانەوە و زیادبوون هەبوو لە ژمارەی تۆمارکارەکان و تێچنەکاندا، بەڵام ئەوانە هەمووی لە بازنەیەکی دیاریکراودا بوو.

"خاڵی گۆڕانکاری" یەکە لە شتێکی دیکەدا بوو.

لە ڕۆژی چوارەمدا، لە کاتێکدا لە نەخۆشخانەوە دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە، ڕادیۆکەم کردەوە هەر بە ئاسایی، گوێم ڕاگرت بۆ بەرنامەی (دلیلة)، کە پەیوەندیەکانی وەردەگرت لە گوێگرانەوە و گوێی لە کێشە و خەمەکانیان

دەگرت و پشتگیری دەکردن و هانی دەدان هەروەها گۆرانی تایبەت بە بارودۆخەکەیان بۆ دەخستنە سەر.

تەنها یەک هەلی بچوکم هەبوو تاوەکو قسەکەری دواتر بم. هەوڵمدا. دەبینم راستەخۆ لەگەڵ دەلیلە دام، لەگەڵیشیدا هەشت ملیۆن گوێگری هەبوو کە گوێیان لە بەرنامەکەی دەگرت.

لە بارەی بیلالەوە دووام، کێ ناتوانێ هاوسۆزی بنوێنێت لەگەڵ هەرزەکارێک کە توشی شێرپەنجە بووە و بە نوسینی چەند نامەیەکی جوان ڕووبەڕووی دەبێتەوە کە ئاراستەی دەکات بۆ هەمووان؟

دلیلة لەم کاتەدا – لە کاتێکدا کە من دەدوێم، هەر ئەوەندەی ناوی تێنوسەکەم برد، چوبویە ناو تێنوسەکەوە (شفرة بیلال)، وا دیارە ئەوەی پێ جوان بووە کە بیلال نوسیویەتی، هەر بۆیە زۆر بە کاریگەرییەوە هەندێکی دەخوێندەوە، چەند جارێکیش ناوی تێنوسەکەی دوبارە کردەوە، پاشان هەمان ئەو گۆرانییەی هەڵبژارد کە لاتیشا هەڵیبژاردبوو بۆ تێنوسەکە: (هەورەکان) ی زاک سۆشیب.

کاتێک گەیشتمەماڵەوە ژمارەی تۆمارکاران گەیشتبوویە ١٣ هەزار، دەیان کۆمێنت (تێچن)یش، پێش ئەوە زۆر لەوە کەمتر بوون.

نازانم دوای ئەوە چی ڕوویداوە، بەڵام شیکردنەوەم بۆ ئەوە ئەوەیە کە یەکێک لە ئامادەکەرانی بەرنامەی (The late late show) لە کەناڵی سی بی سی گوێی لە بەرنامەکەی دلیلە گرتووە، بەشێکیش لە بەرنامەکەی ئەو بە هۆکارێک ڕەت کراوەتەوە، بۆیە بڕیاری داوە بەم بەشە جیاوازە لە کاتی ئاسایی پڕی بکاتەوە لە بەرنامەیەکی خەندە ئامێزی ڕۆژانە.

من تەماشای بەرنامەکەم نەکردبوو، خەو بردمیەوە لە کاتێکدا تەلەفزیۆنەکە داگیرسابوو، لە بەیانی یەک شەممەدا درەنگ خەبەرم بوویەوە تاوەکو ببینم بیلال لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنە.

هاوارێکی زۆر گەورەم کرد لە کاتێکدا درکم بەوە دەکرد کە خەون نابینم و بیلال و چیرۆکەکەی لە هەموو هەواڵەکانی بەیانیاندا باس دەکرێت.

تێنوسەکەم کردەوە، دیتم کە ژمارەی سەردانیکەران و تۆمارکەران گەیشتووەتە زیاتر لە ٧٠ هەزار کەس و، سەدان کۆمێنت و هاوبەشی پێکردن.

ئەوە ڕوودەدات، ئەوە ڕوودەدات.

پەیوەندیم بە لاتیشاوە کرد بەڵام تەلەفۆنەکەی داخرابوو، بەپەلە ڕامکرد تاوەکو پێی ڕابگەیەنم بە بێ ئەوەی دەموچاوم بشۆم.

پاشان شتێکم بیر کەوتەوە..

سوجدەم بۆ خودا برد.

ئەوجا دەرچووم بۆی.

♦ ♦ ♦

## لاتيشا

توشبوون به ڕووناکییەکانی سێرک کە خۆی کردبوویە ناو ژیانمانەوە وەک پرۆسەی ڕووت بوونەوە بوو لە بەردەم خەڵکیدا.

بەڵام پرۆسەی ڕووت بوونەوەی (ناوەکی)، کە تێیدا هەستەکانم ڕووت دەکردەوە، ترسەکانم، وردترین وردەکاری ژیانم.

ئەوەی کە دایکێک باسی جگەرگۆشەکەی بکات کە خەریکە لە بن دەستی دەروات بۆ ڕووناکی و کامێرا و شاشە و تەماشاکەر و تۆک شۆو مشتومڕکارە زیرەکەکان کە زیاتکردنی ڕێژەی بینەریان دەویست زیاتر وەک لە هاوسۆزی.. هەموو ئەوانە پرۆسەی ڕووت کردنەوە بوون لە بەرامبەر خەڵکیدا.

من وشیار بووم بەوە، وشیاربووم بەوەی کە شتەکە بۆ میدیا وەک بەشی (خۆش ڕابواردن) بوو، خەڵک هاوسۆزی دەنوێنێت لەگەڵ بیلال و کاریگەر دەبن بەوەی دەیڵێم، بەڵام لەکۆتایدا بەم کێشانە لە کێشەکانی خۆی هەناسە دەدات، لە فرمێسک ڕێژان بۆ بیلال هۆکارێک دەدۆزێتەوە بۆ پیشاندانی فرمێسک لەو شتانەی دیکە کە بەتەواوی نایەوێت ڕوبەڕوویان ببێتەوە.

هەڵخلیسکانە نێو یاری هەست و سۆزەکان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان شتێکی زۆر فریودەر بوو بێگومان، هەندێک لە مشتومڕکاران لە بەرنامەکاندا ئەوەیان دەویست، پرسیارێکیان دەکرد کە وام لێبکات بگریم لە بەرامبەر بینەردا.

" هەستت چۆنە وەک دایکێک کە تاقانەکەی لە دەست دەدات؟".

پێویست بوو کە کەمێک بێدەنگ ببم، پاشان دەست بکەم بە باس کردنی تایبەتترین و سۆزداریترین هەستم لە بەرامبەر ملیۆنان کەس کە هەموو شتەکە لە لایان بە کلێنسێک تەواو دەبوو کە فرمێسکەکانیانی پێ دەسڕن.

شتەکە بێ گوومان ڕێژەی بینەری زیاد دەکرد، بەڵام ئەوە گرنگ نەبوو بۆ من، نەگەیشتووم بە ئێرە تاوەکو ڕێژەی بینەری بەرنامە گفتوگۆییەکان زیاد بکات، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی بیلال جێپەنجەیەک لەم دونیایەدا بەجێ بهێڵێت، بۆ ئەوەی ئەو ژیانەی کە ماویەتی بە باشترین شێوەبژی.

لە هەموویاندا دووبارەم دەکردەوە کە من لە نێوان ٤ هەزار دایکدا کە ساڵانە لە ئەمریکا منداڵەکەیان دەمرێت لە ڕووداودا بە بەختترینم، چونکە هیچ هەلێکیان نییە بۆ ماڵئاویی کردنێکی ڕێکو پێک یاخود ئەسڵەن هەلێکی نییە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆیشتن، کوڕەکەی لە بەیانیدا دەڕوات بۆ قوتابخانە لە ڕێگادا دەمرێت — بۆ نمونە - کە لەوانەیە ئەو بەیانیە نە ماچی کردبێت نە لە باوەشی گرتبێت.

من بە ئاگا بووم لەوە، شەش هەزار منداڵ هەن لە ئەمریکا کە ساڵانە دەمرن و تەمەنیشیان لە خوار چواردە ساڵەوەیە، زیاتر لە نیوەیان، ٦٣ %، لە ڕووداوەکاندا دەمرن (بە زۆری لە ئۆتۆمبێلدا و، بە ڕێژەیەکی کەمتریش بە تاوان).. واتە مردنێکی لە ناکاوە بە بێ ئاگادار کردنەوەی پێش وەختە..

دەمگوت کە من لە نێو لە ٢٠ % دایکەکاندا بە بەختترینم، ئەوانەی کە دەزانن جگەرگۆشەکەیان دەمرێت و، هەلێکیان هەیە نەک هەر بۆ ماڵئاوایی کردن و بەس، بەڵکو بۆ دروستکردنی پەیوەندیەکی باشتر لەگەڵیان، بۆ باشترکردنی ئەو ماوەیەی ژیانیان کە ماوە.

هەروەها وەک چۆن دەرچونێکی پێشبینی نەکراو بوو لەو بەرنامەیەدا، باسم لە کاریگەری کەسایەتی بیلالی حەبەشی دەکردەوە لەسەر بیلال لە ڕوبەڕوبونەوەی لەگەڵ نەخۆشیەکەیدا، گەڕانی بە دوای خۆیدا لە ڕێگەی گەڕانی بە دوای کەسایەتیەکدا بوو کە باوکی لەوەوە ناوی نابوو، کە ئەو ناوە تاکە شت بووە لە باوکیەوە بۆی ماوەتەوە.

شتەکە لە سەرەتادا نامۆ بوو، بە تایبەت کە ئەو کەسایەتییە مێژووییە کەسایەتیەکی موسوڵمان بوو، بەڵام من لەو ڕووەوە باسم نەدەکرد کە بەردەیەکی ڕەش پێست بووە و لە ڕێی باوەڕەوە ئازاد بووە، ئەوە لە نامۆییەکەی کەم دەکردەوە، بە تایبەت کە من بەهەرحاڵ موسوڵمان نەبووم. من باسم لە کەسایەتیەکی مێژووی دەکرد کە لە شارستانیەتی مرۆڤدا دەستی هەبووە، نەک لە ڕووی" پیاوی ئاینیەوە".

بەدڵنیاییەوە میدیا پێی خۆش بوو کە من و بیلال ڕۆڵی (خەونی ئەمریکی)مان هەبووایە بە ستریۆ تایپێک لەوەوە،ماڵێک لەگەڵ باخچە و ئۆتۆمبێلێک، هەروەها دایک و باوکێکی نمونەیی ماڵەکە پڕ لە خۆشەویستی و میهرەبانی دەکەن.

بە داخەوە، من نمونەی نوسخە ڕاستەقینەکە بووم: من دایکێکی بێ هاوسەر بووم کە لە سانت لویسەوە هاتبوو بۆ نیویۆرک، پشتگیری کوڕەکەی دەکات و لە برۆکلین دەژیەت.

ئەوەم بە ئاشکرا گووت لە (the view) دا، گووتم من ئەو نمونە نیم کە میدیا ڕێک دەیەوێت و، چیرۆکی بیلال لەوانەیە زۆر سەرنج ڕاکێشتر بوایە گەر سپی پێست بووایە، لە خێزانێک بوایە کە لە دایک و باوک پێکهاتبایە، لە خێزانە پلە بەرزەکان بێت و، دانیشتووی گەڕەکەکانی قەراغ شار بێت.

ووپی گۆڵد بێرگ زۆر بە توندی پشتگیری کردم و، گووتی کە ئەوەی میدیای ڕاکێشاوە چیرۆکی مێردمنداڵێک نەبووە کە بەدەست شێرپەنجەوە دەناڵێنێت بەو ڕێژەیەی کە تێنوس و نامەکانی بیلال و شێوازە جوانەکانی ڕایکێشاوە. ئەوەش بووە هۆی مشتومڕێکی چاوەڕوانکراو لە نێوان ئەو و نیکۆڵ والاس بەڵام بەگشتی مشتومڕەکە ئیجابی بوو، منیش توانیم ئەوەی بیلال لە پەیامی ئیجابی هەیبوو بیگەیەنم.

◆◆◆

چاودێری کردنی کاردانەوەی خەڵک لە بوونمان — من و بیلال- بە (دوو ئەستێرە) زۆر سەرنج ڕاکێش بوو.

لە پڕێکدا مستەر وید بوبویە میهرەبانترین کەس کە لە ژیانمدا ناسیبێتم، لەوانەشە بیری کردبێتەوە کە (جذور) بکاتە ڕۆمانێک کە پێویستە بخوێندرێت لە پۆلی دە دا لە ساڵەکانی دواتردا.

نزیکەکان و هاوڕێیەکانی زانکۆ کە بۆ ماوەی چەند ساڵێک گوێم لە زەنگێکیان نەبووبو، کە بە نەخۆشیەکەی بیلالیشیان دەزانی و ڕۆژێک بیریان نەکردەوە نامەیەکی پشتگیری و هاندان بنوسن، بەڵام لە پڕێکدا بوبومە (باشترین هاوڕێیان) کاتێک چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنیەکانیان هاوبەشی پێدەکرد لە هەژمارەکانیان لە فەیسبووک، لە پڕێکدا بوونی هاوڕییەکیان کە کوڕێکی توشبووی شێرپەنجەیان هەیە بوبویە جێی شانازی بۆیان.

تەنها ئەو کاتە کە لە شاشەی کەناڵیکی تەلەفزیۆنی بەناوبانگ دەردەکەوێت.

ماغی زۆر دودڵ بوو لە هەموو ئەم شتانە.

ئەمجەدیش لە هەموو کاتەکاندا لە پەنام بوو، ئەو پشتگیریەی دەدامێ کە لە هەموو تەمەنمدا پێویستم پێی بوو.

◆◆◆

هەندێک کەس لە سێرکی میدیادا زۆر ڕۆیشتن و زیادەڕەویان کرد بەوەی داوایان لێکردم کە ڕەزامەند ببم بەوەی وێنەی ساتەکانی کۆتایی بیلال بگرێت، وەک بەرنامە تەلەفزیۆنیە ڕاستیەکان، منیش ڕەتم کردەوە لەگەڵ برێکی باش و پێویست لە جوێن... مردنی کوڕەکەم ناکەمە سێرکێک کە هەمووی تەماشای بکات.

کۆتا چاوپێکەوتنم لە میدیادا لەگەڵ دکتۆر فیل بوو.

له دوای ئەوەوە بڕیارم دا کە بەسە.

تۆمارکــارانی تێنوســەکە ســێ ملیــۆنی تێپەڕانــدبوو. هــەروەها ژمــارەی بینــەرانی ئـەو ڕاپۆرتــەی گروپی (الرؤیـة) ئامادەیـان کردبـوو لـە پێـنج ملیـۆن زیاتر بوو.

بیلال بە شێوەیەک توانی نامەکەی بگەیەنێت.

ئیدی پێویست بە ڕووناکی زیاتر ناکات..

گەڕامــەوە دواوە تــاوەکو بتــوانم کــاتێکی زیــاتر کــە لەبەردەممــدا مــاوە لەگەڵیدا بەسەر ببەم.

ئاشکراش دیار بوو کە کەم دەکات.

کەم دەکات و

کەم دەکات.

♦ ♦ ♦

## نامەیەك لە بیلالەوە بۆ جێسیکا ( تێنوسەکە )

لەوانەیە منت بیر نەیەتەوە!

لەوانەیە ئەگەر پێت بڵێنەوە کە ئەو کوڕە بوو چویە تەوالێتی کچانەوە، ئەو کات بیرت بێتەوە.

بەڵام من بۆ ئەبەد لە یادت ناکەم. ئەبەدیش بۆ من تەنها چەند مانگێکی دیکەیە بە داخەوە. بەڵام خۆ هەر ئەبەدە.

تۆ تاکە شت بووی کە ئارامی پێدەبەخشیم لە کاتی چوونم بۆ قوتابخانە، تاوەکو ئەو کاتەی چوویت بۆ لۆس ئەنجەلۆس لە پۆلی حەوتدا.

هێشتا ئەو ڕۆژەی یەکەمم لە بیرە لە پۆلی حەوتدا کە جۆن و مایک منیان گرت لە ڕاڕاوە تەسکەکەی نێوان کتێبخانە و هۆڵی وەرزشیەکە و، هەوڵیاندا بە دیوارەکەدا هەڵمواسن.

ڕۆژێکی زۆر خراپ و ناخۆش بوو.

بەڵام خراپترین شت تێیدا ئەوە نەبوو.

بەڵکو ئەوەبوو کە زانیم ڕۆیشتوویت و، ئیدی ناگەڕێیتەوە.

ئەو ڕۆژە ئەوە زۆر زیاتر ئازاری دام لەوەی کە جۆن و مایک ئازاریان دام و ئەوانی دیکە پێم پێکەنین.

ڕووناکییەک هەبوو لەو قوتابخانەیە و، بە ڕۆیشتنی تۆ کوژایەوە.

تەنها بوونت، تەنها تەماشاکردنت، وای لێدەکردم هەستێکی جیاوازم هەبێت.

وەک جوانترین شت لە بووندا تۆم دەبینی، دواتر بۆم دەرکەوت کە هەموو کەس بەو شێوەیە ناتبینێت، بەوە شۆک بووم، کوڕەکان باسی کچە جوانەکانی پۆلیان دەکرد و ناویان دەهێنا بەڵام تۆی تیا نەبوو. لە یەکەم سەرنجدا وای بۆ دەچووم کە ئەوەی جوانترینی شتێکی یەکلاییکەرەوەیە و پێویستی بە باسکردن نییە.

بەڵام ناوەکەت زۆر درەنگ هات... لە دوای پێنج یاخود شەش کچی دیکەوە هات. دانەیەکیشیان گاڵتەی بە لێوت دەکرد و دانەیەکیش پشتگیری کردیت.

ئەوەم زانی کە ئەو جادووەت، هەموو چاوەکان نایبینین.. وەک ڕووناکی نەبینراو، کە پێویستی بە ئامێری تایبەت هەیە بۆ بینینی.

ئەوە زیاتر هۆگری کردم پێتەوە.

تاکییەکەت و، تێگەیشتنم بۆ ئەو تاکییە.

زەردەخەنەکەت زۆر جوان بوو، کە زەردەخەنەت دەکرد چاویشت لەگەڵیدا پێدەکەنی، دونیاش لە پڕیکدا زۆر باشتر و جوانتر دەردەکەوت لە دوای زەردەخەنەکەتەوە. تەنها بە هەبوونت وای دەکرد دونیا باشتر و جوانتر بێت.

جارێکیان لە پۆلی شەش، ڕێک پێش مۆڵەتی بەهاران، خاتوو کۆلتۆن مامۆستای ئینگلیزی داوای لێکردم ئەو شتە بخوێنمەوە کە نوسیومە لە بارەی ( دە شت کە ئاواتەخوازی ڕووبدات تاوەکو دڵخۆش بیت).

نۆ شتم گووت، لە بارەی بوونی باوکمەوە، لە بارەی ئەو پلەیستەیشنەوە کە لە دایکمم دەوێت، لە بارەی وانەی بیرکاریەوە، لە بارەی نەمانی هەندێک کەس لە ژیانم (مەبەستم جۆن و مایک بوو)، لە بارەی ئامادەبوونی ئاهەنگی ویزەوە، هەروەها بلیتی کۆتاییەکانی سوپەر بۆڵ، ئەوەی کێشم دابەزێت، لووتم بچوکتر بێت، ئەوەی کە جێی نەهێڵم و کەس بانگم نەکات کاتێک یاریزانەکانی تۆپی باسکە هەڵدەژێردرێت وەک ئەوەی هەموو جارێک ڕوودەدات...

ئەوجا دەیەم، شتێکم لە بارەی تۆوە گووت، بێگومان بە بێ ئەوەی ناوت بێنم، شتێکم لە بارەی زەردەخەنەکەتەوە گووت، خۆزگەم خواست کە تەنها ئەو زەردەخەنە بمێنێت تاوەکو پۆل ڕووناک بکاتەوە..

ئەوەم گووت و چاوم لەسەر پەڕەکە لابرد و تەماشایەکی تـۆم کـرد، دیـتم ڕوخسارت سوور بووەتەوە لە شەرمدا.

هەستم کرد کە دەزانیت مەبەستم تۆیە.

هەستم کرد کە ئەوە دەزانیت پیش ئەوەی بیلێم.

♦♦♦

لە ساڵی دواتردا ڕۆیشتی.

هەر دوای ئەو بە چەند مانگێک شێرپەنجەکەم دیاری کرا.

♦♦♦

## نامەیەك بۆ خودا – بەشی دووەم ( تێنوسەکە )

ئازیزم خودا..

ئێستا بە شێوەیەکی زۆر باشتر دەتناسم.

هەست دەکەم ئێستا نزیکترم لێتەوە.

هەست دەکەم تۆ نزیکترینی لێمەوە.

لەوانەیە هەموو کات نزیکترین بوبێتی، بەڵام من هەستم بەوە نەکردبوو.

ئایا ئەوە هەست پێدەکەم چونکە لە مردن نزیک دەبمەوە؟

پێم وانیە، هەمومان بە رێگەیەک، لەوەتەی لە دایک دەبین، زیاتر لە مردن نزیک دەبینەوە.

ئەوەی وای لێکردم نزیک ببمەوە لێتەوە، ئەوەیە کە زیاتر لە ژیان تێگەیشتم.

نزیک بوونەوەم لە مردن، وای لێکردم زیاتر لە ژیان بگەم، ناوازییەکەی تێبگەم، لە جوانیە شاراواکەی ناو نامۆییەکەی بگەم.. ئاگایم بەوەی کە دەمرم وای لێکردم کە دەست بە ژیانەوە بگرم پێش ئەوەی بڕۆم، وای لێکردم بیژیەنم تا بتوانم.. هەروەها واشی لێکردم کە لە هەموو شتێکدا بتبینم، زۆر بە سادەیی دەڵێم ناوازیەکی لەو شێوە ناتوانرێت بەدی بهێنرێت جگە لە لایەن خودایەکی ناوازەی وەک تۆوە..

پێش ئەوەی زیاتر بتناسم، هەستم بە بێدادی و نادادپەروەری دەکرد بۆ زۆر شت، هەستم کرد کە تۆ خۆشت نەویستووم، یاخود با بڵێم هەر بە لایەنی کەمەوە بەو شێوەیە بیرم نەدەکردووە... بەڵام من بە پێی پێویست دڵخۆش نەبووم تاوەکو خۆشم بوێیت، هەروەها پێم وابوو کە دەبێت دڵخۆش بم تاوەکو هەست بە سوپاسگوزاری بکەم بەرامبەرت ئەوجا خۆشم بوێیت..

بەڵام ئێستا زیاتر لە بارەی هەموو شتەکانەوە دەزانم.. شێرپەنجە و.. مردنی حەتمی وای لێکردم تێبگەم کە خۆشبەختی ئەو شتانە نییە کە لە ڕیکلامەکاندا دەردەکەوێت، بەڵکو لە شتێکی قوڵتردایە، لە هەستەکانی ناخدایە کە ناتوانرێت لە بەرامبەر کامێرادا نیشان بدرێت، لە قایل بوونی ناخەوەیە، لە ڕەزامەندیەکەیدایە..

بە شێرپەنجەدا تێپەڕیم، گەیشتمە کۆتا ئاستەکانی، ئەوەتا خەریکم دەمرم، بەڵام ئەم ڕێگەیە نزیکتری کردمەوە لە تۆ... بەڵێ، ڕێگەیەکی بە ئازار، ژیانێکیش کە پڕە لە ئازار، بەڵام ئەمە ڕێگری لە خۆشبەختی ناکات وەک ئەوەی پێمان وایە، هەر بە لایەنی کەمەوە وەک ئەوەی من پێم وابوو.

پێویست نەبوو لەسەرت کە دونیا بە شێوەیەکی باشتر دروست بکەیت. بەم شێوەیە ئافراندووتە - بەڕاستیش ناوازەیە - بەڵام تۆ هەلێکت بۆ ئێمە جێهێشتووە تاوەکو باشتری بکەین، پێویست نەبوو لەسەرت کە شێرپەنجە دروست نەکەیت، یاخود وای لێنەکەی کە دروست ببێت، تۆ لێی گەڕایت ڕووبدات چونکە هەندێک لە ڕێگاکان پێویستە سەخت بێت، هەندێک شوێن ناتوانیت پێی بگەیت تەنها لە ڕێگەی ڕێگە سەختەکانەوە نەبێت. ئەسلەن نەدەکرا پێی بگەین.. ئەگەر ئاسان دروستت کردبا، ئەسڵەن نرخی ئەوەمان نەدەزانی کە پێی گەیشتووین..

بەڵێ، شێرپەنجە خراپە، بەڵام زیاتر تێی گەیاندم، لەوانەیە ژیان بە هۆی ئەوەوە کورت بێت، بەڵام بەهۆی ئەوەوە زیاتر لە جارێک ژیام لەم ژیانە کورتەدا، لەوانەیە بەو شێوەیە بژیامایە کە هاوپۆلەکانم دەژین، تاوەکو زۆربەیان لە نیوەی تەمەنیاندا دەمردن، من بەم قوڵییە تێنەدەگەیشتم.. هێندەی تەمەنی ئەوان نەدەژیام، وەک ئەوەی ئێستا ئەگەر توشی ئەمە نەبوومایە.

هەموو ئەوەی بەسەرمدا ڕوویدا لە خۆمی نزیکتر کردمەوە، ئەوجاش لە تۆوە، وەک ئەوەی خۆناسینم، زیاتر تۆی پێناساندبم...

کاتێکیش کە زیاتر دەتناسم، وای دەبینم کە پێویستە زیاتریش خۆشم بوێیت..

ئازیزم خودایە:سوپاست دەکەم بۆ هەموو شتێک، پێشتر خۆزگەم دەخواست ژیانم کەمێ گۆڕانکاری زیاتری تێدابووایە، دەمویست لێرەدا باوکێک زیاد بکەم یاخود چەند شتانێکی دیکەش لەوێ، بەڵام تێگەیشتم (زۆر درەنگیش نا) کە ژیانێکی زۆر جوان و خۆشە وەک ئەوەی کە هەیە، دایکێکی چاک و شازم هەیە کە هەموو هەوڵی داوە تاوەکو من ڕۆژەکانم بە باشترین شێوە بژیەنم، ژیانم هەلێکی زێرین بوو تاوەکو خۆم بناسم، تۆش بە هەمان شێوە، هەروەها هاوڕێیەکی چاکیش وەک ئەمجەد حەلەوانی، جێسیکا، جۆنیش کە لووتیم شکاند، هەروەها کەسێکی ناوازەش کە پێش هەزار ساڵ هەبووە.. ئەویش بیلالی حەبەشیە..

ئازیزم خودایە: ئەمە وەک خۆش دووانێک ناڵێم، دەشزانم خۆش دووان لەگەڵ تۆ سوودی نییە.. بەڵام بەڕاستی ناوازەیت..

هەروەها بە ڕاستیش خۆشم دەوێیت.

بە ڕێگەیەک: دڵخۆشم کە دێم بۆ لات.. سەرەڕای دڵتەنگیم کە دایک بەجێ دێڵم.

تکایە بۆی ئاسان بکە.

◆◆◆

## نامەیەك لە بیلالەوە بۆ ئەمجەد حەلەوانی ( تێنوسەکە )

ئازیزم ئەمجەد..

ئەو ڕۆژەی کە نامەکەم بۆ ناردیت، هیچ کات پێم وانەبوو شتەکان لێردا کۆتاییان دێت.

خۆ من هەر چاوەڕێی وەڵام نەبووم.

تەنها هەوڵم دەدا گومانی باش بە خەڵکی ببەم، هەوڵم دەدا پۆزەتیڤ بم.

شۆکت کردم.

بەڕاستی شۆکت کردم کاتێک وەڵامت دایەوە، کاتێک کاتت تەرخان کرد بۆ من، هەندێک کات وا دەهاتە پێش چاوم کە تۆ سیناریۆی فیلمەکەت پشتگوێ خستووە و کاتت بۆ من تەرخان کردووە!..

کاتێک لە پیاوی خەیاڵەکانەوە هاتیتە دەرێ،بۆ ناو دونیای ڕاستی، ئەو ڕۆژەی کە لە فرۆکەخانە بۆ یەکەم جار چاوم پێت کەوت، هەستم بە سەر سوڕمان کرد کەمێک، ئەو ئەمجەدەی کە دامنابوو بە متمانەتر بوو بەخۆی، ڕاستەقینەکە کەمێک دودڵ و شڵەژاوتر دەهاتە پێش چاوم، لەوانەیە وێنەیەکی پاڵەوان و نمونەییم لە مێشکمدا دروست کردبێت، لەوانەیە سەقفێکی بەرزم لە پێشبینیەکان دانابێت.. پاشان هاتم و دیتم کە زۆر لەو سەقفە کەمتر بوویت.

لەگەڵ کاتدا زانیم کە سەقفەکەی من خەیاڵێک بوو، ڕاستەقینەش هەموو کات جوانتر و گرنگترە، بەڵکو زیاتر لەوەش: زانیم کە ئەو پاڵەوانە هیچ کات ئەوە ناکات کە تۆ کردت، بە زۆری سەرقاڵ دەبێت بە خۆیەوە.

هیچ کەس ئەوە ناکات کە تۆ بۆت کردم کەسێک نەبێت کە کەمێک دودڵە، کەمێک سەر لێشێواوە ،کەمێک گەمژەیە، ڕێک وەک تۆ.

لەبەر ئەوەی ئەوە تەنها مرۆڤێکی راستەقینە دەیکات و، مرۆڤی پاڵەوان کاتی بۆ ئەو شتانە نییە.

مرۆڤی راستەقینەش، بە پێناسە، کەمیک دوودڵ دەبێت، کەمێک شلەژاو، هەندێک جاریش کەمێک گێژ.

بەڵام لە کۆتایدا باشترو جوانترە لە پاڵەوانەکە.

بەم شێوەیە ناسیمیت لە دواتردا... بەم شێوەیەش لێت تێگەیشتم بەرەبەرە.

نا، لە تۆدا "باوک" یاخود " سێبەری باوک" م نەدیتەوە، دڵنیا نیم کە ئەسڵەن بۆی گەڕابێتم.

بەڵام جێگرەوەیەکی زۆر گونجاوترم دۆزیەوە.

"باشترین هاوڕێ" م دۆزیەوە.

ئەمە هیچ کات کەم نییە، بەڵکو لەوانەیە یەکێک بێت لە جوانترین شتەکان لەم ژیانەدا.

لەوانەیە پێشبینیم نەکردبێت کە باشترین هاوڕێ لە کەسێکدا بدۆزمەوە کە لەوانەیە زیاتر لە بیست ساڵ لە خۆم گەورەتر بێت.

بەڵام ئەوەی لە گەورەتر لە خۆتدا بیدۆزیتەوە، باشترە لەوەی کە هەرگیز نەیدۆزیتەوە.

ئەمجەد حەلەوانی، تەنها هەر باشترین هاوڕی نەبووی، بەڵکو ئەو هاوڕێیە بووی کە ژیانمی بۆ باشتر گۆڕیم.

هەر بۆ ئەمەش باشترین هاوڕێیەکان دروست بوون.

◆ ◆ ◆

## نامەیەك لە بیلالەوە بۆ لووتە شکاوەکەی جۆن واشنتۆن( تێنوسەکە )

زۆر داوای لێبووردن دەکەم بۆ ئەوەی شکاندمیت.

بەڵام باش دەزانیت کە دەبوو زۆر لەوە پێشتر رووبدات.

باش دەزانیت کە تۆ لەسەر ڕوخساری جۆن هەیت، کە دەمی (لە خوارەوەی تۆوەیە) هەستا بە سوکایەتی پێکردنم لە ماوەی ئەم هەموو ساڵەی پێشوودا، تاکە هەڵەشم ئەوەبوو کە لە پێشتردا نەمشکاندیت، ئەگەر پێشووتر بوایە، ئەوە نەمدەشکاندیت، تەنها مشتە کۆڵەیەک لە ڕوخساری بەس بوو.

دەزانم جۆن حەتمەن کێشەی هەیە کە وای لێکردووە ئەو شتانەم پێ بڵێت لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە پێی گوتم، ئەوە زۆر ڕوون دیار بوو، کەس ئەوە ناکات تەنها کاتێک نەبێت کە کێشەیەک یان چەند کێشەیەکی هەبێت (لەوانەیە تۆ یەکێک لە کێشەکانی بیت ئەی لووتی جۆن!).. ئەویش کێشەکانی لە کیسی زۆرانبازییە ئاسان و نزیکەکەدا بەتاڵ دەکردەوە..

دەبوایە زووتر ڕووبەڕوی ببمەوە، بەڵام ئەوەم نەدەزانی، چونکە هێشتا خۆمم نەناسیبوو، هاوڕێی خۆم نەبوو، هەر بۆیە ئەوەی کە دەیکرد پێم (ئەو و مایک بە تایبەتی) شتێک بوو بەسەر کەسێکدا هات کە لەوانەیە شایەنی بووبێت وای لێبکرێت، وەک کیسی زۆرانبازی یاخود تەنانەت سەرەرەوەی پێڵاوەکان کە لەبەر دەرگاکەدایە...

من لە دوای ئەوەوە، بە چیرۆکێک ئاشنا بووم وای لێکردم (بیلال) بناسم، بیلالێکی دیکە جگە لە من، ئەو بیلالەی کە بە ناوی ئەوەوە ناو نراوم... ئەوە وای لێکردم بیلالێکی دیکە بناسم کە لە ناخمدایە، ئەوە پێویستە لەسەرم هەروەک چۆن دەبێت ئەوە بم کە شایەنمە.

ئەوجا یەکترناسینەکەمان تەواو بوو، مـن و خـۆم، بـەوەی کـە شـکاندمیت ئەی لووتی جۆن واشنتۆنی.

هیچ شتێکی تایبەتی بوونی نییە بەرامبەرت.

من و جۆن یەکسان بووینەوە، هەر ئەوەندە.

هەر بەو بۆنەیەوە: هەوڵ بدە بە بیر جۆنی بهێنیتەوە، لە دواتـردا، بـەوەی دوا داواکـاریم جێبـەجێ بکـات، تـەنها بـۆ ئـەوەی دڵنیـا ببێتـەوە لـە باشـەی نیەتەکانی..

با جۆن هەوڵ بدات هـەمووان بخاتـەوە بیـری مـن، لـە ڕێـی وشـەیەک یـان گۆرانیەکەوە کە پێشکەشی دەکات یان هەر شتێکی دیکە، ئەوەش کاتێک کە چاک بوویتەتەوە، لە دوای دە ساڵ لە دەرچون لە قوتابخانە.

ئەوە باشەیەک دەبێت لەوەوە.

منیش لێی خۆش دەبم لە هەر کوێیەک بم.

◆◆◆

## نامەی بیلال بۆ ئومەیە ( تێنوسەکە )

ئایا دەتوانم بڵێم: ئازیزم ئومەیە...

پێم وانییە.

بەڵام ئەوە تەنها (شێوازی قسە کردنە)، ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ ئازیز بیت، پەنا بە خودا.

ئایا تۆ ئێستا لەو شوێنەی کە من پێم وایە لەوێیت؟ لەوانەیە زۆر قەرەباڵەخ بێت!

حەزم کرد شتێکت پێ بڵێم.

کاتێک چیرۆکەکەی تۆم بیست، ئەو شەڕە ڕەهایەم نەدی کە وەک هەمیشە لە فیلمە جوڵاوەکاندا دەیبینینەوە. بەڵکو ئەو مرۆڤەم دیتەوە کە هەڵە دەکات و ڕەتی دەکاتەوە دان بە هەڵەکەیدا بنێت، زۆر لەوە لاوازترە کە دانی پێدا بنێت، پاشان دەچێتە ئاستێکی پێشکەوتووترەوە بەوەی ئەم لاوازیەی وای لێدەکات هێزی بازووی بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی لاوازیەکەی بشارێتەوە، بۆ ئەوەی جێی لاوازیەکەی بگرێتەوە.

یەکەم شت لە جۆندا تۆم دەبینیەوە.

ئەوجا لە شێرپەنجەدا.

ئەوجا وام لێهات لە خۆمدا تۆم دەبینی. لە لاوازیەکەمدا بەرامبەر جۆن واشنتۆن. لە لاوازیم بەرامبەر شێرپەنجە.

چیدی تۆ سومبلی شەڕ نەبوویت، بەڵکو سومبولێک بوویت بۆ قایل بوونم بە شەڕ. بۆ لاوازییەکەم بەرامبەر ئەوانی دیکە، بەرامبەر جۆن واشنتۆن، بەرامبەر شێرپەنجە.

نەمدەتوانی مشتەکۆڵەیەک لە جۆن واشنتۆن بدەم، تاوەکو لەو ئومەیە نەدەم کە لە ناخمدایە.. ئەو ئومەیەی کە لاوازم دەکات بەرامبەر ئەو ئومەیەی لە دەرەوەیە..

ئومەیە هەر خۆی زۆر لەوە لاوازترە کە ڕووبەڕوی خۆی ببێتەوە، هەر بۆیە دڵی بەوە خۆشە کە ستەم لەوانی دیکە بکات.

جۆن واشنتۆنیش هەر بەو شێوەیەیە.

منیش بەو شێوەیە بووم.. زۆر لەوە لاوازتر بووم کە ڕووبەڕووی خۆم ببمەوە... هەر بۆیە بەوە خۆش کەیف بووم کە خۆم بەدەستەوە بدەم بۆ قەدەری کیسی زۆرانبازیەکە، یاخود ئەو سرەرەوەی پێلاوە کە لەبەردەم دەرگای دەرەوەیە..

♦ ♦ ♦

ئازیزم ئومەیە: ناتوانم پێت بڵێم: برۆ بۆ جەهەنەم.

چونکە هەر خۆت لەوێیت.

♦ ♦ ♦

## نامەیەك لە بیلالەوە بۆ شێرپەنجە ( تێنوسەکە )

ئازیزم شێرپەنجە..

بۆ یەکەم جار، وا دەردەکەوێت کە تۆ لێت بردەمەوە و سەرکەوتی بەسەرمدا.

بەو شێوەیە دەردەکەوێت کاتێک هەموو ئامێرەکان دەکوژێنەوە، ئەو شتەی کە بەم زووانە ڕوودەدات، پێم وابێت.

بەڵام دەبێت بزانیت کە شتەکە بەو شێوەیە نییە، لەوانەیە هەر تۆ پێش هەموو کەسێک بزانیت کە شتەکە بەو شێوەیە نییە.

لەم جەنگەدا، ئەوەی کە دەمرم واتای ئەوە ناگەیەنێت کە تۆ بردوتەتەوە، چونکە هەمووان لە کۆتایدا دەمرن، هەر تۆ خۆت، دەمریت. ئازیزم شێرپەنجە، کاتێک کە من دەمرم، هەر بۆیە مردنی من سەرکەوتنی تۆ ناگەیەنێت.

لەم جەنگەدا، دۆرانی ڕاستەقینەم مردنی بێ شکم نییە، بەڵکو دۆڕانم ئەو کاتەیە کە ویستی ژیان لە ناخمدا دەکوژێت، کاتێک دەمرم پێش ئەوەی بمرم، کاتێک دەمرم پێش ئەوەی جێ پەنجەیەک (بۆ ژیان) لەم دونیایەدا جێ بهێڵم.

ئەوەش کە ڕووی نەدا، لەوەدابوو کە توانیم بەسەرتدا سەرکەوم. ناتوانیت لەوەدا بمدۆڕێنیت..

لە سەرەتاوە پێم وابوو منیش وەک هەمووان، جەنگەکە ئەوەیە بمێنمەوە لە ژیان، بەڵام ئەوە چ واتایەکی هەیە کاتێک هەر ئەمرین لە دوای هەموو شتێکەوە؟

سەرکەوتنم ئەوەیە کە شتێک لە من بمێنێتەوە دوای ئەوەی کە دەڕۆم.. ئەوەی کە جێ پەنجەیەک جێبهێڵم یارمەتی ئەوانی دیکە بدات لەم جەنگە و جۆرەکانی دیکەیدا..

هەر بەو بۆنەیەوە ئازیزم شێرپەنجە، بە تەواوی نازانم لە کوێوە هاتوویت، بەڵام ئەوە دەزانم کە ڕۆژێک دێت و یەکێک ئەوە دەزانێت و ئەوە یارمەتی دەدات لەوەی خەڵکی لە دەستت قوتار بکات..

ئازیزم شێرپەنجە: کاتێک هەموو ئامێرەکان دەکوژێنەوە، وا دەزانیت کە وشەی کۆتایی تۆ گووتوتە.

بەڵام سەرت دەسوڕمێت بەوەی من ماومەتەوە دوای ئەوەی دەڕۆم.

ئەو کاتە نامەیەکم بۆ جێهێشتوویت: کش مەلیک، ئازیزم شێرپەنجە.

♦ ♦ ♦

From: amjadhelwani@bilal.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

Subject:بیلال وەک چاودێری گشتی

لە دوای دوو ساڵ لە سەرکەتنی موسوڵمانەکان بەسەر بێ باوەڕەکاندا لە مەککە، پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد.

لە بەڕیوەبردنی کاروبارەکانیشدا ئەبوبەکر جێی گرتەوە، نزیکترین هاوڕێی، ئەویش هەر ئەوەیە کە بیلالی ئازاد کرد.

ئەبوبەکریش دوای دوو ساڵ کۆچی دوایی کرد، لەو نێوەندەدا بیلال هەر وەک بانگبێژ مابوویەوە وەک چۆن لە کاتی ژیانی پیغەمبەردا بانگبێژ بوو.

لە دوای کۆچکردنی ئەبوبەکر عومەری کوڕی خەتاب هات، کە بە دووەم نزیکترین کەس لە پێغەمبەرەوە دادەنرێت لە دوای ئەبوبەکر، مەودای حوکومڕانیەکەی ٩ ساڵی خایاند و دەوڵەتەکە بەرفراوان بوو بۆ ئەوەی ببێتە مەزنترین هێز کە بەسەر ئیمراتۆریەتی ڕۆم و فارسدا سەرکەوت، هەروەها لە سەردەمی ئەودا گرنگترین دەستکەوتە شارستانیەکان وەدەست کەوت، ئەو لە دادپەروەری و دادی کۆمەڵایەتیدا وەک نمونە دەهێنرایەوە.

بەڵام لەم ماوەیەدا بیلال دەکشێتەوە لەو ڕۆڵەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر و ئەبوبەکردا هەیبووە، بیلال وازی هێنا لە بانگدان بۆ نوێژ، بیلال هەموو شاری جێهێشت و چوویە ڕیزی سەربازیەوە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ڕۆم ببێتەوە لە وڵاتانی شام.

بۆ یەکەم جار، وا تێدەگەین کە شتەکە هەر وەک ئەوەیە کە گووتی، ئارەزووی بیلال بۆ چوونە نێو سەربازیەوە، تاوەکو دادپەروەری بڵاو بکاتەوە و ستەم نەهێڵێت.

بەڵام چاوپێداخشانێکی خێرا بە ئەو ڕووداوانەی کە لەو ماوەدا ڕووی داوە پێم دەڵێت کە شتەکە زۆر لەوە ئاڵۆزتر بووە.

با ئەو دوو ئاكارە وەبیر خۆمان بهێنیەوە كە بیلالم پێوە ناسی لە نامەكانی پێشوودا.

ئەمانەت پارێزیەكەی (لە ئابووریدا)، كە وای لێكردبوو ببێتە سەرپەرشتیاری خەزینە لە سەردەمی پێغەمبەردا.

هەروەها قسە لەڕوویەكەی كە لەوانەیە توند بێت، وشەی هەق دەڵێت ئەگەر تەنانەت لەسەر نزیكترین كەسیشی بێت، هەروەک بینیمان لە باسكردنی ڕەفتاری خراپی براكەی، لە كاتێكدا ژنی بۆ داوا دەكرد!

ئەو دوو ئاكارە، وای لێدەكات ببێتە ئەو كەسەی كە عومەر دەیەوێت، بە ئیرادە و دادپەروەر و زاهید كە، باش دەیزانی بەرفراوان بوونی دەوڵەت و زۆربوونی سامان دەكرێت ڕوكەشی جیاواز لە زیادەڕەوی بهێنێت لەگەڵ خۆیدا، تەنانەت ئەگەری هەیە ڕابەرەكان سوود وەربگرن لەو بارودۆخە نوێیە.

هەموو ئەو باس و خواسانەی هاتووە لەسەر بیلال كە لە وڵاتی شامە، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە ئەو لە جێی لیژنەی دەستپاكی، یاخود چاودێری دارایی بووە، كە ڕاستەخۆ پەیوەندی بە عومەرەوە هەیە، هەرەوەها عومەر پشتی پێدەبەستێت لە زانینی ڕۆیشتنی كاروبارەكان بە شێوەی ویستراو — یاخود نەڕۆیشتنی — .

كەواتە بیلال لەگەڵ عومەری جێنشیندا بەسەر ماڵی ڕابەرەكاندا دەگەڕێت تاوەكو دڵنیا ببێتەوە لە نەبوونی هەر زیادەڕەویەک یاخود پارەیەكی خەزنكراو..

لە هەمان كاتیشدا، پەیوەندیەكەی لەگەڵ عومەردا، كە ئەو حاكم بووە، پەیوەندیەكی پوختە بووە، پەیوەندیەكی پیاوانە، نەک پەیوەندی پیاوێک لە ناو خەڵكیدا بە حاكمەوە، تا بگات بە پەیوەندی (بەردەیەكی پێشوو) بە حاكمەوە.

بەم شێوەیە بووە بیلال..

خاوەن هەڵوێست، خاوەن کاروباری خۆی، تەنها بەو پێگەیە قایل نەبوو کە بەدەستی هێنابوو، پێگەی دەنگەکەی کە گەیشتبوویە ئاسمان..

بەڵکو ئەو دەنگەی کردە هۆکارێک بۆ گووتنی هەق و ڕاستی تەنانەت ئەگەر لە ڕووی حاکمیشدا بێت، بە ڕووی هەر خراپەکاریەک یاخود زیادەڕەویەکدا بێت...

بیلال پیاوی بنەماکانی بوو.

ئەوانەش هەموو شتێک لەدەست دەدەن لە پێناو بنەماکانیان..

♦ ♦ ♦

## بیلالی حەبەشی

لە دوای ئەوەی پێغەمبەری خودا کۆچی دوایی کرد.

بانگدان بۆ نوێژ زۆر بە ئازار بوو بۆ من... پڕ بوو لە هەست و یادکردن.

لە یەکەم بانگدان دوای ئەوەی دفن کرا، هەستامەوە بۆ ئەوەی بانگ بدەم، بڕوام نەدەکرد کە چیدی لەوێ نەماوە تاوەکو ڕاستەوخۆ گوێی لێم بێت.

ئەوە لە مێشکی دام تاوەکو هەستم بە سەرئێشە کرد.

کاتێکیش گەیشتمە سەر ناوهێنانی ئەو، (و اشهد ان محمد رسول اللّه ﷺ) دەستم بە گریان کرد بە شێوەیەک کە تەنانەت لە منداڵێشمدا وا نەگریا بووم.

سێ جار هەوڵمدا دوبارەی بکەمەوە و، لە هەر جارێکیشدا دەستم بە گریان دەکردەوە..

واتای بێ نەوایی تێگەیشتم کاتێک هەستام بۆ بانگدانی یەکەم بە دوای مردنیەوە.

بە ڕاستی باوکم نەناسیوە، دایکیشم ماوەیەکی زۆرە مردووە.

بەڵام تەنها ئەمڕۆ بە ڕاستی هەستم کردوە کە من بێ نەوا و بێ باوکم.

واتای هەتیوی تێگەیشتم.

بەتەواوی لەوە تێگەیشتم کە (ئەبوبەکر) گووتی بە خەڵکەکە کاتێک هاواری کرد بەسەرماندا کە بینینی ڕوخاوین:ئەی خەڵکینە، ئەوەی موحەمەدی دەپەرەست ئەوە موحەمەد مرد، ئەوەشی خودای دەپەرەست، ئەوە خودا هەمیشە زیندووە و نامرێت.

بەڵێ... ئەبوبەکر بەو ڕستەیە بە خەبەری هێنامەوە لە ناڵە و گریانەکانم..

موحەمەد مرد. کۆتایی هات.

خودا نامرێت. لێرەدا کۆتایی پێنایەت. لێرەدا بەردەوام دەبێت.

بەڵی ، لەوە تێدەگەم..

بەڵام یادکردن و بیرکردن شتێکە ناتوانین بە تێگەیشتن و بە وشەی دانایانە چارەسەری بکەین.

یادکردن شتێکی زۆر بە ئازارە.

هەر ئەمەش بوو ڕووبەڕووم بویەوە لە یەکەم بانگدان لە دوای مردنی ئەوەوە.

ئیدی ئەو لێرە نابێت..

چیدی لێرە نابێت..

گریانی خەڵکەکە زیادی کرد کاتێک گوێیان لە من بوو کە دەگریەم. ئەوە وای لێکردم کەمێک خۆم بگرم، بڕیارم دا کە دەنگم سەرەتا وشەی باوەڕ و شەهادەتی بۆ گواستوونەتەوە نابێت پەیامی خەمباریش بگوێزێتەوە..

کۆنترۆڵی دەنگە ژێیەکانم کرد، وشەکانم بەردەوام پێدا لە کاتێکدا بەرەنیسکم دەدا.

بەڵام هەر بەردەوام بووم لەسەری.

لە هەر بانگدانێک لە دوای ئەوەوە شتیکی لەو شێوەیە هەبوو، بەڵام بە ڕێژەیەکی کەمتر.

ئەو ئازارە هەبوو، ئازاری شتێک کە وشەکان کەمی ناکەنەوە.

بەڵام لەبەر ئەبوبەکر مامەوە، مەرحەلەیەکی زۆر قورس بوو، هەندێک لە هۆزەکانیش گرێبەستەکانیان هەڵوەشاندەوە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا بەستبوویان، خەڵکی بە نەبوونی پێغەمبەر ڕانەهاتبوون، ئەگەر منیش لەگەڵ دەنگەکەمدا دیار نەمامایە بۆ بانگدان، ئەوە خەڵک هەستیان بە جیاوازیەکی زۆر و زۆرتر دەکرد لە نێوان سەردەمی پێغەمبەر و ئەبوبەکردا..

لەوانەیە نەبوونم چەقۆ دانێک بوبێت لە پشت ئەگەر بە ئەنقەستیش نەبوبێت...

مامەوە لەبەر خاتری ئەبوبەکر.

سەرەڕای ئازارەکەم لە هەر جارێکدا کە بانگم دەدا تێیدا بۆ نوێژ..

بەڵام هەر مامەوە لەبەر ئەو..

ئەو هەڵوێستەی ئەو لە گەردنم دا بوو کە ناتوانم لەبیری بکەم... ئەوە لە گەردنمدا بوو کە ئەو گەردنمی ئازاد کرد..

ئەوەش کەمترین شت بوو کە بۆ ئەبوبەکری بکەم.

لەگەڵ عومەر شتەکە جیاوازتر بوو.

خەڵکی بە ڕێگەیەک لە ڕێگەکان خەریکبوو لە نەبوونی پێغەمبەر ڕادەهاتن..

عومەر خۆشی جیاواز بوو... ویستەکانی کە تایبەت بوو بە دەوڵەتەوە و بەرفراوانی بدات بە سنور و ڕووبەرەکەی..

بڕیارم دا کە بەردەوام نەبم لە بانگدان.. بەڵکو لەگەڵ عومەردا بڕۆم بۆ ئەوەی کە دەیەوێت..

بڕیارم دا کە دەرچم بۆ جەنگی ڕۆم لە شام..

دەشمزانی کە عومەر بە ئیرادەکەی و دادپەروەری و زاهیدیەکەیەوە بەوەدا دەکێشێت کە دەزانێت دەچێتە دەروونی مرۆڤەوە.. ئەو ماوەیەی نەفامی کە لەسەر شێوەی خۆشویستنی زیادەڕەوی و پارەدا دێت، هەروەها هە شتێکی دیکەش کە ڕێگاکە بەرەو دواوە بەرێتەوە.

دەمزانی کە ئەو پێویستی بە کەسێکە بۆ یارمەتیدانی..

من یەکێک دەبم لەوانەی کە ئەوە دەکات.

◆ ◆ ◆

## نامەی بیلال بۆ لاتیشا

دەزانم کات خەریکە بەرەو تەواو بوون دەچێت.

هەستی پێدەکەم.

هەموو شتێک بەرەبەرە دەتوێتەوە، چیدی بەئاسانی توانای جوڵانەوەم نەماوە... چیدی بە ئاسانی هەناسەم بۆ نادرێت.. ئیدی بە هەمان ڕوونی جاران نابینم.

ئەوەش پێش چەند ماوەیەک بوو، ئەمڕۆ بە نزیکەیی هیچ نابینم.

تەنانەت ڕوخسای تۆش. چیدی بە هەمان ڕوونی نابینم.

واتای مردن لەم شتانەوە تێگەیەشتم کە خەریکن کەم دەکەن.. ئەوەی کە نەجوڵێم.. ئەوەی کە هەناسە نەدەم..

نەبینم..

بە تایبەتیش کە تۆ نەبینم دایکە..

واتای مردن تێگەیشتم.

تێگەیشتم کە خراپترینە.

ئەوەیە کە بچم بۆ شوێنێک تۆی لێنەبێت..

تۆی تێدا نەبینم..

هەر لە ئێستەوە هەست بە.... دەکەم، ترس نا. شتێکی دیکەیە، ... ، تەنیایی، دایکە شتەکان چۆن دەبن بێ تۆ؟ ئاخر هەر بە بێ تۆ نەبێت؟

هەست بە پەشیمانیش دەکەم... بۆ زۆر شت..

هەست بە پەشیمانی دەکەم لەسەر هەر ساتێک ڕۆیشتووە و باوەشم پێدا نەکردوویت. بێ ئەوەی دەستت بگرم.. بێ ئەوەی بچمە دەرەوە لەگەڵتدا بۆ بازاڕکردن و وەرزش یان باخچە.

چەنجە گەمژە بووم کاتەکانم بە یارکردن بەسەر دەبرد بە یاریە خەیاڵییەکانمەوە، لەگەڵ کەسانێکی خەیاڵی لە ناو دونیایەکی خەیاڵیدا..

ئەمڕۆش، لە کاتێکدا لە دونیای ڕاستەقینەم دەکشێمەوە بۆ دونیایەک کە جیاوازە لە دونیای ڕاستەقینە و دونیای خەیاڵیش... دەبینم کە تەنها تۆم دەوێت لە نێوان ئەو هەموو کەسانەی کە بوونیان نییە..

بەڵام تۆ توانای ئەوەت نابێت بێیت لەگەڵمدا.

چەندە گەمژە بووم ئەو ڕۆژەی بڕیارم دا کە باوەشم پێدا نەکەیت یاخود ماچم نەکەیت لە شوێنە گشتیەکاندا.

ئەمڕۆ، خۆزگە دەخوازم کە ئەوە من بوومایە کە لە هەموو شوێنێک، تایبەت و گشتیش باوەشم پێتدا کردبا.

لە گەمژەییەکەم ببورە. لە کەللە ڕەقی جار جارەم. لە هەڵچوونەکانم هەندێ جار.

هەروەها بۆ هەموو گەمژەییەکانی دیکەشم، تەنانەت ئەوانەش کە بیرم نایەنەوە. لەوانەیە زۆرم هەبوبێت کاتێک منداڵ بووم.

لەوانەیە زۆر هیلاک بوبیت لەگەڵم، لە کاتێکدا بەتەنیا بوویت.

ئێستا بمبورە، چونکە لەمەودواش بە تەنها دەبیت.

خۆزگەم دەخواست کە هەقت بۆ بکەمەوە، کە لەگەڵت مابامەوە، کە پشت و پەنایەک بومایە بۆت کاتێک کە پیر دەبیت..

خۆزگەم دەخواست بە دەرچوونم دڵت خۆش بکەم، بەوەی کە بڕوانامەی زانکۆ بەدەست بهێنم، بەوەی کە هاوسەرگیری بکەم، بە منداڵەکانم کە دەبنە نەوەی تۆ..

بە داخەوە...

هیچ شتێک لەوانە بەدەست ناهێنم. ئەوەتا منیش بە تەنها جێت دێڵم
وەک چۆن باوکیشم بە تەنها جێی هێشتی. بمبورە بۆ ئەوە.
بمبورە لەوەی کە بەڕاستی لێت تێنەگەیشتم درەنگ نەبێت.
لە دوای ئەوەی کە کات خەریکە تەواو دەبێت.
دایکە ئێمە هەموو کات درەنگ تێدەگەین.
درەنگ تێدەگەین.

♦ ♦ ♦

ئەگەریش «دونیایەکی دیکە» هەبوو.
ئەوە هیچ کات دەستت یان باوەشت جێناهێڵم.
لە بەهەشتدا تەنها ئەوەم بەسە..

♦ ♦ ♦

## ئەمجەد

درکم بەوە کرد کە باردۆخی بیلال کە بە خێرایی خراپ بووە، بەڕاستی لە کاتی دابەزاندنی فیلمەکەدا بوونی نابێت، هەر ڕێک وەک ئەوەی لە یەکەم نامەدا نوسیبووی.

دەمزانی کە گۆڕینی کاتی دابەزاندنی فیلمەکە شتێکی ئەستەمە. دەشمزانی کە فیلمەکە هەر جارێ لە کاتی مونتاجکردنی کۆتاییەکەیدایە، بەڵام هێشتا چەند مانگێک لە کارکردن ماوە تێیدا پێش ئەوەی بە شێوەی کۆتایی دەربکەوێت.

پەیوەندیم بە عەبدولەوە کرد و داوای چاوپێکەوتنێکی خێرام کرد لەگەڵی.

گووتی پێم «لە دوازدە سوچەکە دەتبینم».

هەرگیز گوێم بەو ناوەوە نەبووە. ئەوەم بە عەبدول گووت، ئەویش گووتی پێم کە خەریکە گومان دەکات لەوەی نیویۆرکی بم. ڕستەیەک دەیگووت هەر کاتێک بنوسایە بە شوێنێکەوە کە ئەو وای دادەنا لە شوێنە نایابەکانی نیویۆرکە و، منیش هیچ بیرۆکەیەکم لەسەری نییە.

چووم بۆ ڕۆژهەڵاتی برۆدوای تاوەکو چاوم بە عەبدول بکەوێت. بەڕاستی قاوەکەی نایاب بوو هەروەها شلکێنە خرەکانیشیان.

لە عەبدولم پرسی: ئایا گوێت لە ناوی بیلال و شیفرەکەی بیلال بووە؟

ڕاستەخۆ گووتی: بە دڵنیاییەوە، کێ نەیبیستووە؟ زۆر هەوڵماندا پەیوەندی بکەین بە دایکیەوە، چونکە لە زۆر لە چاوپێکەتنەکانیدا باسی بیلالی حەبەشی کردووە، ئەوەش لە قازانجی فیلمەکە دەبێت ئەگەر ئاماژە بە هەبوونی فیلمێک بکات بە ناوی بیلالەوە، بەڵام دایکی هەموو پەیوەندیەکی لەگەڵ هەموو لایەنە ڕاگەیاندنەکان بچڕاندبوو.

هەموو شتێکم بە عەبدول گووت. لە یەکەم ئیمەیڵەوە تاوەکو کۆتا نامەی نێوان من و بیلال.

زۆر سەرسام بوو بە هەموو شتێک، هەستایەوە و باوەشی پێمدا کرد و دەیگوت کە شانازیم پێوە دەکات (براکەم)، هەروەها ئەو بۆنەی کە لە خۆی دابوو زۆر زۆر توند بوو بە شێوەیەک خەریکبوو دەخنکام.

عەبدول دوای ئەوەی دانیشت کەمێ بیری کردەوە و هاواری کرد: دەزانیت ئەم چیرۆکە زۆر نایابە؟ ئەگەر لە نێوانتاندا — تۆ و دایکەکە - چیرۆکێکی خۆشەویستی دەستی پێبکردایە، ئەوە دەبووە جوانترین فیلمی ڕۆمانسی لەم سەردەمەدا. دەکرێت بیۆنسەی ڕۆڵی بگێڕێت سەرکەوتنەکەشی بێ پایان دەبێت.

زەردەخەنەم کرد. بیۆنسەی گونجاوە بۆ ڕۆڵەکە. بەڵام لە چاومدا، لاتیشا جوانترینە.

عەبدول هاواری کرد کاتێک زەردەخەنەکەمی بینی: تۆ بەڕاستی خۆشت دەوێت!

دوبارە لەسەر کورسیەکەی هەستایەوە و پیرۆزبایی لێ دەکردم و پێی ڕادەگەیاندم کە چەندە دڵخۆشە بۆم (براکەم). دوبارە لە نێو بۆندا نوقوم بوومەوە.

بۆ ئەوەی ئاڕاستەی گرنگی پێدانی بە لاتیشا بگۆڕم گووتم: ئەو بۆنە چییە؟

ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە: کەیفت پێ هات؟ ئەمە بۆنی عودە، خوشکەکەم دوێنێ بۆی ناردم بە هاوڕێیەکیدا.

لە جانتاکەیدا شوشەیەکی گەورەی دەرهێنا کە بە قەبارەی لوغمێکی زەوی دەبوو و بڕێکی زۆر گەورەی بەرەو ڕووی من پرژاند کە وای کرد قاوەخانەکە لەناو بۆندا نوقم ببێت، لە دوای ئەوە سوێندی خوارد کە شوشە بۆنەکە وەک هەدیە ببەم!

هەوڵمدا بیهێنمەوە نێو بابەتەکە: بیلال لە سەرەمەرگدایە عەبدول، پێم وانیە لە ژیاندا بمێنێت تاوەکو کاتی دابەزاندنی فیلمەکە لە مانگی دوودا.. ئایا دەکرێت ڕێگەی بدەین کەمێک لە فیلمەکە ببینێت، ئەو ئێستا بە هەر حاڵ زۆر باش نابینێت، ئەوە ئارەزووی کوڕێکە کە لە سەرەمەرگدایە..

عەبدول بە بیرکردنەوە خەریک خوراندنی ڕیشی بوو، لە ڕوخساریدا گرنگیدان بە بابەتەکە دەردەکەوت، پاشان دەفتەری تێبینیەکانی دەرکرد چاوی خشاند بە چەند پەڕەیەکدا.

ئەوجا تەماشای منی کرد و گووتی: بیرۆکەیەکی زۆر باشترم هەیە.

لە ماوەی دە ڕۆژدا، عەبدول توانی سەرۆکی لیژنەی بەڕێوبەرایەتی بەرهەمەکەی قایل بکات بەوەی پێشەکی ناساندنی فیلمەکە لە نیویۆرک بکرێت، ئەوەشی ڕوون کردەوە کە ئەو پێشەکییانە کە ڕەخنەگران و ڕۆژنامەوانان بانگەوازی بۆ دەکەن نابێت هەموو فیلمەکەی بە تەواوی تێدا بێت، بەڵکو تەنها چەند بەشێکی کەمی پیشکەش دەکرێت (هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو لەسەر ئەوە)، ئامادەبوونی بیلال و لاتیشا و، گووتنی ئەوەی کە بیلال کوڕێکە لە سەرەمەرگدایە و خاوەنی تێنوسە بەناوبانگەکەیە، بەرهەمهێنەرانی قایل کرد بە پێویست بوونی خێراکردن لە پێشکەشکردنی پێناساندنەکە.

عەبدول بەرپرسیارێتی هەموو شتێکی گرتە ئەستۆ، تەنانەت جلەکانی لاتیشا، بیلال، منیش هەروەها، قاتێکی سمۆکینگ بۆ من و بیلال، عەزیەکی بۆنەی ڕەشی درێژی نایابیش بۆ لاتیشا.

هەروەها (هونەرزانێکی میکیاج)یشی تایبەت بە لاتیشا نارد پێش ئاهەنگەکە.

پاشان بە ئۆتۆمبێلێکی لیمۆزین هەر سێکەمانی نارد کە لە دوایشییەوە ئۆتۆمبێلێکی فریاکەوتن هەبوو (بۆ پێویستی)

من و لاتیشا بەسەر فەرشی سووردا دەڕۆشتین و پاڵمان بە بیلالەوە دەنا لەسەر کورسی جوڵاو.. لە کاتێکدا ڕووناکی کامێراکان هەمووی لەسەر ئێمە بوو..

شتەکە ڕێک وەک خەون وابوو.

لە کاتی فیلمەکەشدا، پێم وانیە بیلال زۆر شتی بینیبێت کە لەسەر شاشەکەیە.

بەڵام زەردەخەنەی دەکرد.

لاتیشاش دەستی گرتبوو و، دەیشگریا.

بە دەستەکەی دیکەشی هەندێک جار دەستی منی دەگرت.

◆◆◆

## لاتيشا

ڕاهاتبووین لەسەر ئەوەی چی شادی هێنەرە لەسەر شاشەکان ببینین.

بە لایەنی کەمەوە ئەوە هەموو کات هەڵبژاردەیەک بووە. هەڵبژاردەیەک کە دەتوانیت بە ویستی خۆت بیگۆڕیت، ئەوەی کە کەناڵەکە بگۆڕیت، یاخود بیکوژێنیتەوە.

پەیوەندیەکانمان لەگەڵ شاشەکاندا هەموو کات بە پێی هەڵبژاردەکانمان بووە.

هیچ کات بە خەیاڵماندا نایەت کە دەورەدانمان بەم شاشانە، بە وایەری هاتوو- ڕۆیشتوو، بە ژمارە و داتاکان، پێمان دەڵێت کە تاکە خۆشبەختیمان لەم ژیانەدا کۆتایی دێت. لە نێو دەستمان دەڕوات.

لەگەڵ بیلال، لە ژوورەکەی لە نەخۆشخانە، شاشەکان دەورەیان داوم لە هەموو لایەکەوە، ئەو شاشانەی کە هەواڵەکان دەگوێزێتەوە لە جەستە بچوکەکەیەوە، ئەو شاشانەی کە پێمان دەڵێت شتەکان باش نین. باش نین. باش نین.

بیلال بەرەبەرە دەکشایەوە، لە نیوە کۆمایەکدا. چیدی چاوی نەدەکردەوە. چیدی قسەی نەدەکرد. هەناسەدانیشی زۆربەی کات لە ڕێی ئامێرەکانەوە بوو.

خەریکبووم لە شاشەکاندا ژیانە کورتەکەی بیلالم لەگەڵ خۆم دەدیت، ئەو ژیانەی ئەو کە جوانترینساڵەکانی ژیانم بوو.

بە شیوازێکی هێواش دەمدیت. بە هێواشترین خێرایی توانراو، تا بتوانم زۆرترین کاتی ڕەخساوی لەگەڵ بەسەر ببەم.

تێگەیشتم کە دەبێت لەوە ڕابێم لەبەر ئەوەی لە ساڵەکانی داهاتوودا، چواردە ساڵەکەی لەگەڵ ئەو دەگەڕێنمەوە. بە ڤیدیۆی هێواش، بە خێراییەکی هێواش کە تا تەمەنم ماوە بەشم بکات.

◆ ◆ ◆

From: amjadhelwani@bilalmovie.org

To: bilal٢٠٠١ny@hotmail.com

Subject: مردنی بیلال

بیلال لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد... لە ساڵی بیستەمی کۆچی باوەڕداران بۆ مەدینە، ئەوەش لە ڕێی ئەو تاعون و بەڵایەی کە ئەو ماوەیە لە وڵاتی شامدا بڵاو بویەوە.

ئەو کات گەیشتبوویە شەست و سێ ساڵی تەمەنی.

لە هەموو تەمەنیدا بیلال گەشبین بووە، هەموو ئەوانەی لێیەوە گوێزراوەتەوە و لێوەی ماوەتەوە هەمووی لەوپەڕی گەشبینیانە بووە، لە (احد، احد) ەوە، بۆ وشەکانی بانگ، تا دەگاتە هەڵوێستەکەی لەگەڵ عومەردا.

تەنانەت لە کاتی مردنیشیدا، بیلال گەشبین بووە...

زۆر دەگمەنە ئەگەر کەسێک لە سەرەمەرگدا پەیڤ و وشە بەو گەشبینیەوە بڵێت، بەڵام بیلال گەشبین بووە تەنانەت لە کاتی مردنیشیدا..

دەگێڕنەوە کە هاوسەرەکەی دەگریا بە سەریدا کە دەیبینی ئەو دەمرێت و دەیگوت: ئەی ماڵ وێرانخۆم..

بیلالیش وەڵامی دایەوە بە وەڵامدانەوەیەک کە بووەتە سومبولێک لە لای موسوڵمانان:

سبەی بە دیداری خۆشەویستان دەگەین.. موحەمەد و هاوەڵەکانی.

◆◆◆

## لاتيشا

بیلال لە بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەممەدا مرد.

ڕۆژێکی خۆرەتاوی خۆش بوو. ئەو یەکشەممەی کە بیلال تێیدا مرد.

کەش و هەوا گونجاو بوو بۆ گەشتێکی بە کۆمەڵی خۆش.

بیلالیش ئەو گەشتەی کرد، بەڵام بە تەنها.

خودای گەورە ڕۆژێکی خۆشی بۆ هەڵبژاردبوو، خۆرەتاو، بۆ ئەوەی بڕوات بۆ لای.

بەو شێوەیە بیرم کردەوە.

چەند کاتژمێرێک بەر لە مردنی، پێش بەرەبەیان، بیلال دوای چەند ڕۆژێک لە بێدەنگی دووا.

دەستیم گرتبوو کاتێک گوێم لێی بوو گووتی: دایکە..

بە توندتر دەستیم گرت و گووتم: بەڵێ ئازیزم، من لێرەم..

وەڵامی دایەوە: دەزانم لێرەیت. تۆ هەموو کات لێرەیت. تۆ هەموو کات لێرەبوویت لە پێناو من..

بە دەنگێکی بەرزتر لەوەی پێشبینیم دەکرد ئەوەی گووت.

پاشان پرسیاری لێکردم: ئەو ئامێری ئێکس بۆکسەت لە یادە کە ئارەزوویم دەکرد؟

فرمێسکەکانم دەبارین و دەمگووت: بەڵێ لە یادمە.

ئامێرێک بوو بیلال زۆر زۆری حەز لێبوو پێش چەند ساڵێک، ئەو کاتەش من توانای ئەوەم نەبوو بۆی بکڕم.

گووتی: کێشە نییە ئەگەر نەتتوانی بیکڕیت، شتێکی گرنگ نییە..

پاشان زەردەخەنەی کرد و گووتی: چیدی گرنگ نییە، تەنانەت ئەو کاتەش گرنگ نەبووە.

بە دەنگێکی گریاناویەوە پێم گووت: باشە، باشە.

کەمێک بێدەنگ بوو تەنانەت وا بیرم کردەوە کە قسەکانی تەواو کردووە.

بەڵام تفەکەی قوتدا و گووتی: ئەمجەد پیاوێکی باشە.

پێم گووت: ئەرێ، بەو شێوەیە.

دیسان بێدەنگ بویەوە و گووتی: وشەی نهێنی ئیمەیڵەکەم گۆڕیوە.

هەوڵمدا تێبگەم کەی توانیویەتی ئەوە بکات، بەڵام بە خێرایی گووتی وەک ئەوەی بیەوێت بیڵێت پێش ئەوەی کات تەواو ببێت..

وشە نهێنیە نوێیەکە ("احد، احد) ە.

پاشان زەردەخەنەی کرد و گووتی: ئاگات لە خۆت بێت دایکە.

لە دوای ئەوەوە قسەی نەکرد.

◆◆◆

لە دەرەوە ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو..

بەڵام جوانترینی ژیانم جێیدەهێشتم.

لە پڕێکدا شاشەکان دەیانگووت کە جەنگەکە کۆتایی هات، چەند دەنگێکیشی دەرکرد ڕایگەیاند کە بیلال ڕۆیشت.

پەرستارەکان ڕایانکردە چواردەورمان، بەڵام هیچیان نەکرد، من دەمزانی – ئەوانیش دەیانزانی - کە هیچ شتێک سوودی نییە.

من بە تەواوی ئارام بووم.

ئەو ڕۆیشت، لە بەردەممدا ڕۆیشت.

دەبوو لە ڕۆژێکی یەک شەممەی خۆشی لەم شێوەیەدا بچێتە باخچەوە بۆ یاریکردن.

دەشبوو منیش پێی بڵێم: ئاگات لە خۆت بێت، ڕۆژەکەت خۆش بێت.

بە شێوەیەک بیرم کردەوە کە لەوانەیە بچێت بۆ باخچە.

باخچەیەکی گەورەتر و جوانتر.

بیرم کردەوە کە ڕابکەم بە دوایدا و پێی بڵێم: ئاگات لە خۆت بێت بیلال، ڕۆژێکی خۆشت هەبێت..

بەڵام بە خۆمم گووت: خودا ئاگای لێت بێت بیلال.. ژیانەکەی دیکەت زۆر خۆش بێت.

♦ ♦ ♦

لە هەموو ڕۆژێکی یەک شەممەی خۆرەتاو و جواندا یادی بیلال دەکەمەوە کە داوام لێدەکات ئاگام لە خۆم بێت و جێم دەهێڵێت.

هەروەها پێشم دەڵێت کە ئەمجەد پیاوێکی باشە.

بەڕاستیش وایە.

ئەو ڕۆژە و ڕۆژەکانی دواتریش لەگەڵم مایەوە، هەروەک چۆن پیشووتر لەگەڵم بوو و مایەوە، لە دوای ئەوەش پێکەوە ماینەوە.

بە شێوەیەک، ئیدی بە بەردەوامی پێکەوە بووین.

ئەو بەشێک بوو لەوەی بیلال بۆی بەجێهیشتبووم.

دوای ئەوەش بوو بە هەموو شتێک.

ئەو ئێستا لەگەڵمدایە لە یەکەم هەنگاوەکانی " دەزگای بیلال بۆ ژیانێکی باشتر پێش مردن "، دەزگایەک کە خەونمان پێوە دەبینی و ئەو منداڵانە دەکەینە ئامانج کە پزیشکی بێ توانایە لە دوورخستنەوە مردن لێیان، ژیانێکی جوانترمان بۆیان دەوێت پێش مردن، ژیانێکی کورت و ناوازە وەکو ژیانی پەپولە..

ئەمجەد بیرۆکەکەی پێشنیار کرد، بەڵام لە کۆتایدا پێی گەیشتین. هەوڵ دەدەین تێنوسەکە و کاریگەریەکەی بەکاربهێنین لە کۆکردنەوەی بەخشینی پێویست.

هەروەها ئەمجەد هانیدام کە داواکاری خوێندنی ماستەر پێشکەش بکەم لە پایزی داهاتوودا. هەروەها زیاتر لە نامەی پشتگیری کردنی بۆ نوسیم تاوەکو ڕەزامەندی وەربگرم.

بەڵکو بگرە هەر لە ئێستەوە بابەتەکانی گەڕان و پێشکەش کردنەکەم بۆ پێشنیار دەکات.

هەروەها گوتیشی کە خەریکی ئامادەکردنی نشکێو (سوپراین)ێکە لە ڕۆژی دابەزاندنی فیلمەکەی (بیلال) بۆ پێشکەش کردن.

ئەگەر شتەکان بەو شێوەیە بێت کە دەیبینم.. پێم وابێت دەیەوێت بێتە داخوازیم.

پێشم وایە کە دەڵێم: بەڵێ..

◆ ◆ ◆

**لە دوای نزیکەی دوو مانگ لە مردنی بیلال، لاتیشا بەیانیەکیان هەستا تاوەکو ببینێت ژمارەیەکی زۆر لە ئاگادارکردنەوە بۆ ئیمەیڵەکەی هاتووە کە ڕایدەگەیەنێت پێی کەکۆمێنتی نوێ هاتووە بۆ تێنوسەکە (شیفرەکەی بیلال).**

**ژمارەکەی زۆر لە ئاسایی زیاتر بوو، تێنوسەکەی کردەوە تا ببینێت نامەیەکی نوێ نوسراوە لە لایەن بیلالەوە!..**

**لاتیشا موچورکە بە گیانیدا دێت کاتێک ئەم نیشانەیە دەبینێت (لە لایەن بیلالەوە بڵاوکراوەتەوە)، هەستی کرد کە بیلال لە چواردەوری دەسوڕێتەوە.**

**ئەوجا تێگەیشت کە بیلال ئەم نامەیەی خستووەتە ناو خشتەوە تاوەکو لە کاتێکی دواتردا بڵاو ببێتەوە، ئەویش قەدەر وایە کە خۆی مردووە.**

**ئەوە نامەی کۆتایی بیلال بوو، کە لە دوای مردنەکەی بڵاوی کردووەتەوە، وەک ئەوەی بیەوێت بە شێوەیەکی کرداری بڵێت، کە چی نوسیوە پیشووتریش، لە بارەی کاریگەری بەردەوام.. لە بارەی واتای ڕاستەقینەی ژیان.**

## نامەیەك لە بیلالەوە بۆ بیلالی حەبەشی ( تێنوسەکە )

ئازیزم بیلال

ئەمە شتێکی شەرمەزارکەر و نامۆیـە. هـەروەها دەشـکرێت بەشـێکی نـوێ بێت لە (گەڕانەوە بۆ داهاتوو)، یاخود بۆ ڕابردوو، نازانم، هەروەک چۆن تـۆش بە دڵنیاییەوە نازانیت کە باسی چی دەکەم.

شتەکە شـەرمەزارکەر و نامۆیـە، بـەڵام مـن ئـەمڕۆ دەتـدوێنم وەک ئـەوەی لێـرە بیـت، وەک ئـەوەی بتناسـم، سـەرەڕای ئـەوەی تـۆ پـێش ١٥ سـەدە ژیاویت!..

نامۆتر لەوە، ئەوەیە کە تۆ، سەرەڕای ئەوەی لە قارەیـەکی دیکـەی دووردا ژیاویـت، پـێش ١٥ سـەدە، ئـەمڕۆ ژیـانی منـت گـۆڕی، زیـاتر لـە هەرکەسـێک لەوانەی کە هێشتا لە ژیاندان.

ئەمە زیاتر تێیگەیاندم واتای چییە کە لە ژیاندا بیت، وای لێکردم تێبگـەم واتای چییە کە بەردەوام بیت لە ژیان تەنانەت دوای مردنیش.

وا نابینم گرنگی بە وردەکاریەکانی ئـەوە بـدەیت کـە ڕوویـداوە، بـەڵام مـن چیرۆکە درێژەکەت بـۆ کـورت دەکەمـەوە: بـاوکم نـاوی تـۆی بـۆ هـەڵبژاردم، تۆی نەدەناسی بەڵام بە لای مزگەوتێکدا تێپەڕیبوو کە ناوی تۆی لەسـەر بـوو لەسەر قارەیەکی نوێ کـە تـۆ ئـەو کاتـە لەسـەر ئـەم هەسـارەیە بوویـت هـەر نەشتدەزانی هەیە. ناوەکەی پێ جوان بووە... کەمێکی لە بارەتـەوە زانیـوە و بەوە خۆشـی ویسـتووی، سـەرەڕای ئـەوەی ئـەو بەداخـەوە زۆر دوور بـووە لـە هەموو شـتێکی باشـەوە.. ئـەوجا نـاوی تـۆی لێنـاوم و، دوای چەنـد مانگێـک ڕۆیشتووە.

هـەموو ئـەوەی بـۆی جێهێشـتم نـاوی تـۆ بـووە. وەک ئـەوەی وەسـیەتێک بێت. تەنانەت ئەگەر ئەو مەبەستەشی نەبوبێت.

له دوای ئەوه به چەند ساڵێک، من توشی نەخۆشیەکی کوشندە بووم، له کاتێکدا خەریکی وەرگرتنی چارەسەر بووم گوێم لێبوو فیلمێک بەرهەم دێنن له بارەی تۆوه (دەزانم که لەوانەیە تۆ واتای فیلم نەزانی چییە، ناشزانم چۆن بۆتی ڕوون بکەمەوه، بەڵام شتێکە وەک چیرۆکێکی بینراو)، منیش دەمزانی که به زۆری من له ژیاندا نابم کاتێک له فیلمەکە تەواو دەبن، بۆیە لەگەڵیان دووام تاوەکو چاوێک بخشێنم بە سیناریۆکەدا.. مەبەستم چیرۆکە نوسراوەکەیە پێش ئەوەی ببێتە بینراو.

لەو ڕۆژەوه من لەگەڵتدا دەژیم، یاخود پێویستە بڵێم: لەو ڕۆژەوه تۆ لەگەڵمدا دەژیت؟

من لەگەڵتدا بووم کاتێک له ژێر بەردەکە بوویت،

تۆیش لەگەڵمدا بوویت له چارەسەر وەرگرتنە دوور و درێژەکەمدا..

لەگەڵتدا بووم کاتێک بەسەر کەعبەدا سەرکەوتی.

لەگەڵمدا بوویت کاتێک له بنکی بیرەکەم دەهاتمە دەرەوه..

لەگەڵتدا بووم کاتێک دەتچرپاند: (احد، احد) و کچەکان لە شەقامەکانی مەککەدا لێیان دەدایت.

لەگەڵمدا بوویت کاتێک دەمچرپاند بە خۆمدا و دەمگووت کە دەیکەم... وەک تۆ دەبم..

لەگەڵتدا بووم کە بەو وشانە هاوارت دەکرد له گۆڕەپانی جەنگەکەدا، ئەو ڕۆژەی کارت لەگەڵ ئومەیەدا تەواو کرد.

هەروەها لەگەڵمدا بوویت ئەو ڕۆژەی کە گووتم بە خۆم (احد، احد) و، لووتی جۆنم شکاند.

لەو شەوەدا لەگەڵت بووم کە ئازاد بوویت،

تۆش لەو شەوەدا لەگەڵم بوویت، کاتێک بۆ یەکەم جار له زیندان باوکمم بینی..

لەو شەوەدا لەگەڵت بووم، ئەو شەوەی پێش ئەو بەیانییە بوو کە بۆ یەکەم جار بانگت دا.

لەگەڵم بوویت ئەو ڕۆژەی تێنوسم بڵاو کردەوە..

ئەو شەوە لەگەڵتدا بووم کە تەپاو تلت دەکرد کە ڕۆژەکەی بە ڕەنگی دایکتەوە ناوزەندیان کردیت.

ئەو ڕۆژە لەگەڵمدا بوویت کاتێک زانیم کە ڕێژەی ڕزگاربوونم لە نەخۆشیەکە سفر لە سەدە...

لەگەڵتدا بووم لە کاتی سەرلێشێوانت، لە کاتی دڵنیاییت.

لە ڕێگەی نێوان هەردووکیانیشدا تۆ لەگەڵمدا بوویت لە سەرلێشێواوی و دڵنیاییم.. لە ڕێگەی نێوان هەردووکیشیاندا.

سەرەتا حەیرانت بووم، بەوەی کە تۆ پاڵەوانێکی و ناوت هەڵدەگرم... بەوەی کە ئازادییەکەت بەدەست هێناوە و، تۆڵەت لە گەورەکەت کردووتەوە.

بەڵام بەرەبەرە تێگەیشتم کە شتەکە زۆر لەوە گەورەتر و قوڵترە.

تێگەیشتم کە دەکرێت ژیانی تۆ ژیانی من بگۆڕێت و، گەشتەکەت لە بەردایەتیەوە بۆ نێو ئازادی، دەکرێت ڕوناکیەک بێت بۆ ڕزگارکردنی زۆرێک خەڵک.

بەردایەتییەکان زۆر زۆرن..بەڵام ڕێگەی ڕزگاربوون لێیان هەموو کات وەک یەکە. هەموو کات جۆرێکی دووبارە لە دەرچوون هەیە.. هەر بەو شێوەیە ژیانت دەتوانێت یارمەتیم بدات یاخود یارمەتی دایکم بدات، یاخود یارمەتی هەر کەسێک بدات کە بە ڕووبەڕووبونەوەیەکدا تێدەپەڕێت..

بەڵام نەمدەتوانی بگەمە ئەوە پێش ئەوەی سەرەتا شفرەکەت بکەمەوە.

قورس و گران نەبوو کە بزانم لە کوێدا وشەی نهێنی گەشتەکەت بدۆزمەوە.

بەڵام دەبوو تێبگەم واتای چییە.

بە دڵنیاییەوە وشەی نهێنیەکە (احد، احد) بوو. زۆری ناوێت کە کەسێک بیری لێبکاتەوە پێش ئەوەی بزانێت چییە.

احد، احد، بە دڵنیاییەوە.

بەڵام ئەوە واتای چییە؟

خودایەکی تاقانە؟ تەنها؟!

بەڵام خۆ ئەوە زۆربەی کەس باوەڕیان هەیە پێی، بێ ئەوەی شتێک لە ژیانیان بگۆڕێت، جا وەرە بگات بەوەی ژیانی جگە لەوان بگۆڕێت.

ماوەیەکی زۆر دوورم بەسەر برد کە دەمویست تێبگەم، هەوڵمدەدا تێبگەم کە چۆن ئەو وشەیە (احد، احد) ببەستمەوە بە هێزەکەتەوە، بە گەشتەکەتەوە لە بەردایەتیەوە بۆ ڕزگار بوون.. بۆ ئازادی.

شتەکە بۆ من وەک مەودایەکی دوور و درێژ بوو لە چارەسەری کیمیایی (نازانم چۆن شی بکەمەوە بەڵام ئەو چارەسەرێکە نیشانەی زۆر بە ئازاری لێدەکەوێتەوە)..

ئەوجا تێگەیشتم!

ئەوەیە کە هەر تەنها باوەڕت بە هەبوونی خودایەکی تاک نەبێت، بەڵکو ئەوەیە کە پرسەکەتی لەگەڵ یەکبخەیت، ئەوەی کە یەکبگریت لەگەڵ پرسێک کە پەیوەندی بەو بەهایانەوەیە کە بەو خودایەوە دەتبەستێتەوە..

بەهای هەق و دادپەروەری..

ئەوە تاکە ڕێگەیە کە دەتوانێت هێزت بداتێ لەو خودایەوە، ئەوەی کە لەگەڵ پرسەکەدا یەک بگریت، ئەوەی کە شتێکت بۆ بدۆزێتەوە گەشەی پێ بدەیت، شتێک کە لە ئامێزی بگریت، لە ناو خوێن و هەناسەکانت دا هاتووچۆ بکات..

ئەمە (احد، احد)ە، پرسێک کە تێیدا یەکت گرتووە لەگەڵ ئەو شتانەی ئەو خودایە دەیەوێت کە جگە لە هەق و دادپەروەری و خێر چیدیکەی ناوێت..

ئەوە شفرەکەتە، هەروەها شفرەی زۆرێکی دیکەش، نەوەک هەر هی خۆت..

ئەوە شفرەیەکی یەکگرتووە، دەکرێت لە سەدەی یەکی زاینیدا، شەشی زاینیدا و، بیست و یەکی زاینیشدا کار بکات.

شفرەیەک کە هەموو کات کار دەکات، هیچ کات ماوەکەی بەسەر ناچێت.

بیلال، ئەی کوڕی ڕەباح و حەمامە، ئەی ئەوەی پێش هەزار و چوارسەد ساڵ لە قارەیەک ژیاویت کە هەرگیز نەمدیوە، سوپاس بۆ ئەوەی ژیانمت گۆڕی، من بیلالم کە لە ژێر مەرگی شێرپەنجەدام لە بروکلین، کوڕی لاتیشا... هەروەها سەعیدیش (کە نەمدیوە جگە یەک جار نەبێت لە زیندان!)...

سوپاس بۆ تۆ، بە ئەندازەی دووری هەزار و چوارسەد ساڵ کە لە نێوانماندایە، هەروەها بە ئەندازەی ئەو مەودایەی کە بەردایەتی و ئازادی جیا دەکاتەوە.. بە ئەندازەی گۆڕانەکەشم لە دوای ئەوەی ناسیمیت..

سوپاس بۆ تۆ.

دڵسۆزت

بیلال

ڕۆژی ٢٠١٥/١/١ دەستی پێکرد

١/٦/ ٢٠١٥ بە پایان گەیشت

## ناوەڕۆك

# ڕازی بیلال

(ئەوەی کە بە چیرۆکی بیلالی کوڕی ڕەباح کاریگەر بیت شتێکە و، ئەوەش کە هەموو ژیانت بە هۆی ئەوە بگۆڕێت بە تەواوی شتێکی دیکەیە...

هەروەها ئەگەر ئەوە لە کۆمەڵگایەکی عەرەبی موسوڵماندا ڕوو‌بدات شتێکە، بەڵام ئەی ئەگەر لە نیویۆرکدا ڕووبدات؟

سەرەڕای نامۆییەکەی بەڵام ئەوە ڕوویدا.. چیرۆکی بیلالی کوڕی ڕەباح ڕەوگەی ژیانی کەسانێکی گۆڕی کە لە نیویۆرک دەژین، ژیانێکی تەواو دوور لە هەر گۆڕانکاریەکەوە بە تایبەتیش گۆڕانکاریەک کە لە لایەن پیاوێکەوە دێت کە پێش زیاتر لە هەزار ساڵ ژیاوە. بەڵام، ڕۆژێکیان... ئیمەیڵێک بە یەکێکیان دەگات و... هەموو شتێک دەگۆڕدرێت...

ئەم ڕۆمانە چیرۆکی ئەوەیە کە بەسەریاندا ڕویداوە... بە هۆی (بیلال)ەوە..

کە پێدەچێ بەسەر تۆیشدا ڕووبدات..)


07501269689
07511408868
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریك- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



٨٠٠٠ هەزار دینار

ISBN: 978-9922-626-15-4

9 789922 626154